جەمال نەبەز

# کۆ بەرهەم ژمارە - 7
# زنجیرەی وتار و وتوویژ لەگەڵ دەزگەی راگەیاندنی گشتی.. ژمارە (2)



www.jemalnebez.com

چاپی یەکەم
هەولێر ۲۰۰۷

# پێشەکی

مامۆستا و هاوبیری خەباتم جەمال نەبەز داوای لە من کرد کە پێشەکییەك بۆ ئەم کتێبەی بنووسم و منیش سوپاسی دەکەم بۆ ئەو کارە و بڕوا هاوبەشە.

ئەم کتێبە بەشێکە لە زنجیرە کتێبێك کە وتارەکانی رۆشنبیری گەورەی کورد جەمال نەبەز دەگرێتە خۆی، پاش رێکخستنیان بە پێی بەرواری بلاوکردنەوەیان لە رۆژنامەی "میدیا"دا، کە لە هەولێر دەردەچێ.

نووسەر جەمال نەبەز نیو سەتە لەمەوبەر نەخشەی گشتیی بیری پیرۆزی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزمی کێشاوە کە دوایی بوو بە رێبازی کاژێك. خۆی لە شاری سلێمانی لە باشووری کوردستان هاتووەتە دنیاوە، ئەو شارەی کە بەشاری هەلمەت و قوربانی ناسراوە. جەمالیش لە رێبازی شارە خەباتگێرەکەی لاینەداوە و، بەردەوام بووە لە هەلمەت و قوربانیدان بە پارە و کات و ئارەقەی ناوچەوانی، لە پێناو چەسپاندنی بیری کوردانەی ئازادیخوازانەدا. ئەمەشی لە سەتان سیمینار لە شارەکانی ئەوروپا و بەزمانێکی کوردیی پاراو و دلگیر بۆ هەموو گوێگرانی سیمینار و وتارەکانی شیکردووەتەوە. ئەمەش جگە لە پێنووسەکەی کە هەرگیز لە گەیاندنی راستی بۆ جەماوەر نەوەستاوە و، هەمیشە بە تێڕوانینێکی قووڵ و شیکردنەوەیێکی ریالیستانەی رووداوەکانەوە، راستییەکانی نەخشاندووە. لەبەر ئەوەشە کە هەرچی ئەو پێشبینیی رووداوی کردبێت، روویداوە، چۆنکە جەمال نەبەز رووداوەکان لە روانگەیێکی نەتەوەییی ئازادیخوازانەوە شیدەکاتەوە و بەرژەوەندیی نەتەوەی کورد دەخاتە سەرووی هەموو بەرژەوەندییێکی کەسی و خێلەکی و حزبایەتی و ناوچەگەری.

وتارەکانی ئەم کتێبە پڕن لە وێنەی دروستی رووداوەکانی کوردستان وجەمال نەبەز رووداوێك نایەلێت بەبێ باسکرن. سەبارەت بە پاشکۆ مێژووییەکانی و پێشبینیی سەرەنجامەکانی دوارۆژی و لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیفەکانی. ئەو رابردو و ئێستا بەیەکەوە دەبەستێت. تاکو سەرەنجامی، چ باش و چ خراپ، بداتە دەستمان چۆنکە جەمال نەبەز نە سلّ لەراستی دەکاتەوە و نە ماستاویش بۆ کەس دەکات.

وتارەکانی ئەم پەرتۆکە نەك تەنیا گێڕانەوەی رووداوە راستیەکانن، بەلکو لەراستیدا مێژوویێکن بۆ گەلی کورد لەکاتی نووسینیاندا. بەمەش جەمال نەبەز دەبێتە

مێژوونووسێکی بێلایەن و دادوەری ڕووداوەکان، بەڵام بێلایەنیی ئەو وەك مێژوونووسێك ئەوە ناگەیێنێت کە ئەو لایەنگری گەل و نیشتمانەکەی نییە، بەڵکو لە بواری ململانێی کوردیی حزبایەتی و خێڵەکایەتی و ناوچەگەریدا بێلایەنە.

لە پاڵ ناوی جەمال نەبەزدا زۆر ناوی دی هەن کە لەناو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانیدان و، زۆربەیان دەسەڵات و چەك و ملیار دۆلاریان هەیە... بەڵام من جەمال نەبەز لەوان و لە دەسەڵات و هێزی سوپابیان بەهێزتر و لە ملیاردارەکان بە دەوڵەمەندتر دەزانم، بەهۆی هەڵوێستی نیشتمانیی ڕزگاریخوازانەی بەردەوامی خۆی بۆ پتر لە نیو سەدە و هەڵوێستی ئازادیخوازانەی بەردەوامیشی لای من، هێزێکی ڕاستەقینەی نەفەوتاوە.

لەکۆتاییدا هیوادارم کە توانیبێتم هەقی تەواوی ئەم پیاوە سەربەخۆ و نیشتمانپەروەرە بدەم و داواکارم کە یەزدان هێز و تەمەنی درێژە پێبدات و ئەوەی وتارەکانی لەم بەشە و بەشەکانی دیدا بخوێنێتەوە، ڕاستی وتەکانمی لەم پێشەکییە کورتەدا بۆ دەردەکەوێت.

خوا پاڵپشتی سەرکەوتنە.

د. جەواد مەلا

سەرۆکی کۆمەڵەی ڕۆژاوای کوردستان

2007-6-24

ئەم وتارانەی لێرەدا پێشاندراون، بریتین لە 61 وتار، کە جەمال نەبەز لە ڕۆژنامەی "میدیا" و "سەکۆ" و "کۆنگرە"دا لە ساڵانی 1999 وە تا 2007 بلاّویکردوونەتەوە و ئەمانە باشترین شیکردنەوەی زانستانەی ڕووداوە رامیاری وکۆمەلایەتی وڕۆشنبیرییەکانی نێو کۆمەڵگەی کوردستانن، کە بە گیانێکی بە ویژدان وسەربەخۆ نووسراون، لە گەڵ ژمارەیەك پێشنیازی بابەتانە بۆ پێشخستنی کۆمەڵگەی کوردستان، ئەم چەپکە وتارە، دەبێتە بەرگی حەوتەمی "کۆبەرهەم" ژمارە (2)ی زنجیرەی وتار وتوویژ لەگەڵ دەزگەی راگەیاندنی گشتی. کە ژمارەی یەکەمی ئەم زنجیرەیە، وەك کۆبەرهەم ژمارە (6) لە سلێمانی/کوردستان لە 2006 دا لە چاپدراوە. کۆمەڵێکی دیکە لەو وتارانەی کە لە ژمارە (1)دا بلاّوکراوەنەتەوە، لەم ماڵپەرەشدا بلاّودەکرێنەوە.

((بەڕێوەبەری ماڵپەڕی جەمال نەبەز))

**www.jemalnebez.com**

==============================

## سوپاس و پێزانین

سوپاسێکی گەرمی کۆمەڵەی ڕۆژاوای کوردستان، بە سەرۆکایەتیی برایی هێژا وماندوونەناس جەواد مەلا دەکەم، کە بە زەحمەتێکی زۆر، ئەم وتارانەی بۆ چاپکردن وخستنە ماڵپەر ئامادە کرد. هیوام وایە وێنەیان کەم نەبێ.

**جەمال نەبەز**

بەرلین 2007/8/3

==============================

# ناوەڕۆك

# سەلاحەدینی ئەیوبی کوردە، بە کورد کراو نییە!

ئەو وتارەی بیرمەندی نەتەوەیی د. جەمال نەبەز لەرۆژی 1999/10/8 لەرۆژنامەی عەرەبی (الشرق الاوسط)دابلاوکراوەتەوەو، کۆپییەکی بۆ رۆژنامەکەمان ناردووە، ئێمەش لێرەدا بەزمانی کوردی بلاوی دەکەینەوە.
(میدیا)

بەپێی هەواڵێکی رۆژنامە بەرێزەکەتان لە(عەممان)ەوە لەبەرواری 1999/10/3دا، گوایە (عیزەت ئیبراهیم)ی جێگری (سەدام حوسێن) لەم رۆژانەدا بووەتە مێژووناس و لەسەرەتای ئەم هەفتەیەدا وتوویەتی: پشت بەستن بەو شتانەی مێژوونووسەکان گێراویانەتەوە زیان بەبەرژەوەندیو ئایندەی نەتەوەی عەرەب دەگەیەنێ، لەم دیدگایەشەوە، بەپێچەوانەی مێژوونووسەکان، بانگەشەی ئەوە دەکات کە- سەلاحەدینی ئەیوبی- لەهۆزێکی عەرەبی رەسنەو بەتێپەڕبوونی کاتو بەهۆی شوێنی نیشتەجێ بوونو فاکتەرەکانی دەوروبەر، بە کورد کراوە، وەك چۆن ئەمە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە خێزانە عەرەبەکان کراوەو، کوڕەکانیان سەرکردایەتیی شۆرشی کوردانیان کردووە دژی (کۆلۆنیالیزم) لەعێراقدا.

دیارە (عیزەت ئیبراهیم) ئەوەی لەبیرکردووە کەرەخنە لەقسەیەکی (عەبدولرەحمان کوڕی عەلی 1135-1200) ناسراو بە (قاضی الفاضل) بگرێ کە ئەو کاتەی سەلاحەدین سەرکردەی (عەرەبی بەکورد کراو!) بەسەرکەوتوویی چووە ناو(قودس)، لەپێشوازی ئەو سەرکردەیەدا، لەچامەیەکی شیعری خۆیدا دەڵێ:-

(شوکر بۆ خوایە، کەدەوڵەتی خاچپەرستی ریسوا کردو ئایینی پێغەمبەری عەرەبی، بەکورد بەهێزتر کرد).

جێگری سەرۆك، ئەوەی لەبیر چووە بڵێ کە (قاضي الفاضل) مێژووی نەتەوەیی عەرەبی شێواندووە تاکو بەگوێرەی بەرژەوەندیی داگیرکەرو زایۆنیزم، زیان بەداهاتووی بگەیەنێت، هەروەها ئەوەی بەسەردا رەت بووە کە بەبیر خۆی بێنێتەوە، ئەو سەلاحەدینە (بەکورد کراو)ەی یەکەم نەخۆشخانەی لە(میسر) دروست کرد بەناوی (بیمارستان)، مەبەستی بوو ژینگەو زەمینەیەکی لە بار

برەخسێنێ بۆ (بەکورد کردنی) میسریەکان و لەم نێوەشدا ئامانجی خۆی پێکا، چۆنکە ئێستاشی لەگەڵ دابێ، میسرییەکان وشەی کوردی (بیمارستان) بەکاردێنن کە واتای (ماڵی نەخۆشەکان) دەگەیەنێ. هەروەها وشەی "مەهمانە"ی کوردی بە کاردێنن بۆ "معاش"کە مانای "مانگایە".

وەك دەشزانرێ، رێبەری کورد مەسعود بارزانی کەیەکێکە لەئەندامانی ئەو خێزانەی جڵەوی شۆرشی کوردیان لەدەست بووە، بیری لەسازکردنی (زەمینەو دەوروبەرێکی لەبار) دەکردەوە بۆ بەکورد کردنی (خێڵە عەربەکان)، ئەوەش لەوەدا دەردەکەوێ کە لەهاوینی رابردوودا، رێگای بەهەندێك لە خێڵەکان دا، بەتایبەتی خێڵەکانی (جبورو شەممەر) کەمەڕو ماڵاتی خۆیان لەلەوەڕگاکانی کوردستان بلەوەڕێنن و ئێستاش هاوسۆزیەکی پتەو لەنێوان ئەوخێڵانەو گەڵی کورددا هەیە.

دیارە بۆ (راست کردنەوەی پارسەنگی تەرازوو) عیزەت ئیبراهیم و هاوەڵەکانی ئەومافەیان بە خۆیان داوە دەست بکەن بەتەعریب کردنی ناوچەیەکی بەرفراوانی باشووری کوردستان و لەسەرووشیانەوە شاری کەرکووك و خانەقین و مەخمورو ناوچەی ئێزیدییەکان و ناوچەکانی تر، چۆنکە "عەربین"و بەهۆی فاکتەرەکانی دەوروبەر بەکورد کراون و پلیت بەسەر (بەکورد کراوەکان)دا دابەش دەکەن و داوای (راستکردنەوەی ناسنامەی کوردی)و گەڕانەوە بۆ (رەسەنایەتیی عەرەب) یان لێ دەکەن، یان دەبێ، ئەگەرنەوەنەکەن لەشوێنی نیشتەجێ بوونیان دەربکرێن.

**میدیا، ژ54، 1999/11/1**

## دەقی نامەی پرۆفیسۆر جەمال نەبەز بۆ د. ئیسماعیل بێشکچی

ماوەیەك بەری ئێستە، بیرمەندی نەتەوەیی و نووسەری بەنێو بانگ و سەرۆکی (لیژنەی بەخشینی خەلاتی ئۆسمان سەبری) پرۆفیسۆر جەمال نەبەز، نامەیەکی بەسۆزی ئاراستەی زانای کۆمەڵناسی گەورەی تورك و دۆستی بەوەفای کرد د. ئیسماعیل بێشکچی کرد. ئێمەش دەقی ئەونامەمان لەئینگلیزییەوە وەرگێراوەتە سەرزمانی کوردی، شیاوی باسە (لێژنەی بەخشینی خەلاتی ئۆسمان سەبری) لەرۆژی 1998/1/9 دامەزراوەو، خەلاتەکەش بریتییە لەوێنەیەکی ئۆسمان سەبری، کەلە زێر دروستکراوەو، خەلاتێکی سیمبولییە.

(میدیا)

خۆشەویست پرۆفسیۆر بێشکچی

بەناوی (لیژنەی بەخشینی خەلاتی ئۆسمان سەبری)و بەتەواوی ئیرادەی خۆمەوە دەخوازم ئەوپەڕی هەستی خۆشیمان بەرامبەر ئازاد بوونی بەڕێزتان لەزیندان دەرببڕین. ئێوە، بەهۆی ئازایەتیی ئەفسانەییتان و زیرەکی و پاکی هزریتان و بانگەوازە ئاشتیخوازییەکانتانەوە، بوونە سیمبولێکی ئازادی لەنێو کوردو گشت گەلانی ئازادیخوازو رزگاریخوازدا.

هەروەها دەزانن ئۆسمان سەبری کە، بەری چەند ساڵێك ماڵئاوایی لێکردین، هۆزانڤان و نووسەرێکی کوردو تێکۆشەرێکی رێگەی ئازادی بوو، لەبەر چالاکی و کارکردنی هەمیشەیی لەپێناو بەدیهێنانی ئازادی بۆ رۆڵەکانی نەتەوەکەی، چەندان ساڵی تەمەنی خۆی لەزیندانە فەرەنسی و عەرەبییەکاندا بەسەر برد. بۆیەش لەدوای کۆچکردنی، رۆناکبیران- ی کوردو لەنێویاندا- هۆزانڤان و گۆرانیبێژان و مۆزیکڤانان و رۆژنامەنووسان و زمانزانان و دیرۆکنووسان- لێژنەیەکیان دامەزراند بەنێوی لێژنەی بەخشینی خەلاتی ئۆسمان سەبری. ئەم لێژنەیەش، هەرسێ ساڵ جارێك هەڵدەستێ بەبەخشینی خەلاتێکی سیمبولی بەکەسێتییەکی پەسەندو بەنێوبانگ لەهەمبەر ئەو خزمەتە بەنرخەی کە پێشکێش دۆزی نەتەوەی کوردی دەکات، بۆیەش ئەم لێژنەیە بڕیاریدا کەیەکەمین خەلاتی خۆی بە ئێوە ببەخشێ و هیواداریشە ئێوەش قبوڵی بکەن.

بەشداریی ئێوە لەخزمەتکردنی دۆزی کوریدا بەهیچشێوەیەك ناکرێ پشتگۆێ بخرێ‌و ژێیر بکرێ. ئێمە نەمانتوانی خەلاتەکەتان پێ ببەخشین کاتێك دیلی زیندان بوون. بەلام ئێستە زۆر خۆشحالین کە لەپێوەندییەکی راستەوخۆداین لەگەلْ ئێوەو دەتوانین خەلاتەکە بەشێوەیەکی راستەوخۆ بە ئێوە ببەخشین‌و شاندێك لەلای ئێمەوە لەکاتێکی گونجاودا بۆ خەلات بەخشین‌و رێزنان سەردانتان دەکات بە هیوای ئەوپەڕی تەندروستی‌و تەمەنێکی درێژ بۆ ئێوەی بەڕێز.

**جەمال نەبەز**

**سەرۆکی (لێژنەی بەخشینی خەلاتی ئۆسمان سەبری)**

**بەرلین** 1999/9/25

**میدیا، ژ**58، 2000/1/1

## پرۆفیسۆر د. جەمال نەبەز:

## "ئەوانەی کەدەڵێن بیری نەتەوەییی کوردی فەلسەفە نییە، دەبێ جارێ بیری نەتەوەیی کوردییان خوێندبێتەوەو بشزانن فەلسەفە چییە"

مامۆستاو بیرمەندی کورد پرۆفسیۆر د. جەمال نەبەز بەهۆی بەرهەمە هزریو ئەکادیمییە زۆرو بایەخدارەکانی لەنێو رۆشنبیرانو نێوەندە ئەکادیمییەکانی ئەوروپادا خودان نێوبانگێکی فرەو بەربلاوەو زمانزانێکی گەورەی کوردەو شارەزاییەکی تەواوی لەکۆمەڵێك زمانی رۆژهەلاتیو ئەوروپیدا هەیە، لەو رێگەیەشەوە توانیویەتی خزمەتێکی زانستییانەی مەزن پێشکێش بەکوردو زانست بکات . لەبواری سیاسیو هزریشدا بەهۆی پیشەنگێتی کردنی بۆ قوتابخانەیەکی هزریی کوردییانە، هەمیشە تێکە هزرییەکانی جێگەی گفتوگۆ و لێدوان بوونە لە نێو گۆرەپانی سیاسیو هزری کوردستاندا ژ بەر هەندێ بە پێوستمان زانی نوێترین بەرسڤەکانی ئەم مامۆستاو بیرمەندە هێژایەمان دەربارەی هێندێ مژاری هزریو رەوشی سیاسی نەتەوەییمان بە خوێنەرانی (میدیا) بدەینە ناسین لەرێگەی ئەم هەڤپەیڤینەوە کەبەگیانێکی نەتەوەییانەوە پرسیارەکانی لێ قبوڵ کردین بەزوویش وەرامی داینەوە.

هەڤپەیڤین : ئاکۆ محەمەد

میدیا، ژ 63، 2000/3/27

# پەیامی پیرۆزبایی پرۆفیسۆر د. جەمال نەبەز

بەڕێزینە کارگێرانی لێژنەی سەرپەرشتیی پێنجەمین ساڵیادی دامەزراندنی یەکێتیی نەتەوەییی دیموکراتی کوردستان:

پیرۆزبایی جێژنی نەورۆزو بانگێشتەکەتان بەبۆنەی ئاهەنگی پێنجەمین ساڵرۆژی دامەزراندنی یەکێتییەکەتانەوە، گەیشتە دەستم، زۆر سوپاستان دەکەم. هیوام وایە سەرکەوتوو بن لەپێناوی خزمەتو هێنانەدی ئامانجەکانی بیری نەتەوەییی کوردیدا.

بەڕێزینە: بیری نەتەوەییی کوردی، نێوی خۆی بەخۆیەوەیە، واتە بیرێکە کەبەرژەوەندیی نەتەوەی کوردو خەڵکی کوردستان دەگرێتەخۆ، بەهەموو حیزبو کۆمەڵو ڕێبازو هۆزو نێوچەو هەرێمو باژێرو گوندو هەموو تاکێکی نەتەوەی کوردو هەموو کوردستانییەك. ئەوەش لەسەر بنچینەی ئازادیو یەکسانیی کۆمەڵگەی کوردستانو هەنگاونان بەرەو دامەزراندنی قەوارییەکی رامیاریی سەربەخۆ، ئەوجا لەچ شێوەو چوارچێوەیەکدا دەبێ، ئەوە جێی لێدوانو توویژەو، گرنگ یەکسانیی کوردو گەلانی دیکەیە لەدەسەلاتدا. یەکسانی لەدەسەلاتدا بڕبڕەی پشتی ئازادییەو بنچینەو بنەمای بیری نەتەوەییی کوردییە. ئەم یەکسانییەش لەدەسەلاتدا هەر بۆ نەتەوە جۆر جۆرەکان نییە، بەڵکو بۆ بەشەکانی کۆمەڵگەشەو، بەتایبەتی بۆ ژنو پیاو، کە بە داخەوە، دەستدرێژیی پیاو بۆ سەر مافی ژن، لەلایەن پیاوی تەنگە تیلکەو خۆپەرستو مێشك هێشكو دەروون نەخۆشەوە، زوو زوو لەکوردستانی رزگار بوودا روو دەدا، کە ئەوەش بەڵگەیەکی بەرچاوە بۆ ئەوەی کەفەرهەنگی کۆنو رزیوو گەنیوی داگیرکەرانی کوردستان، خەریکە جێ بۆ خۆی دەکاتەوە لەنێو کۆمەڵگەی کوردەوارییدا، کەنموونەیەکی ئەوەش لەدەستوورو نەریتەکانی رژێمی فاشستی بەعسیدا دەردەکەوێ کە هەتا ئێستەش لەکوردستانی رزگار بوودا بەکار دەهێنرێن، مەبەستم لێرەدا زاگۆن (قانون) ی دۆخە تایبەتییەکانە، واتە: (**قانون الاحوال الشخصية**)ی بەعسییەکان کە ژن وەك کۆیلەیەك تەماشا دەکات. لەبەر ئەوە، چاوەڕوانیی هەموو کوردێکی نەتەوەیی لەکاربەدەستانی

کوردستان‌و لەپێش هەموویانەوە لە بەڕێزو خۆشەویست نێچیرڤان بارزانی ئەوەیە، ئەم دەستوورو نەریتانەی بەعسی فاشیست بخرێنە گۆڤەکی مێژووەوە، دەستوورو نەریتی دیموکراتانە بێنە جێیان کە لەگەڵ فەرهەنگی پێشکەوتخوازانەی کورد بگونجێن‌و پەنجەی ئەو پیاوە کەللە رەقە بشکێنرێ کەبەنیازی خراپەکاری بۆ ژنێك درێژ دەکرێ.

بەڕێزینە فەرهەنگی کورد، فەرهەنگی جەنگیزخان‌و هۆلاکۆو تەیمووری لەنگ و حەجاجی کوڕی یوسف و یەزیدی کوڕی مەعاویەو میشیل عەفلەق ونەتاترك ورەزا خان نییە، فەرهەنگی کورد، فەرهەنگی ئەناهیتاو زەردەشت‌و پاپەکی خوڕەمدین‌و فەیلەسووفی مەزن سوهرەوردی‌و سوڵتان سەهاکی کاکەیی‌و شێخ هادی ئێزیدی‌و پیری عەلەوییە، فەرهەنگی کورد، فەرهەنگێکی مرۆڤ دۆستانەیەو، دژ بە هەموو جۆرە زۆرداری‌و ستەم، هۆڤێتییەکە. شەرەفی پیاو لەم فەرهەنگەدا لەکەنەفتکردن‌و بندەستکردنی ژندا نییە، بەڵکوو چەوساندنەوەی ژن بەوپەڕی بێ شەرەفی دادەنێ. ئەو پیاوانەش کە پیاوەتیی خۆیان لە ژنکوژیدا دەبینن، بادڵنیا بن، ئەگەر بچنە سەر پەیژەش، هێشتا ناگەنە ئەژنۆی ژنانی وەك قەدەم خێرو خانزادو قەرە فاتمەو ماهی شەرەف خانم‌و حەپسە خانی نەقیب‌و عادلەی جاف‌و رەوشەن بەردخان‌و میناخانم‌و لەیلا قاسم‌و هەڤاڵ خەجۆو کوردستان موکریانی‌و دایکی جوان.

سەرکەوتنیش هەربۆ رێبازی نەتەوەییی کوردە، رێبازی ئازادی‌و یەکسانی‌و سەربەخۆیی.

جەمال نەبەز

بەرلین 2000/3/26

میدیا، ژ64، 2000/4/15

# بۆ / بیرۆی رامیاریی یەکێتیی نەتەوەییی دیمۆکراتی کوردستان YNDK

بەڕێزینە،

هەواڵی تیرۆر کردنی سیاسەتکارو رۆژنامەنووسی کورد سەربەست مەحموود، سەرنووسەری رۆژنامەی (میدیا) وەك هەورە تریشقەیەك کەوت بەسەرمدا.

سەربەست مەحموود، رۆژنامەنووسێکی شارەزاو ئازاو هەق بێژ بوو. بێگومان تیرۆر کردنی خەباتکارێکی وەك سەربەست مەحموود، نابێتە هۆی چاوترساندنی قەڵەم بەدەستی چاونەترس، یادی سەربەست مەحمووود، وەك شەهدێکی وشەی هەق، لە بیرەوەریی هەموو خاوەن ویژدانێکدا جێی خۆی دەگرێ‌و، رووی ئەو مێشکپووتانە رەش دەبێ کەوەرامی وشە بەچەك دەدەنەوە.

هەزاران سڵاو لەگیانی شەهیدی وشەی هەق، سەربەست مەحموود کەسەری بۆ ناهەقی‌و درۆو دەلەسەی بەرەی تاریکی شۆڕ نەکرد.

ئەز لەکاتێکدا کەئەوپەڕی بێزاری خۆم لەم کردەوە دڕندانەیە دەردەبڕم‌و تف‌و نەحلەت لەچارەی خوێنڕێژان دەکەم، داوا لە کاربەدەستانی حکومەت‌و جەماوەری سەربەرزی کوردستان دەکەم کەئەوپەڕی هەوڵ بدەن بۆ دۆزینەوەی تاوانباران‌و کێشکردنیان بۆ بەردادگە.

جەمال نەبەز

بەرلین 2000/6/1

میدیا، ژ68، 2000/6/15

# کوردۆلۆژی، لەنێوان زانستو هۆقەبازیدا

لەندەن – تایبەت بە میدیا

بیرمەندی گەورەی نەتەوەییمان بەڕێز پرۆفیسۆر د. جەمال نەبەز کاتژمێر (5ر30) ئێوارەی رۆژی 12/ 8/ 2000 لەسەر بانگهێشتی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان KNC لە هۆڵی ماندێلا لە شاری لەندەن، سەمینارێکی هزری بەنرخی لەژێر ئەو نێو نیشانەی سەرەوەدا سازکرد، کەتیایدا د. جەمال نەبەز بەشێوەیەکی زۆر زانستانە باسی لەکوردۆلۆژی کرد، دواتر لەلایەن رۆشنبیرانی ئامادە بووەوە گفتوگۆ لەسەر باسەکە کرا لەدواییدا بەپلەی دەست خۆشیو رێزگرتن بۆ د. جەمال نەبەز کۆتایی سەمینارەکە هات.

میدیا ژ(7) 2000/7/15

# پەیامی بەرێز مامۆستا جەمال نەبەز بۆ ڕۆژی چلەی شەهید سەربەست مەحموود لە هەولێر

شەهیدکردنی ڕۆژنامەنووس وسیاسەتکارو نووسەری کورد سەربەست مەحموود کە نێوی ڕاستەقینەی سیروانە کوڕی بنەماڵەیەکی نیشتمانپەروەری کوردستانە، داخ و خەفەتێکی قورسی خستۆتە دڵی هەموو ئازادیخوازو مرۆڤ دۆستێکەوە کە شارەزای ژیاننامەی ئەم لاوە خەباتکارە لەخۆبردووە بێ، شەهید کردنی سەربەست مەحموود زیانێکی گەورەیە بۆ لایەنگرانی ڕێبازی نەتەوەییی کورد. هەزاران چرا لەسەر گۆڕی پیرۆزی بێ و ئاهو ڕامزدابەهەشتی بەرینی پێببەخشێ.

گەورەترین خزمەت بەگیانی پاکی شەهید سەربەست مەحموود وبنەماڵەی بەرێزی، دۆزینەوەی تاوانبارانە بەزوویەکی زوو، چونکە گەلێك لایەن کەوتوونەتە جووڵەو هەوڵدەدەن،هەریەکەیان جۆرە چیرۆکێك بگێڕنەوە بۆ ئەم کارەساتە جەرگبڕە. لەبەر ئەوە، داخوازیی هەموو هاووڵاتییەکی بەویژدان و بەتەنگەوە هاتوو لەکار بەدەستانی هەولێر، بەتایبەتی لەدەزگای ئاسایش و پۆلیس و پارێزەری مافی گشتی (مدعی عام) ئەوەیە، بۆدیاریکردن و خستنە ڕووی دەستی تاوانباران تێبکۆشن و بەخشیشێکی چەور دەست نیشان بکەن، بۆ ئەوکەسەی سەری دەزووەکە دەردەخا، بێ ئەوەی نێوی ببەن، ئەوا چاوەڕوانین.

میدیا، ژ7، 2000/7/15

# وەرامی نامەیەکی کراوەی هۆنەری بەڕێز دڵزار

برای بەرێز کاك دڵزار

نامە کراوەکەت بۆمن کە لە "ڕێگای کوردستان" دا (ژ 435ی 8- 1- 2001)
بڵاو کرابووەوە پێم گەیشت، سوپاست دەکەم و ئەمەش وەرامەکەیەتی:
لە نامەکەتدا فەرمووتە کە من لە تەلەڤیزیۆنی KTV دا پرۆتستۆیەکی توندم کردووتە سەرت کە "بۆچی ستایشی ستالینت کردووە"، هەروەها فەرمووتە کە "کاسبیت بە شیعرەکانتەوە نەکردووە".

برای بەڕێز:

من لەریزی دەربڕینی ئەو ڕاستیەیەدا کە زۆربەی هەرە زۆری خوێندەوارانی کورد، ماوەی پەنجا ساڵێك، کۆرانە و تەنگە تیلکانە، پەسنێکی خەستی ڕژێمی دیکتاتۆرو تۆتالیتێر و دوژمن بەکوردی سۆڤێتیان داوە، نێوی بەڕێزتم هێناوەو، هۆنراوەیەکی بەڕێزتم وەك نموونە خوێندەوە کە لەپاییزی ساڵی 1952 دا لە خۆرتێکی کۆییم بیستبوو، کاتێك بەهۆی کارەساتی تیشرینەوە لە بەغدا، کەوتمە گرتووخانەی "ئەبوغریب" و لەوێ ناسیاویم لەگەڵ ئەو خۆرتەدا پەیدا کرد. زۆر بەداخەوە کە نێوەکەیم نایەتەوە بیر، بەڵام دەزانم کە گەڵێك هۆنراوەی لەبەر بوو.

کاك دڵزار:

ئەز دڵنیام لەوەی کە تۆ ئەو هۆنراوەیەی بەسەر ستالینت دا هەڵداوە، نە بۆ پلەو پایە بووەو نە بۆ پارە، هەروەها خودێ لێخۆش بووان هەژارو حەمەساڵح دیلانیش، کە تۆ نێوت بردوون، ئەوانیش هەروەك تۆ، بۆ دەسکەوتی گیرفانی خۆیان بە شان و باڵی ستالینیاندا هەڵنەداوە، بەڵکو ئەمە بەپێڕەوییکردنی هێڵی حیزبی کۆمۆنیستی عێراق بووە، کە مخابن دەسکەلای دەستی ڕژێمی تاوانباری سۆڤێت بوو. ئەمەش شتێك نی یە وتووێژبکرێ لەسەری. من لە قسەکانمدا باسی بیرو بۆچوونی خوێندەوارانی کوردم کرد لە سەردەمێکی دیاریکراودا، کە مارکسیزمی ساختەی سۆڤێت و بەردەستە عەرەب و فارس و ترکەکانی بوو بوو بە ئاینی ئائاسمانیی چینی هوردە بۆرژوای کورد، بە کۆمۆنیست و

ناسیۆنالیستەوە. ئەمەش بەشێکی گرنگە لە مێژووی نەتەوەی کورد، نابێ لێی نەدوێین، ئەگەر نا، مەبەستم ئەوە نەبوو چاو لە هەژار، یان کەسێکی دیکە بنووقێنم و هەموو گوتاوپۆکە بهێنم بەسەر تۆدا و خەفەت بکەمە دڵی زارت، ئەوەش بزانە کە ساڵانێك لەمەوبەر، هۆنراوەکەی هەژارم لە نووسینەکانمدا خستووەتە بەرچاو و، بەرنەشتەری لێکۆڵینەوە مداوە (تکایە تەماشای پەرتۆکی "گۆڤاری نیشتمان... هتد"، بکە کە لە ساڵی 1985 دا بڵاو کراوەتەوە، (ل 47)، لەوانەشە ئەگەر من باسی ئەو هۆنراوەیەی هەژارم نەکردایە، هەر گۆڕی ون بووایە.

ئەوەی راستی بێ، هەژار کە لە نێزیکەوە دەمناسی، چەند جار بە خۆمی گوتووە کە ئەو زۆر پەژیوانە لەو هۆنراوەیەی کە بۆ ستالینی رستووەو، ئەوەشی تەنێ لەبەر ئەوە گوتووە کە پێی وابووە، ستالین کورد لە بندەستی رزگار دەکا، بەڵام دوایی بۆی دەرکەوتووە کە ستالین "مەڕی کوردی لەدەمی گورگی ئێرانی سەندووەتەوە، بۆ ئەوەی خۆی بیخوا" ئەم قسەیەشی لە کۆتایی ی پەنجاکاندا دەکردو، هەموو جارێکیش ئەو هۆنراوە فارسی یەی دەخوێندەوە کە دەبێژێ:

چواز چنگال گرگم دربودی عاقبت دیدم گرگم تو بودی

پیرەمێردیش لەماوەی جەنگی دووەمی جیهانییدا، پەسنی "بەریتانیای گەورە" ی داوە. کە گلەیی یان کردووە لێی بۆ ئەو کارە دەکات، گوتوویەتی "پێم وایە کە ئینگلیزەکان مافی کورد دەدەن، دەنا خۆم چ پێویستی یەکم بە ئینگلیزەکان هەیە؟"

"ئەگەر نا من خۆم لە کێ دادمە نان و کەبابێك سەرو زیادمە"

ئەمەیان وا، بەڵام ئەوەی زۆر بەلامەوە سەیرە، برای بەڕێز، ئەوەیە کە تۆ ئەوڕۆ دەفەرمووی:

"جا منێك کە 52 ساڵ بەر لە ئەمڕۆ ستایشی گەورەترین قارەمانی دووەم شەڕی جیهانیم کردبێ، بۆچی دەبێ تاوانم کردبێ"؟ ئایا ئەگەر بۆ تێکشکانی فاشیزم و مەرگی هیتلەری نازی گریابام کارێکی باش دەبوو؟"

هەر لەو جێ یەشدا نێوی جەواهیریشت هێناوە، کە ئەویش بە هۆنراوە، ستالینی بردووتە ئاسمان.
جارێ هەرچی خودێ لێخۆشبوو جەواهیری یە، ئەوا خۆشت دەیزانیت کە ئەو هەرپەسنی ستالینی نەداوە، لەبەر ئەوە ئەم "چەپکە گوڵە" شی بۆ دەخەینە پاڵ "دەسکە گوڵی": (ياشراعا وراء دجلة يجري)! ئەوجا کاك دڵزار، تۆ پەسنی ستالینت نەداوە وەك "قارەمانی شەڕ"!- کە دوایی دێمە سەر ئەو باسەش- بەڵکو کردووتە بە "پێشڕەوو ڕێبەری گەلانی رووی ئەرز" و "قەڵای کورد" و فەرمووتە:

ئەرێ ئەی ستالین، ستالین، ستالینی بەرز
پێشڕەوو ڕێبەری گەلانی رووی ئەرز
***
ستالین پێشەوایە، بۆ کورد، وەك قەڵا وایە
دەسا هەلکەن ئالآیە، ئەوڕۆ بەرلین گیرایە

توو سەری خۆت کاك دڵزار، ستالین "پێشڕەوو ڕێبەری گەلانی رووی ئەرز" بوو؟ ستالینی کوردکوژ و ئەنفالکەر لەخەڵکی کوردستانی سۆر، "قەڵا" بوو بۆ کورد؟ ئێستە ئەگەر ڕێم بدەیت، وەك برایەك قسە بکەم لەگەڵت: دەبێ پێت بێژم: "دڵزار دەرکی درۆت بەقوڕگیرێ!"
باشە، خەم ناکا، ڕەنگە ئەو ڕۆژە ستالینت نەناسبێ، بەڵام ئەوڕۆ پاش پەنجاو دوو ساڵ، دەبوو هەڵوێستێکی دیکەت هەبێ، پاش ئەوەی گەلێك ڕاستینە لەبارەی شێرە بەفرێنەی سۆڤێتەوە لەتاریکی دا نەمان و کەوتنە بەر خۆر.
دوایی کەس نەیگوتووە تۆ دەبوو بۆ "تێکشکانی فاشیزم و مەرگی هیتلەری نازی" قوڕت بپێوایە. بەڵام قوڕ نەپێوان بۆ تۆپینی گورگ، پاساوی پەسندانی سەگی هار نادا. ستالین و هیتلەر، دوو هاوپەیمانی یەك بوون و هەردووکیان وەك یەك ملهوڕو خوێنخۆڕو دوژمن بە ئازادیی خەڵك بوون، لەبەر ئەوە شتێکی سەیر نەبوو کە ئەڵمانیای هیتلەری و سۆڤێتی ستالینی، پەیمانی "بەگژیەکدا نەچوون" یان لەگەڵ یەك مۆر کرد و لە 23- 4- 1934 دا بەپێی پەیمانێکی

دوو قۆڵی، وڵاتی پۆلۆنیایان لەنێوخۆیاندا دابەشکرد، پاش ئەوەی ستالین چەند مانگێك لەوەبەر، هەموو سەرکردەکانی پارتی کۆمۆنیستی پۆلۆنیای کوشتبوو، ئەریٚ: ستالین و هیتلەر، یەك سیستەمی تیرۆریستانەیان دەبرد بەڕێوە، بەڵام بە دوو نێوی جیاوازەوە، خۆ ئەگەر هیتلەر لە ئەنجامی لەخۆبایی بوونەوە پەلاماری سۆڤیێتی نەدایە، هیچ کاتێك ستالین نەدەچووە شەڕەوە لە دژی و، هیتلەرێکی دژ بە ئازادی و دێمۆکراسی، گەلێك پیٚ باشتر بوو لە ئەوروپایەکی دێمۆکراتی، دژ بە کۆمۆنیزمی سۆڤیێتی.

ئەگەر ئێمە ئێستە لەمانەش هەمووی بگەڕێین، ئەوا ستالین "گەورەترین قارەمانی شەڕی دووەمی جیهانی" نەبوو، قارەمانانی ئەو جەنگە خەڵکی چارەڕەشی ئەو شارە بوون کە ستالین بەناڕەوا نێوی خۆی خستبووە سەری و کردبووی بە "ستالینگراد". قارەمانانی ئەو جەنگە، خەڵکە پەلاماردراوەکانی وڵاتی سۆڤیێت و پێشمەرگەکانی یۆگۆسلاڤیا بوون، کە بە "پارتیزان" نێویان چووە مێژووەوە. قارەمانانی ئەو جەنگە، هێزی بەربەرەکانێی گەلێری یۆنان و ئیتالیا و ئیسپانیا و سەربازەکانی لەشکرەکانی ئەوروپا و ئەمریکا بوون. خەڵکەکەی سۆڤیێت کە بەربەرەکانێی لەشکری ئەڵمانیای نازی یان کرد، لە خۆشەویستی "ستالینی پێشڕەو" نەبوو، بەڵکو لە ئەنجامی جانەوەرێتی و دڕندەیەتیی لەشکری نازی بوو. لێرەدا حەز دەکەم بە چیرۆکێك سەرت بیەشێنم.

سەرەتای ساڵی 1964، نێزیکەی ساڵێك دەبوو کە هاتبوومە ئەڵمانیا و لەشاری مۆنیخ نیشتەجیٚ بوو بووم، ئەو سەردەمە ئەڵمانیای کاولبوو بەهۆی جەنگی جیهانیی دووەمەوە، خەریکی خۆ ئاوا کردنەوە بوو، لەبەر ئەوە ئەڵمانیا پێویستی بە کرێکارێکی یەکجار زۆر هەبوو، ئەو کاتە ئەڵمانەکان خۆیان داوایان لە بێگانەکان دەکرد کە کار بکەن بۆیان و تەنانەت کارکەریان لە دەرەوە دەهێناو نێویان نان "کارکەرانی میوان". ئەز ژی، وەك زۆربەی خوێندکارانی زانستگە، لەپاڵ خوێندنەکەمدا کارم دەکرد، بەڵام هەر جارە بۆ ماوەیەکی کورت و، هەر دەمە لەکارگەیەك. ئەو خوێندکارانەی لە کارگەیەك، یان فابریقەیەك کاریان دەکرد، پێیان دەگوتن" یارمەتیدەری کارکەر" و دەدرانە دەست سەرکارێك کە

پێی دەبێژن "پێشکارکەر" و لەلایەن کارکەرەکانەوە بە "شێف Chef" بانگ دەکرێ. شایانی باسە کە من لەئەڵمانیا و بەدرێژایی ی ساڵان، لەگەڵێك کارگە وفابریقەدا کارم کردووەو ژمارەیەکی یەکجار زۆر کارکەر و "شێف" و کرێکاری رۆژانە و خاوەن کار و بەڕێوەبەرم لەنێزیکەوە ناسیوەو کارم کردووە لەگەڵیان و، دەتوانم بەوپەڕی دڵنیایەوە بەکاك دڵزاری بەڕێز رابگەیەنم کە لەنێو کارکەرەکاندا کەمەیەکی یەکجار کەمم دیوە کە پێشکەوتنخوازو رۆشنبیر و بەرچاوتێر بووبن؛ زۆربەی هەرە زۆریان پاشڤەڕۆ، خۆپەرست، چاوچنۆك، دژ بە سیاسەت و، لووت بەرز بەرامبەر هەڤاڵ کارکەر و کرێکار و، سەرشۆڕ و ترسنۆك بەرامبەر بە "شێف" و بەڕێوەبەر و خاوەن کار، بەکورتی، دوور لەو خوورەوشتەی کە کارل مارکسی بەدبەختی لەدایکبووی ئەڵمانیا، نێوی نابوو "هۆشیاریی چینایەتی". بەڵام ئەمەیان بابەتێکی تایبەتی یەو نامەوێ لێرەدا پتر لەسەری بڕۆم، تەنێ دەمەوێ ئەوە بێژم کە کارکردن و دان و ستاندنم لەگەڵ کارکەران ئاسۆی تاقیکردنەوەو ئەزموونەکانمی لەژیاندا فراوانتر کرد.

جارێکیان، رێم کەوتە فابریقەیەکی تەونسازی (نسیج، قماش) و کارەکەم کەوتە بەردەست "شێف"ێك کە بەتەواوی جۆرێکی دیکە بوو: زمان شیرین، بەتۆرە، هێمن، ئاگادار لە سیاسەت و دەنگوباس. ئەوەی پتر جێ ی سەرسوڕمانی من بوو، هەڵسوکەوتی جوانی ئەم پیاوە نەبوو، بەڵکوو ئەوە بوو کە تێکڕای شێفەکان و کارکەرەکان و مووچە خۆرەکانی فابریقە، پێی پێدەکەنین و گاڵتەیان پێدەکرد و، بەزۆری پلاریان تێدەگرت و قسەی لاقرتی یان فڕێ دەدا بۆی، کەچی ئەو وەرامی نەدەدانەوە، رۆژێکیان مووچەخۆرێکی فابریقەکە کاغەزێکی هێنا و دایە دەست شێفەکە وشێفەکەش شتێکی گوت و، ئەویش بزەیەکی کرد و قسەیەکی زۆر ناشیرینی بەگاڵتەوە کرد، بەڵام شێفەکە هیچ وەرامی نەبوو، منیش گوتم: لە رۆژهەڵات پەندێکی پێشینان هەیە دەبێژێ: "وەرامی مرۆڤی کەوج، بێ دەنگ بوونە، دیارە تۆش لەسەر ئەو دەستوورە دەچێت بەڕێوە"، شێفەکە ئەم قسەیەی پێ خۆش بوو و، گوتی: "تۆ خەڵکی کوێیت؟" گوتم: "کوردم، خەڵکی کوردستانم". جا لەبەر ئەوەی ئەو سەردەمە کەم کەس هەبوون

له ئەوروپا نێوی کوردیان بیستبێ، لێم پرسی که ئایه کورد دەناسێ؟ گوتی: "دەمێکه کورد دەناسم". گوتم: لەکوێ؟"گوتی: "لەسیبریا" گوتم: "تۆ چۆن چوویت بۆ سیبریا و کورد له سیبریا چی یان دەکرد؟" لەکورتی بیبڕمەوه، کابرا گوتی که له لەشکری ئەڵمانیادا پلەی "ئۆبەرست لۆیتنانت" ی هەبووه که عێراقی یەکان پێ ی دەڵێن "عقید رکن" و، له جەنگی جیهانیی دووەمدا لەبەرەی سۆڤێتدا بووەو لەوێ بەدیل گیراوەو له سیبریا له دیلخانەدا هێندێك جۆتکاری کوردی دیوه، که ئەوانیش لەولاتی خۆیانەوه، ستالینی به وتەی دلزاری بەرێز "پێشڕەوو ڕێبەری گەلانی ڕووی ئەرز" و "قەلای کورد" و دەمڕاستی "کرێکار و جۆتکار"، دووری خستوونەتەوه بۆ سیبریا، نەوەکا ئەو "جۆتکاره کۆنەپەرستانه" ڕژێمی "چەپەڵی سەرمایەداری" بهێننەوه بۆ بەهەشتی "کرێکاران و جۆتکاران"، گوتم "باشه، ئەمانه لەم فابریقەیەدا بۆچی وا سەریان کردووەته سەر تۆ؟"، گوتی: "بەساڵاچووەکانیان دەیانەوێ بەلگەیەك پێشان بدەن که نازی نەبوون، گەنجەکانیشیان دەیانەوێ بەلگەیەك پێشان بدەن که باوك و دایکیان نازی نەبوون، وادیاره ئەمانه پێویستی یان بەوه هەیه، بەلام ئەز پێویستیم بەوه نی یه، چۆنکه بەڕاستی نازی نەبووم. جا وەك چۆن نازی و هەلپەرست نەبووم، شێرو پالەوانیش نەبووم، ئەمانه بۆ ئەوەی رابوردووی خۆیان بشارنەوه، داوای ئەوه دەکەن له من، که دەبوو وەك کاربەدەستێکی گەورەی سوپا، لەڕووی فەرمانەکانی هیتلەردا وەربگەڕا مایەوه، بەلام ئەز ئەو پالەوانه ئازایه نەبووم که لەگیانی خۆم ببوورم. پاش ئەوەی له دیلێتی چەند ساله بەرەڵلا کرام، هاتمەوه ئەڵمانیا و وەکو سەدان لەشکریی گەورەی دیکه کارەکەم لەدەست چوو، و ئێستەش وا لێره ئەم کاره بچووکەم پێ سپێردراوه، دیاره مرۆڤی ترسنۆك بەرامبەر بێ دەسەلات ئازان".

بەبۆنەی تەواو بوونی ماوەی کارکردنمەوه لەو فابریقەیەو مالاواییکردنم لێی، گوتی: "زۆر حەز دەکەم ڕۆژێك سەرێکم بدەیت لەماڵەوه، پێکەوه قاوەیەك بخۆینەوەو، چەند شتێکیش هەیه دەمەوێ پێشانت بدەم، که چوومه ماڵەکەی، ئەپارتمانێکی یەك ژووری هەبوو، لەگەڵ کەلوپەلێکی ساده، بەلام پاکژو

ڕێکوپێك، گوتی: مەرازێکی سینەمایی ی بچووکم بەتایبەتی بەکرێ گرتووە بۆ ئەوەی فلیمێکی تەلەفزیۆنی هەیە پێشانت بدەم، فلیمەکە بریتی بوو لە کۆبوونەوەیەك لەو کۆبوونەوانەی کە حیزبی نازی لە مۆنیخ ڕێکی خستبوو لەمەیدانێکدا کە یەکجار گەورە بوو، و هیتلەر لەوێ دا خوتبەی دەدا، ئا لەو مەیدانەدا نێزیکەی ملیۆنێك خەڵك کۆبووبوونەوە، پیرو گەنج و ژن و پیاو و مێرمندال، هەموو وەك ئەوەی حالیان لێ هاتبێ، هاواریان دەکرد، "هایل-هیتلەر" (بژی هیتلەر)، "زیگ- هایل" (سەرکەوتن پیرۆز بێ) کابرا گوتی: "باشە، ئەمانە هەموو ئەفسەر و سەربازو پۆلیسن، یان ئەڵمانی سادەن؟ بۆچی خەڵك قسەی هەق ناکەن و گوناهەکە ناخەنە سەر ملی هەموان و هەر دەیخەنە سەر ملی یەك کەس، کە ئەوەتا ئەم هەموو خەڵکە، وەك مەست بووبن، چەپڵەرێزانیانە بۆی؟" ئەوجا گوتی: "خۆ هیتلەر بەکودەتا (انقلاب) نەهاتە سەر کار، بەدەنگی خەڵك (گەل) بوو بەکانسلەری ئەڵمانیا، ئایا ئەوانەی دەنگیان دا بۆی، گوناهبارنین؟".

گوتم: "تۆ بۆچی چوویتە ئەکادێمیای لەشکری؟" گوتی: "حەزم لە فڕۆکەوانی دەکرد، ئەوەش هەر لەنێو لەشکردا دەست دەکەوت، ئەو کاتە سەردەمی هیتلەر نەبوو، ئەڵمانیا دەوڵەتێکی دیمۆکراتی بوو، خوێندنی خۆم تەواو کرد و لەسوپادا مامەوە، بەرە بەرە پێشکەوتم".

کە باسی جوولەکەکانم پرسی لێی، گوتی: "کێشەی جوولەکە لەڕاستیدا کێشەی جیاوازیی ڕەگەزایەتی نەبوو، چۆنکە جوولەکەکان لەنێو کۆمەڵگەی ئەڵمانیادا توابوونەوە و زۆر خزمەتی گەورەیان بە ئەڵمانیا کرد، کێشەی جوولەکەکان کێشەیەکی ئێرەیی (حسد) بوو، جوولەکەکان زۆر زیرەك و ژیهاتی بوون و لەزانست و هونەر و بازرگانیدا گرەویان لە هەمووو کەسێك بردبووەوە. ڕەگەزپەرستی بیانوویەك بوو بۆ ئەوەی ماڵ و سەرمایەکەیان بەخۆڕایی بخۆن، ئەگەرنا، هەموو کاربەدەستێکی نازی، بەدزییەوە کچێکی جوولەکەی جوانی کردبوو بە دۆستی خۆی و پێی ڕادەبوارد".

لەبارەی هەڵوێستی خەڵکی سۆڤێتەوە بەرامبەر لەشکری ئەڵمانیا لەماوەی جەنگدا گوتی: "کە لەشکرەکەمان بەرەو وڵاتی سۆڤێت کشا، لەسەرەتاوە خەڵکەکەی ئەوێ لە بەرەبەرەکانێیەکی سەر زاری بەولاوە هیچ چالاکییەکیان نەنواند، بگرە پێشیان خۆش بوو، چۆنکە پێیانوا بوو، ئێمە چووینەتە ئەوێ بۆ ئەوەی رزگاریان بکەین، بەڵام لەشکری ئەڵمانیا بەوپەڕی دڕندەییەوە کەوتە وێزەیان. ئەوانیش لەتاو گیانی خۆیان کەوتنە بەربەرەکانێ ی ئێمەو، لەو کاتەدا بوو کە من خۆم دا بەدەستەوە، چۆنکە ئەو شەڕەم زۆر بەتاوان دەزانی و، چەند ساڵێك بەدیل لەسیبریا مامەوەو، کە گەڕامەوە ئەڵمانیا زانیم کە ژنەکەم لەو ماڵەدا کە تێیدا دەژیا، بەر بۆمبا کەوتبوو". کە ئەوەی گوت دەستی کرد بە گریان.

**بەرلین** 2001/1/22

**میدیا**، ژ86، 2001/2/1

## پەیاما پرۆفیسۆر جەمال نەبەز
## ژ بۆ میهرەجانا چیایێ شنگارێ/دهۆك/ باشوورێ کوردستان

بەرێز نۆ، بەشدارێن میهرەجانا چیایێ شنگارێ

گاڤا ئەز میهرەجانا چیایێ شنگارێ پیرۆز دکەم، ئەڤ پیرۆزبایی یا من، نە تەنێ ژ بۆ وەلاتیێن ئێزدی یایە، بەلکو ژ بۆ نەتەوا کورد و هەمی خەلکێن کوردستانێ یە، راستی ئەڤە، کو کولتوورا ئێزدی، نەتەنێ کولتوورا ئێزدی یە، بەلکو کولتوورا هەر کوردەك و هەر کوردستانی یەکی یە. ئۆلا ئێزدی، مینا ئۆلا ئەلەوی و، ئۆلا یارسان (کاکەیی) و، ئۆلا شەبەك و ئۆلا هەققە، ئۆلەکە کوردیی کەڤنارو بەشەکی هێژا و بەنرخە ژ فەرهەنگا مەزنێ کورد، ژ بۆناڤێ یەکێ، پاراستنا ئۆلا ئێزدی، نە تەنی ل سەر ئێزدی یان پێویستە، بەلکو لسەر هەر کوردەك و هەر کوردستانی یەکی بەرۆمەت پێویستە، کو ئۆلا ئێزدی، مینا چاڤێن خۆە بپارێزەو، مینا مالا خۆە لێ بنێرە.

بەرێز نۆ:

هەرکەس دزانە کو داگیرکەرێن کوردستان چەند دوژمناتی ئێزدی یان کرنە و دکەن ژێ، ئەڤ دوژمناتی نەژبۆنا ڤێ یەکێ یە کو ئێزدی نەموسلمانن، لێ بەلێ داگیرکەرێن کوردستان رند دزانن کو نکانن ئێزدی یان ژ کورداتی یا خوە بپڕن و بکەن عەرەب، ئان ترك، ئان فارس، وانا باش دزانن، کو هەتا ئێزدی و ئێزداتی بمینە، کورد ژێ دمینە، چۆنکە ئۆلا ئێزدی گرێدایی یا زمان و فەرهەنگ و رامانێن کوردی یە.

ژ ئالی یەکا دن، وەلاتییێن مەیێن ئێزدی ژێ دزانن کو وانا تەنێ لبن سەیوانەکە نەتەوەیی و دەسەلاتەکا کوردستانی دا دکانن ئۆلا خۆە بێ ترس و لەرز ب سەربەستی بخەن کار، ئێزدیێن باەزرا، سەر بلند ئیسپات کرن کو نیشتمانا خوە کوردستان خۆش تڤێن و بجانا خۆە کوردستان د پارێزن و رێ نادن هیچ داگیرکەرەك ئاخا کوردستان گەمار بکە.

ئۆلا ئێزدی پێویستە بمینەو پێشڤە بچە، چۆنکە تا ئێزداتی بمینە کورد ژی دمێنن.

هەربژین و میهرەجانا وەژی پیرۆز بە.

**بەرلین** 2001/2/2

**میدیا،** ژ87، 2001/2/15

# کورد و خوێندنگەی مارت

مانگی مارت لە ساڵنامەی نەتەوەییی کوردیدا مانگێکی پڕ لە پێشهات و ڕووداو و کارەساتە، پڕە لە بیرەوەری خۆش و ناخۆش، سەرکەوتن و ژێرکەوتنی تێکۆشینی کۆمەڵگەی کوردەواری، هەڵبەزەو دابەزەی ڕۆژگار، زیان و دەستکەوت.

مانگی مارت مانگی نەورۆزە، ڕۆژی بیرەوەریی زاڵبوونی گەلی بندەستی کوردە بەسەر ملهوری و هۆڤێتی دا، نەورۆز بیرەوەریی خۆشی خۆرسکاندنە لە کۆت و زنجیری کۆیلەتی و پێخوستیی زۆرداران، نەورۆز بیرەوەریی ناخۆش و تاڵ و تفتی لەدەستچوونی ئەو ئازادیی یەیە کە شۆرشی ڕووتە و هەژارانی کورد پێی گەیشت، بەڵام پێی نەپارێزرا. نەورۆز ڕۆژی بە خوداهاتنەوەیە بۆ پەند وەرگرتن لە مێژوو، لەرابردوو. نەورۆز دینەمۆی هەوڵدانە بۆ فێر بوون لە هەڵە و سەرلێتێکچوونی سەردەمی پێشوو، بەنیازی ڕاستکردنەوەی هەڵوەستە چەوتو چەوێڵەکانی ئەوڕۆ و، خۆلادان لە دووبارە بوونەوەیان. نەورۆز ڕاوەستانە لەبەردەم داروپەردووی کۆشکی ڕووخاوی سەربەخۆیی دا، بەهیوای گوڕدانە خۆ، بۆ بانگدانی نەورۆژی سەتەی بیستویەك و هەزارەی سێیەمینی پاش زایین.

مانگی مارت، مانگی کۆچی دووایی دوو ڕێبەری مەزنی نەتەوەی کوردە، دوو ڕێبەری سەر لە پێناوی ڕزگار بوون. مانگی مارت، بیرەوەریی ماڵاوایی سەرۆك بارزانی و پێشەوا قازی محەممەدە، دوو ڕێبەر کە تا دوا هەناسەی ژیانیان، گیان لەسەر دەستان، مشووری هێنانەدی نەورۆزێکی نوێ یان خوارد، بەڵام بەو ئاواتەوە سەریان نایەوەو پێی نەگەیشتن. مانگی مارت، مانگی پەند وەرگرتنە لە ژیان و بەسەرهاتی ئەو دووانە.

مانگی مارت، مانگی سەر شۆڕکردنی داگیرکەرانی کوردستانە، مانگی بیرەوەریی ملدانی ناچارانەو نا بەدڵانەی ڕژێمی بەعسی فاشیستە بۆ هێندەك مافی سەرەتاییی نەتەوەی کورد، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، مانگی مارت، مانگی بەزینی لەشکری خوێنڕێژو دەست درێژکەری عێراقە لە بەردەم هەڵمەتی پێشمەرگەی لە خۆبوردوو و جەماوەری وره بەرزی کوردستاندا. مانگی مارت،

بیرەوەریی سەرکەوتنی بەرەی ڕۆناکی و ئازادیخوازانە بەسەر بەرەی تاریکی و ناڕەوایی و تیرۆرو جەنگ خوازاندا.
مانگی مارت، مانگی بیرەوەریی تەفرە خواردنی کوردی دڵ و دەروون پاك و خۆش باوەڕە، بە ڕێککەوتنی 11ی مارت، مانگی بیرەوەریی متمانە کردنی ساویلکانەیە، بە گورگی پێستی مەڕ لەبەر کردوو. مانگی مارت، بیرەوەریی کەوتنە رووی درۆو دەلەسەی رژێمی مرۆڤ دوژمنی بەعسە. مانگی تازەکردنەوەی شاڵاوی ناکاوی گورگی هاری ماندوو حەساوەیە.
مانگی مارت، مانگی نێوبژێکردنی درۆزنانە و خاپێنەرانەی رژێمی سۆڤێتی تاوانبار و دوژمن بە ئازادی و یەکسانی و سۆسیالزمە. مانگی بیرەوەریی هەڵوێستی راست و دروستی یەکێتیی نەتەوەییی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا (نوسکە)یە، کە وەك تاکە رێکخراوێکی کورد، گومانی خۆی بەرامبەر رێککەوتنی مارت خستە ڕوو و، گوتی: "سەرناگری".
مانگی مارت، مانگی هەرەسهێنانی کوتوپڕی شۆڕشی ئەیلوولە، گەورەترین شۆرش لە مێژووی نەتەوەی کورددا، پاش شۆڕشی گەلێری کورد بە رێبەری شۆڕشگێری یەکسانخواز، پاپەکی خوڕەمدین: هەزار ساڵێك پێش شۆڕشی ئەیلوول. مانگی مارت مانگی بیرەوەریی شین و شەپۆڕی ناهومێدیی راستە خەڵکەکەی کوردستانە، بیرەوەریی دەرکەوتنی درۆو دەلەسەو چاوبەستی شای ئێران و، بێ ویژدانی ساداتی میسر و بومیدیەنی جەزائیر و، دەستبڕین و تەفرەدانی کوردە لەلایەن کاربەدەستانی ئەو سەردەمەی دەوڵەتی ئەمریکاوە.
مانگی مارت، مانگی ئەو پرسیارە رەوایەیە کە چۆن و بۆچی شۆڕشێکی وا گەورەو گران، پاش چواردە ساڵی رەبەق، بەو شێوەیەو ئەو دەمو دەستە هەرەسی هێنا؟ مانگی مارت، مانگی گەڕانە بەدوای وەرامی راستی ئەو پرسیارەدا، بۆ تۆڵە کردنەوەی ئەو زیانە گەورەیەی لە کورد کەوت، نەك تۆڵەسەندنەوە لە گوناهباران، چۆنکە گوناهو هەڵە، تایبەتکاری هەموو مرۆڤێکە، نەك یەك و دووان.

مانگی مارت، مانگی ئەنفال و بەعەرەبکردن و بە بەعس کردن و ڕاگواستنەوەو گرتن و کوشتن و سووکایەتی کردنە بەکورد. مانگی مارت، مانگی بەکارهێنانی چەکی کیمایی یە دژی کورد. مانگی مارت مانگی شەمید بوونی هەڵەبجەیە، مانگی گەلکوژی یە لە خەڵکی کوردستان، مانگی گریان و سنگ کوتانە، عاشورای کوردانە.

مانگی مارت، مانگی ڕاپەڕینی خۆجۆشی جەماوەری باشووری کوردستانە بەڕووی ڕژێمی تەقیانووسی بەعسی عەرەبدا، مانگی ڕزگار کردنی کەرکووکی خۆشەویستە، بەڵگەیەکی دێرۆکی یە بۆ ئەوەی هەر کاتێك جەماوەری کورد، کاری خۆی بگرێتە دەست خۆی، ئەوەی بە خەونیش نابینرێ دەیهێنێتە دی.

مانگی مارت، مانگی پەلامار دانەوەی لەشکری سنگ شێری ماکەرپشتانە بۆ سەر باشووری کوردستان، پەلاماری ئەوانەیە کە "بەکەر ناوڕێن بەڵام بە کورتان شێرن"، بیرەوەریی پەلاماری دڕندانەی ئەوانەیە کە هەموو ئازایەتی و دلێری یەکیان ئەوەیە کە چەکی قورس و تووناکەریان هەیەو، کورد ئەو چەکانەی نییە. بیرەوەریی خۆکیفکردنەوەی ئەو مێشك پووتانەیە کە کۆلۆنیالیستەکانی ئەورووپا بۆ بەرژەوەندیی خۆیان، چەند دەوڵەتێکیان دروست کرد بۆیان، بەڵام کوردیان لە دامەزراندنی دەوڵەتی خۆی بێ بەشکرد.

مانگی مارت، مانگی بیرەوەریی فریوخواردنە بەقسەی ئەم و ئەو. مانگی بڕیاردانە بۆ چەق بەستن لەسەر تەوەرەی باوەڕ بە خۆکردن و پشت بەخۆبەستنی ژیرانەیە.

مانگی مارت، مانگی یادی ئەو ڕۆژەیە کە سەت ساڵێك لەمەوبەر، ڕۆژی هەشتەمینی ئەم مانگە کرا بە ڕۆژی سەربەرزی و خەباتی ژنان، هەشتی مارت، ئەو ڕۆژەیە کە چینی ژێر دەستە و بەشخوراوی ژنان، پێ لەسەر یەکسانیی لەدەسەڵاتدا داگرت، بەرامبەر زۆر دەستی و لەخۆبایی بوون و پێ لێ هەڵبڕینی چینی پیاوان. هەشتی مارت ڕۆژێکە کە دەبێ ژنانی کوردو کوردستان، وێرای ژنانی هەموو جیهان، بەوپەڕی هۆشیاریەوە، قافڵەی ڕزگار بوون بخەنە تەکان، بۆ

بەرگری کردن لە ئازادی و هێنانەدی یەکسانیی خۆیان، بەرامبەر دەستدرێژیی کەر پیاوان.

ئەریّ... نەتەوەی کورد و خەڵکی کوردستان، لە خوێندنگەی مارت دا، ئەم وانانەیان خوێندووەو مافی ئەوەیان هەیە کە لە مانگی مارتی ئەمساڵدا و، پاش تێپەڕبوونی دەساڵ بەسەر دامەزراندنی دەسەڵاتی خۆییدا، لەسێ ستانی باشووری کوردستان، لە سیاسەتکارانی کورد و هەموو حیزبەکانی کوردستان بپرسن، ئایا لەوانەکانی قوتابخانەی مارت، چەند کەڵکیان وەرگرتووەو، تا چ هەندازەیەك ئەو زانیاری یانەیان خستووەتە مەیدانی کارەوە.

**بەرلین** 2001/2/11

**میدیا،** ژ90، 2001/3/21

# له بیرەوەری نەمران بارزانی و قازی سیمینارێکی زانستی لە سوێد ساز دەکات

پ/ میدیا- سوێد

سیمینارێکی زاستی گرنگ لەلایەن پرۆفیسۆر دکتۆر جەمال نەبەز، لە بیرەوەری (22)ەمین سالیادی کۆچی دوایی سەرۆك بارزانی نەمر و یادی (54)ەمین سالی لە سێدارەدانی پێشەوا قازی محەمەدی نەمردا، لە شاری مالمۆیی سوێد بەست.
رۆژی شەممە رێکەوتی 7/ 4/ 2001 و لە کاتژمێر (5 تا هەشتونیو)ی ئێوارە بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی فراوان لە کوردانی هەرچوار پارچەی کوردستان و بە ئامادە بوونی نوێنەرانی سەرجەم پارت و لایەنە سیاسی و کۆمەڵە کولتووریەکانی شاری مالموێ، سێیەمین شاری گەورەی سوێد، و بەرێز و شکۆوە، ئێوارە کۆرێکی مەزن و سمینارێکی زانستی فراوان بۆ پرۆفیسۆر دکتۆر جەمال نەبەز، زانا و نووسەری ناوداری گەلەکەمان لە بیرەوەری (22)ەمین سالڕۆژی لەسێدارەدانی پێشەوا قازی محەمەدی نەمردا ساز کرا. کە تێیدا وتارو بروسکەی کۆمەڵێك لە پارتە سیاسیەکان و کۆمەڵە کلتووریەکان و چەندین سروودی کوردیش لە یادەکەدا پێشکەش کران.
سەرەتای بەرنامەکە بەسروودی نەتەوەیی کوردستان (ئەی رەقیب) دەستپێکرد و دوا بەدوای ئەمیش هەندێك سروودی کوردیی تری تایبەت بەم یادەوە لەلایەن هونەرمەندانەوە پێشکەش کران. لەمیانەی پرۆگرامی ئەم یادەدا چەندین بابەت و سروودی تریش پێشکەش کران وەك: چیی بوو تاوانی ئەوانەی وا لە سێدارە دران، کوردستان ئەی نیشتمانم، واوەتەن خەملیوە وەك گوڵ، نەوبەهاری میللەتە، دێمەوە هەر دێمەوە دڵنیابە بەیەکجاری دێمەوە، خوایە وەتەن ئاواکەی چەند دڵگیر و شیرینە، و کۆتاییەکەی بەرنامەکانیش بە سروودی ئەی شەهیدان بوو، و لەبەشی دووەمی ئەم یادەشدا و بۆماوەی زیاتر لە دوو کاتژمێر پرۆفیسۆر جەمال نەبەز، نووسەرو زاناو لێکۆڵێنەری ناسراوی گەلەکەمان کە یەکێکە لە سەرکەوتووترین ئەو نووسەرە مەزن و هەڵکوتووانەی

گەلی کورد کە توانیوەیەتی لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتی، زۆرترین و پڕ بایەخترین بەرهەمی سوود بەخش پێشکەش بە کلتوورو زمان و سەرجەم بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و رامیاری و بڵاو کردنەوەی بیری نەتەوەیی و کوردایەتی لەناو گەلی کورددا بکات و، کە توانیویەتی لەسەر کورد و کێشە رەواکەی و مێژووی هاوچەرخی کورد و شۆرشەکانی بەرهەمی بەنرخی زۆر بەزمانی کوردی و بە زمانەکانی عەرەبی و فارسی و تورکی و ئینگلیزی و فەرەنسی و ئەڵمانی و سوێدی پەرتۆك و نامیلکە و بابەتی فرە سوود بەخشی بڵاو کردۆتەوە، سیمینارێکی زانستی گرنگی لەسەر رۆڵی بارزانی نەمر لە بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستاندا پێشکەش کرد و، سەبارەت بە سەرجەم لایەن و بابەتە پەیوەندارەکانی بارزانی نەمر و تایبەتمەندییەکانی کەسایەتی و خەباتی درێژخایەنی لە پێناوی کورد و کوردستان و کێشە رەواکەی بۆ بەشدار بووان دواو، هەروەها سەبارەت بە رۆڵ و خەباتی سەرکردە نەمرەکانی تری گەلەکەمان وەك شەهیدان شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و شێخ مەحمودی نەمر و پێشەوا قازی محەمەدی نەمر دواو، بەراوردێکی زانستیانەی کرد لەنێوان بارزانی نەمرو سەرکردەکانی تری کورد بەدرێژایی مێژوو لەسەر حکومەت و لێهاتوویی بارزانی نەمر دواو، وەك گەورەترین سەرکردەی نەتەوەیی کورد، سەرۆکایەتیی گەورەترین شۆرشی هاوچەرخی کوردستانی کرد و، هەڵگری بیری نەتەوەیی و کوردایەتی رەسەن بوو، و کورد کێشە رەواکەی بەجیهان ناساند و نمونەی رەوشت بەرزی و عەدالەت خوازی و دیموکراتی و پاراستنی مافی مرۆڤ بوو، بە کردەوە سەلماندی کە بەچاوی یەکسانی دەڕوانێتە رۆڵەکانی گەلی کورد و سەرجەم کەمایەتی و ئاینەکانی کوردستان و، بڕوایەکی تەواوی بە یەکێتیی کورد و یەکبوونی کوردستان هەبوو.
لەهەر شۆرشێك تروسکاییەك رۆناکی بۆ گەلی کورد دەرکەوتایە، ئەوە بارزانی نەمر هەوڵی گەشە کردنی بۆ دەدا و سنورە دەستکردەکانی کوردستانی دەبەزاند و خەمخۆر و باوکێکی دلۆڤان بوو بۆ هەموو رۆڵەکانی گەلەکەی و بەختیاریی خۆی لە بەختیاریی گەلەکەیدا بینیوەو، هەرگیز چاوی لە پلەو پایە و مادە و

ماڵی دنیا نەبوو و مەرجەعیەت و سەرۆکایەتیی نەتەوەیی لە میللەتەکەیەوە پێ بەخشرابوو، کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ڕێزی تایبەتی گەلی کورد بۆ خانەدانی و ڕێزداریی مستەفا بارزانی، هەر لەسەردەمی نەمران شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و شێخ ئەحمەدی بارزانی و تا بە ئەمڕۆش، هەر هەمان ڕێزیش میللەتی کورد بەخشیبووی بە قازی محەمەدی نەمر و شێخ مەحمودی نەمر لە سەرۆکایەتی کردنی گەلی کورد، دواییش پرۆفیسۆر د. جەمال نەبەز سەبارەت بە بارودۆخی ئێستای گەلی کورد و ناو ماڵی کورد و پرۆسەی ئاشتی لە کوردستان و کێشەی کورد لەناوچە و جیهاندا دواو، لە بەشی کۆتایی کۆڕی سەرەوەدا وەڵامی پرسیاری سەرجەم هەموو ئەو بەڕێزانەی دایەوە کە بەشدارییان لە کۆڕەکەدا کردبوو.

لە کۆتاییدا کۆڕەکە زۆر سەرکەوتوانە کۆتایی هات و بوو بەمایەی ڕەزامەندیی بەشدار بووان لەوەی کە جالیەی کورد بەرێزو بایەخەوە بۆنەو یادەکانی کوردستان زیندوو دەکەنەوەو لە ئاشتی و برایەتی و تەباییدا دەژین و سەرجەم بەشداربووانیش شاگەشکەی خۆیان پیشاندا لەبەرەو پێشەوە چوونی پرۆسەی ئاشتی لە کوردستاندا و ڕێکخستنی ناوماڵی کورد و پەرەسەندنی ئارامی و سەقامگیری و پرۆسەی ئاوەدانکردنەوەی کوردستان و کۆمەڵگای کوردەواری.

**میدیا، ژ92، 2001/4/15**

# پەیامی بیرمەندی گەورەی نەتەوەییمان

# بەڕێز مامۆستا جەمال نەبەز

## هاوولاتە بەڕێزەکان

ئەوا ساڵێك تێپەڕی بەسەر شەهید بوونی سیاسەتکاری کورد سەربەست مەحمود دا.

سەربەست مەحمود بە بیرو قسەو بەکردەوە نەتەوەیی بوو، لەنێو خەڵکدا بەرەوشت بەرزی و رابوردوو پاکی و چاو نەترسی ناسرا بوو، لە هەموو ژیانیدا، سەربەست زیانی بە چۆلەکەیەکیش نەگەیاند بوو، چ جایەکی مرۆڤێك، دیارە هەر کەسێك کە ویژدانی سەگ نەیخواردبێ، دەستی ناچێتە گیانی خاوینی یەکێکی وەك سەربەستەوە. ئێمە هەمووومان ئەو راستی یە باش دەزانین، بەلام ئەوەی کە سەرمان لێی دەرناچێت و، ساڵێکە بە دووایدا دەگەڕێین، وەرامی ئەو پرسیارەیە: سەربەست مەحموود لەلایەن کێوە تیرۆر کرا؟ ئەوە ساڵێکە چاوەڕوانین کە کاربەدەستانی ئاسایش لە هەولێر پەنجە بخەنە سەر ئەو دەستە رەشە، ئەویش نەك بەنیازی تۆڵەسەندنەوە، چۆنکە مرۆڤی نەتەوەیی، چاوی لە تۆڵەسەندنەوە نییە، بەڵکو دەیەوێ دەستە رەشەکە بکەوێتە روو، هەر هێندەو بەس.

داخوا کەینێ وەرامان دەدەنەوە!

بەرلین 2001/5/24

میدیا، ژ 31،2001/5/96

# رۆژنامەی (میدیا) هەر لە ژمارە (سفر)ی یەوە تا ئەوڕۆ..

بەرلەهەموو شتێك درۆشمی سەربەخۆیی کوردستانی بەرز راگرتووەو، تەشی بۆ هیچ داگیرکەرێك نەرستووە.

دەرکردنی رۆژنامەیەکی کوردی و، بەتایبەتی رۆژنامەیەك لەنێوچەیەکدا وەك (هەرێمی ئاسایش) کە لەهەموو لایەکەوە دەرگە خڕ داخرابێ لەسەری و، دوژمن و نەیار گەمارۆیان دابێ و، لەسەر هەموو جۆرە کەرەسەیەکی چاپ و چاپەمەنی پەك کەوتبێ: ئەوجا رۆژنامەیەکیش کە رازا بێتەوە بەبابەتی جیاجیا و قەڵەمی توانا و هەموو جارێك بەرێکوپێکی و لەکاتی خۆی دا دەربچێ، ئەرك و زەحمەتی هێنانە بەرهەمی رۆژنامەیەکی وا، مەگەر هەر ئەوانە بزانن کە خەریکی ئەو کارە بوون، یان لەنێزیکەوە ئاگادارن لێی. هەر لەبەر ئەوەشە، کە گەلێك رۆژنامەوان، لەنێو ئەوانەشدا کەسانی کارامەو ژێهاتی، لەم دە ساڵەی دەسەلاتی دواڕۆژ نەدیاری کورد دا، بەرگەی قورسایی ئەو بارە گرانەیان نەگرتووەو لە ژێری دا پساون.

بەلام رۆژنامەی "میدیا" خۆی لە گێژاوی ئەو بارودۆخە نالەبارەدا راگرت و، هەر لە ژمارە هیچ (سفر)ی یەوە تا ئەوڕۆ، هەوڵی ئەوەی دا ئەو بەرنامەیەی بۆ خۆیی داناوە پێڕەویی بکا و، بەر لەهەموو شتێك درۆشمی سەربەخۆیی کوردستانی بەرز راگرتووەو، تەشی بۆ هیچ داگیرکەرێك نەرستووەو، لەهەمان کاتدا بەسنگێکی فراوانەوە لەسەر هاوولاتێتی و برایەتی ئەو گەلە کەم ژمارانەی کردووەتەوە کە لە کۆنەوە لەگەڵ نەتەوەی کورددا لەسەر خاکی کوردستان ژیاون و دەژین و، کوردستان بەنیشتمانی خۆیان دەزانن و، بۆ پاراستنی شان بەشانی کورد تێدەکۆشن.

"میدیا" هەرچەندە زمانی رێکخراوێکی رامیاری یە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا گرنگییەکی زۆری داوە بە بلاو کردنەوەی بیرو بۆچوونی رۆشنبیران و نووسەران و زانستکاران و هونەروەران و رامیاران و تەنانەت دژ بیرانیش و هەڤپەیڤینی ساز کردووە لەگەلیان: بێ ئەوەی گوێ بداتە رێبازی هزرییان.

"میدیا" نرخی گرانی ئەم رێ و رەوشەی خۆی داوە، تیرۆر کردنی نووسەرو رۆژنامەوان سەربەست مەحموود، سەردەستەی ئەو قوربانییانەیە کە لەم پێناوەدا داوێتی، تیرۆر کردنی سەربەست بەدەستی دوژمنانی خوێنرێژ، بەشێکە لە نەخشەی تووناکردنی قەڵەم بەدەستانی ئازادیخواز و، هەروەك تیرۆرکردنی داماوی موکریانی و ئەنوەری مایی و سەدیقی بلووکێنی و مووسا ئەنتەر و فرانسوا هەریری و سەعیدی یەزدانپەناو زانای گەورەی کورد و رۆژهەلات مامۆستا جەمیلی رۆژبەیانی، پچراندنی گۆیەکی زێرینە لەملیوانکەی پرشنگداری رۆشنبیرانی کوردستان کە بووەتە چقڵی چاوی داگیرکەران.

رۆژنامەوانی، کارێکی یەکجار سەخت و پیشەیەکی پیرۆزە، بە مەرجێك بەدەست مرۆڤی کارزانی بەویژدانەوە بێ، خۆ ئەگەر کەوتە دەست چەقاڵ و بەقاڵ و بەکرێگیراوو چەقەنە لێدەر بۆ ملهوڕان، ئەو کاتە دەبێ (فاتیحە)ی بخوێنیت.

بەرلین 2001/7/8

میدیا، ژ100، 2001/7/15

# داخوازیی سەددام لە کورد بۆ "وتوویژ" لەگەڵی

سەددام تاوانباری گەلکوژی یە لە کورد و، تاوانباری هەڵگیرساندنی سێ جەنگە (جەنگ دژی کورد، جەنگ دژی ئێران و، جەنگ دژی کوێت و کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان)، ئەزموونی کورد و ناکورد لەگەڵ سەددام، ئەوەی بەڕۆنی دەرخستووە کە هەموو رێککەوتن و بەڵێندان و سوێندخواردن و پەیمانبەستنێکی سەددام و دارو دەستەکەی بەیەکەوە دێ و دەچێ و، ئەنجامەکەی لە پەژیوانی و مالکاولیی پتر هیچی دی نییە. ئەمە لەکاتێکدا کە ئەمڕۆ هیچ هەلومەرجێکی لەبار بۆ وتوویژ لەنێوان کورد و سەددام دا نییە. سەددام دەبوو، بەلایەنی کەمەوە، داوای لێبوردن بکا لە نەتەوەی کورد بەرامبەر تاوانەکانی و، "پاکتاو کردن" ی رەگەزی لەو نێوچە کوردستانی یانەدا بوەستێنێ کە هێشتا لەژێر دەستی دایەو، دان بە فێدەراسیۆنی کوردستان دابنێ و، رژێمێکی دیمۆکراتیی پلووراليستی بۆ عێراق بخاتە بەرچاو.
بەڵگە نەویستە کە سەددام بەدوای چارەسەرێکی ئاشتی یانەو مرۆڤ دۆستانەدا ناگەڕێ بۆ کێشەی کورد، سەددام، پاش ئەوەی توانی بە پارووی چەور، دەوڵەتی خۆفرۆش و مێژوو رەشی رووسیا رازی بکا، یارمەتیی تەکنیکی بدا بۆ بەهێزکردنی سیستەمی چەکی بەرگریی ئاسمانی، ترسی خستووەتە دڵی فرۆکەوانەکانی بەریتانیا و ئەمریکاوە لە "هەرێمی نەفرین"ی باشووری کوردستان و خوارووی عێراقدا و، دەیەوێ بە زۆری چەک، بەریتانیا و ئەمریکا و کورد سەرشۆڕ بکا. ئەوەی پتر سەددامی هانداوە بۆ کەوتنە سەر رێی دەستوەشاندن لە کورد، بێ هەڵوێستیی بەریتانیاو ئەمریکا و فەرەنسایە بەرامبەر کردەوەکانی سەددام و، نەبوونی نەخشەیەکی دیاریکراوی ئەم سێ دەوڵەتە زلهێزەیە بۆ دواڕۆژی کوردستان و عێراق، هەروەها دوزمانیی رژێمی ترک کە بەسەرزاری خۆی بە هەڤاڵبەندی بەریتانیا و ئەمریکا دەداتە قەڵەم، بەڵام لەگەڵ سەددام دۆست و هاودەنگە لە قڕکردنی کورد دا. سەرباری ئەمانەش، رۆڵی دزێوو پەنامەکی ئیسرائیل کە بووەتە هاوکار و هاوپەیمانی سوپایی و ئابووری و هەواڵگوزاری و سیخوریی رژێمی ترک، هەر بۆ ئەوەی دەوڵەتی ترک

ڕێ بە ئیسرائیل بدا لە باکووری کوردستانەوە سیخوڕی بەسەر عێراق و سووریا و ئێرانەوە بکا. سەیرە..!!! ئەو جوولەکانەی کە سالآنی ساڵ و هەتا ئێستەش بازرگانییان بەوەوە کردووە و دەکەن کە گەلکوژی کراوە لێیان، کەچی ئێستە دژی کورد دەوەستن کە گەلکوژی کراوەو دەکرێ لێی، تەنانەت دەوڵەتێکیشی نیە وەك ئەوان.

جا ئەگەر ئێستە گلەیییەکی توند و تیژ هەبێ، دەبێ بەر لە هەموو شتێك لە کورد خۆی، بەتایبەتی کاربەدەستانی بکرێ، چۆنکە کاربەدەستانی باشووری کوردستان، دە ساڵی تەواو ماوەیان هەبوو بۆ ئەوەی سووت لەو دەرفەتە دیرۆکی یە وەربگرن کە جەنگی دووەمی کەنداو رەخساندی بۆیان. بەڕاستی ئەو دە ساڵە کاتێکی باش بوو بۆ بەخودا هاتنەوەو خۆ کۆکردنەوەو دامەزراندنی هێزێکی سوپایی یەکگرتوویی مۆدێرن بۆ ئەو رۆژەی کە پارێزگارانی "هەرێمی نەفرین" لەپڕ خۆیان دەکشێننە دواوە، تاکو کورد ناچار نەبووایە بەملیۆن لەوڵاتی خۆی رابکا و ببێتە ئاردی نێو درك. ئەز بەش بەباری خۆم، لەم دە ساڵەدا، بەزمان و بە نووسین، بەدەمی و بەنامەی تایبەتی، بەرۆژنامە و سەمینار و رادیۆو تەلەفیزیۆن، ئەمەم راگەیاندووە بە کاربەدەستانی کوردستان.

ئێستا کورد لە بەردەم دوو رێیانێکی پڕ لە مەترسی دا وەستاوەو، دەبێ ژیرانە و دەستوبرد، رێ یەکی وا هەڵبژێرێ، کە هیچ نەبێ بەرەو نەمانی کورد نەڕوا. لەسەر کاربەدەستانی کورد پێویستە بزانن، هەموو بەرژەوەندییەك (تایبەتی بێ، یان حیزبایەتی بێ، یان نێوچەیی) دەکەوێتە خوار بەرژەوەندیی نەتەوەی کوردەوە، لەبەر ئەوە دەبێ دڵ و دەروونیان بکەن بەیەك. ئەوڕۆ رۆژی ئەوە نییە کە نوێنەرانی دوو حیزبە گەورەکە لەسەت جار پتر لەگەڵ یەك دابنیشن بۆ باسی گەڕانەوەی کوردی دەرکراوی سلێمانی بۆ هەولێر و هەولێر بۆ سلێمانی، یان چەند دینار بەم دەبڕێ و چەند دینار بەو، رۆژ رۆژی یەکێتییەو، رۆژی خۆکۆکردنەوەی گشتی (التعبئة العامة) و، وتووێژی خەستو خۆڵ و ئەنجامدار لەگەڵ کاربەدەستانی بەریتانیا و ئەمریکا و فەڕەنساو، بە ئاشکرا و بێ پێچوپەنا دەربڕینی ئەوەی کە ئێمە چی دی بە بەڵێن و قسەی خاوی پف هەڵدراو دابین

نایین، پێویستە بەرەسمی دان بنرێ بە بوونی کۆماری فیدرالی کوردستاندا و پەیمانێك ببەسترێ لەگەڵی، کە بەو پێ یە هێزەکانی پارێزگاران لە ئینجرلیکەوە بێنە نێوچەی بادینان و، چەند فرگەیەك لە هەرێمی کۆماری دا بکرێنەوەو، هەرێم فراوانتر بکرێ بە جۆرێك کە کەرکووك و مووسڵ و دیالەی بچێتە سەر، ئەم کارانەش لەدەست ئەم دەوڵەتانە دێن. دەبێ هەموو لایەك باش تێ بگەیەنرێن کە کورد ئامادە نی یە کچی خۆی بکا بەقوربانی کوڕی دراوسێ، ئەوجا چ دراوسێ‌یەك! ئەو دراوسێ‌یەی کە پێ‌دەنێ بە سێبەری سەری کورددا. دەبێ لە ئەمریکا و بەریتانیا و فەرەنسا بگەیەنرێ کە کورد نایەوێ تاقیکردنەوە تفت و تاڵەکانی بەهاری 27 و بەهاری 37 و بەهاری 47 و بەهاری 70 و بەهاری 75 و بەهاری 88 و بەهاری 91 ی سەتەی رابردوو، دووبارە بکاتەوە. لەسەر کاربەدەستانی پارێزگاران پێویستە کە کورد هێندە ناهومێد نەکەن، ناچار بێ هەوڵی بەستنی پەیمانێکی سوپایی بدا لەگەڵ دەوڵەتێك کە نەدۆستی ئەمانە و نەدۆستی ترك و عێراق! بەڕاستی زۆرم پێ ناخۆشە کە ئەم قسەیە دەکەم، بەڵام چار چی یە کە کورد بەرەو نەمان بچێ، هەرە لەبەر ئەوەی سەری رژێمی ترك و ئیسرائیل خۆش بێ، دیارە دەبێ لە هەموو دەرگەیەك بدرێ.

که من وەسلی مرادم بێ سەمەربێ، بەمن چی باخی عالەم جووم لەبەربێ!

هەرچی هەرەشەکەی سەددامیشە کە گوتی "ئەگەر لەگەڵ کورد نەگەیشتە چارەسەرێك بۆ کێشەکە، ئەوا ئەوکاتە "لکل حادث حدیث" کە بە کوردی "کنگرو ماستیش بۆکاتی خۆی" دەگەیەنێ، ئەز بەم شێوەیەی خوارەوە لێکی دەدەمەوە:

پاش ئەوەی رۆشنبیری کورد، بەڕێز بەهادین نووری گەیشتە پلەی کۆمیتەی نێوەندیی پارتی کۆمۆنیستی عێراق، ئازایانە لەساڵی 1952 دا پەنجەی خستە سەر هەڵوێستی هەڵپەرستانەو ترسنۆکانەی پارتی کۆمۆنیستی عێراق لەبارەی کێشەی کوردەوەو، دانی نا بە مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد دا، هەتا دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ. بەهادین بەم هەنگاوە بوێرانەیەی سەلماندی کە کوردێکی ئازادیخوازە، جا هەرچەندە هێندەك لەکار بەدەستانی حیزبەکەی کەوتنە دژایەتیکردنی خۆی و بەرنامەکەی کە بە "بەرنامەی باسم" بەنێوبانگ

بوو، بەڵام لەبەر بەهێز بوونی بزووتنەوەی کوردایەتی، نەیانتوانی "مافی بڕیاری چارەنووسی کورد" لە پرۆگرامی پارتی کۆمۆنیستی عێراق دەرهاوێژن. ئەوجا حیزبەکانی عێراق، بەتایبەتی (الحزب الوطني الديمقراطي) بە سەرۆکایەتی خودێلێخۆش بوو کامیل چادرچی و حیزبی ئیستقیلال (استقلال) کە حیزبێکی عەرەبی ئاسیۆنالیست بوو، کەوتنە خۆیان، بۆ ئەوەی باسی مافی کورد بخەنە پرۆگرامی حیزبەکەیانەوە. ئەو سەردەمە (1952) لە هەموو عێراقدا چوار بەعسی هەبوو، ئەمانیش خەڵکی سووریا بوون و، لەگەڵ ئێمە لە کۆلێجی پەروەردە (كلية التربية) دەیانخوێند. بەڵام بەرە بەرە ژمارەیان پتر بوو، ئەندامانی حیزبی "ئیستقیلال" دەبوونە بەعسی، ساڵی 1956 کە حیزبەکانی عێراق خەریکی ئەوە بوون "بەرەیەکی نیشتمانی" (جبهة وطنية) پێك بهێنن، بەعسیەکان هێزێك بوون بۆخۆیان، بەتایبەتی چۆنکە خۆیان بە (جەمال عەبدولناسر) دا هەڵدەواسی و پرۆپاگەندەیان دەکردبۆی و بۆ یەکێتیی عەرەب. هێندێك لە بەعسییەکان، هەر لەو ساڵەوە (1956) کەوتبوونە سەربیرێك بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردستان، ئەگەر هاتو کورد بوونە کۆسپ لەڕێی "یەکێتیی عەرەب" بە سەرۆکایەتیی ناسر. دەیانگوت: با کوردەکانی هەولێر و سلێمانی و چەمچەماڵ و هێندێك بەشی ستان (لواء)ی مووسڵی ئەو سەردەمە (کە هێشتا ستانی دهۆك دروست نەبوو بوو) ببەن بۆ خۆیان و دەوڵەتێك دروست بکەن. بەعسی یەکان پێیان وابوو کە کورد ناتوانن دەوڵەت ببەن بەڕێوە، ئەوجا، یان ئێران، یان دەوڵەتی ترك، پەلاماریان دەدا و خاکەکەیان داگیر دەکا، یان ئەوەتە رازی دەبن بگەڕێنەوە سنووری "نیشتمانی عەرەب" و ببنە کەمایەتییەکی بێ نرخ. ئەز خۆم ئەم قسەیەم لە فوئاد ریکابی (فؤاد الركابي) بیست، کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی حیزبی بەعس پاش کودەتای 14 ی تەمووزی 1958. تەنانەت کاتێك کە عەقید شەواف (الشواف) بەرووی ڕژێمی قاسمدا ڕاپەڕی و "کۆماری عێراقی" دا خۆیانی کرد لە مووسڵەوە، قسەکەری رادیۆکەی شەواف، رووی دەمی کردە کورد و گوتی: "شكلوا كردستان" واتە "کوردستان دروست بکەن".

لەوانەیە سەددام کە هیچ چارەی نەما بڵێ، ئەوا دەستم هەڵگرت لەو نێوچانەی بەدەست کوردەوەیەو، هەر لەبەر ئەمەشە نێوچە کوردستانییەکانی بن دەستی خۆی لە کورد (پاك) دەکاتەوە. پێی وایە بەوە رزگاری دەبێ، یان ئەو عەرەبانەی کە هێنراونەتە کوردستان پاش گۆڕانی بارودۆخی رژێم، هەروا بەهاسانی دەتوانن لەو شوێنانە بژین و بخۆن و بکەن.

**بەرلین** 2001/8/8

**میدیا،** ژ103، 2001/8/15

# پێوەندیەکانی ترك و ئیسرائیل..
# کێ ئەوی دیکە دەستخەرۆ دەکات؟

نووسەر و لێکۆلینڤانی کوردستانیی دانیشتووی ئەلمانیا

ئەم بابەتەی بیرمەندی گەورەی نەتەوەییمان، پرۆفیسۆر جەمال نەبەز، لە ژمارەی رۆژی 17/ 8/ 2001 ی رۆژنامەی (الشرق الاوسط) دا بلاو کراوەتەوەو وێنەیەکی بۆ ئێمە نێردرابوو بە زمانی عەرەبی و، ئێمەش دەقاودەق کردوومانەتە کوردی، هەروەها ناساندنەکەی مامۆستا جەمال نەبەزیش هی رۆژنامەی (الشرق الاوسط)ە. (میدیا).

ئەرێیل شارۆنی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل لەکاتی سەردانی ئەو دواییەیدا بۆ ئەنقەرە، لە بارەی ئەوەوە پەیڤی کە ناوی نا (تیرۆریزمی کوردی)، دوای ئەوەی کە (مەترسیی تیرۆریزمی فەلەستینی لەسەر ناوچەکە) بۆ بولەنت ئەجەویدی هاوشانی ترکەکەی شرۆڤە کردو گوتی: (ئەو تیرۆریزمەی ئەمڕۆ گەیشتووەتە ئێمە، سبەینێ دەگاتە ئێوەش، ئەگەر بەرامبەری بێدەنگ بین) هەروەها شارۆن بۆ هاوشانە ترکەکەی ئاماژەی بەوەیش دا کە: (هێزەکانی سوپای ترك بەتەواوی تیرۆریزمی کوردی لە نێوبردو، زۆری نەمابوو لەو پێناوەدا شەڕی دژی سوریا و عێراقیش بەرپا بکات) لەڕاستیدا شارۆن بەو ئاماژەیە ویستی گازندە لە هاوشانە ترکەکەی بکات بەهۆی رەخنەگرتنی (ترکیا) لە ئیسرائیل، لەکاتێدا کە ترك خۆی هێزێکی زێتری بەکارهێنا بۆ لەنێوبردنی ئەوەی شارۆن بە (تیرۆریزم) ناوی دەبا.

خویایە، شارۆن لە دلّی خۆیدا زۆر سەیری بەوە دێت کە دەبینێ هاوشانە ترکەکەی زۆر بە دژواری شەڕ لەگەلّ گەلی کورددا دەکات بەبیانووی لەنێوبردنی (تیرۆر) و، خاکی کوردستان داگیر دەکات و هەولّی لەنێوبردنی گەلەکەی دەدات و لەمافی بەکارهێنانی زمانەکەی وسەرەتاییترین مافە مرۆڤییەکانی بێبەشی دەکات، کەچی رەخنە لە شارۆن دەگرێ لەسەر کردەوەکانی لە فەلەستینی داگیرکراودا. لەوەوە بەدیار دەکەوێت کە شارۆنی شارەزا و قالبووی بواری سەربازی و سیاسی، تا ئێستا لەوە تێنەگەیشتووە کە نزیکبوونەوەی رژێمی

ترك له رژێمی ئیسرائیل بۆ پێوەندییەکی برایانەو بەردەوام نییە، بەڵکو رێکەوتنێکە، بەهۆی وێکچوونی بەرژەوەندییەکانی هەردوولا، کە لەکاتێکی دیاریکراودا پەیدا بووەو، پێوەستە بە بارودۆخەکەیەوە. لەوانەیە شارۆن هێشتا گوێی لەو وتەیەی ژەنەراڵ دیگۆل نەبوونێ کە دەبێژی: (پەیماننامەو رێککەوتنەکان وەك کچە لاوەکان و گوڵەکانی سەرەتای بەهارن).

لەراستیدا ترکەکان سەلماندیان کە ئەوان لە بازرگانیی سیاسیدا زۆر لەشارۆن و ناتانیاهۆی هەڤاڵی زیرەکترن، لایەنی ترکی توانی شارەزایی تەکنەلۆژیای ئیسرائیلی بەدەستبێنێ (بۆ پڕ چەککردنی سوپایەکەی بە نرخێکی هەرزان) و توانی دەزگای سیخوڕیی ئیسرائیلی، وەك لایەنێکی کاریگەر لە کرداری تیرۆریستانەی رفاندنی سەرکردەی کورد عەبدوڵڵا ئەجەلان دا بەکار بێنێ، هەروەها ئیسرائیلی، وەك کارتێکی گوشار، بەرامبەر کۆنگرێسی ئەمریکا بەکار هێناو، بەو هۆیەوە توانی رێگە لە کۆنگرێس بگرێ، بڕیاری تاوانبار کردنی دەوڵەتی ترك دەربکات بەهۆی قڕکردنی ئەرمەنییان (هەروەك چۆن پەرلەمانی فەرەنسا کردی). بەلام ئەرێ گەلۆ رژێمی ئیسرائیل چی بەدەستهێناوە بێجگە لە نەفرەتی کورد و قوڵکردنەوەی هەستکردنی کورد بەوەی کە داگیرکەرانی خاکی نەتەوەکانی تریش لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان یەك تاس و حەمامن و لەیەك پارچە پەڕۆ دروستکراون، هەرچەند ئایین و زمان و گوتنەکانیان لێك جیاوازیش بن.

مەبەستی من لێرەدا ئەوەنییە بەرگری لە عەبدوڵلا ئۆجەلان و پارتەکەی، یان سەرکردەو پارتیَکی دیکەی کوردی بکەم، بەلام هەر بۆ نموونە ئۆجەلان هیچ تاوانێکی قڕکارییانەی وەك تاوانی سەبراو شاتێلای لە وڵاتی ترکان دا ئەنجام نەدابوو و، هەروەها هیچ کردەوەیەکی دژی ئیسرائیل ئەنجام نەدابوو، کاتێك کە پێگە سەربازییەکانی هێندەی مەودای بەردە دەستێك لە ئیسرائیلەوە دوور نەبوون. بەلام ئیسرائیلییەکان لە بەرلین چوار کوردیان بەنامەردی کوشت، کاتێك دژی رێگیریەکانی ئیسرائیل خۆنیشاندانی ناڕەزاییان رێکخستبوو. لەکاتێکدا بەهەزاران جولەکەی عێراقی و ئێرانی، بەڕێگەی ناوچە رزگار کراوەکانی

کوردستانەوە، کاتی خۆی توانیان خۆیان لە مردن رزگار بکەن. ئەز ئەوە دەڵێم چۆنکە پێش چەند ساڵێك، ئەز یەکێك بووم لەو کوردە پێشەنگ و هەژمارکەمانەی داوای پێکهاتن و ئاشتی نێوان فەلەستین و ئیسرائیلیەکانمان دەکرد کە ئەو لێدوانانە بۆ ئەو کات سەرتێدا چوونیان تێدا بوو، بەڵام ئاشتی و پێکهاتنەوەی روومەتدار لە ئاسمانەوە ناهێتە خوار، بەڵکو لەرێگەی ئەو سیاسەتڤانە پاکانەوە دروست دەبێ کە بڕوایان بە برایەتی مرۆڤانە و ئازادی و مافی بڕیاردانی چارەنووسی هەیە، مخابن گەلە پەرێشانەکانی رۆژهەلاتی نێوەڕاست بەدەست نەبوونی ئەو سیاسەتڤانانەوە دەناڵێنن کە ئێمەش چەندین ساڵە چاوەڕوانیانین.

**میدیا، ژ**104، 2001/9/1

# دوکتۆر فالیح عەبدولجەبار و رۆژنامەی میدیا

ئەز دکتۆر فالیح عبدولجەبار ناناسم، بەڵام لە ئەنجامی پرسیارکردندا لەم و لەو، بۆم دەرکەوت کە دوکتۆر فالیح ئەکادێمییەکی عێراقی عەرەبەو لە هەولێر میوانە و لە زانستگەی سەلاحەدین وانە بێژ (محاضر)ە.

بەهۆی هەواڵێکەوە کە رۆژنامەی (میدیا)ی زمان حاڵی (YNDK) بڵاوی کردبووەوە لەبارەی ئەوەوە کە قسەکەرێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا گوتوویەتی، حکومەتی ئەمریکا بڕی 11و6 ملیۆن دۆلاری داوە بە کورد و عێراقییە بەرهەڵستکەرانی رژێمی سەددام و، لەنێو ئەوانەدا، دوکتۆر فالحیش نێوی هاتووە، دوکتۆر فالیح بەجۆرێك تووڕە و کەللەیی بووە کە وەك کوردەکە دەڵێ (دۆو دۆشاوی تێکەڵ یەك کردووە)، لەوانە خستنە ژێر پێی رۆژنامەی (میدیا) و جنێودانی سارد و سووك بەسەر نووسەری (میدیا) بەڕێز ئاکۆ محەمەد، هەروەها تاوانبارکردنی ئاکۆ و YNDK و ئەوانەی لە (میدیا)دا دەنووسن، بەوەی کە سیخوڕو پیاوی دەزگەی موخابەراتی عێراقن، بێجگە لەوەش هەڕەشەی کوشتنی کردووەو، ئەو هەمو جنێوو هەڕەشەیەشی لە رۆژنامەی (هاولاتی)دا بڵاو کردووەتەوە کە لە سلێمانی دەردەچێ.

بێگومان، شتێکی زۆر ناخۆشە، مرۆڤ بەناڕەوا کردەوەیەك بنێنە پاڵی کە نەیکردبێ، لەم رووەوە دکتۆر فالیح مافی لەسەرخۆ کردنەوەی شارستانییانەی هەیە. هەرچەندە (میدیا) ئەم هەواڵەی لەسەرچاوەی دیکەوە وەرگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو لەوەرگرتنی هەواڵێکی وادا کەمێك وریا بووایە، بەتایبەتی کە دوکتۆر فالیح لە هەولێر دەژی و پرسیار کردنێك لەخۆی، کارێکی گران نەبوو بۆ (میدیا). دوکتۆر فالیحیش، دەشیا پاش بڵاوکردنەوەی هەواڵەکە، یەکسەر پێوەندیی بگرێ بە (میدیا)وە وبێژێ (ئەو هەواڵە درۆیە و دەبێ بەدرۆی بخەنەوە، ئەگەر وانەکەن، بانگی دادگە دەکەم) ئەگەرچی (میدیا) خۆی لەخۆیەوە، هەواڵەکەی بەدرۆ خستووەتەوە، کەچی دوکتۆر فالیح دڵی ئاوی نەخواردووەتەوە. ئەمەش مافێکی دەست بۆ نەبراوی خۆیەتی، بەڵام ئەو چووە بەژێر پێ خستنی رۆژنامەی (میدیا) کە ئاڵای کوردستانی پێوەیە و، بەگەلێك

جنێو و هەڕەشەی بازاڕییانە کەوتووتە کارو، بەمەش خۆی شکاندووە، چۆنکە دوکتۆر فالیح دەبێ بزانێ کە ژمارەیەکی زۆر لە رۆشنبیرانی کورد و، یەکێك لەوانە خۆم، لە رۆژنامەی (میدیا) دا دەنووسین و، ئەوی (میدیا) بخوێنێتەوە دەزانێ کە داگیرکەرانی کوردستان چەند دژی (میدیا)ن. (میدیا) هەڵوێستێکی ئازایانەو ئازادیخوازانەی هەیە بەرامبەر کێشەی ژنان و بەشخوراوان و سەربەستیی بیروڕا، ئاکۆ محەممەدیش کە سەرنووسەری (میدیا) یە، رۆژنامەڤان و رۆشنبیرێکی سەربەرزو ژیهاتیی کوردستانە، خۆ ئەگەر مرۆڤ بتوانێ، هەموو جۆرە گوناهێك بداتە پاڵی، ئەوا بەڕاستی سیخوڕی و نانخۆریی بێگانە، ناتوانرێ بدرێتە پاڵی، بەباوەڕی من، باشترین شت ئەوەیە هەردوو لا پاکانە بۆیەك بکەن، چۆنکە ئەگەر دۆزەکە بگاتە دادگە، پێ دەچێ کە ئەنجامەکەی بۆ دوکتۆر فالیح و رۆژنامەی (هاوڵاتی) باش نەبێ و، ئەو دەمە دوژمن بەهەموومان پێدەکەنێ.

بەرلین 2002/6/21

میدیا، ژ126، 2002/7/1

# ئەمریکاو سەددام و هات هاتی رۆم

رۆمەکان کە ئیمپراتۆریتییەکی زۆر گەورەو بەهێزیان هەبوو، لەکاتی لەشکرکێشیدا بۆ سەر فارسەکان بەکوردستاندا تێپەڕ دەبوون و هەر کەسێکیان لەسەرەڕێ بەردەستکەوتبا، دەیانکوشت و بەهەر باژێرو گوندێکدا بڕۆیشتنایە، وێرانیاندەکرد. لەبەر ئەوە کوردی کۆن کە ویستبێتیان ترسولەرز بخەنە نێو دڵی خەڵکەوە، گوتوویانە: "خەڵکینە، ئەوا رۆم هات!". زۆر جاری واش بووە کە سەر و کەللەی رۆمەکان هێشتا دیار نەبووە، بەڵام خەڵك لە بیستنی ئەو قسەیە زارەترەك بوونە، چۆنکە زەوروزۆنگی رۆم بەنێوبانگ بووە. کە ترکە عوسمانییەکانیش جێی رۆمەکانیان گرتەوە، کورد بەمانیشی هەر دەگوت "رۆم"، چۆنکە ئەمانیش لەکردەوەی خراپ و خوێنرێژیدا چەپیان نەبووە لەرۆمەکان. تەنانەت خودێلێخۆش بوو باوکم دەیگێڕایەوە کە لەسەردەمی منداڵیی خۆیدا هۆنراوەیەکی لەپیرەکانی ئەو رۆژگارە بیستووە کە دێڕێکی ئەمەی خوارەوە بووە:

**ئەگەر دە پرسی بەدەستووری رۆم**

**مافت ون بووە، وەك ترِی بن گۆم**

بەڕاستی پەلاماری ئەمریکا بۆ سەر رژێمی عێراق، بووە بە "هات هاتی رۆم". ئەوڕۆ لەهەموو جیهاندا باس باسی ئەو پەلامارەیە. هێندەك دەبێژن لەمانگی شوباتی 2003دا دەبێ. هێندێك دەبێژن لەکانوونی دووەمی 2003دا، هەبوون دەیانگوت لەمانگی ئاب یان ئەیلوول یان ئۆکتۆبەری 2002دا دەبێ. ئاب و ئەیلوول هاتن و چوون و پەلامار نەبوو. جۆرج دەبلیو بوشیش دەبێژێ "هێشتا بڕیاری پەلاماری نەداوە".

شایانی باس ئەوەیە کە زۆربەی هەرە زۆری دەوڵەتەکان، هەڵوێستی دژ بەجەنگیان داخۆیانیکردووە. نەك لەبەر هەستی مرۆڤدۆستی بەڵکو

هەریەکەیان لەبەر هۆیەکی دی. هێندێکیان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی ئابووریی خۆیان، وەك ئەورووپاو رووسیاو چین، هێندێکیان بۆ دژایەتیکردنی ئەمریکا وەك فەرەنسا. هێندێکشیان لەترسی لەدەستدانی دەسەلاتی ناڕەوای دیکتاتۆرانەی خۆیان، وەك دراوسێیەکانی کوردستان و عێراق. هێندەکی دیکەش هەن کە دوای "مۆدە" کەوتوون. لە ئەورووپا بەزگی تێرەوە لەسەر شەقامەکانی لەندەن و بەرلین و پاریس خۆپێشاندەدەن بۆ "ئاشتی"و "لەدژی جەنگ"، بەلام کە چەکی کیمیایی لەدژی خەلکی کوردستان بەکارهێنراو، ئەنفال لەکورد کرا، ئەمانە لە هیچ کونێکەوە دیار نەبوون.

وەك لەوتارەکانی پێشوومدا کە لە رۆژنامەی "میدیا"دا بلاوکرانەوە، نووسیبووم، کورد نەدەیانەوێ دژی پەلاماری ئەمریکا بوەستن و نەدەشتوانن بوەستن و نەپێشیان دەکرێ بێلایەن بمێننەوە. لەبەر ئەوە کوردستان دەبێتە گۆڕەپانی جەنگێکی هۆ بەهۆی زیندەوەر قرکەر، چۆنکە هەر لەئێستەوە دەولەتانی ئێران و ترکی داگیرکەر خێوەتیان لەسەر سنووری دەستکردەکانیان داکوتاوە، بۆ ئەوەی کە کورد کەوتە راکردن، لەژێر ئەو خێوەتانەدا زیندانییان بکەن، تا دەسکەلاکانی ئەوان، وەك "بەرەی ترکمانی" باشووری کوردستان و، چەکدارەکانی "بەدر" خوارووی عێراق دەکەوێتە دەستیان. نوێنەری "بەرەی ترکمانی" لەهەولێر سینان ئاغا، چەند رۆژێك لەمەوبەر بەپەیامنێری رادیۆی "العراق الحر"ی گوت کە بەرەی بەرێزی "حەفتا هەزار چەکداری مەشقپێکراوی هەیەو ئامادەی شەڕە بۆ داگیرکردنی کەرکووك"و هەڕەشەی ئەوەشی کرد کە "هیوای وایە کارەکە بەبێ شەڕو خوێنڕێژی بێتە دی". بەڕاستی نازانم ئەم حەفتا هەزار چەکدارە لەکوێ بوون کاتێك کە هەزاران پێشمەرگەی کورد سی سالی رەبەق شەڕیان دژی دیکتاتۆرێتی دەکردو نیو ملیۆن کورد کوژران و ملیۆن

و نیویێك کورد دەربەدەر کران؟ باشە کە کورد ئێستە ئەو هەموو مافانەی داوە بەترکمانەکان، کەچی سینان ئاغا لەهەولێر دانیشتووە و ئەم قسانە دەکا، ئەگەر کورد لەگەڵ سەددام رێکبکەوتنایە، سەددام دەیهێشت ترکمانێك سەر بەرز بکاتەوە؟ بۆچی ئەوە هەشتا ساڵە دەوڵەتی عێراق هەیە، کەچی رژێمی ترك تازە باسی "مافی ترکمان" دەکا؟ ئەمەیان "بەرەی ترکمانی". ئەوجا هەرچی سەید محەممەد باقیری حەکیمە، ئەوا لەوتوویژێکیدا لەگەڵ رۆژنامەی فارسیزمانی "جمهووری ئیسلامی" لەتاران لەرۆژی پێنجشەممەی 10/3دا باسی وتوویژی خۆی کرد لەگەڵ ئەمریکاو گوتی: "ئێمە (لە ئەمریکا) پێچەوانە وەستانی خۆمان بەرامبەر جەنگی ئەمریکا دژی عێراق دەربڕی.. . ئێمە باوەڕمان وایە کە رژێمی عێراق دەبێ لەنێوبچێ، بەڵام هەر لەو کاتەشدا باوەڕمان وایە کە بەرپرسیارێتیی لەنێوبردنی رژێم دەکەوێتە سەر گەلی عێراق و نابێ ئەم لەنێوبردنە لەدەرەوە بێ".

ئێمە لێرەدا باوإز لەوە بهێنین کە سەید دەیەوێ بەچەکدارەکانی "بەدر" کە لەئێران پەنابەرن، رژێمی عێراق بگۆڕێ‌و بیکاتە "ئیسلامی"، بەڵام سەید لەوەرامی پرسیارێکدا کەچ دەبێژێ لەبارەی ئەوەوە کە "دوو حیزبی گەورەی کوردی عێراق رەشنووسێکیان ئامادە کردووە بۆ دامەزراندنی کۆمارێکی فێدەراڵی لەعێراقدا"، دەبێژێ: "ئاگام لەم رەشنووسە نییە، پارتی دێمۆکراتی کوردستانی عێراق پێشنووسەکەی دەرکردو ئێمەش لەگەڵ ئەوان لەبارەی فێدەراسیۆنەوە قسەمانکرد، بەڵام ئەز بە بەشکردنی عێراق بەدوو بەش رازینابم. ئەگەر مەبەست لەیەکگرتنی فێدەراڵی ئەوە بێ کە هەموو خەڵکی عێراق بگرێتەوە، ئەوا دەبێ گەلی عێراق لەو بارەیەوە باری سەرنجی خۆی دەربڕێ".

بەکورتی، سەید هەر لەئێستەوە دژی ئەوەیە کە باشووری کوردستان لەشێوەی کۆمارێکی فیدەرالیدا بێ. کەواتە "بەرەی ترکمانی"و "مجلس اعلای انقلاب اسلامی عراق" کە ئەویان لە ئەنقەرەو ئەمیان لەتارانە، بەپێی قسە نەستەقە ئەڵمانییەکە دەجووڵێنەوە کە دەبێژێ: "نانی کێ بخۆم سترانبێژی ئەو کەسەم"!.

دەمێنێتەوە سەر ئەوەی، ئایا ئەمریکا لەم جەنگەدا چ رۆڵێك بەکورد رەوا دەبینێ، یان کورد خۆیان دەتوانن رۆڵێکی وا بگێڕن کە ئەگەر هاتوو نەشگەیشتنە ئامانجی خۆیان، هیچ نەبێ ئەوەی هەشیانە لەدەستیان نەچێ؟ وەرامی ئەم پرسیارە زۆر زەحمەتە. ئەز خۆم لەو باوەڕەدام کە کورد بەهۆی حیزبحیزبێنەو شەڕی نێوخۆییەوە گەلێك دەرفەتی باشیان لەدەست خۆیان داوەو، دوژمنانیش خۆیان قایمکردووەو، لەهەموو لایەکەوە بەگوێی کاربەدەستانی ناتۆو ئەمریکادا دەخوێنن کە باوەڕ بەکورد نەکەن. هەر بۆ نموونە جەنەراڵ کلارك کە لەساڵی 1999دا فەرماندەی هێزەکانی ناتۆ بوو لەجەنگی سربیاداو ئێستە خانەنشینە، بەپێی هەواڵێك کە ئەژانسی "فرانس پرێس" بڵاویکردەوە، ئەمریکای "هۆشیار کردووەتەوە لەمەترسیی ئەوەی کە لەکاتی جەنگدا پشت بەهێزە نێوچەییەکان، بەتایبەتی کورد ببەستێ، چۆنکە ئەمانە باش رانەهێنراون بۆ جەنگ بەشێوەی نوێ دژی لەشکری عێراق کە زۆر لە لەشکری ئەفغانستان بەهێزترە". بەکورتی، "مەبەستی ئەوەیە ئەمریکا کورد بخاتە پشتگوێ‌و پشت بە لەشکری ترك ببەستێ کە ئەندامی ناتۆیەو باش مەشقی پێکراوە". راستیەکەی باسی ئەوەش دەبیسترێ کە پەیمانێکی نهێنی لەنێوان ئەمریکاو دەوڵەتی ترك و ئیسرائیلدا هەیە کە پێکەوە پەلاماری عێراق و سووریاو ئێران بدەن، ئەوجا لەبەر ئەوەی ئەمریکا لەم وڵاتانەدا، تا سەر نامێنێتەوە، ئەوا نێچیرەکە بەر دەوڵەتی ترك و ئیسرائیل

دەکەوێ. ئەوان بۆ "تۆرانستانی گەورە" لە "چینەوە تا یۆنان"و ئەمانیش بۆ "ئیسرائیلی گەورە" لە "فوراتەوە تا نیل". کوردو عەرەب و فارسیش "دەست لە گۆنان درێژتر"!.

شایانی باس ئەوەیە لەم رۆژانەدا بارەکە وایلێهاتووە کەس سەر دەرناکا لێی. هێندەك دەبێژن، سەددام هەموو داخوازییەکانی ئەنجومەنی ئاشتیی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ رێدان بە پشکێنەرانی چەکی کۆمکوژ بۆ هاتنە عێراق جێبەجێدەکاو شەڕ هەڵناگیرسێ. هێندەك دەبێژن، ئەمریکا بێگومان پەلاماری عێراق دەدا، بۆ وێنە بەڕێز مەسعوود بارزانی لەهەڤپەیڤینێکدا لەگەڵ رۆژنامەی "الحیاة" گوتی: "لێدانی رژێمی عێراق بڕیاری لەسەر دراوە. کەینیّ‌و چۆن، ئەوە نازانم، بەڵام کێشەی لێدان باسێکەو بڕاوەتەوە" (رۆژنامەی "الحیاة" ژ/ 14446، 2002/10/8).

ئەز بەش بەباری خۆم، باوەڕ ناکەم ئەمریکاییەکان هێندە سادە بن کە نەزانن لەوڵاتێکی وەك عێراقدا شاردنەوەی چەند لابۆر (مختبر)ێك بۆ بەرهەمهێنانی چەکی کیمیایی، یان بیۆلۆژی هێندە گران بێ کە چارە نەکرێ‌و، پاش گەڕانەوەی پشکێنەرەکان بەدەستی ڤالا، سەر لەنوێ دەستپێنەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەش، ئەمریکا ئەوڕۆ تەنیایەو دوور نییە لەباری ناچارییەوە جاریّ بێدەنگ بێ‌و پاش هەڵبژاردنی نوێ لەئەمریکا سیاسەت نەگۆڕێ. جا بۆ ئەوەی کوردەکە نەبێ بە "کوردەکەی لە هەردوو جەژنان بوو" پێویستە رامیارانی کورد بکەونە دەستپێشکەری. لێرەدا پێشنیازێك دەخەمە ڕوو بۆ لێوردبوونەوەو وتووێژکردن لەسەری:

ج دەبێ ئەگەر پەرلەمانی کوردستان پاش تاوتوێکردنی هەلومەرجی نێوخۆو دەرەوەی وڵات، ئەم پێشنیازەی کە دەیکەم، لەگەڵ ئەمریکاو بەریتانیا باس بکاو بەرێککەوتنێکی پەیماننامەیی کە هەر سێ لا دەروێستی راگرتنی بن، بانگەوازێك دەربکا بۆ سەددام کە خۆیەو خێزان و

کەسوکارو دەستوپێوەندی بێنە کوردستان و ئەمریکاو بەریتانیا گەرەنتی ئەوە بدەن کە دەستنەبەن بۆیان. ئەمەش بەرامبەر بەوەی سەددام لەبەردەم پەرلەمانی کوردستاندا داوای لێبوردن لە نەتەوەی کورد بکاو هەر لەو کاتەشدا دەستەبەر ببێ بەوەی کە کۆمیتەیەك لەکوردستان دروستببێ بۆ پێکەوە نانی حکوومەتێکی کاتی کە هەڵبژاردنێکی دیمۆکراتانە لەباشووری کوردستان و عێراقدا بەسەرپەرشتیی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان ساز بکاو، هەتا باری وڵات دادەمەزرێو سیستەمی نوێ جێی خۆی دەگرێ، هێزێکی سوپایی کە لەسەت هەزار پێشمەرگە پێکهاتبێ لەبەغدا جێگیر بن بۆ پاراستنی حکوومەتی کاتیو بەدیهێنانی بڕیارەکانی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێگرتن لەجەنگێکی تەڕو هیشك سووتێن و گۆڕینی ڕژێمی عێراق بەشێوازێکی ئاشتیو بەربەستکردنی دەستدرێژیی دراوسێیەکان بۆ سەر باشووری کوردستان و عێراق.

ئەز نازانم هەڵوێستی کوردو سەددام بەرامبەر ئەم پێشنیازە چۆن دەبێ. بەڵام بێگومان کە شەڕ قەوماو سەددام و لەشکرەکەی دەرفەتیان هێنا دەستبکەنەوە، ئەوا هەتا دەکوژرێن، زیانێکی یەکجار زۆر بەهەموو لایەك دەگەیەنن. پاش ئەوەش وڵاتێکی کاول بوو دەکەوێتە دەستی دراوسێیانی نەیار. خۆ ئەگەر سەددام نەکوژراو توانی دەرباز بێ، ئەوا پێی دەڵێن "راکردوو"و "هەڵاتوو"، بەڵام پەنابردنی سەددام بۆ کوردستان بەو شێوەو مەرجەی لەسەرەوە باسمکرد، وەك ئەوە نییە کە سەددام پەنابباتە بەر دەوڵەتێکی عەرەب، یان ناعەرەب. لەهاتنی سەددام بە خۆیو ماڵ و منداڵ و خزم و کەسوکارییەوە بۆ کوردستان، بەنیازی داخوازیی لێبوردن و ژیان لەکوردستان تا ئەو ڕۆژەی خودێ پێی خۆش بێ، هیچ جۆرە سەرشۆڕییەکی تێیدا نییە. ئەز تا ئەو هەندازەیەی کورد دەناسم، لێی

دەبوورن. چۆنکە تائێستە لەگەڵێك تاوان و خراپەکاری بوردوورن. هەر بۆ نموونە نزار خەزرەجیو وەفیق سامەرایی لەڕێی کوردستانی رزگارکراوەوە روویانکردە ئەورووپا. ژمارەیەکی زۆریش لەکادرەکانی بەعس ئێستە لە هەولێرو سلێمانیو دهۆك کاربەدەستن.
ئەوجا ئەگەر کورد لەم تاقیکردنەوەیەدا سەرکەوتووبن، ئەوا بەگەلێك ئاواتی خۆیان دەگەن و هەموو ئاشتیخوازێکی ئەم جیهانەش سوپاسبژێری کورد دەبن و، چ.دەبێ ئەگەر ئەمەش تاقیبکەینەوە. کورد گوتوویانە: "کردوو پەشیمان بیت باشترە لە نەکردوو پەشیمان".
2002/10/10

**میدیا**، ژ 134، 2002/10/15

## "كۆنفرانسی بەرهەڵستكارانی عێراقی" لەلەندەن (2002/12/17-14)

# خۆڵ و دۆیەك بوو بەدەستی كورد خۆی، كرا بەسەری نەتەوەی كورددا

پاش نێزیكەی ساڵێك هاتوچۆو وتووێژو چرپە چرپ و لێكتۆران و ئاشتبوونەوەو دیسانەوە لێكتۆران، ئەوجا بەدەستێكەڵیی راستەوخۆی ئەمریكا، زۆربەی زۆری ئەوانەی خۆیان بە بەرهەڵستكارانی رژێمی سەددام دەزانن، هەوڵیاندا كە لەبرۆكسل (پێتەختی بەلجیكا) كۆببنەوە بۆ باسی "دوارۆژی عێراق دوای سەددام"، بەلام بەلجیكا رێینەدا پێیان، ئەوجا ناچار بوون لەلەندەن كۆببنەوە، چۆنكە بەریتانیا تاكە وڵاتێكی ئەوروپاییە كە هەڵوێستی بەرامبەر رژێمی عێراق وەك هەڵوێستی ئەمریكایە. لەم كۆبوونەوەیەشدا، برێك لەبەرهەڵستكارانی عێراق بەشدار بوون، لەنێو ئەوانەدا، دوو زلحیزبە كوردییەكە (ینك و پدك)و "بزووتنەوەی ئیسلامیی كوردستانی عێراق"ی مەلا عەلی، هەروەها "ئەنجومەنی بالای شۆرشی ئیسلامیی لەعێراقدا" بەسەركردەیەتیی محەمەد باقیری حەكیم و، چەند دەستەیەكی دیكەی وەك "بزووتنەوەی ویفاقی وەتەنی"ی ئەیاد عەللاوی،و "بزووتنەوەی شاخوازیی دەستووری" بەسەركردەیەتیی شەریف عەلی ئیبنی حسەین و، "كۆنگرەی نیشتمانیی عێراق" بەسەركردەیەتیی ئەحمەد چەلەبی، كە ئەم چوارەی دوایی لەگەڵ دوو زلحیزبە كوردییەكە بە "دەستەشەشێكە" ناسراون و، هەمووشیان ئەندامن لە "كۆنگرەی نیشتمانیی عێراق"دا، بێجگە لەمانەش خەلیل زەلمای، وەك نوێنەری سەركۆماری ئەمریكا، جۆرج دەبلیو بوش، ئامادە بوو. "دەستەشەشێكە" لەسەرەتاوە وا بەتەمابوون كە هەر خۆیان

بینە سەر گەورەی کۆنفرانسەکە لەگەڵ ژمارەیەك لەکەسانی بەسەر زاری "سەربەخۆو بێ لایەن"، لێ لەراستیدا بەدڵی ئەم حیزب و ئەو حیزب هەڵسوڕاو، بەڵام لەئەنجامی ئەوەوە کە لەلایەنەکانی دیکەوە گوشار خرایە سەریان، ناچار بوون دەرگە بکەنەوە بۆ ژمارەیەکی زۆر لەکۆمەڵ و حیزبۆلکەو ماستاوکەرو کۆنە بەعسیو تۆرانی، تا ژمارەی بەشداران گەیشتە 370 کەسێك. بەقسەی هێندەك لەرەخنەگران، کۆنفرانسەکە هەر سەددام و عەلی حەسەن مەجیدو خەزرەجی کەمبوو.

لێرەدا دەمەوێ ئەوەی لەم کۆنفرانسەدا سەرنجراکێش بوو، بەتایبەتی لەبارەی کوردەوە، بەکورتی لەچەند خاڵێکدا بخەمە بەرچاو، ئەگەرچی خۆم بانگنەکرا بووم بۆ کۆنفرانسەکە، بەڵام بەهۆی دەزگەی راگەیاندنی گشتییەوە، ئاگام لەرووداوەکانی نێو کۆنفرانسیش هەیە:

1-ژمارەیەکی زۆر کەسانی سەربەخۆی ناسراو باگنەکرابوون، هەروەها ژمارەیەك حیزب و کۆمەڵەی عێراقی وەك حیزبی دەعوەی ئیسلامیو حیزبی کۆمۆنیستی عێراق و حیزبی بەعسی عەرەبی (سەر بەسووریا) هەرچەندە بانگکرا بوون، بەڵام هێندیکیان بەشدارییان نەکرد. هێندیکیان بەتایبەتی کۆمەڵە ئیسلامییەکان -وەك دەڵێن- خۆیان لەکۆنفرانسەکە کێشایەوە. حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق بانگنەکرابوو، هێندەك لەئەندامەکانی ئەم حیزبە لەبەر دەرگەی شوێنی کۆنفرانسەکە دەستیانکرد بەخۆپێشاندان لەدژی کۆنفرانسەکەو بەکەینوبەینێکی ئەمریکایی دایانە قەڵەم. ئەز بیرو بۆچوونم لەگەڵ بیرو بۆچوونی حیزبی کۆمۆنیستی کرێکاریی عێراق یەك نییە، بەڵام کە باسی دێمۆکراسی دەکرێ و کەسانی وەك وەفیق سامەرایی کۆنەکاسەلێسی دەستی سەدام و، سەنعان ئاغای تۆرانی دەسکەلای رژێمی ترك، دەکەنە لیژنەی "التنسيق والمتابعة"ەوە، دەبوو ئەوانیش بانگبکرانایە، چۆنکە ئەوانیش هەن.

2-بەشێکی ئەو کەسانەی کە گوایە "بێ لایەن"ن و، بۆ کۆنگرە بانگکرابوون، لەوانە بوون کە هەرچەندە خۆیان بەناحیزبی دەدەنە قەڵەم، بەڵام لە هەڵسوکەوتیاندا دیارە کە لەدڵدا سوێند بەسەری حیزبەکان دەخۆن. شایانی باسە، تاکە یەك کوردی رەخنەگر لەسیاسەتی حیزبەکانی کوردستان بانگنەکرابوو و، یەك کوردی نەتەوەیی لەکۆنفرانسدا نەبوو.

بۆ وێنە: یەك کەسی سەر بەکۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان بانگنەکرابوو. یەکێکی وەك خەباتکاری ناسراوی کورد، جەواد مەلا کە هەر لەمنداڵییەوە تائێستە بێوچان و بێهیچ چاوەڕوانییەك بۆ کورد تێدەکۆشێ، بانگنەکرابوو، ئەمە لەکاتێکدا کە هەزاران کوردی باشوور هەن کە پشتگیری کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان دەکەن. هاوبیری هێژا جەواد بەرێکەوت چاوی بەسکرتێرەکەی شەریف عەلی، واتە، عەباس قەرەغۆلی کەوتبوو و پێیگوتبوو "بانگنەکراوەو حەز دەکا بەشداریبکا وەك گوێگر"، ئەویش گوتبووی "زۆر باشە"و "خیر انشاءالله"و نێوی جەوادی دابوو بە"لیژنەی تەکنیك" (اللجنة الفنية) کە بریتی بوو لەئەندامانی "یەکێتیو پارتی"، بەڵام ئەوان جەوادیان بانگنەکردبوو، ئەمەش لەپاداشی ئەوەدا کە جەواد چەند ساڵێك هەوڵی کوژاندنەوەی شەڕی چەپەڵی نێوان پارتیو یەکێتیو ئاشتکردنەوەیانیدا، ئەو شەڕە ماڵوێرانکەرەی کە بەقسەی مام جەلال تەنێ 3000 کوردی تێدا کوژرا کە راستییەکەی لەوە پترەو تائێستەش کەس باسی ئەوە ناکا کە بەرپرسیاران و گوناهبارانی ئەو خوێنرێژیو کوردکوژییە کێ بوون؟ دەبێ ئەوەش بڵێم کە هەر بەسایەیی هەوڵ و تەقەلای هاوبیر جەوادەوە بوو کە دۆزی هەشت هەزار بارزانییە بێسەرو شوێنکراوەکان خرایە بەردەم کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان و، کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، هاوبیر جەوادیان بەتایبەتی بانگکردو مەسەلەکەیان لەگەڵ باسکردو خستیانە ئەجەندەوە.

شایانی باسە، یەك دوو کەسی سەر بەڕێبازی نەتەوەیی بانگکرابوون، بەڵام بانگێشتنەکە، یان وا درەنگ نێردرابوو بۆیان کە پێیاننەکرێ فریای کۆنفرانسەکە بکەون، یان بەرێککەوتنی لەوە پێش لەگەڵ دەوڵەتە دراوسییەکانی "هەرێمی نەفرین" بۆ ئەوەی رێنەدەن پێیان بەوڵاتەکانیاندا تێپەڕن، نەیاتوانی بەشدار بن، لەبەر ئەوە ئەوانیش ناچار بوون بەدەستی ڤالا (بەتاڵ) بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان. بەڵێ.. ئەم کارو کردارە دزێوانەش نێودەنێن "دێمۆکراسی". ئەوجا ئەگەر ئەمە سەرەتای "دێمۆکراسی"ی ئەم بەڕێزانە بێ، کە جارێ هێشتا عێراق بەدەست سەددامەوەیە، ئەی ئەگەر عێراق کەوتە دەست ئەمانە، داخوا رەنگ و تامی دێمۆکراسی چی لێ دێ؟ کورد باشیان گوتووە "مانگ هەر سەر لەئێوارێوە دیارە".
سەیر ئەوەیە کە لەکاتێکدا هەڵوێستی زلحیزبەکان بەرامبەر بەکوردی پاگژو تێکۆشەرو کەزەب شەوات (جگەر سووتاو) ئاوا دوژمنانەو ساختەکارانەیە، هەڵوێستیان بەرامبەر خەڵکانی دیکە جۆرێکی دیکەیە.
هەر بۆ وێنە: عەلیرەزا نووری زادە کە یەکێکە لەهاوکارانی هەفتەنامەی فارسی "کیهان" کە سەر بەشاپەرستەکان و نەیاری رژێمی ئێرانەو لە لەندەن دەردەچێ، بێجگە لەوەش هەڵوێستی ئەم هەفتەنامەیە هەر لەکۆنەوە بەرامبەر بە کورد دوژمنانەیە، لەژمارە (936)ی 19-2002/12/25دا لەبارەی کۆنفرانسەکەوە دەنووسێ:
"هێندەك بەعەرەبی قسە دەکەن، چەند کەسێکیش بەکوردی، بەڵام دەنگی فارسیزمانان لەهەموویان بەجۆشترە.. ئای چەند هەست بەشانازیدەکەم کاتێك دەبینم کە زۆر کەس هەر لەکوردەکانەوە بگرە کە ئامادەبوونیان لەکۆنفراسەکەدا بەرچاوە، تا دەگاتە شیعەکان، کە هەرچی چۆنێك بێ، لەرەوتی مێژوودا بەئێرانەوە بەستراون، بەفارسی قسە دەکەن.." ئەوجا دەبێژی: کاتێك کە ئاغای جەلال تاڵەبانی لەنێوان پاسەوانان و ژمارەیەك

له بەشداران و هەواڵگوزاراندا لەکۆبوونەوەکە هاتە دەرێو لەنێو ئەو هەموو خەڵکەدا دەستی منی گرت و بەهەموو لوتف و دڵپاکییەکی کوردیی خۆیەوە گوتی: "بابچینە پەنایەکەوە کەمێك دەردە دڵ بکەین، ماندوو بووم.. (ئەو دەمە) هێندێك لەهەواڵگوزارەکان پێیان وابوو کە ئەز لەهێندەك نهێنی ئاگادارم کە خەڵکی دی ئاگایان لێی نییە، بۆیە هەرچییەك روویدەدا، دەگەڕان بەدوای مندا، تا بزانن مەسەلە چییە..".
شایانی باسە، ئەم کردەوەیە لەکاتێکدایە کە سەرکردەکانی "ینك" زوو زوو سەری مەلاکانی ئێران دەدەن و لەسلێمانی کۆبوونەوەی گەورە گەورە رێکدەخەن بۆ یادی ساڵڕۆژی مردنی خومەینیو بەدرێژاییی رۆژ، پەسنی "چاکەی خومەینی بەسەر کوردەوە" دەدەن. ئەمەش ئەو سیاسەتەیە کە جارێکیان رۆژنامەنووسی لوبنانی (حازم صاغیة) لەرۆژنامەی "الحیاة"دا بەوپەڕی گاڵتەپێکردنەوە نووسی بووی: "لکل مقام مقال".
3-لەکۆنفرانسدا باسی "فیدەرالیزم" کراو، بڕیاردرا کە عێراقی دوای سەددام، عێراقێکی فیدەراڵی بێ، بەڵام بڕای بڕای باس لەوە نەکرا کە شێوەی ئەو "فیدەرالیزم"ە چۆن چۆنی بێ. فیدەرالیزم، وەك لەگەڵێك لەگوتارو سەمینارەکانی خۆمدا باسمکردووە، سیستەمێکی سنوور دیار نییە، بەڵکو جۆری زۆرە. تەنانەت دابەشکردنی وڵاتێك بەسەر چەند ستانێکدا (لیوا)و دانی مافی بەڕێوەبردنی هێندەك کاروباری سادەی بەڕێوەبەرێتی بە هەر ستانێك لەو ستانانە (وەك عێراقی سەردەمی شایەتی)، ئەوەش هەر جۆرە فیدەرالیزمێکە، کۆمارەکانی یەکێتیی سۆڤیەتی دوا بڕاو، جۆرە فیدەرالیزمێك بوون، یۆگۆسلافیای سەردەمی تیتۆو چیکۆسلۆڤاکیای پێش جیابوونەوەی چیکەکان و سلۆڤاکەکان لەیەك، جۆرێکی دیکە بوون، ئەڵمانیاو ئەمریکا هەریەکەیان جۆرە فیدەرالیزمێکە کە لەیەکناچن. ئیسپانیاو پاکستانیش هەریەکەیان

جۆرێكی دیكەیە لەباری سیستەمی فیدەرالیزمەوە. كەواتە، فیدەرالیزم پێوەندیی بەجۆری رێككەوتنەوە هەیە لەنێوان دەسەڵاتی نێوەندیو دەسەڵاتی هەرێمیدا. ئەوجا لەكاتێكدا كە رادەی ئەو دەسەڵاتەو، سنووری ئەو خاكەی كە ئەو دەسەڵاتە دەیگرێتەوە، هەر لەئێستاوە بۆ باشووری كوردستان دیارینەكرێ‌و، كار بخرێتە پاش رووخانی سەددام و، بڕیاردان لەسەر ئەوەش بەگشتپرسیی هەموو "گەلانی عێراق" بێ، نەك بەدەستی كورد خۆی بێ، ئەوا با هەر لەئەوڕۆوە "فاتیحا"ی "فیدەرالیزم" بخوێنین و، وا گەڕاینەوە سەر سفرو سفر بەدەستەوە.

وادیارە مێژوو دووبارە دەبێتەوە، كاتی خۆشی (سەرەتای ساڵی 1970) كە چەند كۆنە زوڕناژەنێكی رژێمی تیرۆریستی سۆڤێت، وەك "قسەكەر"ی شۆرشی ئەیلوول، كەوتنە وتووێژ لەگەڵ رژێمی بەعسی لەبەغدا، ئەوەبوو نەباسی كەركووك و نەباسی گوێڕو مەخموورو مووسڵ و خانەقین و كووت و، نە باسی فەیلییەكانیان لەگەڵ بەعسییەكان برێنرانەوە، هەروەها "نوێنەری شۆڕش" پێیان لەسەر ئەوەش دانەگرت كە عێراق بەشێك نییە لەنەتەوەی عەرەب و، دەبێ دەستووری عێراق بگۆڕدرێ، بەڵكو كارەكەیان بەنیوە ناتەواوی بەجێهێشت و، هێنانەدی "ئۆتۆنۆمی"یەكەشیان خستە پاش چوار ساڵ. ئەنجامی ئەم "دەمخواری"یەی "نوێنەرانی شۆڕشی كورد" ئەو هەرەسە گەورەیە بوو كە تووشی شۆڕش و، ئەو چارە ڕەشییە بوو كە تووشی نەتەوەی كورد بوو. وادیارە چارەنووسی كورد هەر ئەوەیە كە هەموو جارێك و، پاش ئەم هەموو قوربانییە، وەك "كورتانەكەی جەجاڵ" سەر لەنوێ بیدوورێتەوە، بەڵام داخی گەورە ئەوەیە ئەو "كورتانە" هەموو جارێك بەدەستی دەستڕۆیشتووان دەدڕێنرێ‌و بەدەستی ڕەشووڕووت و هەژاران و ژنانی لێقەوماوی كورد دەدوورێتەوە. ئەمەش ئەگەر بیتۆ ئەو "كورتانە" ئەمجارە جێی دەرزیلێدانی پێوە مابێ.

4-حیزب و کۆمەڵ و سیاسەتکارانی کورد، پاش ڕێککەوتنی 11ی مارتی 1970 کەوتنە چەپڵەڕێزان بۆ ئەو ڕێککەوتنە کە بەسەر سەرکردەی شۆڕش، بەهەشتی مەلا مستەفای بارزانیدا سەپێندرا. تاکە ڕێکخراوێکی کورد کە گومانی خۆی بەرامبەر بەو ڕێککەوتنە خستەڕوو "یەکێتیی نەتەوەییی خوێندکارانی کورد لەئەوروپا" (نوکسە) NUKSE بوو کە لەرۆژنامەکەیدا "کوردستان ئینفۆرماسیۆن" لێیدوا. ئەو رۆژنامەیە بەزمانی ئەڵمانیو بەسەرنووسەریی هاوبیری خەباتکار، ئەندازیار بروسك ئیبراهیم دەردەچوو. وەك گوتم، ئەنجامی ڕێککەوتنەکەی 11 مارتی حەفتا، دیمان چۆن بوو. ئێستەش مرۆڤی هەڵمەتەکاسەو حیزبحزێینەکەر کەوتۆونەتە ماشەو هووشەو هەڵدانی ئەنجامە "باشەکان"ی ئەم کۆنفرانسەی لەندەن. خۆ ئەگەر بەهوردی لێکیبدەینەوە، ژێرکەوتنێکی گەورەیە بۆ کوردو سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ تۆرانیزم و داگیرکەرانی کوردستان، چۆنکە ئەگەر ئەمریکا پەلاماری عێراق بدا، دیارە وەك ئەمریکاییەکان خۆشیان دەبێژن، سەیرانێك نابیّ، نە بۆ ئەمریکاو نە بۆ کوردو نە بۆ خەڵکی عێراق، بەڵام ترك دەبنە ئاغای باشووری کوردستان. ئەوەتە سەفیری ئەمریکا لەئەنقەرە بەئاشکرا گوتی: "ئەمریکا ڕێنادا بەکورد کە لەباکووری عێراقدا دەوڵەتێکی کوردی دروستبکەن، ڕێنادا بەکورد کەرکووك بخەنە سەر هەرێمە ئۆتۆنۆمییەکەیانەوە. ترکمانەکانی کەرکووك کە زۆرینەی خەڵکی کەرکووکن (ئاوا!)، مافیان دەپارێزریّو لەحکوومەتی نێوەندییدا دەسەڵاتیان دەبیّ. نەوتی کەرکووك بەدەست حکوومەتی نێوەندییەوە دەبیّ، عێراق یەك دەوڵەتی یەکتا دەبیّو کورد لەنێو عێراقدا دەمێننەوە". (ئەم قسانە لەرادیۆی "العراق الحر"ەوە، کە رادیۆیەکە بەپارەی ئەمریکا دەچیّ بەڕێوە، بەهۆی پەیامنێرەکەیەوە

لەئەنقەرە کە ترکمانێکەو نێویاننناوە "جان لوتفی" لەڕۆژی 12/21دا بڵاو کرایەوە).
ئەوجا ئێستە ئەگەر کەرکووکی کوردستان، سەددام بیکا بەعەرەبستان، یان ڕژێمی ترك و سەنعان ئاغای دەسکەلای ترك بیکەنە تۆرانستان، جیاوازی بۆ کورد چییە؟ کورد باشیان گوتووە: "بۆ کوردی هەژار، چ گورگ و چ سولر"!. شایانی باسە، یەکێك لەبڕیارەکانی کۆنفرانسی لەندەن ئەوەیە کە "بەرژەوەندیی دەوڵەتەکانی دراوسێیی عێراق"، واتە بەرژەوەندیی دەوڵەتانی ترك و فارس و عەرەب بپارێزدرێ، باشە پاراستنی ئەم بەرژەوەندییە لەسەر حسێبی کێ دەبێ بێجگە لەکورد؟
5-نوێنەرانی دوو زلحیزبە کوردییەکە، چەند جارلەکۆنفرانسەکەدا گوتیان "کورد دەوڵەتی ناوێ و هیچ کوردێك نییە بیر لەدەوڵەتی کوردی بکاتەوە". ئەم قسەیەش لەهەموو شوێنێك بەبۆنەو بێ بۆنە دەکەن. ئەمەش بەڵگەیەکی بەهێزە بۆ ئەوەی کە ئەوان باوەڕیان بەدیمۆکراسی نییە، چۆنکە ئەوان تەنێ مافی ئەوەیان هەیە بەنێوی حیزبی خۆیانەوە قسە بکەن، نەك بەنێوی نەتەوەی کورد، یان خەڵکی باشووری کوردستان، یان خەڵکی "هەرێمی نەفرین"ەوە. ئەگەر دەفەرموون "کورد دەوڵەتیان ناوێ" و دەیانەوێ پاش یانزە ساڵ سەربەستیو جیابوونەوە لەرژێمی دەستوەشێنی عێراق، جارێکی دی بچنەوە نێو قەفەسە هاسنینەکەی عێراق، دەبا بفەرموون گشتپرسییەکی ئازاد لەو هەرێمەدا داخۆیانیبکەن، تابزانین خەڵکی ئەو هەرێمە چیاندەوێ. چەند جار ئەم گشتپرسییە لەلایەن کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستانەوە داواکراوە، بەڵام لەلایەن زلحیزبەکانەوە گوێنەدراوە پێی و، ئەوەش بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە باوەڕیان بەدیمۆکراسی نییە، بەڵکو خۆسەپاندن لەڕێی دەستدرێژیی میلیشیا چەکدارەکانیانەوە.

ئەز بەش بەباری خۆم، باوەڕ ناکەم کوردی "هەرێمی نەفرین" بیانەوێ بچنەوە نێو ئەو قەفەسە، چۆنکە هیچ گەرەنتییەك نییە کە جارێکی دیو، چەند جاری دی، کورد ئەنفال نەکرێنەوەو خاکەکەیان نەکرێتە عەرەبستان و گەلکوژی نەکرێ لێیان. ئەم "یەکێتیی عێراق"ەی کە زلحیزبەکان شانازیدەکەن پێوەی، هۆی بنچینەیی هەموو جۆرە کوێرەوەییەکە کە حەفتا ساڵێکە لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوە بەسەر کوردی باشوور هێنراوە، ئەوەش هەر پێوەندیی بەرژێمی بەعسەوە نییە. بەعەرەبکردنی کەرکووك، لەسەردەمی شایەتییەوە دەستیپێکرد، کاتێك رژێمی شایەتیی عەرەبی هێنایە حەوێجەو نێوچەی بارزانی بۆمبابارانکردو چوار ئەفسەری کوردی لەسێدارەداو شێخ مەحموودی شای کوردستانی بەمردوویێتی دایە بەرگوللە، لەکاتی بەخاك سپاردنیدا لەلایەن جەماوەری کوردەوە. رژێمی قاسم بوو کە لە1961ەوە تارۆژی کوشتنی بەدەستی بەعسییەکان و ناسرییەکان (1963/2/8) لەشکرەکەیو جاشەکانی لەکوردستاندا کوردیاندەکوشت. ئێمە ئەمانەمان لەبیر نەچووەتەوە. عێراق دەوڵەتێکی دەستکردی بەریتانیایە، تەنانەت وەزیری دەرەوەی بەریتانیا جاك سترۆ، ماوەیەك لەمەوبەر دانی بەوەدانا کە دروستکردنی عێراق هەڵەیەك بووە، دەوڵەتەکەی وی کردوویەتی، بەڵام زلحیزبەکانی کورد ئەو "هەڵە"یە، کە لەڕاستیدا تاوانێکی گەورەیە، بەپیرۆز دادەنێن.

6-هیچ دەوڵەتێکی عەرەبی، بێجگە لەکوێت، نوێنەری خۆی نەناردبوو بۆ کۆنفرانسەکە. کوێتیش لەبەر ئەوە نوێنەرێکی ناردبوو، چۆنکە سەددام، چەند رۆژێك بەر لەبەستنی کۆنفرانسەکە هەڕەشەی لەکوێت کردو، خەڵکی کوێتی هاندا کە دەستبوەشێنن لەکاربەدەستانی حکوومەتەکەیان و، ئۆباڵی پەلاماردانە سەر کوێتی خستە ئەستۆی حکوومەتی کوێت، ئاشکرایە هەموو دەوڵەتە عەرەبییەکان (کوێتیش لەنێو ئەوانەدا) عێراق

بەولاتی عەرەب دەزانن و، لەدژی ئەوەن کە کورد هیچ جۆرە هەرێمێکی بکەوێتە دەست، تا فەرمانڕەوایی بەسەرەوە بکا. هەموویان باسی "یەکێتیی خاکی عێراق"و "دەوڵەتی عێراق"و "گەلی عێراق"و "حکوومەتی عێراق" دەکەن و، بێجگە لەکوێت (ئەویش پاش هەڕەشەی سەددام)، هەموویان لەگەڵ ئەوەن کە سەددام بمێنێ و، ئەمریکا دەستنەوەشێنێ لێی و، هێندێکێشیان وەك سەرکردەی یەمەن، عەلی عەبدوڵلا سالح، بەئاشکرا دەبێژێ "سەددام بووە بەنیشانە (رمز)ی عێراق و گەلەکەی"و، هەروەها گوتی "دەبێ کۆمەڵەی دەوڵەتە عەرەبەکان" بەیەك دەنگ بێژن "نامانەوێ پەلامار بدرێتە سەر عێراق"، "نامانەوێ دەوڵەتۆچکە دروستببێ" (کە دیارە مەبەست لەدەوڵەتۆچکە کوردستانە).

7-ئامادەبوونی نوێنەری جۆرج دەبلیو بوش، واتە دوکتۆر خەلیل زەلمای لەکۆنفرانسەکەدا، هەلێکی زۆر باش بوو بۆ زلحیزبە کوردییەکان کە هێندەك شتی زۆر گرنگ کە لەتاریکیدان رۆشنبکرێنەوە، بۆ وێنە: ئایە ئەمریکا گەرەنتی دەدا بەکورد کە لەشکری ترك نەیەتە باشووری کوردستانەوە، لەکاتێکدا کە ئەمریکا پەلاماری عێراق بدا؟ ئایە ئەمریکا ئامادەیە رێ بەدەوڵەتی ترك نەدا، دەستبخاتە کاروباری نێوخۆیی عێراقەوە؟ ئایە ئەمریکا چ دەورێك دەدا بەکورد لەکاتی پەلاماردانی عێراقدا؟ ئایە ئەمریکا ئامادەیە بەر لەپەلاماردانی عێراق، خەڵکی باشووری کوردستان رەخت (تجهیز) بکا بە دەمامۆك (کمامە)و دەرزی دژی نەخۆشییەکان (وەك ئاوڵەو گرانەتیو رەشەگرانەتیو.. هتد)و چەکی مۆدێرن بدا بەچەکدارەکانی کوردو، پەناگەیان بۆ ئامادە بکا بۆ خۆشاردنەوە لەکاتی جەنگدا؟ کە ئەمانە تائێستە هیچیان نەکراون و نەکردنیان دەبێتە هۆی قڕکردنی هەزاران و سەت هەزاران کەس لەکاتی جەنگدا. ئاشکرایە کەسێك لەحیزبییەکان دەمی هەڵنەپچڕا پرسیارێکی

وابكا. ئەوجا ئەگەر لەشكرى ترك، يان تۆرانييەكانى دەسكەلاى لەنێو تركمانەكاندا بكەونە كوشتارى كورد، ئەوا زۆر دوور دێتە بەرچاو كە ئەمريكا لەوەدا دژى ترك بوەستێ. ئەوەتە سالآنى ساڵە لەشكرى ترك لەباكوورى كوردستاندا كورد دەكوژێ بەنێوى "بەربەرەكانێى جيابوونەوەخوازى"يەوەو ئەمريكاش لەهەموو بارێكدا هەر لەسەر ترك دەكاتەوە. شايانى باسە لەمڕۆژانەدا لەئەورروپا باسى فليمێكى بەڵگەدار (وثائقي) دەكرێ كە رۆژنامەوانى ئيـرلـەنـدەيى جێمى دۆران JaimieDoran لەئەفغانستان گرتوويەتى و ئەوە پێشاندەدا كە سەربازانى ئەمريكايى ئاگايان لەوە هەيە كە هەزاران ديلى تاليبانەكان لەلايەن رەشيد دۆستەمى هەڤاڵبەندى ئەمريكاوە كوژراون. ئەم ديلانە لەمانگى نۆڤەمبەرى 2001دا، هێندێكيان لەكاتى گواستنەوەياندا بۆ گرتووخانە لەڕێ مردن و، ئەوانى ديكەش گوللەباران كران و، هەمووشيان پێكەوە لەگۆڕستانێكدا كران بەژێر خۆڵەوە بەبەرچاوى سەربازانى ئەمريكايەوە. ئەم فليمە لەلايەن تەلەڤزيۆنى ARDى ئەڵمانييەوە رۆژى 12/16و كاتى 21:55 پێشەندرا. ئەگەرچى ئەمريكاييەكان گوتيان ئەمە درۆيەو بوختانە، بەلآم ئەو فليمە شتێكە هەيە. شايانى باسە كە رەشيد دۆستوم تركى ئۆزبەكييەو لەلايەن رژێمى تركەوە يارمەتيدراوەو دەدرێ. هەر لەم رۆژانەدا، ئەحمەد چەلەبى لەئەنقەرەيەو دەيەوێ لەشكرى ترك بباتە باشوورى كوردستانەوەو بە پشتگيريى لەشكرى ترك ببێتە سەركۆمارى عێراق، ئەوە لەكاتێكدا كە سياسەتكاران و كاربەدەستانى كورد، بەدەم دژى هاتنى لەشكرى تركن بۆ باشوور، بەلآم مام جەلال دەبێژى "دژى ئەوە نييە لەشكرى ترك لەسنوورى پەيمانێكى نێو نەتەوەييدا بكشێتە عێراقەوە"، چۆنكە "تركيا" بەقسەى مام جەلال "دەوڵەتێكى دۆستە". سەير ئەوەيە لەشكرى ئيسرائيليش دەيەوێ لەگەڵ لەشكرى ترك بەشداريبكا بۆ "بەربەرەكانێى

تیرۆریزمی ئیسلامی" و "جیابوونەوەخوازیی کورد" لە"باکووری عێراقدا".

8-لەکۆنفرانسەکەدا باسی مافی ژن و رۆڵی ژن و دواڕۆژی ژن لەکۆمەڵگەی کوردستان و عێراقدا بەشێوەیەك نەکرا کە ئەوە دەربخا کە کۆمەڵگەی دواڕۆژی پاش سەددام، هەر کۆمەڵگەی پیاو نابێ، بەڵکو کۆمەڵگەی ژن و پیاو دەبێ. ئەمەش پەڵەیەکی رەشە بەنێوچەوانی هەموو ئەوانەوە کە کۆنفرانسەکەیان بەڕێوەبرد.

9-لەکۆنفرانسەکەدا باسی ئەو تاوانانە کرا کە لەلایەن رژێمی عێراقەوە بەرامبەر بەگەلی کوردو عێراقییەکان کراوە، بەڵام هیچ لیژنەیەك پێکنەهێنرا بۆ دواکەوتنی نەخشەی دانی ئەو تاوانبارانە بەدادگەیەکی نێودەوڵەتان. دیارە ئەمەش لەکەسانێك چاوەڕواننەکرێ کە شایەتی بدەن بۆ نزار خەزرەجی کە "ئاگای لەگەلکوژیی کورد نەبووە و"وەفیق سامەڕایی" بە "دۆستی خۆیان" بزانن و بیخەنە لیژنەی "تنسیق ومتابعة"وە، هەروەها باسی ئەو کارگەو دەزگە ئەوروپاییانەش نەکرا، کە لەدروستکردنی چەکی کۆمەڵکوژدا یارمەتیی سەددامیان داوە. بەپێی ئەو بەڵگەنامانەی کە رژێمی سەددام ناردوویێتی بۆ کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، (80) کارگەی ئەڵمانی لەم یارمەتیدانەدا بەشدار بوون. نوێنەرانی زلحیزبەکان زوو زوو دەچنە لای کاربەدەستانی ئەڵمانیا، بەڵام هیچ کامێکیان ئەوەیان بەخەیاڵدا نایەت یارمەتیی سەتان کۆڵەواری چەکی کۆمەڵکوژ بدەن بەوەی پارێزەر (محامی) رابگرن بۆیان و کێشەکە بگەیەننە دادگەو، داوای قەرەبوو کردنی ئەو زیانە بکەن کە لەکورد کەوتووە. دیارە مردووەکان زیندوو ناکرێنەوە، بەڵام ئەڵمانیا دەتوانێ بەرامبەر بەوە زانستگەیەکی تەکنیکی لەکوردستاندا دابمەزرێنێ و بودجەی تایبەتی ببڕێتەوە بۆی تا 25 ساڵ و، هەموو ساڵێك هەتا دە ساڵ، سەت خوێندکاری کورد

لەزانستگەکانی ئەڵمانیادا وەربگرێ بۆ خوێندن بەپارەی دەوڵەتی ئەڵمانیاو پارەیەکی باش بدا بەکۆڵەوارەکان و کەسوکاری کوژراوەکان. یەکێتی و پارتی هەردووکیان لەئەڵمانیا نوێنەریان هەیە، ئەرێ بەڕاستی ئەوانە چ دەکەن؟

ئا لەم ڕۆژانەدا کە لەشکری ئەمریکا بەهەڤاڵبەندێتی ڕژێمی ترك خۆی تەیار دەکا بۆ پەلاماردانی عێراق لەڕێی باشووری کوردستان و کوێتەوەو، زستانیش وا لەبەر دەرگە بەخۆیو سەهۆڵبەندانییەوە، مەترسیی ئەوە هەیە کە کۆمکوژییەك و گەلڕەوێکی دیکە بەسەر کورددا بسەپێنری. خەڵکی سادە هەموو چاوەڕوانی ئەوەیاندەکرد کە کۆنفرانسی لەندەن، هیچ نەبێ، ڕێو شوێن دابنێ بۆ کەمکردنەوەی ئەو مەترسییەو مسۆگەر کردنی دواڕۆژێکی خۆش بۆ ئەوانەی لەدەم گورگی هاری جەنگ رزگاریان دەبێ، بەڵام بەداخەوە کۆنفرانسی "بەرهەڵستکارانی عێراقی" لەلەندەن، وەك لەلایەن مرۆڤی کارزانەوە پێشبینیدەکرا، خۆڵ و دۆیەك بوو، بەدەستی کورد خۆی، کرا بەسەر نەتەوەی کورددا. ئاهوڕامەزدا نەتەوەی کوردو کوردستان بپارێزێ.

بەرلین 2002/12/22

**میدیا**، ژ 139، 2003/1/1

## ((ئەی گەلی رووت و برسی، لە زۆرداران نەترسی، بێژە بەخاوەن کورسی، رێ چۆڵکەن بۆ گشتپرسی))

لەژمارە (139)ی رۆژی 2003/1/1ی "میدیا"دا باسی کۆنفرانسی لەندەنم کرد کە بەرهەڵستکارانی عێراقی بەپشتگیریی دوو زلحیزبە کوردییەکە سازیانکرد. هەروەها ئەنجامە زیانبارەکانیشیم بێپەردە خستە بەرچاو. شایانی باسە، هێشتا چلەی کۆنفرانس تێنەپەڕیوە، ئەوەتا لە گەلێك لاوە دەنگی ناڕەزایی و رەخنەگرتن لەکۆنفرانس بەرزبووەتەوە. کورت و کرمانجی، نە ئەو لایەنانەی کە دوو زلحیزبە کوردییەکە دەیانویست رازییانبکەن، رازیبوون،و نە بۆ دواڕۆژی کوردیش خاڵێکی ئەرێنی (ایجابی) خرایە سەر کاغەز کە مافی کورد، راستوڕەوان و بێگرێوگۆڵ، جێگیر بکا.

کۆنفرانسی لەندەن بە پاشگەزبوونەوەی دوو زلحیزبەکەو دەستهەڵگرتنیان (تنازل) لە چەند داخوازییەکی بنچینەییی کورد، کەوتە سەر پێ، وەك بەڕێز سامی عەبدولڕەحمان ئازایانە دانیپێدانا. تاکە بابەتێك کە پێوەندیی بەکوردەوە هەبوو، خاڵی "فێدەراسیۆن" بوو، کە لەکۆنفرانسەکەدا، بە "ئارەزووی دڵ و ئاواتی کورد" دانرا،و کۆنفرانس "رێزی خۆی" بەرامبەر دەربڕی، نەك بەمافێکی رەوای کورد کە بەرهەڵستکارانی عێراقی "پەسند"یان کردبێ،و دەستەبەربووبن بەوەی لەدەستووری هەمیشەیی عێراقی پاش سەددامدا بیچەسپێنن. سەیر ئەوەیە لەنێو بەشدارانی کۆنفرانسدا، کەسانی وای تێدا هەبوون کە قانوونیان خوێندووە، وەك بەڕێزان دوکتۆر نوری تاڵەبانی و مام جەلال تاڵەبانی، کە دیارە دەزانن کە "رێزگرتن"و "پەسند کردن" (قبول) لەباری قانوونییەوە زەوی‌و ئاسمان دوورن لەیەکەوە. بێجگە لەمەش سپاردنی مافێکی وای کورد، بەدەنگی

سەرجەمی دانیشتووانی عێراق کە زۆربەیان ناکوردن، ئەنجامەکەی هەر لەئێستەوە دیارە کە ناهومێدیو رەنجەڕۆییە.
ئەوەی راستی بێ، ئێمە لەسەردەمێکدا دەژین کە کۆمەڵگەی کوردەواری تووشی سەرلێشێوانێکی یەکجار خراپکراوە. لەلایەکەوە، بەدەم هاوار دەکەین لەدەست ئەنفال و چەکی کیمیایی و بەعەرەبکردنی کوردستان، کەچی لەلایەکی دیکەوە، رۆژی لەدایکبوونی ئەو هێزە خوێنرێژە تاوانبارە دەکەین بەجێژن کە دەوری سەرەکی گێڕاوەو دەگێڕێ لەداگیرکردنی باشووری کوردستان و کوژاندنەوەی هەموو شۆڕشەکانی کوردو ئەنفالکردن و بەعەرەبکردنی کوردستان و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی و کوشتنی زارۆی کوردو سوکایەتیکردن بەرەشوڕووتی کوردو دەستدرێژیی بۆ ناموسی ژنانی کورد، لەمەش پتر دەبینە شایەت و پارێزەر (محامی)ی سەرکردەی سوپای عێراق "نزار خەزرەجی"و پاکانە دەکەین بۆیو دەبێژین "ئاگای لەئەنفال و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی نەبووە".
لەلایەکەوە، باسی سەربەستی رادەربڕین و دێمۆکراسی دەکەین و، لەلایەکی دیکەوە، زۆر بەسەختی دەچین بەگژ خوێندکارانی زانستگەدا کە داوای بچووکترین مافی خۆیاندەکەن، وەك کەڵکوەرگرتن لە کۆمپیوتەرو سنووردانان بۆ ئەو مامۆستایانەی کە کۆنەبەعسی بوون و، لابردنی هێندەك نەریتی دەوری بەرد، وەك دوورخستنەوەی خوێندکارانی کوڕو کچ لەیەك و، دوانەخستنی مانگانەی خوێندکاران.
لەلایەکەوە، باسی پاراستنی فەرهەنگ و ئاسەوارە مێژووییەکانی کوردستان دەکەین، بەڵام خانە سووتاوی سلێمانی کە شوێنەواری دەوڵەتی بابانە دەڕووخێنین، باسی مافی ژنان دەکەین، بەڵام بەڕۆژی نیوەڕۆ ژنان دەکوژرێن و لەسەریان هەڵنادەینێ، باسی مافی هەژارو رووتە

دەکەین، بەڵام خۆپێشاندانی هێمنانەی خاوەن گالیسکە (عەرەبانچی)کانی سلێمانی بەوپەڕی توندوتیژییەوە سەرکوت دەکەین.
لەلایەکەوە، باسی ڕای گشتیی گەل دەکەین و لەلایەکی دیکەشەوە، ڕووناکەینە گەل لەرێی دەنگوەرگرتنێکی گشتییەوە، تابزانین خەڵکی هەرێمی نەفرین لەم ڕۆژە نازکە چڕو پڕەدا چییاندەوێ، پەرلەمانێکمان هەیە شەش ساڵە وەك ئینگلیزەکان دەبێژن "ئێکسپایەر" بووە، کەچی هەڵبژاردنێکی نوێ ناکەینەوە، تابزانین جەماوەری گەل، کێیان بەدڵە بۆ پەرلەمانی تازە.
لەلایەکەوە، هەزار سوێند دەخوێن کە جارێکی دیکە شەڕ بەیەکدی نافرۆشین و تفونەحلەت لەهەموو تێکبەربوونێکی نێوخۆیی دەکەین، کەچی هەتا ئێستەش میلیشیاکانمان نەکردووە بە لەشکرێکی یەکگرتوو بەسەرکردەیی جەنەڕاڵێکی سەربەخۆی نەتەوەیی.
لەلایەکەوە، باسی دەستووری بنچینەیی کوردستان دەکەین، کەچی تائێستەش، دوو حکوومەتمان هەیەو نوێنەرانی هەردوولا لەدەرەوەی وڵات هەریەکە بەنێوی زلحیزبێکەوە قسە دەکا، نەك بەنێوی حکوومەتی کوردستانەوە، کەچی گلەییش دەکەین کە بێگانە داننانێ پێماندا.
باسی کوردو کوردستان و زۆرداریی ڕژێمی بەعس دەکەین، کەچی پەرتۆکی قوتابخانەکانمان هی سەردەمی سەددامن و، زۆریان وێنەکەی سەددامیان پێوەیەو، هێندەك لەو پەرتۆکانە بۆ منداڵی عەرەب نووسراون، کەچی دەکرێن بەگەرووی منداڵی کورددا.
یانزە ساڵە حکومەتین، کەچی تائێستە پۆستەیەکمان بۆ دەرەوە نییە. هەتا ئێستە نەمانتوانیوە کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان و، تەنانەت دەوڵەتی ئەمریکاو بەریتانیا کە لەگەڵێك ڕووەوە بەرژەوەندییان لەگەڵ بەرژەوەندیی نەوڕۆی کورد یەکدەگرێتەوە، دابینبکەین، ڕێی پۆستەیەکی دەرەوە بکەنەوە بۆمان و فڕگەیەك لەکوردستاندا دابمەزرێنن.

ئا لەم رۆژەدا کە ئەمریکاو بەریتانیا هەتا هەندازەیەك دۆست و دوژمنی خۆیان ناسیوەو سەنگ و سووکی "هەڤاڵبەندەکان"ی خۆیان لەرۆژی تەنگانەدا، کێشاوە، باشتر نەبوو لەباتی ئەوەی کۆنفرانسی لەندەن بکەینە دوانگەیەك بۆ ئەوەی لەهەموو جیهاندا بلاوییبکەینەوە کە کورد ئەم سەربەستیەی ئەورۆ لەکوردستاندا هەیانە، نایانەوێ و، لەعەرەبی تکریت و سامەڕا عێراقیترن، هەوڵی ئەوەمان بدایە ئەمریکاو بەریتانیا رازیبکەین بەوەی پەیمانێك ببەستن لەگەڵمان، یان هیچ نەبێ گشتپیرسییەکمان بکردایە لەو سێ لیوایەدا، تابزانین ئایە کورد بەراستی دەیەوێ جارێکی دی بەعێراقەوە بنووسێنرێ، یان دەیەوێ ئەگەر هەر چاری نەما، ببێتە پرۆتێکتۆرات (محمية)ێکی کۆمەڵەی نەتەوە یەککرتووەکان، وەك ئەنجامی راپرسییەکی سەرەتایی لەهەولێرو زاخۆ پێشانیداوەو، ماوەیەکی درێژ لەمەوبەریش باسمکردووە.

ئەوانەی دڵسۆزی کوردن و بەتەنگ دواڕۆژی خەڵکی کوردستانەوەن، دەبێ زەوی خۆشبکەن بۆ گشتپرسییەك لەو 3 ستانە (لیوا)داو هەر لەو کاتەشدا سەرژمێرێك بۆ دانیشتووانی "هەرێمی نەفرین" بکرێ، چۆنکە کە شەڕ قەوما، یان بەهۆی کودەتایەکی ناکاوییەوە باری عێراق هاتە گۆڕان و، دەسەلاتێك هاتە پێشەوە کە بەدڵی داگیرکەرانی کوردستان و ئەمریکاو دەوڵەتانی رۆژاوا بوو، ئەو دەمە کێشەی کورد گوێ شلناکرێ بۆی، ئەوڕۆش رۆژی چوونەوە چیاو شەڕی میلیشیا نییە، چۆنکە، نە گەلی کورد جارێکی دی ئامادەی دروونەوەی کورتانەکەی جەجاڵەو، نەهەلومەرجی نێوچەیی و نێودەوڵەتانیش رێی ئەو کارانە دەدەن و، ئەو حملە رەشوڕووتی کورد دەکەونەوە رەوکردن و دەبن بەناردی نێو درك. لەبەر ئەوە باشترین شت لەم رۆژەدا گشتپرسییە، گشتپرسی.

**میدیا**، ژ 141، 2003/2/1

2003/1/26

# ئاگری سۆری جەنگ و هەرزانفرۆشی کورد

ئاگری سۆری جەنگ وا لەبەر دەرگەی کوردستان بڵێسەی دێو، جیهان بووە بەدوو بەشەوە: بەشێکی "بەرەی جەنگی دژ بە سەددام" بەسەرکردەیەتیی ئەمریکاو بەریتانیاو، بەشێکیشی، گوایە "بەرەی ئاشتی" بەسەرکردەیەتیی فەڕەنساو ئەڵمانیاو رووسیاو چین. بەرەی گوایە "ئاشتی" دەڵێن: "ئەمریکا مەبەستی لەم جەنگە ناڕەوایە، دەستگرتنە بەسەر نەوتی عێراقدا". بەڵام کورتە سەرنجدانێکی رابوردوو و ئێستەی دەوڵەتانی فەڕەنساو ئەڵمانیاو رووسیاو چین، بەسە بۆ ئەوەی باوەڕ بەوە بهێنین کە ئەم رژێمانەی ئەوڕۆ خۆیانکردووە بە "کۆتری ئاشتی"، هەر ئەو رژێمە هەڵمەتە کاسەو بێڕەوشت و چاوچنۆکانەن، کە بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی ئابووریی خۆیان، ساڵانی ساڵ سەددام و رژێمە تێرۆریستەکەیان بەهەموو جۆرە چەکێکی قڕکەر پڕ چەك کردووەو، چاویان لەوە پۆشیوە کە رژێمی سەددام، بە بەر چاوی هەموانەوە، ئەنفالی لەکورد کردووەو، هەڵەبجەو سەردەشت و بادینان و زەردیئاوا (قەراخ)ی کیمیابارانکردووەو، نیو ملیۆن کوردو، یەك ملیۆن عێراقی و ئێرانی و کوێتیی کوشتووەو، ملیۆنێك کوردو دوو ملیۆن عێراقی دەربەدەر کردووەو، چوار هەزار گوندی کوردستانی لەگەڵ زەوی تەختکردووەو، هەر کەسێکیش کەمە رەخنەیەکی لێگرتبێ، یان زمانی بڕیوە، یان گوێی بڕیوە، یان چاوی هەڵکوڵیوە، یان دەستدرێژیکردووەتە سەر ناموسی خۆی‌و کەسوکاری، یان بەجۆرێك لەنێوی بردووە. بەڵام ئەوڕۆکە ئەمریکا هاتووەتە سەر ئەوەی کە لەمانی سەددام و رژێمەکەیدا مەترسییەکی گەورە بۆ خۆیان دەبینن و، ئەم هەڵوێستەشیان لەهێندێك رووەوە لەگەڵ بەرژەوەندیی کوردو خەڵکی عێراق یەکدەگرن، ئەوەتە دەوڵەتانی بازرگانیکەر لەگەڵ سەددام، کەوتوونەتە باسی "ئاشتی و ئاشتیخوازی"!و

"گوێڕایەڵیی" بڕیاری "کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان" -ببوورن- دەوڵەتە یەکگرتووەکان، وەك ئەوەی سەددام لەماوەی پانزە ساڵدا (17) بڕیاری دەوڵەتە یەکگرتووەکانی ژێر پێ نەخستبێ! سەیر ئەوەیە، وەزیرەکانی فەڕەنساو ئەڵمانیا دەفەرموون کە "مافی گۆڕینی ڕژێمی عێراق بەدەستی ئەمریکا نییە، بەڵکو بەدەستی گەلی عێراق خۆیەتی". بەڕاستی فەڕەنساییەك و ئەڵمانییەك، دەبێ زۆر ڕوویان قایم بێ، کە لەم قسەیە شەرمنەیانگرێ، ئەگەنا، گەلی ئەڵمانیا نەبوو کە ڕژێمی هیتلەری ڕووخاندو، گەلی فەڕەنساش نەبوو کە لەشکری هیتلەری لەفەڕەنسا دەرکرد، بەڵکو لەشکری ئەمریکاو بەریتانیاو هەڤاڵبەندەکانیان بوون کە ڕژێمی ئەڵمانیای نازییان ڕووخاندو سەربەستییان بەگەلانی ئەڵمانیاو فەڕەنسا بەخشی، کە ئەوەتە ئەوڕۆ پاداشی ئەو کارە وەردەگرنەوە.
خۆش ئەوەیە، ئەوڕۆ هەردوو بەرەکە، دەستیانکردووە بەجنێودانبەیەك. وەزیری بەرگریی ئەمریکا ڕۆناڵد رامسفیلد بەرامبەر هەڵوێستی فەڕەنساو ئەڵمانیا، گوتی: ئەم دووانە "نوێنەری ئەورووپای کۆنن، نەك ئەورووپای نوێ". لەوەرامی ئەمەدا خانمە وەزیری دەرووبەر، لەکابینی شیراکدا گوتی: "ئەز خەڵکی ئەو شارەم کە جەنەراڵ کامیرۆن تێیدا لەدایکبووە. ئەز هەر قسەکەی وی دووبارە دەکەمەوە". ئەم جەنەراڵ کامیرۆنە سەرکردەیەکی سوپایی بوو، لەشکرەکەی ناپلیۆن لەشەڕی واتەرلوودا. کە فەرمان هاتووە بۆی، خۆیو تیپەکەی بدا بەدەستەوە، تەنێ یەك وشەی دەربڕیوەو گوتوویەتی: "گوو"! خۆزگە خانمی وەزیری شیراك، ئەو قسە نەستەقەی کوردی بزانیبایە، کە دەڵێت، "مەلێك هەیە هەردوو چاوی کوێرەو قاچێکیشی شەلەو ساڵی جارێکیش دەخوێنێو کە خوێندی، دەبێژی: "گوو"!".

بێجگە لەمەش، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، وەك ئەوەی بووبێتە "مۆدە"، لەهەموو جیهاندا خەڵك، بەزۆری ئەوانەی خۆیان بە چەپی دەزانن و، بەیادی ئەو سەردەمەی کە "چەپییەکان" چەپڵەیان بۆ "ئاشتیخوازی"ی ڕژێمی سوڤێت و "چینی گەلێر" لێدەدا، بەهەزاران و هەزاران دێنە سەر جادەو داوای "ئاشتی" دەکەن، گوایە بۆ پاراستنی "گەلی عێراق"و "منداڵانی عێراق"، وەك ئەوەی گەلی عێراق هاواریکردبێتە ئەم "ئاشتیخوازانە" بۆ ئەوەی سەددامی "سەرکردەی تەنگانە"و "پاڵەوانی شەڕی "اُم المعارك"و "ئازادیخوازو دێموکرات"، لەدەست "جەنگخوازان" بپارێزن بۆی.

ئەرێ . . ئەمە باری ئەوڕۆی خەڵکی ئەم جیهانەیە کە زۆربەی هەرە زۆریان دوورن لەجەنگەوە. بەڵام زۆر بەداخەوە، هەڵوێستی سیاسەتبازانی کورد کە ئاگری جەنگەکە بەمزووانە لەوڵاتەکەیاندا هەڵدەگیرسێ، لەحیزبحزبێنەو، چاوەڕوانیی بێ بەرو، و دڵخۆشیخۆدانەوەی ناشیانەو، خەیاڵپڵاوی، ئاچێ بەولاوە، لەکاتێکدا کە داگیرکەرانی کوردستان، دەمێکە خۆیان تەیار کردووە بۆ ئەوەی ئەگەر ئەمریکا دەستی لە سەددام وەشاند، نەك کورد هیچی دەستنکەوێ‌و بەس، بەڵکو ئەو سەربەستییە کەمەش کە بەسایی هەلومەرجێکی نێو نەتەوەیی و ڕێکەوتەوە، لە "هەرێمی نەفڕین"دا دەستیکەوتووە، ئەوەشی لەدەستبچێ.

ئا لەم بارودۆخە ناسکەدا، ژمارەیەك لە ڕۆشنبیرانی دڵسۆزی کورد کەوتوونەتە خۆیان بۆ بیروڕا گۆڕینەوەو، وتووێژ، بۆ هێنانە کایەی هەڵوێستێکی کوردانەی سەربەخۆ لەبارەی جەنگ و دواڕۆژی کوردو عێراقەوە. نموویەك بۆ ئەمە، ئەو سەمینارە بوو کە "کۆمەڵەی کوردەکانی دەرەوەی وڵات لەئەڵمانیا" لەشاری کوێلن لەڕۆژی 2003/1/15دا بەو مەبەستە سازیکردبوو بۆ من و، هەموو لایەنێکیشی بێ جیاوازی بانگێشت کردبوو. بەڵام حیزبەکان، خودێ لەگوناهیان ببوورێ، وەك خووڕەوشتی

هەمیشەییبیان، کە هەرچی خۆیان نەیانکردبێ، لەدژی دەوەستن، سەمینارەکەیان بۆیکۆت (مقاطعة) کردبوو و، تەنانەت یەکێك لە بەرپرسیارەکانی یەکێك لەو حیزبانە بەتەلەفۆن هەڕەشەیەکی تاوانبارانەی لەڕێکخەری سەمینارەکە کردبوو، ئەوجا بۆ ئەوەی ئەندامەکانیان لە بەشداریکردنی سەمینار بێبەشبکەن، لەو ڕۆژو کاتەدا، کۆبوونەوەیەکی حیزبییان دانابوو، وەك ئەوەی ڕۆژو کات بڕابێ. ئەمە لەکاتێکدا کە، مانگێك لەوە پێش دەیانزانی، لەو ڕۆژەو کاتەدا، ئەو سەمینارە دەبەسترێ. سەرەڕای ئەم هەموو بەربەرەکانی و هەڕەشەو گوڕەشەی بەعسی وێنانەیەش، سەت کوردی ڕۆشنبیر بەشدارییانکردو، سەمینارەکە نێزیکەی چوار دەمژمێر درێژەیکێشاو هەموو ئەوانەی ویستیان بیروڕای خۆیاندەربڕن، بەوپەڕی سەربەستییەوە دەریانبڕیو کۆبوونەوەکە بەسەرکەوتوویی و خستنەڕووی چەند پێشنیازێك کۆتاییهات (ڕاگەیاندنی "کۆمەڵەی کوردەکانی دەرەوەی وڵات" لەلاپەڕە "2"ی ئەم ژمارەیەدا بەرچاو دەکەوێ).

کۆبوونەوە جەماوەرییەکەی کوێلن دەریخست کە ڕۆشنبیرانی کورد، ئاشتیی نەتەوەیی و ڕزگاریی کوردستانیان دەوێ و، ئەحلەت لەهەموو جۆرە حیزبحزبێنەو خۆسەپاندنی بەزۆرو، هەموو دووبەرەکی و ناکۆکینانەوەیەك دەکەن لەنێو ڕیزەکانی نەتەوەی کورددا و، داوا لەکاربەدەستانی حیزبەکان دەکەن، کە واز لەوتووێژی نهێنی و شاراوە لەگەڵ داگیرکەراندا بهێنن و هەر وتووێژێك دەکەن، با بێکەموکورتی بڵاویبکەنەوەو، لەکاروباری چارەنووسسازدا، دەستبەجێ بگەڕێنەوە بۆ بیروڕای گەل و، بەبێ گشتپرسییەکی ئازادانە، هیچ جۆرە بڕیارێك نەدەن، چونکە ئەگەر وانەبێ، بڕیارەکەیان ڕەوایەتی (شرعیەت)ی نابێ، بەتایبەتی، لەم ڕۆژەدا، کە کوردستان لەبەردەم جەنگێکی هۆبەهۆدایە،

پێویستە بەوپەڕی هۆشیاریو سەربەستییەوە، دیبلۆماسیێتییەکی ژیرانە بگرنە بەرو، ئەو زیانەی کە کەوتووەو دەکەوێ بەهۆی ڕژێمی سەددام و جەنگەوە، ڕەپوڕاست بخەنە بەردەست کاربەدەستانی ئەمەریکاو بەریتانیاو، بەهیچ جۆرێك ڕازینەبن بەهاتنی لەشکری ترك بۆ باشووری کوردستان. شایانی باسە، کە شتێکی جوان نییە بۆ سەرکردەیەکی کوردی وەك برای بەڕێز مام جەلال، کە بیێژێ "لەشکری ترك هاوپەیمانمانەو، بەرازیبوونی ئێمە نەبێ نایەتە کوردستانەوە"، چۆنکە، مام جەلال خۆشی باش دەزانێ کە لەشکری ترك هاوپەیمان و هەڤاڵبەندی کورد نەبوون و نین و، پرسیش بەو ناکەن، ئەگەر بیانەوێ بێنە کوردستانەوە، هەرچەندە ئەو و برادەرە حیزبییەکانیشی، گەلێك جۆرە "تنازلات"یان بۆ ڕژێمی ترك و "بەرەی ترکمانی"ی دەسکەلای دەستی ڕژێمی ترك کردبێ و بیکەن.
کاربەدەستانی دوو حیزبە دەسەلأتدارەکە، کە هەر خۆیان بەنوێنەری کورد دەزانن و، حەپولکی کەس نادەن، پێویستە لەئەمریکا بگەیەنن کە هاتنی لەشکری ترك بۆ باشووری کوردستان بەهیچ جۆرێك بەدڵی کورد نییەو، بەهیچ جۆرێکیش خزمەتی ئامانجەکانی ئەمریکا ناکات. بەڵکو کێشەیەکی گەورە دەنێتەوە بۆ ئەمریکاو ترك و ئەو کاربەدەستە کوردانەی ڕێدەدەن بەوە، چۆنکە، هاتنی لەشکری ترك بۆ باشوور، مانای ئاژاوەنانەوەیە لەنێوچەکەدا، ئاژاوەیەك کە بەهیچ لایەك بەرینەگیرێ. باشووری کوردستان قوبرس نییە. نیوەی لەشکرەکەی ترك کوردن و، لەرۆژایەکی وادا، هەموو دوژمنانی دێرین و نوێی ترك دێنەوە سەر گۆڕەپان و، ئەمەش بەهیچ جۆرێك لەبەرژەوەندیی ئەمریکاو بەریتانیا نییە کە جەنگ و بەیەکدادان چەند ساڵێك درێژە بکێشێ. پێویستە هەر لەوڕۆوە لەئەمریکا بگەیەندرێ کە کورد نایانەوێ نەورۆزی 2003یان ببێتە نەورۆزەکەی 1947و نەورۆزەکەی 1975 یا ن.

موخابن، کورد دیپلۆماسێتیەکی ناحیزبی زیندووی چالاکی نییە. ئەگەر ئەوەی هەبوایە، دەمێك بوو گەلێك دەسکەوتی لەئەمریکا، بەتایبەتی لەم ڕۆژە تەنگانیەدا، وەدەستهێنا بوو. دەوڵەتی ترك، کە گوایە "هەڤاڵبەند"ی ئەمریکایە، ئەمە پەنجا ساڵە، پارەو چەك و یارمەتییەکی فراوانی هەمەجۆرەی لەئەمریکا وەرگرتووە، مانی بەپێوە، بەسایی ئەمریکاوەیە. کەچی دەوڵەتی ترك ئەم هەموو پەڵپە دەگرێ بۆ ئەوەی ڕێ بەلەشکری ئەمریکا نەدا، بەسنووری دەوڵەتەکەیدا تێپەڕێ. دەزگەکانی ڕاگەیاندنی گشتی لەهەموو جیهاندا باس لەناکۆکیی ئەمریکاو دەوڵەتی ترك دەکەن، بەهۆی داخوازییە قورسەکانی ترکەوە لەئەمریکا، بەڵام باسی کورد لەکوولەکەی تەریشدا نییە، چۆنکە سیاسەتکارانی هەرزانفرۆشی کورد، هیچ داخوازییەکی بنچینەییان نییە. خۆ ئەگەر بیشیانبێ، ئەوا لەدزەخونجێنەو بەڵێنی دەمی بەولاوە، شتێکی دیکەیان دەستگیر نەبووە. هەرچی ڕژێمی ترکە، ئەوا داوای بەڵگە بەنووسین و واژۆ (ئیمزا)و بڕیاری کۆنگرێسی ئەمریکا دەکا، بۆ مسۆگەر کردنی ئەوەی کورد هیچ مافێکی پێنەبڕێ. دەنگوباسەکانی ئەم دواییە ئەوە دەگەیەنن کە ئەمریکا لەگەڵ ڕژێمی ترك ڕێککەوتووە لەسەر ئەوەی لەشکری ترك بەسەربەخۆیی بچێتە باشووری کوردستانەوە. هەروەها لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە عێراق نەبێتە وڵاتێکی فێدەرالی و، لەسەر ئەوەش ڕێککەوتون کە کورد، مووسڵ و کەرکووکیان بەدەستەوە نەبێ. تەنێ ئەوە ماوە کە "بەرەی ترکمانی" – کە یەکێك لەسەرکردەکانی لەم ڕۆژانەدا، بەتۆمەتی تیرۆریستی لەهەولێر گیراوە– بخرێتە دەستەی بەڕێوەبەرێتیی عێراقی دواڕۆژەوە، بەمەرجێك هەر کاتێك ترکمانەکان دڵیان شکێنرا، ئەوا لەشکری ترك بتوانێ بێتە مەیدانی کارەوە، بەڵام کاربەدەستانی کورد دەمیان هەڵناپچڕێ‌و یەکجار

بیێژن: "هەی لەبەر دەوڵەتی ترك مرم، مافی ترکمان بەسەرچاو، بەڵام ئەی مافی بیست ملیۆن کوردی ژێر دەستەی ئێوە؟".

ئەز نازانم، سەرکردەکانی یەکێتی کە ئەوان هۆیەکی سەرەکی بوون بۆ هێنانە پێشەوەی تۆرانییەکان لەباشووری کوردستاندا، لەم بارەیەوە چ دەفەرموون؟ ئاشکرایە هەموو چەند خولەکێکی ماوە بۆ نیوەشەوو، جەماوەری بێکەس و بێپشتوپەنای کورد، پەژارەی چارەنووسی خۆیەتی، خۆ ئەگەر ئەمجارە ریسەکەی بکرێتەوە بەموو، ئەوا دڵنیاین کە کورد جارێکی دی رێی ئەزموونی حیزبحزبێنەو شەرە میلیشا ناداتەوە، پاش ئەوەی یانزە ساڵی رەبەق بەتەمای ئەنجامێکی گەش، چاوی لەهەموو تاوان و براکوژیو دەرفەت لە دەستدان و خراپەکارییەك پۆشی.

بەرلین 2003/2/22

**میدیا**، ژ 142، 2003/2/27

## کاتژمێری چارەنووسی کورد، چەند تاوێکی ماوە بۆ نیوەشەو مەرگەساتی مارتی 1975 نابێ دووبارە ببێتەوە

کورد، بەو کەسانەی بەڕوو تەنکن و، ئەوەی لە دڵیاندایە دەرینابڕن، دەڵێن "شەرمن". شەرمنی، دۆخێکی ڕەوانی و دەروونییەو، جیایە لە ترسنۆکی و درۆزنی و شاردنەوەی ڕاستی، بەنیازی هەلپەرستی و گەیشتنە دەسکەوتی تایبەتی. لە نێو ئەم دوو دۆخەشدا، جۆرێکی دیکە هەیە، کە بەزۆری، مرۆڤی رامیار و دیپلۆماتی بەتەنکەوە هاتوو بۆ بەرژەوەندیی دەوڵەتێک، یان بەرژەوەندییەکی گشتی، نەک تایبەتی، جاروبار، هێندەک ڕاستی نایەننە سەر زمان، بەڵکو کورد گوتەنی: وەک "کنگرو کاست بۆکاتی خۆی" هەڵیدەگرن، واتە، بۆ بارێکی گونجاو، ئەوجا دەریدەبڕن، بەڵام کە مافێک، لە بەردەم پێشێلکردندا بێ، یان تاوانێك قەومابێ و، پێویستی بەزڕاندن و خستنەڕوو هەبێ، ئەو دەمە بێدەنگبوون، وەک بەشداریکردنە لە پێشێلکردنی ماف و تاوانکاریدا.

هەتا ئەو رادەیەی ئەم باسەی سەرەوە پێوەندیی بە کوردو کێشەی کوردەوە هەیە، ئەوا ئەو هەلومەرجەی کە لەسەردەمی فەرمانڕەواییی سەددامدا لەکاردا بوو، ئەوڕۆ لە بنەڕەتەوە گۆڕاوەو، هەلومەرجێکی دیی وا هاتووەتە کایەوە، کە چارەنووسی کوردی پێوە بەستراوە، لەبەر ئەوە، ئەگەر تا ئێستە، لە هێندەک کەموکورتی، چاومان دەپۆشی، لەبەر خاتری تەناهیی نەتەوەیی، ئەوا لەم ڕۆژەدا، نابێ بەهیچ جۆرێك، چاو لە هەڵەو گوناه و تاوانی هیچ لایەنێك بپۆشین، ئەوجا هەر لایەنێك دەبێ با ببێ، خۆ ئەگەر کەمتەرخەمیمانکرد، ئەوا خۆشمان تاوانبارین.

بۆئەوەی بچینە نێو جەرگەی باسەکەوە، حەزدەکەم بەکورتی چیرۆکی "هەرێمی نەفرین"، یان "نەوای ئارام" کە پتر لە دەساڵ لەمەوبەر باسمکردووەو، لەگەڵێك وتارو سەمینارو وتووێژی رادیۆیی و تەلەفزیۆنیدا دووبارەمکردووەتەوە، سەرلەنوێ بیخەمەوە بەرچاو.

پاش ئەوەی سەددام بۆی دەرکەوت کە جەنگی هەشت ساڵەی دژ بە ئێران، سەرەڕای ئەو هەموو یارمەتییەی کە لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا وەریدەگرت،

نەیبردووەتەوەو، خەزێنەکەشی ڤالایە، کەوتە سەر بیری داگیرکردنی کوێت و، ئەمەش دوای ئەوەی کوێت لەساڵانی جەنگدا، بەسەتان ملوێن دۆلاری بە سەددام بەخشی بوو، کە بەشێکی زۆری ئەو پارەیە، ئەو چەکانەی پێکڕا کە کورد و عێراقییەکان و ئێرانییەکانی پێکوژران، تا لەو کاتەدا، چەکدارەکانی حیزبەکانی باشووری کوردستان، هەموو لە ئێران بوون و، چەکدارەکانی حیزبەکانی رۆژهەڵاتی کوردستانیش لە عێراق بوون و، چەکدارەکانی باکووری کوردستان، واتە (پێ کێ کێ) بە ژمارەیەکی کەم، لەشوێنی خۆیان، خەریکی دەستوەشاندن بوون لە بنکەی پۆلیس و سەربازی ترک ودژی ئەو کوردانەی لە حیزبەکانی دیکەدا بوون. سەرکردەیەتییەکەشیان لە سووریا بوو. سەددام: بەهۆی هەڵە کردنەوە لە لێکدانەوەی هەلومەرجی رامیاری (نێوچەیی و جیهانی)و، خۆ بەزلزانین و گوێنەگرتن لە قسەی کەس، بڕیاری هەڵکوتانە سەر کوێتی دا، ئەوەشی نەگرتە بەرچاو، کە جیهان لەساڵی 1990 دا، لەشێوەی دوو بەرەییدا نەمابوو. سۆڤێت پووکابووەوە و، ئەمریکا وەك تاکە زلهێزێك لەجیهاندا مابووەوە، کە ئەویش دژی داگیرکردنی کوێت بوو. بێجگە لەمەش، هەموو وڵاتانی جیهان تێکڕا، بەڵام هەریەکە لەبەر هۆیەکی دی، دژی داگیرکردنی کوێت بوون، ئەوەبوو لە ئەنجامدا، لەشکری عێراق بە زۆر لە کوێت دەرپەڕێندرا، بەڵام ئەمریکا لەبەر خاتری "هەڤاڵبەند"ە ساختە کارەکانی، وەك حوسنی موبارەکی میسر و شاحوسینی ئەردەن و شا فەهدی حیجاز، وازی لە سەددام هێناو، دەستییشی بەرەڵڵا کرد بۆ لێدانی کورد و شیعەو، لەوەوە ئەو گەلڕەوە دروستبوو، کە ملوێن و نیوێك تا دوو ملوێن کورد: لەشوێنی خۆیان هەڵاتن و روویانکردە سەر سنوورەکانی ئێران و دەوڵەتی ترك و، ئەوەبوو دەزگەی راگەیاندنی گشتی لەهەموو جیهاندا و، هەموو رۆژێك، ئەو مەرگەساتەی کوردی هەڵاتووی پێشانی خەڵك دەداو، لەمەوە جۆرە بەزەییەك لە دڵی خەڵکدا پەیدا بوو بەرامبەر بە کورد، لەگەلێك شوێن پارە کۆکرایەوە بۆ کورد. تەنانەت، لە لەندەن کۆنسێرتێکی نێو نەتەوەیی رێکخرا بۆ خڕکردنەوەی پارە بۆ کورد. بەرێککەوت لەو سەردەمەدا فرانسوا میتران سەرۆك کۆماری فەرەنسا و، تورگوت ئۆزال

سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی ترك بوو، جۆن مێجەریش، سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا بوو، ئەوە بوو بە هەوڵ و تەقەڵای میتران و گەلێك لایەن، كۆمەڵی نەتەوە یەكگرتووەكان، بڕیاری دامەزراندنی "هەرێمێكی نەفرین"ی دا كە بە "نەوای ئارام" نێویرۆیی.

بەڵام كاربەدەستانی حیزبە كوردییەكان رانەوەستان، تا كۆمەڵی نەتەوە یەكگرتووەكان بڕیارێكی باشتر بدا بۆ كورد، چوون بۆ لای سەددام و دەستیانكردە ملی وداوایان لە كوردە هەڵاتووەكان كرد بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان، كە بە قسەیان نە كردن. ئەم كردەوەیە لەو رۆژەدا، تەرمۆمەتری بەزەییهاتنەوەی خەڵكی بەكورددا، زۆر هێنایە خوارەوە، گەلێك لەو پارەیەی كە بۆ كوردستان كۆكرابووەوە، ئیدی نەدرا بەكورد.

كورت و كرمانجی، دامەزراندنی ئەم هەرێمە، لەئەنجامی شەڕی چەكداریی حیزبە كوردییەكانەوە، یان لەئەنجامی دیپلۆماسێتیی و وتووێژی سەركردەی حیزبەكانەوە لەگەڵ رژێمی عێراق، یان كۆمەڵەی نەتەوە یەكگرتووەكان نەبوو، بەڵكو لەئەنجامی گەلرەوەكەو، ئەو بارودۆخە نێو نەتەوەییەوە بوو كە باسمكرد، واتە، رۆڵی حیزبەكانی تێدا نەبوو، حیزبەكان هاتنە سەر خوانی ئامادەكراو.

ئەمەش قسەی ئەوڕۆم نییە، قسەی دە ساڵ لەمەوبەرمە كە بۆ رۆژنامەی "كوردنامە"م كردووە (كوردنامە، ژ 23، مایسی 1993) مەبەستیشم لەمە ئەوە نییە كە بێژم كورد خەباتی نەكردووە، یان حیزبەكان هیچیان نەكردووە، كردوویانە، بەڵام ئەم "نەوای ئارام"ە، ئەنجامی ئەو خەباتە نەبووە.

پاش ئەوەی دوو زلحیزبەكە كەوتنە گیانی یەكدی و، پەرلەمانی كوردستان درایە بەر تۆپ و، گەلێك كەس كوژران و، نێوو نێوبانگی كورد خراپ بوو، لەگەلێك لاوەو، و چەند جارێك، پێوەندیكرا پێمەوە بۆ دامەزراندنی "حیزبێكی نەتەوەیی"، بەڵام بەهەموو لایەكم راگەیاند كە ئەو كارە بەڕاست نازانم، گوتیان: "لە كوردستاندا دەبێ جێگیرەوە (بدیل)یەكی نەتەوەیی هەبێ بەرامبەر بەم حیزب و حیزبۆلكە نانەتەوەییانە كە ئەمە پەنجا ساڵە چەپڵە بۆ رژێمی تاوانباری سۆڤێت و، برایەتیی درۆزنەی كورد و عەرەب و كورد و فارس و كورد و ترك

لێدەدەن و، زوەڕنا بۆ ئۆتۆنۆمی لێدەدەن و، خۆشت ئەوە زۆر باش دەزانیت"، گوتم: "ئەوە راستە، بەڵام ئەگەر رێکخراوێکی نەتەوەیی هەبێ، لەم کاتەدا، ناتونێ بە سەربەخۆیی کار بکا و پەلبهاوێ و بژی، چۆنکە ئەو حیزبانە باوەڕیان بە ئازادیی بیروڕا و دیموکراسی نییە، ئەوجا، یان ئەوەتە دەبێ ببێتە دەسکەڵای دەستی یەکێك لە حیزبە گەورەکان و بکەوێتە فشە کوردایەتی، یان ئەوەتە بەچەك بەربەرەکانێیدەکەن و لەنێوی دەبەن"، گوتیان: "ئێمەش دەتوانین هێزێکی چەکدار دروستبکەین و لەسەر خۆمان بکەینەوە" گوتم: "دوور نییە بتوانن هێزێکی چەکدار دروستبکەن، بەڵام یەکەم، ئەو هێزەی ئێوە، هەر لەشەوو رۆژێکدا نابێتە هێزێکی وەك ئەوەی ئەوان، چۆنکە ئەوانە چەند ساڵە لەلایەن داگیرکەرانی کوردستانەوە پشتگیریدەکرێن و، لەلایەکی دیکەشەوە، دەبێتە بەیەکدادان و خوێنڕژان و، ئەزیش ئەوە زۆر بەخراپ دەزانم، کە کورد کورد بکوژێ لەسەر حیزبحیزبێنە". گوتیان: "ئەی باشە، چارچییە؟" گوتم: "چار ئەوەیە هەوڵبدرێ کە جەماوەرەکەی ئەم حیزبانە بەبیری نەتەوەیی ئاشنا بکرێن و تێیانبگەیەندرێ کە حیزب بووەیەکی پیرۆز نییە، بەڵکو هۆیەکە بۆ گەیشتنە ئامانجێك، هەر کوردێك کە خاین نەبێ، مافی سەربەستیی رادەربڕین و کارکردنی رامیاری هەیە، نابێ کورد دەست لە کورد بوەشێنێ". لە دواییدا هەموو جارێك ئەوەشم دەگوت پێیان، کە ئەمە بیرو بۆچوونی منەو بەس، ئەز نابێژم حیزب دروستمەکەن، یان دروستبکەن، ئێوە سەربەستن، خۆتان چۆنی بەباش دەزانن وابکەن" گوتیان: "باشە، ئەگەر شتێك دروستبوو، تۆ لەدژی ناوەستی؟" گوتم: "ئەگەر کاری باش بکا، ئافەرین دەکەم لێی و، ئەگەر کاری خراپ بکا، رەخنە دەگرم لێی، بەڵام بەهیچ جۆرێك ناچمە ناوی،" گوتیان: "بۆچی؟" گوتم: "چونکە باوەڕم بە حیزبایەتی نییە، لەگەڵ رێزمدا بۆ ئەوانەی باوەڕیان پێیەتی".ئەوجا ، لەوکاتەوە ، دەستمکرد بەهەوڵدان بۆ نێزیکردنوەی حیزبەکان لەیەك و، هەوڵدان بۆرازیکردنی ژمارەیەکی زۆر لەهەموو لایەك ، بەتایبەتی پارتی و یەکێتی، بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ یەك، لەجیاتی لەیەکدی کوشتن و، خراپەکاری لەگەڵ یەك . دیارە ، هەمووجۆرە راهێنان و فێربوونێکیش پێویستی بەکات و بەردەوامیی

هەیە ، هەتا بنچینەکانی لەمێشکدا دەچەسپێن و ، جێی خۆیان دەگرن . پێشم وایە ، ئەم هەڵوێستەی من کەڵکی هەبوو . بەڵام وەك هەمووان دەزانین ، زلحیزبەکان ، بەتایبەتی یەکێتی و پی کی کی و پارتی ، وازیان لە ڕەوشی تۆتالیتێرانەو " پێشڕەوانە " و " تاك پەرستانە " نەهێناوە ، کە ئەوەش پاشماوەی زلکاوی بیری چەپەڵی ستالینیستیەو ، ئەم حیزبانە پەنجا ساڵە میشکی جەماوەری کوردی پێ بەنج دەکەن . لە ئەنجامی شەڕەقۆچ و بەیەکدادانی حیزبەکاندا ، ژمارەیەکی زۆر چەکداری هەردوولایان و هەموو لایەکیان کوژران ، کەئەمانە بێگومان ناچنە خانەی شەهیدانەوە . بێجگە لەوەش، داگیرکەرانی کوردستان توانییان جێپێی خۆیان لە " هەرێمی نەفرین " دا بکەنەوە . چۆنکە پارتی و یەکێتی بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ یەك، پەنایان نەبردە بەر نەتەوەی کورد ، بەلکو، چوونە سلاوی داگیرکەران. شایانی باسە ، زۆرجار لەکار بەدەستانی هەردوو زلحیزبەکە دەبیسین کە سوپاسی ڕژێمی ترك دەکەن کە گوایە " کوردو هەرێمی نەفرین " ی پاراستووە . ڕاستییەکەی ئەوەیە ، ئەگەر ئەمریکاو بەریتانیا لەپشت پاراستنی ئەو هەرێمەوە نەبوونایە . بێجگە لەوەش ، ئەگەر ڕژێمی ترك نەیارێکی بەهێزی وەك پی کی کی ی نەبووایە ، کە لەشکری ترکی هێنابووە هەلەکەسەما ، هەروەها ، دوو زلحیزبەکەی باشوور ، بەتایبەتی پارتی ، ئالیکاریی لەشکری ترکیای نەکردایە بۆ بەربەرکانێی پی کی کی ، ئەوا ڕژێمی ترك ، پاش نەمانی ئوێزاڵ ، ڕێی بە بوونی هەرێم نەدەدا . ئەگەر بیرمان مابێ ، هەرشەش مانگ جارێك ، پاراستنی هەرێم تازە دەکرایەوەو ، ئەنجومەنی ئاسایشی ناسیۆنالی ترك ، هەموو جارێك دەیگوت " لەبەر خاتری ئاسایشی ناسیۆنالی ترك " درێژ کرایەوە ، ئەمەش شتێکی زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە لەبەر خاتری چاوی کاڵی کورد نەبووە . لەمەش بترازێ ، ئەو قسەیەی کە ڕژێمی ترك دەیکات کە گوایە زیانی پارەی لێکەوتووە ، ڕاست نییە ، هەموو ڕۆژێك بە هەزاران لۆری لە عێراقەوە بۆ نێو دەوڵەتی ترك و لەوێوە بۆ عێراق بەقاچاخی لە هاتو چۆ دابوون و ، ڕژێمی ترك و کاربەدەستانی هەرێم ، سووتەکەیان لەخۆیان بەشدەکرد . زیانی چی ؟ شایانی باسە ، کەڕژێمی ترك باوەڕی نەدەکرد کە

ئەمریکا و بەریتانیا، بێ هاوکاریی ترک ، بتوانن پەلاماری سەددام بدەن ، یان بچن لەگەڵ کورد رێکبکەون . سەددامیش باوڕی نەدەکرد بەوەی ئەمریکا و بەریتانیا پەلاماری عێراق بدەن، ئەگەر رژێمی ترک رازی نەبێ، ڕێ بەلشکرەکانیان بداو، هەر لەو کاتەدا ئەلمانیاو فەرنساو رووسیاو چین و تەنانەت پاپاش، دژی جەنگ بوون و، بەملیۆن خۆپیشاندەر لە هەموو جیهاندا دژی جەنگ دەهاتنە سەر شەقامەکان، بەڵام کە کار لەکار ترازا، ئەو دەمە ترک پەژیوان بوونەوەو، ئێستەش دەیانەوێ، ئەمجارە، ئەوەی دەبوو بەشەڕ دەستیان بکەوتایە، زۆر بەهەرزان دەست خۆیان بخەن و 10- 15 هەزار سەرباز رەوانەی عێراق بکەن و بەملیار پارە وەربگرن و بکەونە فرتو فێڵ دژی کورد. لەم ماوەیەدا، دەنگ هەبوو کە پارتی و یەکێتی دژی ئەوە بوون کە لەشکری ترک، لەڕێی باشوورەوە بکشێتە نێو عێراقەوە. بەڵام کاربەدەستێکی سوپای ترک گوتی: "ئێمە گومانمان هەیە لەوەی کوردەکان وایانگوتبێ، چۆنکە هیچ ناشێ کورد قسەی وا بکەن" "الزمان 11/ 8/ 2003". وایە، خاڵۆی خۆیان باش ناسیوە.

بەڵام دوو زلحیزبەکە، هەتا ئێستە قوڕو قەپیانکردووە لە ڕۆنکردنەوەی هەڵوێستیان کە لێرەدا داوادەکەم لێیان، هەڵوێست پێشانبدەن.

ئەوجا ئێستە، ئەم پرسیارانەی خوارەوە لە کاربەدەستانی دوو زلحیزبەکە دەکەم:

1- کەسێك ئەلفوبێی زانستی رامیاری بزانێ، دەبێ ئەوە بزانێ کە فێدەرالیزم لە دەوڵەتێکدا، جۆرە سیستەمێکە بۆ هەموو دەوڵەتەکەو بڕیاردان لەسەری، بەدەست بەشێکی خەڵکی ئەو دەوڵەتە نییە، بەڵکو بەدەست هەموو خەڵکی ئەو دەوڵەتەیە، واتە، کورد، ئەگەر خۆیان بە عێراقی بزانن (کە ئەوەتە دوو زلحیزبەکە، نەك شانازی بە عێراقێتیی خۆیانەوە دەکەن، بەڵکو ئاڵاکەی عێراق کە لەڕاستیدا ئاڵای سەددامە، بێ شەرمانە هەڵدەکەن و شایەرەکانیان هەڵەبجە دەبەنە بەغدابۆیان) بەتەنێ بۆیان نییە، دەنگ بۆ فیدەرالیزم بدەن. باشە، ئایە گەرەنتی چییە کە زۆربەی زۆری خەڵکی عێراق، کە کورد نین، دەنگ بدەن بۆی؟

خۆ ئەگەر دەنگیان نەدا بۆی، دەبێ کورد رازی بێ بەوە، چونکە دووزلحیزبەکە، هیچ مەرجێکیان دانەناوە بۆ ئەو دۆخە. باشە، ئەگەر کورد رازی نەبوو و سەرکێشی کرد، ئایا بەخیاڵی حیزبەکان، دەبێ چی بکرێ، چی ئامادەکراوە بۆ ئەورۆژە؟ لێرەدا ئەو پرسیارە روایە خۆی دێنێتە پێشەوە، ئایە ئەم دوو زلحیزبە کە بە 12 ساڵ نەیانتوانیبێ بەرێوە بەرێتی لە دوو شاردا بکەنە یەك، تۆ بڵێیت بتوانن ئەو دەمە کورد لەو کوێرەوەریە رزگار بکەن، کە ئەورۆ پێشبینی دەکەن، بەلاَم پێشگیری ناکەن.

2- با وادابنێین، کە زۆربەی زۆری خەڵکی عێراق، دەنگ بۆ فێدەرالیزم دەدەن، بەلام فێدەرالیزم چەشنی زۆرە، یەکێك لەوانە ئەوەیە، هەر پارێزگەیەك بەتەنێ، یەکەیەکی فیدراڵی بێ، یان چەند پارێزگایەك پێکەوە بدرێن لەیەك، بۆ وێنە، نێوی بنێت (هەرێمی باکوور) واتە، نێوی کوردستانی لەسەر نەبێ، دوو زلحیزبەکە چ دەفەرموون؟؟

3- زۆرجار باسی دەستوورو (شەڕی دەستوور)، دەکرێ. دەستوور، ئەمریکاییەکان داینانێن. کۆمەڵێك پسپۆڕی عێراقی، رەشنووسی دەستوور ئامادە دەکەن. کێ دەڵێ ئەو کۆمەڵە، دەستوورەکە بەدڵێ کورد دەنووسنەوە؟ ئایا پێویستی نەدەکرد، داخوازییەکانی کورد، وەك سنووری باشووری کوردستان و نێوی هەرێم و دەسەلاتەکانی هەرێم، لەکۆبوونەوەکانی سەلاحەدین ولەندەن و ناسرییەدا بخەنە بەردەم بەرهەڵستکاران و ئەمریکاو هەموو عێراقییەك و بێژن ئەمە داخوازیی ئێمەیەو بەم مەرجە نەبێ، ئێمە هاوکاری ناکەین، یان بۆ چی بۆ ئەوکۆبوونەوانە، چەند کوردێکی شارەزایان بانگنەکرد؟ پاش ئەمە، ئایە دەستوور لەولاتە رۆژهەڵاتییەکاندا نرخی هەیە؟ ئایە ئەوەتەی عێراق هەیە، چەند جار دەستوورەکەی گۆڕا، پاش هەر کودەتایەکی سوپایی؟ ئایا ئەمریکاییەکان، هەتا رۆژی قیامەت لەعێراقدا دەمێننەوە بۆ پاراستنی ئەو دەستوورە؟

4- باوادابنێین کە عێراق بوو بەدەوڵەتێکی کۆماری و فێدەراڵی و کوردستانیش بووە هەرێمێك، ئایا گەرنتی چییە بۆ ئەوەی کە هەموو ساڵێك هەزاران عەرەب

نایەن لەو هەرێمەدا نیشتەجێ بن؟ هیچ هەرێمێکی فیدەراڵی، ناتوانێ رێ لەخەڵکی تەواوی دەوڵەتەکە بگرێ و نەهێڵێ لەو هەرێمەدا بژین. گەرنتی چییە بۆ ئەوەی رۆژێ لەرۆژان، زۆربەی زۆری خەڵکی هەرێم نابنە عەرەب؟ ئەوەتە دەوڵەتە عەرەبییەکان خەریکی دامەزراندنی یەکێتیی بازرگانیو بازاڕی ئازادو یەککردنی پارەکانیانن (وەك یوروێ ئەوروپا). ئایە پێویست نەبوو، هەر لەسەرەتاوە، مەرجێك بخرێتە پێش: ( نابێ لەدەستووردا بنووسرێ عێراق بەشێکە لەنیشتمانی عەرەب)، هەروەها مافی مانەوە (اقامة) لە کوردستاندا بۆ ئەوانەی خەڵکی کوردستان نین، بەپێی قانوونێکی تایبەتی دەستنیشانبکرایە؟

5- پارێزگاری بەعقوبە، لەم رۆژەدا کەئەمریکاییەکان داینناوەو هیچی بەدەست نییە،دەفەرمووێت: خانەقین کوردستان نییەو نابێ پەروەردەی کوردی تێدا بێ (کوردستانی نوێ 2003/8/6). ئایا سەر بەرزییە بۆ ئەندمە کوردەکانی (مجلس الحکم الانتقالی) بێدەنگ بنو نەڵێن (ئەگەر ئەو کابرایە دەستبەجێ دەرنەکرێ، ئێمە لەم (مجلس)ە دەکشێیینەوە؟

6- لەم رۆژەدا کە هێشتا عێراق نەبووە بەدەوڵەتو جارێ لەشکرو حکومەتی نییەو کورد جارێ هێندەك دەسەڵاتیان هەیەو تاهەندازەیەك قسەیان دەڕوا، ئایا پێویست نییە کە هەردوو زلحیزبەکە، تازووە هەوڵی گشتپرسییەك بدەن لەهەموو نێوچەکانی کوردستانداو پرسیارێك لەخەڵك بکەن، ئایا سەربەخۆییان دەوێ، یان یەکگرتن لەگەڵ عێراق لەشێوەی کۆمارێکی کوردستانیی فیدەراڵیدا کە ناسنامەیەکی تایبەتیو دەستوورێکی تایبەتی هەبێ و بەزووترین کات ئەنجامەکەی بدرێ بە کۆمەڵی نەتەوەیەکگرتووەکان، وەك بەڵگەنامەیەکی نێو نەتەوەیی!؟ ئەم پێشنیازەم لەکاتی خۆیدا لە (میدیا) دا بڵاوکردەوە لەژێر سەرنێوی (ئەی گەلی رووتو برسی لەزۆرداران نەترسی، بێژە بەخاوەن کورسی، رێ چۆڵکەن بۆ گشتپرسی (میدیا2003/2/1)، بەڵام دووزلحیزبەکە بەداخەوە لەدژی وەستانو سەیرە خۆشیانو هەموو کەسێك دەزانێ کەپەرلەمانەکەیان هەشت ساڵە رەوایەتی نەماوە. باشە، بەچ مافێك باسی پەرلەمان دەکەنو بەچ مافێك رێ لەهەڵبژاردنێکی نوێ دەگرن؟ ئایە رێگرتن لەمافی رەوای خەڵکی

باشووری کوردستان بۆ دەنگدان بەئازادی، لەترسی ئەوەی کە دەزانن ئەمجارە لەهەڵبژاردندا زۆر ناهێنن، ئایا ئەمە کەڵەگایی نییە بەسەر رەشوڕووتی کوردەوە؟

7- کە ئەمریکا لەناچاریی و، پاش ئەوەی رژێمی ترک دەستی بڕی، روویکردە پارتی و یەکێتی و، ئەوەبوو لەرۆژێکی تایبەتیداو لە کاتێکی تایبەتیدا، دەبوو هەرسێ لایان، لەیەك کاتدا، بگەنە کەرکووك، بەڵام چەکدارەکانی یەکێتی لەچەمچەماڵەوەو چەند دەمژمێرێك لەوەبەر،کەوتنە رێ و بەر لەدوانەکەی دی، بە پەرۆ کەسکەکەوە چوونە نێو کەرکووك و، بەگەیشتنیان، تاڵان و بڕۆیی دەستپێکرد، کەپارتی دوای ئەوان گەیشتە ئەوێ و ئەوانیش بەپەرۆ زەردەکەوە، دەمێك بوویەکێتی کوردی کەرکووکی کرد بوو بە چواریەکی دانیشتووانی ئەوێ. ئەمەلەکاتێکدا کە کوردی کەرکووك ئاڵای کوردستانیان بەرزکردەوە، بەڵام چەکدارەکانی پارتی و یەکێتی، بەفەرمانی ئەمریکاو هەڕەشەی ترك، لەکەرکووك چوونە دەرەوە. ئەوجا لەبەر ئەوەی پارتی و یەکێتی نەیانتوانی لەسەر دانانی پارێزگارێك رێکبکەون، کوردێکی سەربەخۆ بوو بەپارێزگارو ئەوچاتر، بەڵام هەتا ئەورۆکە، زۆربەی زۆری کوردە دەرکراوەکانی کەرکووك نەیانتوانیوە بگەڕێنەوە سەر ماڵ و ملکی خۆیان، بێجگە لەوەش ئەگەر کوردێك لەسەر کارێك دابمەزرێ، دەبێ ئاشوورییەك و ترکمانێك و عەرەبێکیش دابمەزرێنن، وادیارە ئەمریکاییەکان بەتەمانین عەرەبە داگیرکەرەکان بەزۆر لەکەرکووك دەربکەن، بەڵکو ئەوەی‌بەئارەزوو بگەڕێتەوە شوێنی خۆی، پارەی دەدەنێ،ئەوەش لەکاتێکدا کە ئەو عەرەبانە لەکەرکووکدا بمێنن، دیمۆگرافیای باشووری کوردستان تێکدەچێ. دوو زلحیزبەکە چ دەفەرموون لەم بارەیەوە؟

8- (**جامعة الدول العربية**)و لەپێش هەموویانەوە میسرو سووریاو حیجاز، دان بەرەوایەتیی (مجلس الحكم الانتقالی) دانانێ،، بەبیانووی ئەوەوە کەهەڵنە بژێردراوەلەلایەن گەلی عێراقەوە. لە ڕاستیشدا لەبەر ئەوەیە کەدەترسن (**عروبة العراق**) یان لە دەست بچێ. ئەم سێ دەوڵەتە، هەر ئەو سێ دەوڵەتەن،

کەکاربەدەستانی کورد، هەرساتەنەساتێ دەچوونە سڵاویان‌و پەسنی ڕژێمەکانیاندەدا.

ئایا ئێستە کاتی ئەوە نەهاتووە کە(5) ئەندامە کوردەکەی (مجلس) داوا لە(**جامعة الدول العربية**) بکەن، داوای لێبوردن بکا لەکوردو ئامادەبێ زیانەکانیان ببژێرێتەوەو، داوا لە دەوڵەتە عەرەبەکان بکەن کەئەوانیش ڕەوایەتیی خۆیان لەڕێی هەڵبژاردنی ئازادەوە بەسەرپەرشتیی کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان بەئیسپات بگەیەنن،چونکە هیچ ڕژێمێکی عەرەبی ڕەوایەتی نییە. ڕژێمی سووریا، دەستوورەکەی خۆی گۆڕی لەبەر خاتری ئەوەی کوڕی حافیز ئەسەد بکەنە "سەرکۆمار". ئەمانەن، کە باسی دیمۆکراسی و هەڵبژاردن دەکەن!!!.

9-کچی کورد، هەر بەکاربەدەستانی میسر نەفرۆشراون، بەڵکو بەگەلێك دەوڵەتی عەرەبی فرۆشراون، ئەو بەڵگەنامەیەی کە (میدیا) بۆ یەکەمین جار بڵاوی کردەوە، بەڕۆنی دەریدەخا کە ئەو کچە کوردانە بەکاربەدەستانی ڕژێمی میسر فرۆشراون، نەك بە بازرگانانی ژن، ئایا ئێستە پێویست دەکا کەبەرێز سەلاح ڕەشید وەزیری مافی مرۆڤی (یەکێتی) پاکانە بۆ خۆی بکا کە ئەونەیگوتووە شتی وابووە، بەڵکو تەنێ پرسیاری کردووە لەکاربەدەستانی میسر، تابزانێ ئاگایان لەمە هەیە یان نا، مەبەستی وی تەنێ زانیاری بووە لەسەر ئەو بابەتە(الشرق الاوسط 2003/8/3). ئایا لەباتی ئەوە، نەدەبوو حیزبی (یەکێتی) چەند خۆپیشاندانێکی گەورە سازبکا لە باشووری کوردستان‌و، بەغداو ئەورووپا و ئەمریکا و داوا لەنوێنەرایەتیی میسرو دەوڵەتە عەرەبییەکانی دی بکا، کچە کوردەکان بگێڕنەوە بۆ کەسوکاری خۆیان؟

وادیارە ئەم کچە کوردانەش دەچنە ریزی ئەو چەند هەزار ژنە کوردەی کە لەم (10-12 ساڵەی دواییدا (لەهەرێمی نەفرین) بەدەستی کەرپیاوان‌و تاوانباران کوژران، بێ ئەوەی هیچ کاربەدسەتێکی ئەم دووحیزبە لێیان بپرسێتەوە. بەڕاستی کەشوهەوای ئەم ڕۆژانە، لەکەشوهەوای سەردەمی ڕێککەوتننامەی مارتی 1970 دەچێ کە(یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لەئەورووپا ) (نوکسە) یەکەمین‌و تاکە ڕێکخراوێکی کوردی بوو کە گومانی خۆی بەرامبەر بەو

ڕێککەوتننامە کالۆ کرچە بڵاوکردەوە. خۆ ئەگەر ئەو ڕێککەوتننامەیە لەهەموو ڕوویەکەوە بێ کون و کەلەبەر بوایە، کێشەی کەرکووک و خانەقین و مەندەلی و فەیلییەکانی بڕاندایەوەو جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەکەش دەستبەجێ داوابکرایەو نەخرایە پاش چوار ساڵ، بەدڵنیاییەوە کارەساتی ماڵوێرانەکەرانەی مارتی 1975 مان نەدەدی.

دوو ڕۆژ پێش ئەمڕۆ 2003/8/10، سەت ڕۆژ تێپەڕی بەسەرهەرەسی ڕژێمی سەددامدا، بەڵام تائێستە نەکوردەکانی کەرکووک چوونەتەوە جێی خۆیان و نەئەوانەی زیانیان لێکەوتووە هیچ پارەو پوولێکیان وەرگرتووەو، کەرکووک و مووسڵ و خانەقین و مەندەلی و کووت وشارەبان وجەلەولاو شوێنە داگیرکراوەکانی دیکەی باشوور، هێشتا نەخراونەتەسەر (دوو بەڕێوەبەرێتییەکە ) وئەو دوو بەڕێوەبەریتییەش تائەورۆ نەبوونەتەوەیەك. بەڕاستی ئەگەر جەماوەری کورد نەکەونە خۆیان،هیچ دوور نیە مارتی 1975 جارێکی دی، بەڵام بەجۆرێکی دی،دووبارە ببێتەوە. لەبەر ئەوە ڕۆژ ڕۆژی کارەو، ڕۆژی قسە لەڕوویی و ڕاستگۆیی و شەرمنەکردن و هەستی خۆ دەربڕینە،کێش دڵی دێشی بابیەشێ، چش و هەزار جار چش!!!

بەرلین 2003/8/12

میدیا، ژ146، 2003/8/16

## کورد لەبەردەم دووڕییانی مان و نەمان دا
### (ڕەخنەگران و بێزارانی نێو حیزبەکان، پێویستە هەڵوێست بنوێنن)

کە ئەمریکا هێشتا پەلاماری عێراقی نەدابوو، بزووتنەوەیەکی یەکجار بەجۆش لەهەموو جیهاندا کەوتە سەرپێ، بەنێوی ڕێگرتن لە"شەڕخوازیی" ئەمریکا، کە لەڕاستیدا، ڕێگرتن بوو لەخستنی ڕژێمی سەددام. ئەم بزووتنەوەیە کە لەشێوەی "چێشتی مجێور" دابوو، پێکهاتبوو لەچەند دەوڵەتێکی خاوەن پیشەسازیی گەورەو، لەپێش هەموویانەوە، فەرەنساو ئەڵمانیاو رووسیاو چین. هەروەها دەوڵەتە عەرەبی و ئیسلامییەکان و فەلەستینییەکان و، ئەو بەرەیەی کە بە "بەرەی چەپاژۆ" (الجبهة اليسارية) دەناسرێ و، ئەوجا کلێسەکانی دیانەکان، بەسەرکردەیەتیی پاپا، کە زۆر بەداخەوە، دەستی دایە دەست تاوانبارێکی وەك تاریق عەزیزی وەزیری دەستە ڕاستی سەددام. ئەمانە، هەموو، بەنێوی "ئاشتیخوازی"یەوە قسەیاندەکردو، باسی "پاراستنی گەلی عێراقیان" دەکرد لە "دەستدرێژیی ئەمریکا"، بێ ئەوەی گەلی عێراق، پەنای بردبێ بۆیان کە بکەونە فریای. ڕۆژانە بەهەزاران کەس دەهێنرانە سەر شەقامەکانی ئەورووپا، بۆ خۆپێشاندان لە "دژی جەنگ"و، سووك و ڕیسواکردنی ئەمریکا، بێ ئەوەی بە یەك وشە نێوی ڕژێمی تێرۆریستی سەددام ببەن. بەڕاستی، زۆربەی زۆری ئەو خۆپێشاندەرانە تەفرەیانخوارد بوو، چۆنکە، کە دەچوومە نێویان و لێیانمدەپرسی، ئایە دەزانن مێژووی عێراق چییەو، سەددام و ڕژێمەکەی چۆنن، نەیاندەزانی و هەر دەیانگوت "ئەوە گرنگ نییە، ئێمە دژی جەنگین و، ئەمریکا دەیەوێ نەوتی عێراق داگیر بکا". بێگومان، هێندێکیان پاش دەمەتەقێ لەگەڵیان، کەمێك سارد دەبوونەوەو، حەزیان بەزانیاریی پتر دەکرد لەو ڕووەوە، بەڵام مخابن، لەهەموو جیهاندا وایە، کە کەسانی ساختەکارو خاوەن بەرژەوەندیی

خۆیی، لەرێی فرتوفێڵو شاردنەوەی مەبەستو بارگۆڕینەوە، توانیویانە هەزاران مرۆڤی سادەو ساویلکەو دەروونپاك، بۆ ئامانجی گڵاوی خۆیان بەکار بهێنن. ئەم تەفرە خواردووانە، نەیاندەزانی کە سەددامو رژێمەکەی، 35 ساڵە بانگەوازی جەنگیان داوە لەدژی کوردو عێراقی و ئێرانی و کوێتی و، هەر کەسێك کە رەخنەی گرتبێ لێیان. لەگەڵ ئەوەشدا، کەسانی دیکەش هەبوون، کاتێك دەهێنرانە بەر مێزی وتووێژ، نەیاندەتوانی مەبەستی خۆیان بخەنە لاوە، بۆ وێنە: وەزیری دەرەوەی ئەڵمانیا، یۆشکا فیشەر، لەوەرامی رۆژنامەیەکی ئەڵمانیدا کە پرسیبووی لێی، چ دەبێژی بەرامبەر بەوەی کە رژێمی سەددام مافی مرۆڤ پێشێل دەکا؟ گوتبووی: "تەنانەت ئەگەر رژێمێکیش مافی مرۆڤ پێشێل بکا، هێشتا نابێتە بەڵگەیەك بۆ رووخاندنی ئەو رژێمە بە زۆر". ئەمە قسەی ئێستەی ئەم یۆشکا فیشەرەیە کە لەشەستەکانی سەتەی رابوردوودا، چەپاژۆیەکی وا توندڕۆبوو، لەیەکێك لە خۆپێشاندانەکاندا، کەوتە پەلاماردانو لێدانی پۆلیسی ئەڵمانیاو، لەسەر ئەوەگیراو کەوتە بەر لێکۆڵینەوەو سزادانو، ئێستەش کەبووە بەوەزیر، هی ئەوەیە کە حیزبەکەی (حیزبی کەسکەکان)، هەرچەندە لەهەڵبژاردندا، رێژەیەکی یەکجار کەمی هێناوە، بەڵام بەیەککگرتن لەگەڵ سۆسیالدێمۆکراتەکاندا، کراوە بەوەزیری دەرەوەو، بەلای ئەو رژێمانەدا دادەتاشێ کە کاتی خۆی بەدەستنێژی ئیمپریالیستەکانی رۆژاوا دەیدانە قەڵەم. چۆنکە، ئەوەتە پاش رووخانی رژێمی سەددام، ئەم فیشەرەو سەرکردەکەی (کانسلەری ئەڵمانیا، گێرهارد شرۆیدەر) لەگەڵ پووتین (سەکردەی رووسیا)و جاك شیراك (کە نێوی بەجاك ئیراك دەرچووەو، بەیەکێك لەماوڕێکانی سەددام دەناسرێ) هەموو خەریکی ئەوەن، ئەمریکای لەجەنگدا سەرکەوتوو، لەرێکخستنی کاروباری عێراقدا، نووچ بهێنێو، بەسەرشۆڕی لەعێراق بچێتە دەرەوەو، ئەمانیش

**"لێخوڕە دەشتە"، فابریقە بازرگانییەکانیانو، سیاسەتی خۆیان، بەکامی دڵیان لەعێراق بخەنە کارو، ئەوەتە دەبێژن: "ئێمە سەرباز نانێرین بۆ عێراق، ئەگەر بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکانی لەگەڵ نەبێ. ئەمریکا بێ پرسی ئێمە، پەلاماری عێراقی داوە، لەبەر ئەوە، هەر خۆی بەرپرسیارە بەرامبەر پاراستنی ئاسایش لەعێراقدا".** رووسیاو فەڕەنساو ئەڵمانیا، هەرسێکیان، داوای ئەوە دەکەن کە دەوڵەتە دراوسێیەکانی عێراقو دەوڵەتە عەرەبو ئیسلامییەکان، لەدابینکردنی ئاسایش لەعێراقو لەئاڕاستە کردنی سیاسەتی عێراقو، ئاوەدانکردنەوەی عێراقدا، دەورێکی دیاریان هەبێ. تەنانەت شرویدەرو فیشەر، رۆژی 9/3، لەبەردەم ئەردۆغاندا کە هاتبوو بۆ بەرلینو، دەپاڕایەوە کە رژێمەکەی لە "یەکێتیی ئەورووپا"دا وەربگرن، بەکوڵودڵ پشتیانگرتو، تەنانەت یۆشکا فیشەر گوتی: "سەبارەت بەوەی باری ئاسایش لەعێراقدا لەدۆخێکی خەتەرناکدایە، پێویستە ترکیا دەورێکی دیاری بدرێتێ لەپاراستنی ئاسایشدا".

ئاشکرایە، ئەمەش مانای وایە کە دەستی رژێمی ترك بۆ لەنێوبردنی کورد، بەرەڵلا بکرێ. ئەمەش لەکاتێکدا کە رژێمی ترك، بەبەڵێنو، دەمچەور کردنی هێندەك سەرۆکهۆزی عەرەب، کارێکی وایکردووە، کە ژمارەیەك ئیمزا کۆبکەنەوەو، داوا لەرژێمی ترك بکەن، سەرباز بنێرێ بۆ عێراقو، لەم تەنگانەیەی ئەمریکاو، ئەم هەڵوێستەی ئەڵمانیاو فەڕەنساو رووسیا، سووت وەربگرنو، وەك خۆیان بەڕۆنی دانیپێدادەنێن، تاکو کورد هیچی دەستنەکەوێ. لەم کورد دوژمنیەشدا، رژێمەکانی ئێرانو سووریا، سەرەڕای ناحەزییان بەرامبەر رژێمی ترك، هاوهەڵوێستن لەگەڵیو پێکەوە کار دەکەن. ئەوەتا لەم رۆژانەدا، رژێمی ترك بۆ رازیکردنی دڵی کاربەدەستانی ئێران، ژمارەیەکی زۆر لەو کوردە رۆژهەڵاتییانەی دایەوە

دەست رژێمی ئێران، کە رایانکردبووە نێوچەی بن دەسەڵاتی ترك، ئەگەرچی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، دانیبابوو بەمافی پەنابەرییاندا، ئەو کوردانە، هەر دەستبەجێ پاش گەیشتنە ئێران، خرانە زیندانەوە. شایانی باسە، ئەمە سووکایەتیکردنە بەکۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، کە دەوڵەتە زلەکان ئەم "کۆمەڵە"یان وازلکردووە، دەفەرموو بابزانین بەرامبەر بەم کردەوە تاوانکارانەیەی رژێمی ترك دەفەرمووێ چی؟ ئەوەش دەبێ بێژین کە رژێمی سووریا، ژمارەیەکی زۆر کوردی داوەتە دەست رژێمی ترك، کە هێندێکیان کوردی ترکیا نین، بەڵکو لەو کوردانەی سووریان کە "جنسیة"یان لێسەندراوەتەوەو، لەهەموو مافێك بێبەری کراون.

ئەوجا، ئەوەی کە دەوڵەتە عەرەبییەکان، دان بە "مجلس الحکم الانتقالي" دانانێن، چۆنکە بەلای ئەوانەوە، بەهەڵبژاردن نەهاتووەتە سەر کارو، رەوایەتی نییە، راستییەکەی لەبەر ئەوەیە کە لەوە دەترسن، "عرووبەی تێرۆیستانە"ی عێراق، بەرەو پاشەوە بگەڕێتەوەو، رژێمێکی نیوە دێمۆکراسی لەعێراقدا دروستبێ کە رژێمە دیکتاتۆرەکانی ئەوان بخاتە لەرزە، لەگەڵ ئەوەشدا، دەبوو "مجلس الحکم الانتقالی"، بۆ پاراستنی ئاوڕووی خۆی، بیگوتایە: "ئێمە دان بەرەوایەتی رژێمە عەرەبییەکاندا نانێین، هەتا هەڵبژاردنێکی ئازاد نەکەن لەژێر چەتری کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکانداو، ئەو کارە دژ بەمرۆڤایەتییانەی، تائێستە فەرمانڕەواکانیان دژ بە گەلەکانیان کردوویانە، نەخرێنە بەر دادگەیەکی بێ لایەن". بەلام داخی گرانم، ئەوەتە "مجلس الحکم الانتقالی" وا خۆی سووککردووە کە تکا دەکا رێبدەن بەوەی ئەندامێکی لەکۆبوونەوەی وەزیرەکانی دەرەوەی دەوڵەتە عەرەبییەکاندا بەشدار ببێ. سەیر ئەوەیە وەزیری دەرەوەی عێراق کە کوردە دژی هاتنی لەشکری ترکە بۆ عێراق،

بەڵام "مجلس الحكم" قوڕو قەپی کردووە، ئایە ئەمە دەرفەتێك نییە بۆ بەڕێز کاك هۆشیار زیباری، هەڕەشەی "تعليق عضوية" بکا؟ وەك بحرلعلووم کردی؟.

بەدڵنیاییەوە، ئەم بارە نالەبارەو، ئەم هەموو گوشارە زۆرەی وا لەسەر ئەمریکاو، ئەو مەسرەفە زۆرەی کە رۆژانە کەوتووەتە سەریەو، خوێنی ئەو سەربازانەی کە رۆژانە لەعێراق دەڕژێرێ، بەناچاری، هەڵوێستی کۆنی توندو تۆڵی ئەمریکا، شلدەکاتەوە. با هەر دوور نەڕۆین، جاران ئەمریکا داوای لەرژێمی ترك دەکرد سەرباز نەنێرێ بۆ عێراق، ئێستە خۆی تکا دەکا لێی، سەرباز بنێرێ. بێجگە لەوەش دۆناڵد رامسفیلد، وەزیری بەرگریی ئەمریکا، دەبێژێ "ئەو دەوڵەتەی سەرباز بنێرێ بۆ عێراق، کورسیەك بۆ خۆی مسۆگەر دەکا لەژووری بڕیارداندا، لەبارەی چارەنووسی عێراقەوە". ئەوجا قوڕ بەسەر کورد، چۆنکە ئەو دەمە، رژێمی ترك خاوەن بڕیار دەبیٚو، هەر لەئێستەشەوە، وەك کوردە کە دەبێژی "مانگ، سەر لەئێوارێوە دیارە". لەبەر ئەوە، دەبێ ئەوە بخرێتە بەرچاو کە لەوانەیە، ئەمریکا جۆرە "تنازلات"یکێش بکا کە لەبەرژەوەندیی کورد نەبێ. سەرکردەکانی حیزبە کوردییەکان دەفەرموون چی؟

تائێستە، کەمدابێژێك باسی بەرەی نەیارانمانکرد، ئەوجا با بێینە سەر بەرەی کوردو، بەر لەهەموو شتێك بپرسین، کورد مانای کیٚ؟

ئێمە ئەگەر درۆ لەگەڵ خۆمان نەکەین، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە بەرەیەکی رۆشنبیرانی کورد، کە سەربەخۆ بیر بکاتەوەو، سەر بەم حیزبو ئەو حیزب نەبیٚو، هەڵوێستی بایەتانەو بوێرانەی هەبیٚو، لەنێو جەماوەریشدا دەسەڵاتو پشتگیرییەکی فراوانی هەبێ، نییەو نییە. راستە، کوردی رۆشنبیری بەویژدانی ئازاو سەربەخۆ هەن، بەڵام وەك تاکە تاکەو، پچڕ پچڕو، بێ بنکە (بناوانی) جەماوەری، نەك وەك بەرەیەکی یەکگرتووی

خاوەن قورسایی جڤاکی. ئەمانە، هەرچەندێك هەوڵبدەنو، زەحمەتبکێشن، ناتوانن دەورێکی کاریگەر بنوێنن. لەنێو حیزبەکانیشدا مرۆڤی رۆشنبیری بەویژدان هەن، کە رەخنە لەسیاسەتی حیزبەکانیان دەگرن، بەلأم لەبەر ئەوەی پێیان بە رەوڕەوەی لاسەنگی حیزبەکانیانەوە بەستراوە، دەفیان دەنگ نادا. ئەمانە، زۆریان هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی کە رێبازی حیزبەکانیان، بەو شێوەیەی ئەوڕۆی، بەرەو ئازادیی کوردو سەربەخۆییی کوردستان ناڕواو، ئەوەی حیزبەکانْ داوای دەکەن، نرخی سەتیەکێکی ئەو قوربانییەی نییە کە نەتەوەی کورد داوێتیّ، لەبەر ئەوە بێزاریو ناهومێدی خۆیان ناشارنەوەو، جاروبار دەشیخەنە سەر کاغەز. هێندەك جاریش، وادەگاتە جەرگیان، کە واز لەحیزبەکانیان دەهێننو، دەچنە مالّی خۆیانو، زۆریشیان، بەخەفەتو داخو خەمەوە، لەنێو حیزبەکاندا دەمێننەوەو، چاوەڕوانی ئەوەن، تراویلکەکە ببێتە ئاو، لەکاتێکدا، کە نەگۆشەگیریو خۆخواردنەوەو، نەچاوەڕوانیی بێسووت، دادی کەس دەدا. لەبەر ئەوە، وا لێرەدا، ئەم پێشنیازەی خوارەوە دەخەمە بەردەم هەموو ئەوانەو، هیوام وایە، بەوپەڕی هۆشو لێوردبوونەوەو، تاوتۆکردنەوە، لێی بکۆڵنەوە:

چ دەبیّ، ئەگەر رەخنەگرانو ناڕازیانی نێو هەموو حیزبەکان (مەبەستم لەوانەیە کە لەرێبازی هەڵەو چەواشەکەرانەو، داخوازییە پووچەڵەکانی حیزبەکان ناڕازیو بەتەنگهاتوون، نەك ئەوانەی لەبەر مەبەستی تایبەتی خۆیان، لەکاتی گونجاودا، کەوتوونەتە تەقەو، سالأنی سالّیش، هەموو تاوانێکی کاربەدەستەکانیان شاردووەتەوە، بۆیان) قسە بکەن بەیەكو، پێکەوە کۆبوونەوەی جەماوەرانە لەکوردستانو دەرەوەی کوردستاندا رێکبخەنو، بەرنامەیەکی تێروتەسەلی کار، بخەنە پێش خۆیانو، خالّ بەخالّ وتووێژ بکەن لەسەریو، لەسەر هەموو خالێك بڕیار بدەنو، ئیمزای

خۆیان بخەنە ژێریو، ئەگەر بەباشیشیان زانی، ئەم خاڵانەی خوارەوەش بخەنە بەرچاو:

1-تەماشایەکی مێژوو و کارنامەی حیزبە کوردییەکانی هەموو کوردستان بکەن، لەسەتەی رابوردووەوە، بەتایبەتی لەم پەنجا ساڵەی دواییداو، بزانن، ئایا ئەم حیزبانە، لەم ماوەیەدا، چەند هەنگاویان ناوە بەرەو ئامانجەکانی نەتەوەی کورد، کە وەك هەر نەتەوەیەکی دیکەی ئەم جیهانە، بریتین لەئازادیو سەربەخۆیی. ئەوجا ئەم پرسیارە لەخۆیان بکەن: ئایە حیزبە کوردییەکان، کە جاران هەر باسی مارکسیێتیو لینینێتیان دەکردو ئێستە باسی دیمۆکراسیو پێشکەوتنخوازی دەکەن، بەپێوانەی دیمۆکراسی، مافی ئەوەیان هەیە، بەنێوی کوردەوە قسە بکەن، یان دەبێ تەنێ بەنێوی حیزبەکانی خۆیانەوە قسە بکەن؟ چۆنکە تائێستە، هەڵبژاردنێکی ئازاد لەهەموو کوردستاندا نەکراوەو، ئەو هەڵبژاردنەی کە لە "هەرێمی نەفرین"دا لەساڵی 1992دا پەرلەمانی بۆ چوار ساڵ دەستنیشانکرد، پاش ئەوە، واتە لەساڵی 1996ەوە تا ئەورۆ، هەڵبژاردن نەکراوە. لەبەر ئەوە، دوو زلحیزبەکەو هیچ حیزبێکی دیکەش، مافی نوێنەرێتیی کوردی نەماوەو نییە. خۆ ئەگەر دەیانەوێ بەنێوی کوردەوە قسە بکەن، فەرموو، با بچن هەڵبژاردنێکی نوێ بکەن. ئەوجا کە ئەم دوو زلحیزبە، رێ بەهەڵبژاردنێکی نوێ نادەن، هەروەها رێیان لەگشتپرسییەك گرتووە، بۆ دیاریکردنی چارەنووسی باشووری کوردستان، ئایا ئەمە، مانای ئەوە نییە کە ئەم دوو زلحیزبە، نەك هەر باوەڕیان بە دیمۆکراسی نییەو بەس، بەڵکو بە کەلەگاییو دیکتاتۆرێتی فەرمانڕەواییەك دەکەن، کە لەلایەن گەلەوە پێیاننەسپێردراوە؟

2-رووخانی رژێمی سەددامو، هەڵوەشاندنەوەی لەشکری تێرۆریستی عێراقو، هێنانە تەنیشت یەکی لەشکری ئەمریکاو هێزی چەکداری کورد،

هەروەها، ناكۆكیی نێوان ئەمریكاو دەوڵەتە داگیركەرەكانی كوردستان، هەڵكەوتێكی مێژوویی بوو، كە باشترین‌و لەبارترین هەلومەرجی هێناوەتە پێشەوە بۆ كورد، ئایا بەستنی چارەنووسی كورد بەفیدەرالیزمەوە، كە ئەوەش هەر وەك ئەو ئۆتۆنۆمییەیە، كە چەند ساڵ كوردیان پێ خەڵەتاند، كارێكی بەجێیە؟ ئایا ئەم درۆشمە، شتێكی راستە لەم كاتەدا؟ ئایا پێویست نییە، یەكسەر داوای سەربەخۆیی بكرێ؟ ئایا كە ئەم هەلە لەدەستچوو، كەوا خەریكە لەدەستبچێ، جارێكی دی دروست دەبێتەوە؟

3-حیزبێكی كوردی، كە بیست ساڵی رەبەق، هەزاران كوردی دڵپاكی، بەنێوی "تێكۆشین بۆ سەربەخۆیی كوردستان"ەوە تەفرەدابێ‌و، هەر كەسێكیش باسی ئۆتۆنۆمی، یان شتێكی دیكەی كردبێ، بێجگە لەسەربەخۆیی، بەخاینی دابێتە قەڵەم‌و، خوێنی ئەوانەشی حەلاڵكردبێ كە رەخنەیانگرتووە لێی‌و، كردەوەی وای نواندبێ كە دوژمنانی كورد، كورد بەتێرۆریست بدەنە قەڵەم‌و، لەپێناوی ئەو ئامانجەی سەرەوەدا، بووبێ بەهۆی چۆڵكردنی هەزاران گوندی كوردستان‌و، رەڤینی سێ ملیۆن كورد لەكوردستان‌و، بوونیان بە "ئاردی نێودڕك"، هەریەك‌و دووان بەلایەكدا، پەرەوازەو بێ نەوا بووبن، ئەوجا پاش ئەم بیست ساڵەو، لەبەر خاتری تاكە زەلامێك، شەڕی وەستاندبێ‌و، سیاسەتی خۆی 180 پلە گۆڕیبێ‌و، ئێستە هەر كەسێك باسی سەربەخۆیی كوردستان بكا، بەخاین‌و نۆكەری بداتە قەڵەم، (ناشزانم نۆكەری كێ؟)و كەوتبێتە باسی "چارەسەری دێمۆكراتی"و تەنانەت بەئۆتۆنۆمیش رازی نەبێ، ئەگەر هاتوو كەسانێك لەنێوخۆیدا پەیدا بوون‌و، وێرایان باسی "ئۆتۆنۆمی" بكەن‌و، پاش پێنج ساڵ رستنی تەشیی "چارەسەری دێمۆكراسی"، هەڕەشەی تازە كردنەوەی شەڕ بكا، وەك شەڕ گاڵتەی منداڵان بێ، ئەمە لەكاتێكدا كە ئەو بارودۆخەی بۆ ئەو حیزبە هەڵكەوتبوو، بۆ هیچ حیزبێكی دیكە، لەهەموو

مێژووی حیزبایەتیی کورددا هەڵنەکەوتبێ، کەچی، چارەنووسی خۆی، بەدەستی خۆی، گەیاندبێتە ئەمڕۆژە، و، لکە "سۆرانی"یەکەشی لەباشووری کوردستاندا، دژی ئەوانە قسە بکا کە باسی "فیدەرالیزم" دەکەن و کەرکووک بەکوردستان دەزانن و، بەڵام ئەو دژ بەمەو، بەدڵی تۆرانیی و بەعسی بجووڵێتەوە، ئایە دەبێ هەڵوێست بەرامبەر بەو حیزبە چۆن بێ و، چۆن بخرێتە سەر ڕێی ڕاست؟

4-ئەگەر حیزبێك، خۆی بەعێراقی زانی، کەچی ناوی "کوردستانی" بەخۆیەوە نا، دیارە، ئەو حیزبە، نەعێراقییە، عێراقی بێ و، نەکوردستانیشە، کوردستانی بێ، بەڵکو شتێکە وەك "نێرەمووك" وایە، ئەمەش دەبێتە هۆی سەر لێشواندنی کوردیش و عێراقیش و، دەستخەڕۆ کردنیان بەرامبەر بەو چاوەڕوانییانەی هەیانە لەو حیزبە. کورد کوردستانین و، عێراقییەکانیش عێراقین. هیچ کاتێکیش خەڵکی باشووری کوردستان، دەنگیان نەداوە بۆ ئەوەی ببەسترێن بەعێراقەوە، بەڵکو بەزۆری چەکی بەریتانیا کراون بەعێراقی و، ئەوەتا بەریتانیاییەکانی ئەوڕۆ، خۆشیان دان بەم ڕاستییانەدا دەنێن. لەبەر ئەوە، ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ، ئایا ئەو حیزبانەی ئاوا دوو "فلیچقانە"ن، ڕەوایەتییان هەیە؟

5-هەموو نەتەوەیەك ئاڵایەکی هەیە، کە لەپاڵ سروودی نەتەوەییدا، بەنیشانەی بوون و، بەپیرۆزترین گەنجینەی ئەو نەتەوەیە دەژمێردرێن و، هەر کەسێك خۆی بەئەندامی ئەو نەتەوەیە بزانێ، شانازییان پێوە دەکا. باشە، ئایا ئەگەر حیزبێك وشەی "کوردستانی" بەخۆیەوە نا، بەڵام ساڵانی ساڵ لەدژی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان وەستاو، لەجیاتی ئەوە، پەڕۆییەکی حیزبی هەڵکرد، پاشان کە دیتی ئەمریکاییەکان ڕێزی ئاڵای کوردستان دەگرن، ئەوجا بەنابەدڵی، ئاڵای کوردستانی خستە پاڵ ئاڵای سەددامەوەو، لەمەش سەیرتر، ئەگەر هاتو سەرکردەی ئەو حیزبە چووە

ئوسترالیاو، لەکاتێکدا کە کۆمەڵێك کوردی دانیشتووی ئەوێ، بەئاڵای کوردستانەوە چوون بەپیرییەوە، لەباتی ماچکردنی ئاڵای کوردستان، بەتووڕەییەوە بێژێ: "ئەو ئاڵایە لابەن"و بەمە چەمۆڵویەك بنێ بەڕووی کوردەکان‌و، دڵی ئەو چەند تۆرانیو عێراقچییە خۆشبکا کە لەوێ بن.

ئەوجا ئێستە ئەم پرسیارانەی خوارەوە دێنە پێشەوە:

أ–ئایا ئەو کوردانەی چوو بوون بەپیر "سکرتێری گشتیی حیزب"ەوە، شەرمیاننەکرد مانەوەو، بەجارێ نەچوونە دەرەوە، کاتێك سووکایەتی بەئاڵای کوردستان کرا؟.

ب– ئایا نابێ ئەوانەی لەو حیزبەدان‌و، خۆیان بەکورد دەزانن، هێندە سەریان بەرز بێ، داوای هەڵپەساردنی "سکرتێری گشتی" بکەن، ئەگەر هاتو پێی بەگوناهباریی خۆیدا نەناو، بەئاشکرا داوای لێبوردنی لەنەتەوەی کورد نەکردو، بەڵێنی نەدا کە ئەو کردەوەیە دووبارە نەکاتەوە؟

ئەوەش بخەمەوە بیر، کاتێك کە یەك دوو کورد لەخۆپێشاندانێکدا، ئاڵای ترکیان دڕاند، واتە سووکایەتییان کرد بەئاڵای ترك، ڕۆژنامەکانی هەردوو زلحیزبەکە بەو کوردانەیان گوت "بێ ئەخلاق"! باشە. سووکایەتیکردن بەئاڵای کورد چییە؟

6–ئەگەر دوو زلحیزب، لەماوەی 12 ساڵداو، پاش کوشتنی هەزاران چەکدارای یەکدی‌و، پاش پەنابردن بەپێتەختەکانی داگیرکەرانی کوردستان‌و، هێنانی لەشکری داگیرکەران بۆ "هەرێمی نەفرین"و، بەستنی چەند "پەیمانێکی ئاشتی" لەگەڵ یەك‌و، هەزاران کۆبوونەوەی "دوو قۆڵی"، نەیانتوانیبێ بەڕێوەبەرێتیی دوو شار بکەن بەیەك، ئایا دەتوانن ئامانجی نەتەوەی کورد، نەك لەئازادیو سەربەخۆییدا، بەڵکو بچکۆلەترین ئامانجی بەجێ بهێنن؟، بەتایبەتی لەم کاتە نازکەدا، کە شارەزاییەکی نێو

نەتەوەییانەو، سنگێکی فراوان‌و، هەستکردن بەبەرپرسیارێتی‌و یەکگرتنی توندو تۆڵ لەلایەن حیزبەکانەوە، زۆر زۆر پێویستە؟

7-ئایا دەکرێ پشت بەدەستووری عێراق ببەسترێ، لەکاتێکدا ئەگەر لەدەستووردا بنوسرێ، هەر کەسێك دژی "یەکێتیی گەلانی عێراق" بوەستێ، بەتاوانبار بدرێتە قەڵەم‌و، بەهیچ جۆرێك رێ بەجیا بوونەوەی باشووری کوردستان نەدرێ، لەکاتێکدا ئەگەر گەلی کورد ویستی جیابێتەوە؟ پاشان، ئەوەش هەیە، دەستوورێك لەکاتی داگیرکردنی وڵاتێکدا رێکخرابی، لەباری قانوونییەوە رەوایەتیی نییە.

8-ئایا راست‌و رەوایە، بۆ دیاریکردنی سنووری باشووری کوردستان‌و، بەتایبەتی مووسڵ‌و کەرکووك‌و . . . هتد گشتپرسیی بکرێ؟ ئایا هیچ نەتەوەیەك ئامادەیە، لەبارەی سنووری وڵاتەکەی خۆیەوە، بکەوێتە گشتپرسی؟ ئایا رژێمی ترك ئامادەیە، لەئەستەموول گشتپرسی بکا، لەکاتێکدا کە 4 ملیۆن کورد لەئەستەموول دەژین‌و، ئەستەموول گەورەترین شاری کوردە، پاش ئامەد (دیاربەکر)؟ ئایا عێراقییەکان ئامادەن لەبەرخاتری ملیۆنێك کوردی بەغدا گشتپرسی لەبەغدا بکەن؟

**9-ئایا ناکرێ لەئەمریکا بگەیەندرێ، کە عێراق هەروا بەمزووانە نابێ بە "ماستی مەیو" بەڵکو نەخشەو پیلانی نەیارانی ئەمریکا، بەرەو ئەوە دەچێ کە ئەمریکا لەعێراقدا بشکێ‌و، بەسەر شۆڕی لەعێراق بچێتە دەرێ. ئەوجا، ئەو سەرشۆڕییە، هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە کە هەڤاڵبەندی ئەمریکان‌و، لەنێو ئەوانەشدا کورد. لەبەر ئەوە، ئایا باشتر نییە، ئەمریکا لەژێرەوە بەپێی پەیمانێك، کە دەتوانرێ قسەی لەسەر بکرێ، لەگەڵ رووسیا رێکبکەوێ‌و، رووسیا هێزێکی گەورە بهێنێتە نێوەراستی عێراقەوەو، هێزەکانی ئەمریکاش، بەمەندازەی پێویست، بێنە باشووری کوردستانەوەو، بەپێی پەیماننامەیەك لەگەڵ کورد، بنکەیەکی سوپایی بۆ**

**ئەمریکا، لەباشووردا دابمەزریٚ‌و، ئەمریکاش دان بەباشووری کوردستاندا بنیٚ، وەك دەوڵەتێك، یان ئەگەر دەوڵەتیش نەبیٚ، وەك پرۆتێکۆراتێکی (محمیە)ی ئەمریکا بۆ ماوەی 25 ساڵ. ئەو دەمە ئەمریکا، نەپێویستی بەرژێمی ترك دەبیٚ‌و، نە سووریاو ئێرانیش دەتوانن کردەوەی تێرۆریستانە بنوێنن‌و، بەشێکی زۆری لەشکرەکەی دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی‌و، ئەو هەموو ملیاردە مەسرەفەشی لەکۆڵدەبێتەوەو، کوردیش هەتا هەتا سوپاسبژێری دەبن‌و، ئایا ناکریٚ لەم ڕێگەیەوە، بەکردەوە، هەنگاوێك بنریٚ.؟**

ئەوجا ئەگەر ئەم پرسیارانەو گەلێك پرسیاری دیکە کران‌و، وەرامدرانەوە، ئەوسا لەوانەیە، ئەو کۆمەڵە خەڵکە کە سەر بەچەند حیزبێکی کوردیین، بیر لەوە بکەنەوە، پێکەوە هاوبەندی (اتصال)یەکی رۆشنبیرانەی درێژخایەن لەگەڵ یەك ببەستن‌و، ژمارەیەکی زۆر خەڵکی ناحیزبیش لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوەو، دەنگی خۆیان بگەیەنن بەهەموو نەتەوەی کوردو بێگانەو، رەنگە هیوایەك هەبیٚ بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێك بۆ کێشەی کورد، ئەگەرنا ئاسۆی هیوای کورد زۆر لێڵە.

بەرلین 2003/9/6

**میدیا**، 2003/9/9

# گێڕانەوەی سەروەریێتیی بۆ عێراق،
# بێ دیاریکردنی سنوورو چارەنووسی باشووری کوردستان،
# هەرەسهێنانێکی دیکەی بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی کوردە

کوردستان، لەسەرەتای سەتەی رابوردوودا، بە زۆر بەسەر سێ ئیمپراتۆرێتیی سیستەم جیاوازو دوژمن بەیەکدا، دابەشکرابوو. یەکەمیان: ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی بوو، کە خۆی بە پارێزگاری ئاینزای سوننی دەزانیو، دووەمیان: ئیمپراتۆرێتیی قاجاری بوو، کە خۆی کردبووە دەمڕاستی شیعەگەرێتیو، سێیەمیشیان: ئیمپراتۆرێتیی رووسیا بوو، کە نوێنەرێتیی دەسەلاتی کۆلۆنیالیستانەی بنەماڵەی قەیسەری رووسیای دەکرد. داڕمانی نەریتی کۆمەلایەتی لەم سێ ئیمپراتۆرێتیە پانو بەرینەداو، جەنگی درێژخایەنیان دژی یەك، کە هێزی لەبەر هەر سێکیان بڕیبوو، مرخی کۆلۆنیالیستە چاو برسییەکانی ئەورووپایی لەسامانی فراوانیان خۆشکردو، لەئەنجامدا چەند دەولەتێکی رۆژاوایی، وەك بەریتانیاو فەرەنساو ئیتالیاو یۆنان یەکیانگرتو، بانگەوازی جەنگیان لەدژی ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی دا، بەبیانووی ئەوەوە کە لەگەلْ ئەلْمانیای دژ بەرەیان بووەتە هەڤالْبەندو، ئەمەش بوو بەهۆی هەرەسهێنانی ئەم ئیمپراتۆرێتیە کە چەند سەتسالێك بوو، وەك دەسەلاتێکی دەستدرێژکەر، خۆی بەپێوە راگرتبوو.

جەنگی "هاوپەیمانان" دژی دەولەتی عوسمانیو ئەلْمانیا، رێخۆشکەرێك بوو بۆ شۆرشی ئۆکتۆبەر لەرووسیاو، رووخانی دەسەلاتی قەیسەرییو، دامەزراندنی رژێمی دیکتاتۆرێتیی سۆڤیەتیو، هەر ئەو هۆیەش بوو کە زاتی نایە بەر نەخوێندەوارێکی ملهوڕی وەك رەزا خانی "میر پێنج"، کە

لەرێی کودەتایەکی سوپاییەوە، ئیمپراتۆرێتیی شەقوشڕی قاجاری بڕووخێنیو، بەیارمەتیو پشتگیریی کۆلۆنیالیستەکانی بەریتانیاو، رژێمی تازە دامەزراوی سۆڤێت، خۆی بکاتە شاو میری سەربڕ لەئێرانو، رۆژهەلاتی کوردستاندا.

جەنگی جیهانی یەکەم، دەرفەتێکی گەورەی هێنایە پێشەوە بۆ کورد، بۆ رزگاریو سەربەخۆیی، کە ئەوە بوو پەیمانی سێڤری لێکەوتەوەو، تەنانەت دەوڵەتێکی کوردیی نیوە سەربەخۆیش لە باشووری کوردستاندا بەسەرۆکایەتیی شێخ مەحموودی حەفید دروستبوو، کە ئەوە یەکەمین ناوکی دەوڵەتی ناسیۆنال بوو لەهەموو خۆرهەلاتی ناڤیندا. بەلام هەلومەرجی نێوخۆیی و دەرەوەی کوردستان، ئاشبەتالی رووخانی شانشینی کوردستانی پێوە بوو، کە ئەنجامەکەی هاتنە کایەی چەند دەوڵەتێکی دەستکردی بیانیی دوژمن بە کورد بوو لەسەر خاکی کوردستان.

جەنگی جیهانیی دووەم، دەرفەتێکی دیکەی خستە بەردەم کورد، کە بوو بەهۆی دامەزراندنی کۆماری کوردستان لەرۆژهەلاتی ولاتدا، بەلام دیسانەوە هەلومەرجی نێوخۆو دەرەوە، ئاشبەتالی رووخانی کۆماری کوردستانو پتەو کردنی ریزەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانو، دژ بەکوردی لێکەوتەوە.

شایانی باسە کە جەنگی جیهانیی یەکەم بوو، کە بوو بەهۆی تێکشکاندنی سەروەرێتیی ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی و، جەنگی جیهانیی دووەمیش بوو کە بوو بەهۆی تێکشکاندنی سەروەرێتیی رژێمی رەزا خان لەئێران، ئەویش بەهۆی داگیرکردنی خاکی فەرمانڕەواییی ئەم دوو دەوڵەتە لەلایەن لەشکری بێگانەوە. نەمانی سەروەرێتیی ئەو دوو دەوڵەتە بوو، کە ئەو دوو دەرفەتە بەنرخەی پێشکێش بەکورد کرد. هەر لەگەڵ گەڕانەوەی

سەروەریێتیی بۆ ئەو دوو دەوڵەتە، یەکەمیان بەدانـنان بەدەوڵەتی مستەفا کەمالدا بەنێوی "ترکیای نوێ"وەو، دووەمیشیان بەدانـنان بەسەروەریێتیی ئێران‌و محەممەد رەزای کوڕی رەزا خاندا، وەك شای ئێران، کێشەی کورد بووە وە بەکێشەیەکی نێوخۆیی و چارەسەر کردنی کەوتە دەستی ئەو دوو رژێمە.

ئێستە، ئەو وانە (دەرس)یەی کە لەم بەسەرهاتانەوە فێری دەبین ئەوەیە، کە گەلانی ژێر دەستەی وڵاتانی داگیرکراو، ئەگەر هاتو خۆیان رێکخستبوو و ریزەکانیان یەککخستبوو،و زانییان چییان دەوێ، ئەوا دەتوانن لەکاتی هەرەسهێنانی سەروەریێتیی داگیرکەرەکانیاندا، سەروەریێتیی بەسەر خاکەکەی خۆیاندا بپچڕن. بەپێچەوانەی ئەمەوە، لەکاتی بوونی سەروەریێتیی دەوڵەتێکی داگیرکەردا، زۆر زەحمەتە گەلێکی ژێردەستە بتوانێ بگاتە سەربەخۆییو، وەدەستهێنانی چارەنووسی خۆی. یۆگوسلافیا نموونەیەکی زەقی ئەمەیە، هەتا هێزی سوپاییی ئەمریکاو ئەورووپا، وڵاتی یۆگوسلافیایان داگیر نەکرد، کرواتستان نەبوو بەدەوڵەتێکی سەربەخۆو، کۆزۆڤۆش لەژێر باری پاکتاوکردنی رەگەزیدا دەیناڵاند. هەر ئەم دەردەشە کە بوو بەهۆی سەرنەکەوتنی هەموو شۆرشەکانی کورد، سەرەڕای هەموو قوربانییەك کە گەلی کورد دای‌و، هەموو گەلکوژییەك کە رژێمەکانی سۆڤێت‌و ترك‌و عەرەب‌و فارس لەکوردیان کرد. چۆنکە هەموو شۆرشەکانی کورد، پاش دروستبوونی دەوڵەتە داگیرکەرەکان‌و گەیشتنیان بەپلەی سەروەریێتیی، هەڵگیرسان. مەزنترین شۆرشی کورد، شۆرشی ئەیلوول بوو، کە 14 ساڵ درێژەیکێشاو، (150) هەزار پێشمەرگەو، سەرۆکێکی گەلەڤین (شعبی)و مەزنی وەك مەلا مستەفای بارزانی هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەنجامەکەی بەناشبەتاڵ تەواو بوو، چۆنکە عێراق دەوڵەتێکی خاوەن سەروەریێتیی

بوو، شۆرشی ئەیلوولیش بۆ تێکشکاندنی سەروەرێتیی عێراق هەوڵی نەدەدا، بەڵکو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەژێر خێوەتی سەروەرێتیی عێراقیدا تێدەکۆشا. بەڵام سیاسەتبازانی کورد بەداخەوە هیچ لەوە فێر نەبوون و ئەوەتە، دەست دەکەنەوە بەو کونەدا، کە دوپشکەکەی تێدایە.

شایانی باسە کە جەنگی هەشتساڵەی ئێران و عێراق کە بەجەنگی یەکەمیی کەنداو نێوبراوە، دەرفەتێکی زێرینی دیکەی هێنایە پێشەوە بۆ کورد، ئەگەر سیاسەتکارانی کورد نەچوونایە بەگژ یەکداو، هەموویان یەکبوونایەو، بەشێکیان لەگەڵ خومەینی، دژی رژێمی سەددام و، بەشەکەی دیکەیان لەگەڵ سەددام، دژی رژێمی خومەینی نەبوونایە، بەڵکو یەکیانبگرتایەو، هەوڵیان بۆ تێکشکاندنی سەروەرێتیی دەوڵەتێك لەو دوو دەوڵەتە بدایە، ئەو دەمە کورد دەیتوانی لەبەشێکی وڵاتەکەیدا لافی سەروەرێتیی لێبداو، ببێتە هاوبەش لە بڕیاردانی چارەنووسی دوای جەنگدا. بەڵام جەنگی هەشتساڵە، چۆنکە سەروەرێتیی ئێران و عێراقی وەك خۆی هێشتەوە، ئەنجامەکەی بۆ کورد ئەوە بوو کە پێویست بە باسکردن ناکا، ئەمەش گوناهێکی گەورەی دیکەی کاربەدەستانی حیزبە نانەتەوەییەکانی کوردستان بوو.

جەنگی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان دژی عێراق، بەسەرکردەیەتیی ئەمریکا لەساڵی 1991داو، دەرپەڕاندنی لەشکری سەددام لە کوێت، بوو بەهۆی راپەڕینی مەزنی بەهاری 1991و رزگارکردنی بەشێکی گەورەی باشووری کوردستان، بەڵام تێکشکانی لەشکری سەددام لەبەردەم لەشکری ئەمریکادا، نەبوو بەهۆی نەهێشتنی سەروەرێتیی عێراق بەسەر باشووری کوردستاندا. لەبەر ئەوە سەددام بەهاسانی کوردستانی گرتەوە، بێ ئەوەی تووشی هیچ جۆرە رەخنەیەکی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان ببێ. بەڵام

گەلرەوەکەی بەهاری ئەو ساڵەو، ئەو بارودۆخە خەمهێنەرەی کە لەنێوچەکەو جیهاندا لەوەوە سەرییهەڵدا، کارێکی وای کرد کە سەروەرێتیی عێراق لەسەر بەشێکی کوردستان لابرێ. کە ئەمەش شتێکە تاکهەڵکەوتوو (استثنائي) بوو لەمێژووی دەوڵەتە سەربەخۆکانی جیهاندا. کورد لەو رۆژانەدا کە بەزەییەکی نێو نەتەوەیی بۆ خۆی بچڕیبوو، دەیتوانی بانگەوازی سەربەخۆیی کوردستان بدا، بەلایەنی کەمەوە، لەو چەند ستانەدا (هەولێرو سلێمانیو دهۆك) کە سەددام خۆی بەجێی هێشتبوون. بەڵام دوو زلحیزبە کوردییەکە رێی ئەوەیان نەدا ئەم دەرفەتە لەلایەن کوردەوە بقۆزرێتەوەو بەوەش، گوناهێکی گەورەی مێژووییان خستە سەر گوناهەکانی دیکەیان.

پەلاماردانە سەر عێراق لەمانگی نیسانی ئەمساڵدا، لەلایەن ئەمریکاو هاوپەیمانەکانو هەڤاڵبەندەکانییەوە، کە کوردیش یەکێکن لەو هەڤاڵبەندانەو، رووخاندنی دەوڵەتی عێراقو، هەڵوەشاندنەوەی دەزگەی دەستوەشێنی تیرۆریستی عێراقو، نەهێشتنی سەروەرێتیی عێراق، دەرفەتێکی یەکجار بەنرخی دیرۆکی بوو بۆ کورد، کە بەداخەوە ئەمجارەش حیزبە کوردییەکان، بەتایبەتی دوو زلحیزبەکە، بوونە رێگر لەبەردەم جاڕی سەربەخۆیی کوردستاندا، ئەوجا، نەك هەر بەوە دابین بن کە باسی سەربەخۆیی کوردستان نەکەنو، تەنانەت لەدژی بوەستنو بەس، بەڵکو کەوتنە عێراقچێتیکردنێکی واخەستوخۆڵ کە عەرەبێك گوتبووی: "بەڕاستی برا کوردەکان هێندە عێراق پەروەرێتی پیشاندەدەن، کە ئێمەی عەرەبیان شەرمەزار کردووە".

هەوڵدانی هەردوو زلحیزبەکە ئەوڕۆ بۆ بنیاتنانەوەی سەروەرێتیی عێراقە، ئەو سەروەرێتییەی کە هەشتا ساڵ پترە کورد لەژێریدا دەناڵێنی، لێی دەکوژرێ، سووكو ریسوا دەکرێ، ئەنفالی لێدەکرێ، وڵاتی دەکرێ بە عەرەب، شار بەدەر

دەكرێو ژنەكانی ئەتك دەكرێنو دەفرۆشرێن، چەكی كیمیایی لە دژ بەكار دەهێنرێو، هەوڵی تواندنەوەی دەدرێ. كەچی سەركردەكانی، بە پەلە داوای گێڕانەوەی ئەو سەروەرێتییە دەكەن. عادیل موراد كە یەكێكە لەسەركردەكانی "یەكێتی" دەبێژی كە چەند دەوڵەتێك بە حیزبەكەیان گوتووە "بۆچی بانگی سەربەخۆیی كوردستان نادەن"، كەچی ئەوان گوتوویانە: "ئێمەش عێراقینو بەشێكین لەعێراقو سەربەخۆییمان ناوێ". دیارە كاربەدەستانی پارتیش قسەی لەوە "باشتر" ناكەن.

لێرەدا ئەو پرسیارە خۆی دەسەپێنێ بەسەر ئەو دوو زلحیزبەدا، ئەو گەرەنتییەی كە دراوە بەكورد چییە؟ ئەز باسی گەرەنتییەكی نێو نەتەوەیی ناكەم، هەر باسی گەرەنتیی ئەمریكاو بەریتانیا دەكەم كە هەڤاڵبەندی كوردن، گەرەنتی ئەم دووانە بۆ پاراستنی كورد لە گەلكوژیو گەرەنتیی ژیانی بەئازادی لەسەر خاكەكەی خۆی چییە، ئەگەر سەروەرێتیی عێراق گەڕایەوە جێی خۆی؟ مەبەستیشم لە گەرەنتی، قسەی رووتو دۆستانە نییە، بەڵكو پەیماننامەیەكە كە رێزی لێبگیرێ. ئەو پەیماننامەیە كوانێ؟ ئەگەر هەیە، پیشانمان بدەن، ئەگەر نییە رەپو راست قسە بكەنو لەنەتەوەی كوردی نەشارنەوە. چۆنكە كە سەروەرێتیی عێراق دروستبوورەوە، ئەو دەمە كێشەی كورد دەبێتەوە بەكێشەیەكی نێوخۆیی عێراقو، چارەسەر كردنی بەدەست "گەلی عێراق" دەبێو، ئەوجا چارەسەر كردنی بەزۆر، ئەوەیە كە هەشتا ساڵە لەكاردایەو، چارەسەركردنیشی بەشێوەیەكی دێموكراسی، ئەوە بەدەستی زۆربەی زۆری خەڵكی عێراقە، كە ئەو زۆربەی زۆرە عەرەبە، كورد نییە. زۆربەی زۆری عەرەب، لەگەڵ ئەوەدا نین، نەك كوردستان سەربەخۆ بێ، بەڵكو تەنانەت لەگەڵ "ئۆتۆنۆمی"ش نین. هەر كەسێك درۆ لەگەڵ خۆیو خەڵك نەكا، دەبێ دان بەو راستییە دابنێ.

ەواتە، ئەگەر ویسترا شتێك بكرێ بۆ كورد، دەبێ هەتا عێراق
ـەروەرێتیی دەستنەكەوتووەتەوەو، لەلایەن كۆمەڵی نەتەوە
ەككگرتووەكانەوە دانی پێدا نەنراوە، ئەوە بكرێ. ئەمەش بەوە دەبێ كە
ناربەدەستانی دوو زلحیزبەكە بەرژەوەندیی نەتەوەییی چل ملیۆن كورد
ەكەنە قوربانی بەرژەوەندیی تەسكو تروسكی خۆیان، بەڵكو دەبێ بێ
پەندو چۆن‌و بێ هیچ مەرجێكی پێشەكی، هەردوو بەڕێوەبەرێتیەكەیان‌و
پەكدارەكانیان بكەنە یەك‌و، لەگەڵ جەماوەری كوردستانداو لەپێشیانەوە،
ـالای كوردستان بەدەستەوە، خۆپیشاندانی ملیۆن كەسی بخەنە سەر شەقامەكانی
لوردستان‌و بەغداو داوای مافی رەوای كورد بكەن لەبڕیاردانی چارەنووسی خۆیدا
ەباشووری كوردستان، كە هەموو نێوچەكانی باشوور بگرێتەوە. بۆ ئەمەش دەبێ
سنووری ستانەكانی بهێنرێنەوە شوێنی خۆیان. كفری‌و كەلارو چەمچەماڵ‌و تووز
ەبێ بخرێنەوە سەر كەركووك. لەسەردەمی كۆندا كۆیەش لەسەر كەركووك بووە،
ـەك لەسەر هەولێر. پێویستە ئەندامە كوردەكانی نێو "مجلس الحكم
لانتقالی" پێ دابگرن لەسەر ئەوەی خانەقین‌و جلەولاو مەندەلی‌و شارەبان
بكرێنە ستانێك بەنێوی ستانی خانەقین، یان ستانی "سیروان"، كە
ئەمەش داخوازییەكی رەوای خەڵكی خانەقین‌و دەوروبەرێتی كە دەبێ
پشتگیریلێبكرێ.
بەڕاستی، مەترسییەكی گەورە لەسەر مان‌و ژیانی كورد لەئارادایە. بێجگە
ـەوەی كە دەوڵەتە داگیركەرەكانی كوردستان، واتە، دەوڵەتانی ترك‌و
ئێران‌و سووریا، بەهەموو جۆرێك هەوڵدەدەن كە كورد هیچی
دەستنەكەوێ، بەعسیەكانیش خەریكن خۆیان كۆدەكەنەوەو، بەپشتی
ڕژێمی سووریا، سەر لەنوێ دێنە كایەوە. پارێزگاری بەعقوبە كە ماوەیەك
لەمەوبەر گوتبووی نابێ خوێندن‌و پەروەردەی كوردی لەخانەقین هەبێ،
ئەوا بڕیاری گێڕانەوەی چەند سەت مامۆستایەكی بەعسی داوە بۆ سەر

کاری خۆیان، کە پاش رووخانی رژێمی سەددام لەسەر کار دەرکران. کەچی "مجلس الحکم الانتقالی" هەتا ئێستە یەك وشەی لەدەم دەرنەچووە. بەعسیەکان‌و چڵکاو خۆرەکانی سەددام‌و عەرەبە داگیرکەرەکانی ستانی کەرکووك دەچنە سەر شەقامەکان‌و، بە "هەڤاڵبەندی"ی تۆرانییەکان‌و، وەك ساڵی 1959، خۆپێشاندان ساز دەکەن‌و، داوای لابردنی پارێزگاری کەرکووك دەکەن، هەر لەبەر ئەوەی کوردە، ئەگەرنا ئەم پارێزگارە رۆشنبیرە، زیانی بۆ مریشکێکیش نەبووە، بەڵام "مجلس الحکم الانتقالی" لەمە بێدەنگە. لە هەمووش خۆشتر ئەوەیە، ئەندامی "مجلس الحکم الانتقالی" دوکتۆر مەحموود عەلی عوسمان، لەوتووێژێکیدا لەگەڵ رۆژنامەی "الحیاة" کە لە لەندەن دەردەچێ، بەڵام لەسەر رێبازی "مجێوری دوو کەعبە" (خادم الحرمین الشریفین) دەڕوا بەڕێوەو، بەئاشکرا دژی رماندنی رژێمی سەددام‌و مافی رەوای کوردە، فەرمووبووی کە "من الحکمة توسیع مجلس الحکم حتی یضم فئات سنیة عربیة جدیدة، بینهم القومیون العرب واطراف اسلامیة کتجمع علماء السنة" (الحیاة 2003/12/14 ل9). دەك لەبەرت مەرم خولە! نازانم، خولە گیان، مافی فەیلییەکان‌و ئێزدییەکان‌و کاکەییەکان‌و شەبەکەکان‌و ژنە کوردە ماف پێشێلکراوەکانت خستنە کام گیرفانت؟ ئەی باشە تۆ خۆت‌و چوار ئەندامەکەی دیکەی "مجلس الحکم الانتقالی" سوننی نین؟ ئایا شیعەکانی "مجلس الحکم الانتقالی" هەموو عەرەب نین؟ ئایا ناسیۆنالیستە عەرەبەکان، دان بە"مجلس الحکم الانتقالی" دادەنێن، بەرێزت وا بەکوڵ‌و دڵەوە هەوڵ بۆ هێنانە نێو "مجلس"ی ئەوانە دەدەی؟ ئایا باشتر نەبوو ئێوە هەر پێنجتان لەباتی ئەوەی بچنە "مجلس الحکم الانتقالی"یەوە، بەرەیەکی بەرهەڵستکاری کوردستانیتان بەرامبەر بە "بەرهەڵستکارانی عێراقی" پێکبهێنایەو نەچوونایە نێو بەرەی "بەرهەڵستکارانی عێراقی"و

"مجلس"ەوەو، ئەگەر دەشچوونە "مجلس" ئەوا بەپێی گەلێك مەرجی قورس و مافی ڤیتۆ بچوونایە، وەك هەر لەسەرەتاوە پێمڕاگەیاندن و، لەرۆژنامەی "میدیا"دا بلاوكرایەوە؟

بەڕاستی، جێی داخە كە سیاسەتبازە دەسەلاتدارەكانی كورد، كارو پیشەیان هەر ئەوە بووە، خۆڵ بكەنە چاوی جەماوەری كوردەوە. ئەوەتا بەهەزاران كەس دێنە سەر شەقامەكانی شارەكانی كوردستان و خۆشیی خۆیان بۆ گرتنی سەددام دەردەبڕن، بەلام یەك خونێشاندانی جەماوەری نابینیتەوە كە داوای مافەكانی نەتەوەی كوردو بڕیاری چارەنووسی كورد بكا. وادیارە كوردێكی زۆر پێیان وایە كە سەددام گیرا، زەوی تەخت دەبێ بۆ دادپەروەری.. مخابن.. ئەوە تێناگەن كە سەددام و بیری سەددامێتی ژێرخانێكی مێژوویی هەزار ساڵەی هەیە. ئەوانەی كە پاپەكی خوڕەمدین و بەهزادان (ئەبوموسلیم)ی خۆراسانی و فەیلەسووفی بەنێوبانگ سوورە بەردی (سوهرەوەردی)یان بەوپەڕی ئەتك و سووكایەتی پێكردنەوە كوشت، سەددام و سەددامی نەبوون؟ لەنێو ئەو دەولەتانەدا كە كوردستانیان داگیر كردووە، بە ملیۆن خەلك هەن هەروەك سەددام بیر دەكەنەوە. كێشەكە كێشەی پەروەردەو فەرهەنگە، نەك كێشەی تاكە كەسێكی وەك سەددام. بەكوشتنی سەددام، بیری خۆ بەزلگرتن و ملهوڕی و دڕەندەیەتی بەرامبەر مرۆڤ، كۆتایی نایەت. ئەوەتا لەنێو عەرەبەكان و لە ئەورووپاش بەسەتان پارێزەر (محامی) خۆیان ئامادە كردووە، بۆ ئەوەی لەدادگە (محكمە)دا بەرگری لە سەددام بكەن. دیارە دەبێ سەددام پارێزەری هەبێ، چۆنكە ئەمە قانوونە، بەلام ئەو پارێزەرە دەبوو دادگە بگەڕێ بۆی بەچراوە، نەك بەسەتان پارێزەر لەخۆیانەوە خۆیان نێونووس بكەن و، لە ئەردەن كۆمیتەیەك دروست ببێ بۆ "بەرگری لە سەددام" كە "سەرۆكی رەوای" عێراقە. ئەمەش هەروا لەخۆڕایی نییەو، ئەوەش لەخۆڕایی نییە كە ئەمریكا سەددام بە "دیلی

جەنگ" نێو دەبا، نەك بە"تاوانباری جەنگ‌و گەلکوژی". چۆنکە ئەگەر ویژدان‌و نامووس هەبێ، دیارە سەددام نابێ بەتەنێ تاوانبار بکرێ، بەڵکو هەموو ئەوانەی کە یارمەتیی سەددامیان داو، هەتیوچەیەکی خوێنڕێژی شەلاتیی کۆلانانیان کردە ئەو سەددامە، پێویستە بهێنرێنە بەردەم دادگە، لەوانە ژمارەیەکی زۆر لەئەورووپایی‌و ئەمریکایی‌و رووس‌و. . . هتد کە، یان کاربەدەستی دەوڵەتی خۆیانن، یان بازرگان‌و خاوەن فابریقەن. مام جەلال کە دەچێ بۆ فەڕەنساو شوێنانی دیکەو، لە جاك شیراك‌و هاوپیشەکانی دەپاڕێتەوە "قەرزەکانی عێراق کەم بکەنەوە"، دەبێ جارێ ئەو پرسیارە بکا، ئایا ئەو قەرزانە بۆچی‌و لەشێوەی چیدا دراون بەعێراق؟ بۆ دەرمان‌و ئامێری نەخۆشخانە بووە، یان بۆ کڕینی لیستکی منداڵانی کوردو عێراقی؟ یان بۆ پێشخستنی زانست؟. ئەگەر بۆ ئەمانە بوون، ئەوا عێراقێکی دەوڵەمەند پێویستی بەقەرز کردن نەبوو، خۆ ئەگەر بۆ شتێکی دیکە بوو، دەبێ بەئیسپات پێمانڕابگەیەنن. ئەگەر دەرکەوت ئەو قەرزانە بۆ کڕینی چەکی کۆکوژو ئامێری خەڵك لەنێوبردن‌و بەکارهێنانی بۆ جەنگ بووە، پێویستە شیراك‌و هاوپیشەکانی ئەورووپایشی لەئەڵمان‌و رووس‌و ئەوانی دیکە، بهێنرێنە بەر دادگەو لەتەنیشت سەددامەوە بوەستن‌و، لێکۆڵینەوە بکرێ لەگەڵیان. دیارە لەم تاوانبارییەی سەددامدا، کاربەدەستانی هێندەك لەدەوڵەتە عەرەبەکان، وەك ئەردەن‌و کوێت‌و حیجازو میسرو جەزائیر، دەستی درێژیان هەبووە، شان بەشانی ئەوانیش، داگیرکەرانی کوردستان، بەتایبەتی رژێمی ترك‌و رژێمی ئێرانی سەردەمی شاو رژێمی سووریاش، هەریەکە بەشی خۆیان لە بەهێزکردن‌و پشتگیریکردنی سەددامدا دەستیان هەبووە، بەڕاستی، دەرفەتێکی زۆر بەنرخ بۆ کورد هەڵکەوتووە، کە سیاسەتبازانی کورد بەخۆتو خۆڕایی لەدەستی دەدەن. **ئەوەی بەتاقیکردنەوە دەرکەوتووە ئەمەیە، ئەم**

**ترەکەڵەکەیەی دروستکردنەوەی عێراق، هەوڵێکی بێ سووتەو سەرناگرێ. تەنانەت هێندەك لەدەسەڵاتدارانی ئەمریکاییش هەستیانکردووە پێی.**
کەسایەتیەکی بەنێوبانگی وەك لێسلی ئێچ گێلب L.H. Gelb، ئەندامی دەزگەی لێکۆڵینەوەی ستراتیژیی‌و پێوەندییە نێودەوڵەتەکانی ئەمریکا، کە کاتی خۆی یارمەتیدەری سەرنووسەری نیویۆرك تایمزو ئێستە ئەندامی سەرکردایەتیی کۆلیژی بەڕێوەبەرێتی زانستگەی هارڤاردە، وتارێکی لەڕۆژنامەی هەرالدتربیوّنی نێونەتەوەییدا نووسیبوو، باسی ئەوە دەکا کە پێکەوە لکاندنی عێراق هەڵەیەکی گەورەیەو، سیاسەتی راست ئەوەیە 3 دەوڵەت دروست بکرێ: دەوڵەتی کورد، دەوڵەتی شیعەو دەوڵەتی سوننی. گێلب لەو وتارەدا، کورد بەدۆست دادەنێ، کە نەوتیان هەیەو دەتوانن بەباشی پێی بژین‌و، مەترسییان نییە بۆ جیهانی ئازاد. ئەم قسانە ترسێکی زۆری خستووەتە دڵی داگیرکەران‌و دوژمن بەکوردانی ترك‌و فارس‌و عەرەبەوەو، رۆژنامەکانیان پڕە لەوەرامدانەوەی گێلب. یەکێك لەوانە رۆژنامەی "کیهان"ی لەندەنە کە رۆژنامەیەکی دوژمن بەکوردی شاپەرستەو، ئەم قسانەی گێلب بە "نغمةً شوم" دادەنێ.
کورت‌و کرمانجی، ئەگەر کورد بیانەوێ مافێکیان دەستبکەوێ، دەبێ تاعێراق سەروەرێتیی نەکەوتووەتەوە دەست، ئەوە بۆ خۆیان بیچڕن، ئەگەرنا، کە عێراق بووەوە بەدەوڵەتێکی یەکپارچەیی خاوەن سەروەرێتیی، دەبێ وەك پیرەمێردی رەحمەتی کە پاش ئاشبەتاڵی بەهاری 1947و هەرەسهێنانی کۆماری کوردستان گوتی:
ئەی ناهومێدی، ئەی ناهومێدی
نەگبەتی وەها، تو خوا ساکێ دی؟

بەلام ئەو نەگبەتییە لە ئاسمانەوە ناکەوێتە خوارێ، بەڵکو بەدەستی سیاسەتبازانی کورد ئاراستەی گەلی رەشوڕووتی کورد دەکرێ‌و کورد دەبێ هۆشیاربن، رێ بە ئاشبەتاڵێکی دیکە نەدەن. چۆنکە رێی **ئاشبەتاڵێکی دیکە لەو پەیماننامەیەدا نەخشەی بۆ کێشراوە کە لە 15ی نوڤەمبەری ئەمساڵدا لەلایەن مام جەلال‌و پۆل بریمەر ئیمزا کراوەو باسی فیدرەیالیزم دەکا لەشێوەی "پارێزگاکان" (محافظات)دا.** ئەمەش رێکەوت نییە کە ئەم "پەیماننامە"یە لەکاتی "کوێخایەتیی" مام جەلالدا ئیمزا کراوە. مەترسیی فێدەرالیزمی پارێزگاکان‌و کوێر کردنەوەی نێوی کوردستانم ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر لە"میدیا"دا خستەڕوو. چۆنکە حیزبحزبێنە بەرەو کوێخایەتی دەڕوا بەسەر نێوچەیەکەوە (میری پارێزگە)، نەك بەسەر نیشتمانێکەوە (کوردستان) خۆ ئێستە سلێمانی‌و هەولێر دوو پارێزگەی فێدەرالین، نەك هەرێمێکی فێدەرالی. راستیەکەشی ئەوەیە کە ئاغایەتی (سەروەرێتی) لە هەموو کەسێك نایەت‌و، **هەموو لایەکیش دەبێ بزانن، کە ئەم جارە، خودێ نەکا، ئەگەر قەوما، ئەوا لەهەژارو رەشوڕووتی کورد ناقەومێ، چۆنکە هیچیان نییە لێیان بستێنن، بەڵکو لە کوێخاکان دەقەومێ.** ئاهوڕامەزدا رەشوڕووتی کورد بپارێزێ.

بەرلین 2003/12/17

**میدیا**، ژ 152، 2003/12/21

# نەتەوەی کورد لە تەنگانەدا

## ئەگەر ئەمریکا دۆستایەتیی کورد بدۆڕێنێ

وەك دەزانین، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، پەژارەو دڵڕێشیی جەماوەری نەتەوەی کورد، چ لەوڵاتو چ لەدەرەوەی وڵات، بۆ دواڕۆژی باشووری کوردستان، خەستترو کوورترو پڕ ئێشتر دەبیٚو، داخو خەفەتو هەستی ناهومێدی، سەرو دڵی هەموو کوردێکی بەتەنگەوە هاتووی داگرتووە. لەهەمووشی ناخۆشتر ئەوەیە، کە ئەو کارەساتە پشتشکێنەی چاوەڕوانی کورد دەکا، وەنەبێ چاوەڕواننەکراو بووبیٚو، لەپڕ لەئاسمانەوە داباریبێ، چۆنکە هەموو خاوەن هۆشو ویژدانێکی زیندوو، دان بەوەدا دەنێ کە نووسەری ئەم وتارە، لەسالأنێك لەمەوبەرەوە، هەوڵیداوە، مەترسیی ئەو ڕۆژە تاریکانە بخاتە بەردەم خەڵکی کوردستانو، بەتایبەتی کاربەدەستانی حیزبە خۆ بەوەستازانەکانی گۆڕەپانی ڕامیاریو، زۆر بەتایبەتیتر، سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، کە مخابن، لە قسەی خۆیان پتر، گوێ لەقسەی کەس ناگرنو، ڕەخنەی دۆستانەو ڕێپێشاندانی بابەتانە، بەدوژمنایەتی تێدەگەن، چەند جارو چەند جار پێمگوتن، ئەوەی بەکچێنیو، لەکاتی دوانزە ساڵ فەرمانڕەواییی سەربەخۆدا دەکرێ، یان لەکاتی ناچار بوونی ئەمریکا بە پەنابردنە بەر هاوکاریی کورد، دەکرێ، ئەوە لە بێوەژنیداو، لەپاش خستنی سەددامو، یەکگرتنی داگیرکەرانی کوردستانو، خۆ تەیارکردنی شیعەو سوننیو تۆرانییەکانی عێراق، ناکرێ. چەند جارو چەند جار پێمگوتن، مافی کورد بەوە ناسەپێ، کە سەرکردەکانی کورد، خۆیان لەعەرەبی عێراق بەعێراقیتر بدەنە قەڵەمو، هەوڵ بۆ گێڕاندنەوەی "سەروەریێتیی" عێراق بدەن، بەڵکو بەوە دەستدەکەوێ کە خۆیان بەنەتەوەیەکی بەزۆر بەعێراقیکراوی نیشتمان

داگیرکراو بدەنە قەڵەمو، داوای مافی سەربەخۆیی‌و بڕیاری چارەنووس بکەن‌و، ئەگەر نەکرا، ئەوا لەڕێی گشتپرسییەکەوە، باشووری کوردستان بۆ ماوەیەك بکەنە پرۆتێکتۆراتی (محمية) کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئەوەش بەگەرەنتی دەوڵەتێکی مەزنی وەك ئەمریکا. چەند جارو چەند جار پێمگوتن، شەڕ بەیەکدی نەفرۆشن‌و، واز لەهەڵمەتەکاسەییی حیزبحیزبێنە بهێنن‌و، دەستبدەنە دەستی یەك‌و، حکوومەتێکی کوردستانی‌و لەشکرێکی کوردستانی دروستبکەن‌و، ئاڵای کوردستان بگرنە دەست‌و، واز لەپەڕۆی زەردو پەڕۆی کەسك بهێنن. چەند جارو چەند جار پێمگوتن، لەرکی یەکدی، تۆرانی‌و حیزبوللاهی بەهێز نەکەن‌و، بۆ سەر شۆڕکردنی یەکدی لەشکری داگیرکەران نەهێننە سەر ماڵی خۆتان. چەند جارو چەند جار پێمگوتن، کە پێڵاودانان‌و ماستاوکردن بۆ ملهوڕەکانی ئەنقەرەو دیمەشق‌و تاران‌و، بەرتیلدانی چەند ملیۆنی بەسەرمایەدارانی ئێرانی‌و ترك، بەبیانووی گرێبەندی (عقود)یەوە، پوولێکی قەڵپ ناهێنی‌و، لەباتی ئەوە، بچن یەکسەر لەگەڵ دەوڵەتە گەورەکان رێکبکەون‌و، تێیانبگەیەنن کە ترەکەڵەکی پێکەوە نووساندنی جەستەی پارچە پارچەی عێراق، سەرناگریّ‌و، سەربەخۆییی کوردستان، هەر بەتەنێ سووتی کوردی تێدا نییە، بەڵکو سووتی ئەوان‌و ئاشتیی جیهانی ئازادو کۆمەڵگەی شارستانێتیشی تێدایە. چەند جارو چەند جار پێمگوتن، کە تۆ خۆت بەعێراقی بدەیتە قەڵەمو، بتەوێ لەڕێی دێمۆکراسییەوە کێشەکەت چارەسەر بکەیت، ئەوا دێمۆکراسی بریتیە لەدەنگدان‌و زۆرو کەمی دەنگەکان‌و، تۆش کە عێراقی بیت‌و، دیارە عێراقیش یەك وڵاتەو دوو وڵات نییە، ئەوا لەهەموو دەنگدانێکدا، کورد هەر کەمینەیەو نایباتەوە. چەند جارو چەند جار پێمگوتن، کە سیستەمی فێدرالی سیستەمێك نییە کە هەر بەبڕیاری بەشێکی خەڵکی ئەو وڵاتە، یان ئەو دەوڵەتە، (لێرەدا عێراق‌و

کورد) بێته دی، بەڵکو دەبێ زۆربەی زۆری هەموو خەڵکی ئەو وڵاتە (لێرەدا عێراق) دەنگ بدەن بۆی. هیچ جۆرە گەرەنتییەکیش نییە کە زۆربەی زۆری خەڵکی عێراق دەنگ بۆ سیستەمی فیدرالی بدەن، یان بۆ ئەو جۆرە فیدرالییە دەنگ بدەن، کە سەرکردەکانی حیزبە کوردییەکان مەبەستیانەو داوای دەکەن.

بەڵام ئەوە بوو ئەم قسانە بەم گوێیاندا هاتو لەو گوێیان دەرچوو و، رۆژمان گەیشتە ئەو رۆژە رەشەو کەوتووینەتە قوڕپێوان. ئەوجا لەباتی ئەوەی کاربەدەستانی کوردو دەستوپێوەندەکانیان، کەمێك بەخۆیاندا بێنەوەو، بیرێك لەهەڵەوخراپەکاری‌و تاوانی گەورەو بچووکیان بکەنەوەو، هەستی بەرپرسیارێتیی بەرامبەر بەنەتەوەو نیشتمان، وایانلێبکا خۆیان بدەنە بەر لێپرسینەوەو، مەردانەو، بێ پاکانە کردن بۆ خۆ، بێنە سەر باس، کەچی کەوتوونەتە پەنا بردنە بەر قسەی لاقرتی‌و گوێ ئاگردان‌و، هەڕەشەی بێدەسەڵاتانەو، چەمۆڵەنانی نێو گیرفان‌و، دەفەرموون: "ئەمریکا، دەستی کوردی بڕی"، "ئەمریکا، وەك ساڵی 1975 دەکا لێمان، کە لەپشتەوەو، دزانە تێمانیسرەواند"، "ئەمریکا، دڵپاکیی ئێمەی خراپ بەکارهێناو"و. . . هتدو، هەر لەو کاتەشدا دەبێژن "ئەگەر گوێ لەداخوازییەکانیان نەگیرێ، لە "یەکگرتنی دڵخواز"دا، ئەوا "خیار"ی دیکە هەیە". . . خۆ ئەگەر ژێربێژانە بێینە ژێر ئەم تۆمەتانەو شییانبکەینەوە، دەبینین ئەوە، لەسەر دەرنەچوون لەرامیاری‌و، ئاگا نەبوون لەباری ئاڵۆزی جیهان، هیچی دیکە ناگەیەنێ. چۆنکە هەموومان باش دەزانین کە "کالیار"ەکەی ئەوان، لەهەموو "خیار"ەکانی ئێمە زلترە. بێجگە لەوەش، دەمێکە پێمگوتوون کە ئەمریکا برای باوکی کورد، یان گەلێکی دیکە نییە. ئەمریکا، زلهێزێکی جیهانییەو، بەرژەوەندیی سوپایی‌و رامیاری‌و ئابووریی خۆی هەیەو، دوای پاراستنیان کەوتووە. ئەو بەرژەوەندییە بەگێ‌و لەگوێ بپارێزرێ،

ئەوا روو لەو کەسەو لەو شوێنە دەکا. دۆستایەتی‌و دوژمنایەتی لەم جەواڵەدا جێیان نابێتەوە. بەڵام، ئێمە بەداخەوە، پێمانوایە، دۆستایەتیی رامیاری بەماچو مووچ‌و گوڵباران دروستدەبێ. . .

باشە، ئەگەر کوردێکی وەك جەلال تاڵەبانی، لەکاتی کوێخایەتییەکەیدا لەبەغدا، بچێ بەنێوی "مجلس الحكم الانتقالي"یەوە، لەگەڵ پول برێمەری فەرمانداری شارستانێتیی ئەمریکا لەعێراق، پەیماننامەیەك ئیمزا بکا بەئارەزووی خۆی‌و، بێ ئەوەی نوقورچێك لەورگی گیرابێ، یان "دارکاری" کرابێ‌و، بەیەك وشە نێوی کورد، یان کوردستان لەو پەیماننامەیەدا نەبێ‌و، باسی فێدەرالیزمی پارێزگەکان بکا، کە بەوەش دەیەوێ جۆرە کوێخایەتییەك بۆ حیزبەکەی مسۆگەر بکا، ئەوە دیارە مام جەلال هەر لەخۆیەوە ئەوەی نەکردووە، بەڵکو پرسی بە ئەندامەکانی دیکەی "مجلس" کردووەو، لەپێش هەمووشیاندا بەچوار ئەندامە کوردەکەی دی، بەڵام بێ گەڕانەوە بۆ بیروڕای گەل‌و گشتپرسی، واتە، بێ ئەوەی بەلایەنی کەمەوە نرخێك‌و رێزێك بۆ بیرو بۆچوونی ئەندامانی یەکێتی دابنێ، ئەوجا تۆ لەبیرو بۆچوونی چەند ملیۆنێك کورد بگەڕێ، ئێدی دەبێ گوناهی ئەمریکا چی بێ، با مام جەلال‌و ئەندامە کوردەکانی "مجلس" هیچ نەبێ هێندەی عەلی سیستانییەکی فارسی ئێرانی ورەیان ببوایە، کە لەسەردەمی سەددامدا نەیدەوێرا بڵێ "لەل"و، ئێستەش هەزاران خۆپیشاندەر دەخاتە سەرشەقام بۆ بەربەرەکانێکردنی ئامانجەکانی سەرکردەکانی حیزبە کوردییەکان، کە ساڵانی ساڵ بەسەر چیاکانەوە بوون. لێرەدا دەبێ ئاماژە بۆ ئەوەش بکەین کە هەرچی ئەمریکایە، ئەوا ساڵانێك هەوڵی لەگەڵ پارتی‌و یەکێتیدا بۆ ئاشتبوونەوەو یەکگرتن‌و خۆ بەهێزکردن‌و، تەنانەت لەئۆکتۆبەری 1998دا پەیماننامەیەکی مۆر کرد لەگەڵیان، بەڵام ئەوان هەتا ئەوڕۆ، کە ئەوڕۆیە، یەکیاننەگرتووەو، دوو بەڕێوەبەرێتییەکەو، چەکدارەکانیان

نەکردووە بەیەك، ئیدی چۆن دەتوانن داوای فیدراسیۆنیکی جوگرافیایی و نەتەوەیی بۆ باشووری کوردستان بکەن، لەکاتیکدا ئەوان ئەمە هەشت ساڵە فیدەرالیزمی پاریزگاکەکان دەبەن بەڕیوەو، تەنانەت سلیمانی کارەبا بەهەولیر نادا. باشە! با وادابنین ئەمریکاو بەریتانیاو عیراقییەکان رازیبوون، کەرکووك و مووسڵ و دیالەو کووت بخەنە سەر "هەریمی کوردستان"، ئەوجا لیرەدا دەبێ ئەو پرسیارە بکرێ، ئایا بیخەنە سەر "کوردستانی یەکیتی" یان "کوردستانی پارتی"؟؟؟ پاشان، ئایا کوردستان ماڵی باوکی پارتی و یەکیتیە، کەوا تۆپتۆپینی پیدەکەن؟؟؟

**پارتی و یەکیتی، دوانزە ساڵی رەبەق، حکومەت و پەرلەمان و لەشکرو پۆلیس و بودجەی دەوڵەمەندانەو پیوەندیی دیپلۆماسییانەو رامیارانەی دەرەوەیان هەبوو. لەکاتیکدا عەرەبەکانی عیراق، لەژیر پۆستاڵی سەددامدا دەیاننالاندو، سیاسەتکارەکانیان بوو بوونە پەنابەرانی ئەوروپاو ئەمریکاو، بەپارەی "ئەمرەو نەژی" دەزگەی سۆسیالی ئەو دەوڵەتانە دەژیان، کەچی ئەوان چوون ئەو عەرەبە دەربەدەرانەیان کردە گەورەی خۆیان و، کۆنگرەیان ریکخست بۆیان لە سەلاحەدین و ڤیەنناو لەندەن و، کردنیان بەدەسەلاتدارو، ئەوجا لەباتی ئەمانە دەست لەکورد بگرنەوە، ئیستە کورد دەست دەگرنەوە لەمان.** بەڕاستی، ئەگەر کەمیك هۆشی نەتەوەیی هەبێ، ئەوا دەبێ بزانین ئەمە چارەڕەشییەکی گەورەیە کە ئەنجامەکەی هەروا بەئاسانی نایەتە بەرچاو. لەگەڵ ئەمەشدا، ئەمە تەنێ لایەنیکی کیشەکەیە کە دوور نییە ئەگەر هەروا بڕوا، بەرەو ئەوە بچێ کە کورد لەناهومیدییەوە دەست لەدۆستایەتیی ئەمریکا بشۆن و، دوو زلحیزبەکەش لەئەنجامی ئەو بارودۆخەوە کە دروست دەبێ، بکەونە لیسی کویرانە هاویشتن و، هەوڵبدەن هەڵەکەیان بەهەڵەیەکی دیکەی لەوە خراپتر بسڕنەوە، کە ئەوەش دەبیتە دوو هەڵە. هەر بۆ نموونە: **بەڕیز نەوشیروان مستەفا، ماوەیەك لەمەوبەر، هەڕەشەی ئەوەیکرد کە کورد خۆیان لەهاوکاریکردن**

لەگەڵ ئەمریکا بکێشنەوە. ئەمەش ئەو پەندە کوردییە دێنێتەوە بیرم کە دەبێژێ "شەڕ براوەتەوە، تازە کوڕی تایەن بەدوای داردا دەگەڕێ". کاک نەوشیروان، دەبوو ئەو رۆژە کە ئەمریکا رووی لەئێوەو پارتی نا، لەگەڵ هێزەکانی بچنە کەرکووک‌و مووسڵ، بازرگانییەکی رامیاریتان بەمۆرو ئیمزا بکردایە لەگەڵی‌و، کە چووشنە کەرکووک‌و مووسڵەوە، هەوڵی گەورەتان ئەوە بووایە، عەرەبە هاوردەکان دەرپەڕێنن‌و کوردە ئاوارەکان بخەنە جێیان‌و، بەپەرۆی زەردو کەسکەوە نەچوونایەتە کەرکووک‌و مووسڵ‌و، رێی ئەو هەموو جەردەیی‌و دزێتییەتان نەدایە کە روویانداو، ئەمریکاییەکانی سەرسامکردو، رێزی کوردی کەمکردەوە لایان. پاشان حەز دەکەم لێرەدا بەئاشکراو رەپوروون بە بەڕێز کاک نەوشیروان‌و هەموو دۆستان‌و برادەران بێژم، کە پەیدا بوونی ناکۆکی لەنێوان کوردو ئەمریکادا، ئاواتێکی داگیرکەرانی کوردستان‌و هێزە دژ بەکوردەکانی عێراقە، کە دەمێکە خەون دەبینن پێوەی‌و، ئەو رۆژەی کوردو ئەمریکا بکەونە دژایەتیکردنی یەکدی، هەڵوێستی هەموو ئەو لایەنانەی کە ئێستە دژایەتیی ئەمریکا دەکەن، دەبێتە دۆستایەتیکردن‌و پشتگیریکردنی ئەمریکا. ئەنجامی ئەمەش کارەساتێکی وای بەدواوە دەبێ کە هاوتای نەبووبێ لەمێژووی کورددا. با ئەوەش بدرکێنم، کە دەسەڵاتدارانی رژێمی ترک، پاش ئەوەی نەیانتوانی ئەمریکا رازیبکەن بەخراپەکاری لەگەڵ کورد، ئەگەرچی ئەمریکا مل بۆ هەموو داخوازییەکانی کورد نادا، روویان کردووەتە شیعەکانی عێراق‌و، رژێمی ئێران‌و سووریاشیان کردووە بەدەلاڵ‌و، بەڵێنیانداوەبەشیعەکان، ئەگەر بێتو پشتگیریی کورد نەکەن بۆ گەیشتنە فیدرالی، ئەوا رژێمی ترک رازییە کە دەوڵەتی عێراق ببێتە دەوڵەتێکی شیعەگەرێتیی وەک ئێران، بەمەرجێک هێندێک لەداخوازییە ئابوورییەکانی رژێمی ترک جێبەجێبکرێ.

هاوكاریی موقتەداسەدرو تۆرانییەكانی باشووری كوردستان‌و، بەپیرەوە چوونی عەبدولعەزیز حەكیم لەئەنقەرە، وەك شاو، پشتكردنە دوكتۆر بەرهەم ساڵح‌و سوكایەتیكردن پێی، چمكێكی ئەم پیلانە ژەهراوییە دەردەخا. رژێمی ترك تەنانەت كەوتووەتە نێوبژێكردنی ئەمریكاو ئیسرائیل‌و سووریا. لەبەر ئەوە رۆژ رۆژی ئەوە نییە كە سیاسەتكارانی كورد ساویلكانەو بەكەفوكوڵی دڵ بڕواننە رووداوەكان.

**ئەی باشە چار چییە؟**

ئەمە پرسیارێكی بەجێیە. بەبیروڕای من، رێی راست بۆ دەرچوون لەم تەنگژەیە ئەوەیە، كە دوو زلحیزبەكە هێندە ئازایەتی‌و خۆشەویستیی نیشتمان‌و نەتەوە لەخۆیاندا دروستبكەن، كە دان بەهەڵەی خۆیاندا بنێن‌و، بەرپرسیارێتیی ئەم رۆژە رەشە بگرنە ئەستۆ، رێبدەن بەجەماوەری كورد، بەزووترین كات، هەڵبژاردنێكی بەراستی ئازادو بێ ترس‌و لەرز، لەهەموو نێوچەكانی باشووری كوردستان (مووسڵ‌و كەركووك‌و هەولێرو دهۆك‌و سلێمانی‌و دیالەو كووت‌و تەنانەت لەنێو كوردی بەغداش، چۆنكە بەغداش كە ملیۆنێك پتر كوردی لێیە، دەبێ شاری "برایەتی" بێ) رێكبخرێ‌و، ئەو دەمە ئەو پەرلەمانەی دروستدەبێ، بڕیاری مافی چارەنووسی كوردو جۆری پێوەندیی لەگەڵ ئەمریكاو دەوڵەتانی دیكەو خەڵكی پارچەكانی دیكەی كوردستان دەستنیشان بكاو، دەستبەجێ پاش ئەوە، حكوومەتێكی كوردستانی‌و، لەشكرێكی كوردستانی تەوزیمی (لەنێرو مێ) پێكبهێنێ، ئەو دەمە نەتەوەی كورد، هەموو هەڵەو ناتەواوییەكانی دوو زلحیزبەكە دادەپۆشن‌و، دوو زلحیزبەكەش ئیسپاتی دەكەن كە نیشتمانپەروەرن‌و بەرژەوەندیی نەتەوەو وڵات، لەسەروو بەرژەوەندییی حیزبەوە رادەگرن.

خۆ ئەگەر دوو زلحیزبەکە رێککەوتننامەیەکیان بەنووسین لەگەڵ ئەمریکا هەبووایە، دەیانتوانی ئەمڕۆ گوشار بخەنە سەر حکومەتی بوش، بەتایبەتی چۆنکە هەڵبژاردنی ئەمریکا لەمانگی نوڤمەبەردا دەستپێدەکاو ئەو حەلە دەیانتوانی هێندەك ماف بۆ کورد بپچڕن، بەلام ئێستە بیٚ ئەو بەلگەنامەیەو، پاش لەدەستدانی ئەو دەرفەتە زێرینەی کە بۆ کورد هەلکەوتبوو، ئەگەر پێیانوابیٚ دەتوانن زۆر لەئەمریکا بکەن، مل بدا بۆ تەواوی داخوازییەکانیان، ئەوا بەدڵنیاییەوە پێیاندەبێژم، بەهەڵە چوون. چۆنکە، یەکەم: جاریٚ شەمەندەفەرەکەی ئەمریکا لە تۆنێلە تەسکەکە تێپەڕیوەو، رۆژ بەرۆژ ئەو دەوڵەت و لایەنانەی کە دژایەتییان دەکرد لەچوونە شەڕی عێراقدا، ئێستە مێچکە مێچکە دەکەن بۆی. هەر تەماشای هەلوێستی کاربەدەستانی فەڕەنساو ئەڵمانیا بکەن بەسە. پاشان ئەمریکا هێزێك نییە کە وەك سەرکردەکانی ترك و فارس و عەرەب، قسە هەر قسەی خۆی بیٚ. ئەمریکا گویٚ لەپێشنیازو بیروڕا دەگریٚ، بەتایبەتی ئەگەر لەدۆست و هەڤالبەندەوە بیٚ. ئەمریکا، ساڵی 1975 هەڤالبەندی کورد نەبوو، بەلکو هەڤالبەندی شای ئێران بوو،و بۆ پاراستنی فەرمانڕەوایی شای ئێران، کە لەلایەن ناسرو بەعسیەکانەوە هەڕەشە دەکرا لیٚی، لەڕیٚی دەزگەی ئاسایشی خۆیەوە، سووکە یارمەتییەکی شۆڕشی ئەیلوولی دەدا. کە شای ئێران پشتیکردە شۆرش، ئەویش پشتیتێکرد. ساڵی 1975و ساڵی 2004، زۆر لەیەك جیاوازن. لەگەڵ ئەمەشدا، دەبیٚ ئەمە بخەینە بەرچاومان، ئەگەر پیلانی دوژمنان و ناحەزان، خودیٚ نەکا، ببێتە هۆی بگرەو بەردە لەنێوان کوردو ئەمریکادا، دیارە ئەو حەلە، جەماوەری کورد، سووتی خۆی لەوەدا نابینیٚ کە جارەکی دی، پەنا ببا بۆ ئەم ئەشکەوت و ئەو ئەشکەوت و، ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەتی داگیرکەرو، خۆ ئەگەر کەسانێکیش بێن رووبکەنە ئەو جۆرە کردەوانە، ئەوا هەل بۆ گەلێك بزووتنەوەی رادیکالانەو چەپاژۆو ئیسلامیست، هەڵدەکەویٚ، کە

داخی دڵی خۆیان بەدەسەڵاتدارانی ئەوڕۆی کورد برێژن. ئەو دەمەش داگیرکەرانی کوردستان کە هەموو رژێمی تێرۆریستین، بەنێوی "یارمەتیی ئەمریکا"و سەرکوتکردنی "تێرۆریزمی کوردی"یەوە، دەکەونە گیانی رەشوڕوتی کورد. ئەو رۆژەش ئەو رۆژە دەبێ کە بەدڵی هەموو دوژمنێکەو، ئەوەش نەخشەی دەوڵەتی ترکو ئێرانو سووریاو میسرو ئەردەنو حیجازە، کە دەیانەوێ کوردستان ببێتە "گۆڕستانی کورد"و، دەبێ ئەو حەلە ئاوات بخوازین بە بەهاری 75و سەردەمی دوابڕاوی سەددام، بەڵام ئەوەش هەیە کە ئەورووپا، وەك جاران پەنابەر وەرناگرێ.

**شایانی باسە، رامیاری وەك ماتماتیك وایە، لە ماتماتیكدا کە تۆ هەنگاوێکت بەهەڵە دانا، هەنگاوەکانی دیکەش، هەموویان هەڵە بەخۆیانەوە دەگرنو، ئەنجامەکەش بە هەڵە دەردەچێ.** لەبەر ئەوە، دەبوو، هەنگاوی یەکەمی سیاسەتکارانی کورد، لەناسنامەی "عێراقێتی"یەوە نەبوایە، بەڵکو لە ناسنامەی "کوردستانێتی"یەوە بوایە، واتە لە "کوردستانێتی"یەوە بەرەو "عێراقێتی" بچوونایە، نەك بەپێچەوانەوە، وەك کردیان. ئەگەر وابیریانبکردایەتەوە، خۆیان بەهێز دەکرد، نەك پەنابەرە عێراقیەکانو، سەرەتا لەسەربەخۆییەوە دەستیان پێدەکرد، خۆ ئەگەر نەکرا، ئەوجا، بەرەو "کۆنفێدرالی"و "فێدرالی" دەچوون، نەك بەپێچەوانەوە، دەرفەت لەدەستبدەنو پاش "خراب البصرة"، هەڕەشە بکەنو بێژن "ئەگەر فێدرالێتی نەدرێ پێمان، داوای سەربەخۆیی دەکەین". چۆنکە ئەمە لەوە دەچێ ئێمە نانمان نەدەنێ، کەچی داوای پاقلاوە بکەین.

ئەوڕۆ کە ئەم وتارە دەنووسم، بەرێکەوت رۆژی دووی مانگی رێبەندانە. ساڵڕۆژی یادی دامەزراندنی کۆماری کوردستانە، ئێمە دەبێ لەرووخانی کۆماری کوردستانو، لەوە پێشیش لەرووخانی شانشینی باشووری کوردستان پەند وەربگرین. سەردەمی ئەوڕۆ لەو سەردەمانە زۆر جیاوازە.

گەورەترین زلهێزی جیهان وا لەکوردستان و، بەربەرەکانێی تێرۆریزم و ئازادی و مافی مرۆڤی کردووە بەسەر پەرەی درۆشمەکانی خۆی. کورد لەهەموو نەتەوەیەکی دی پتر بووەتە قوربانی تێرۆریزمی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، کە سیانیان ئەمریکاش بەتیرۆریستی دادەنان و ئێستە دوانیان. کورد لەهەموو گەلانی رۆژهەلاتی نێوەراست، پتر تینووی ئازادییەو حەز بەئاشتی و دێموکراسی دەکا. لەبەر ئەوە چەند خاڵێکی نێوکۆیی (مشترك)ی گرنگ لەنێوان کوردو ئەمریکادا هەیە، دەبا سیاسەتکاران و سەرکردەکانی کورد کاربکەن و، شاندێکی دەپانزە کەسی لەخەڵکی هەموو پارچەکانی کوردستانی گەورەو دەرەوە دروستبکەن و، بچنە لای سەرکۆمار جۆرج دەبلیو بوش و سەرۆکوزەیران تۆنی بلێرو سەفەرێکی یەك دوو مانگی بەئەمریکاو ئەوروپادا بکەن و، بەپێی نەخشەیەکی دەرزکراو کێشەی کوردو بەرژەوەندیی نێوکۆیی کوردو ئەو لایانەنە بخەنە سەر مێزی وتووێژ، داخوازییەکانی کورد بگەیەننە شوێنی بریاردان و جێ چۆڵنەکەن بۆ ئاردۆغان و کوڕی حافزو مەلا خاتەمی و کوڕی شاحسەین و مجیۆری دوو کەعبەو موبارەکە فەندی، بوختان و درۆ دەلەسە بۆ کورد رێکبخەن و، بۆ پشتیگریی ئەمەش دەبێ خۆپێشاندانی یەك لەدوای یەك لەسەر شەقامەکانی کوردستان و ئەوروپاو ئەمریکا بۆ مافی بریاری چارەنووسساز بکرێ. زۆر سەیرە! شیعەکان بەهۆی خۆپێشاندانە جەماوەرییەکانیانەوە، ئەمریکایان ناچار کردووە، رێزی داخوازییەکانیان بگرێ. ئەوەتە ئەو قانونە کۆنەی کە پێش پەنجا ساڵ، فشە مافێکی دابوو بەژنان، لایانبردو ژنانیان گێرایەوە دەوری بەرد، هاکا -سیستانی و حەکیم کە هەردووکیان فارس و ئێرانین- وەك خومەینی مامۆستایان، قانونی "دەستبڕینی دزو بەردبارانی دڵداریکەران تامردن و دارکاریکردنی سەرخۆش و.. هتد"یان هێنایە عێراقەوە، بەڵام کوردستان وەك خۆڵی مردووی

**بەسەردا کرابێ، هیچ خۆپیشاندانێکی تیا بەدیٚ ناکرێت، وەك ئەوەی شەقامی کوردی نووستبێ. گەورەترین هەڵەش ئەوەیە کە حیزبە کوردییەکان لەگەڵ سوننیە عەرەبەکان رێککەون بەرامبەر بە شیعە. کورد نابێ شەڕی شیعەو سوننی بهێنێتە ماڵی خۆی.** هەروەها نابێ رێبدا "مجاهیدین خلق" هەروا بەخۆڕایی بدرێنەوە دەست ئێران، بەڵکو پێویستە "مجاهدین خلق" لەکوردستانداو لەژێر کۆنترۆڵی کورددا بمێننەوە بۆ رۆژی خۆی. راستە "مجاهدین خلق" خراپەیان بەرامبەر کورد کردووە، بەڵام دانەوەیان بەئێران، نۆکەریکردنە بۆ رژێمی دوژمن بەکوردی ئێران.

دووی رێبەندان 2703
بەرلین 2003/1/22

**میدیا**، **ژ** 154، 2004/1/28

# المفكر الكردي جمال نبز في محاضرة هامة بمدينة ميونيخ

بدعوة من جمعية الثقافة الكوردية في مدينة ميونخ (جنوب المانيا) القى المفكر الكردي المعروف جمال نبز في يوم 31/ 1/ 2004 محاضرة حول الوضع الراهن في كردستان ومستقبل الامة الكردية على ضوء المستجدات السياسية والاجتماعية والستراتيجية على الساحة الكردستانية والعراقية والشرق اوسطية و العالمية، مع التركيز على الوضع في جنوب الوطن الكردي ودور الاحزاب الكردية وفي مقدمتها الحزبان الحاكمان، الديمقراطي الكردستاني والاتحاد الوطني الكردستاني وتحالفهما مع اعظم قوة في العالم وهي الولايات المتحدة الامريكية والنتائج السلبية والايجابية لذلك التحالف. وقد وجه المحاضر وكذلك المشتركون والمشتركات مرَّ العتاب الى هذين الحزبين اللذين تسببا في ضياع تلك الفرصة التاريخية النادرة التي اتاحها سقوط نظام صدام وانحلال الدولة العراقية وجهازها القمعي، عندما تشبثا بالفدرالية واحجما عن اعلان استقلال كردستان واستنتج الحاضرون بعد مناقشة مسئلة الفدرالية وهي نظام يقام في مجتمعات حضارية على بنية الاتحاد الاختياري، لايمكن ضمان بقاءه في العراق حتى في حالة الوصول اليه تحت ظروف استثنائية.

وفي جزء آخر من محاضرته وذلك بمناسبة التطرق الى تاكيد السيد علي السيستاني على اجراء انتخابات مبكرة في العراق قبل وجود احصاءات دقيقة تتضمن استيعاب المهاجرين والمُهجرين وقبل وضع دستور اساسي للبلاد يضمن حقوق الاقليات الدينية والمذهبية والعرقية وحق الشعب الكردي في تقرير مصيره في وطنه المغتصب جنوب كردستان، ذلك لان السيستاني الشيعي يتنكر لذلك الحق باسم الاكثرية، كما اغتصبته الاقلية السنية منذ ثمانين عاماً باسم "وحدة العراق المقدسة"، تطرق المحاضر الى موضوع حساس وكان قد اشار اليه قبل اكثر من عشرين عاماً في كتابه "بعض القضايا الاساسية للمدرسة الكردية للفكر الاشتراكي "الا وهو الديمقراطية والحرية والدكتاتورية الجماعية، وقال المحاضر بان الديمقراطية وهي نظام يعتمد في اساسها على مجموع اراء مجتمع معين من حيث كثرتها وقتلها، قد تؤدي في المجتمعات المتاخرة الى اقامة

دكتاتورية جماعية باسم الاكثرية وهي اشد خطراً من الدكتاتورية الفردية ولقد مرت عدة شعوب بهذه التجربة المهلكة ومنها انتخاب هتلر كمستشار المانيا في تصويت حر والتصويت الى جانب اقامة مايسمى بالجمهورية الاسلامية في ايران وكذلك فوز بعض الاحزاب الفاشية اليمينية واليسارية في كثير من بلدان العالم في انتخابات حرة، وعلى الشعب الكردي ان يتحلى بالحيطة والحذر لكي لاتقضى على الحرية باسم الحرية، فالحق هو الحق وهو لايتناسب طردياً مع الاكثرية والاقلية، واستطرد المحاضر قائلاً "بأن الحرية لاتوجد إلا في حالة المساواة في القدرة" كما اشار الى المخاطر التي تلوح في الافق وذلك بالسعي للقضاء على حرية المرآة وارجاعها الى المطبخ كما ورد في قرار اصدره مايسمى بـ "مجلس الحكم الانتقالي" في العراق. وقال كردي من خانقين وقد أبيد من اهله واقربائه (8) شخصاً، وسجن في العراق وايران عدة سنين لكونه كردياً فقط، بأن "شعباً لا دولة له لا شرف له".

هذا واثناء فرصة الاستراحة التي كانت 10 دقائق سأل احد الكرد المُهجرين في المانيا "لماذا لايدعو السيستاني وهو ايراني من زميله خامنئي السماح بإجراء انتخابات حرة في وطنه ايران ولايترك شؤون العراق للعراقيين؟".

**ميديا، ژ155، 2004/2/8**

## خوێنرێژی بەنێوی "خودێ"وەو پەند وەرنەگرتنی کورد

ئەو کارەساتەی کە لەهەولێر لەسەرەتای شوباتدا روویدا، تەنێ ئەلقەیەک بوو لەو زنجیرە ئەنفالەی کە لەرۆژانی دێرینی مێژووەوە لەکورد دەکرێ و، لەسەردەمی ئاشووریەکان و ئارامییەکان و رۆمەکانەوە دەستیپێکرووە، تا گەیشتووەتە عەرەبە موسڵمانە فتوحاتکەرەکان و، ئەوجا ئەمەوییەکان و عەباسییەکان و مەغۆلەکان و تەتەرەکان و، دوای ئەوانیش عوسمانییەکان و سەفەوییەکان و قاجارەکان و رووسەکان و، پاشان دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، کە دەستکردو دەستنێژی رژێمی سۆڤێت و دەوڵەتە کۆلۆنیالیستە ئەوروپاییەکانن و، ئەم ئەنفالەش، بینی خواردووەتەوە هەتا ئەورۆ و، هەتا کوردستان ژێر دەستەبێ، کۆتایی نایەت.

ئەم پەلامارەدەرە ئەنفالکەرانە کە هەموویان لەرەوشتی خوێنرێژیدا چەپیان نییە لەیەک، وای لە کورد کردووە کە هێندەک جار، نێوی یەکێکیان، وەک نێوی ئەویدیکەیان بەکاربهێنێ. بۆ وێنە: کوردە کۆنەکان بەترکە عوسمانییەکانیان دەگوت "رۆم"، چۆنکە عوسمانییەکان، وڵاتی رۆمەکانیان (کە رۆژاوای ئەناتۆل بوو) داگیر کردبوو و، پێتەختی رۆمە بیزانتینیەکان (کۆنستانتینۆپێل)یان خستبووە ژێر دەست خۆیان و نێویان نابوو (ئیستانبول)و، ئەمانیش هەروەک رۆمەکان، کوردستانیان کاولدەکردو خوێنی کوردیان دەرژاند. تەنانەت خۆم لەسەردەمی منداڵیدا، هۆنراوەیەکم لەباوکم دەبیست، کە بەداخەوە، هەریەک بەیتیم لەبیر ماوەو، دەبێژێ:

**ئەگەر دەپرسی بە قانوونی رۆم**
**مافت فەوتاوە، وەک تری بن گۆم**

ئەوەی راستی بێ، تاکە گەلێك کە لەدرێژاییی مێژوودا، لەگەڵ کورد هاوکاری کردبێ، ئەوە تەنیو تەنێ کلدانییەکان بوون، کە ئەوڕۆ هێندەك کەس خەریکن کلدانییەکان بەئاشوورییەکانەوە ببەستن، هەر لەبەر نێزیکی زمانی ئاینی هەردوولایان لەیەکەوە، کە ئەمەش، سایان سەردەرنەکردنە لەمێژوو، یان ئامانجێکی رامیاری وا لەپشتەوە کە لەبەرژەوەندیی کلدانییەکان نییە.

سەرنجێکی کورتی ئەم کاولکاریو خوێنڕێژییە، ئەوە دەخاتە بەرچاومان کە ئەم تاوانکارییە، بەزۆری، بەنێوی "خودێ"وە خراوەتە کار. جا ئەو "خودێ"یە، ئەگەر لەشێوەی "پت"ێکدا بووبێ کە مرۆڤ بەدەستی خۆی دروستیکردبێ، یان لەشێوەی هێزێکی نەبینراودا بووبێو، لەڕێی فریشتەیەکەوە، پەیامی خۆی بەپەیامبەرێك گەیاندبێ بۆ خەڵکەکە، ئەوە هەر وەك یەك بووەو، هەموو جارێك خوێنڕێژان گوتوویانە کە بە "فەرمانی خودێ"و "لەڕێی خودێ"دا، ئەو خوێنەدەڕێژن، بێ ئەوەی توانیبێتیان بچووکترین بەڵگە پێشانبدەن کە خودێ ئەو فەرمانەی داوە پێیان. بێگومان ئەو جەنگو گەلکوژیو وێرانکاریانەی کە بەدرێژاییی دیرۆکی مرۆڤایەتی، بەنێوی ئاینەوەو، گوایە بە "فەرمانی خودێ"و "لەڕێی خودێ"دا روویانداوە لەژمارە نایەن. دوژمنانی مافی ئازادیو یەکسانیی مرۆڤ، کە رەپوڕاست دوژمنی ئازادیو سەربەخۆییی نەتەوەی کوردن، بەوپەڕی بێشەرمییەوە هەوڵدەدەن، لەلایەکەوە، کەشوهەوای ئازادانەی عێراقی پاش سەددامو، لەلایەکی دیکەوە، نەزانیو بیری تەنگو دواکەوتووانەی کۆمەڵگەی عەرەب لەعێراقدا، بەکاربهێنن دژی کورد، بۆ گەیشتنە ئامانجی دیکتاتۆرانەو ملهوڕانەی خۆیان، سایان بەتیرۆر، یان بە سەرلێشێواندنی خەڵك. سەرکردە شیعەکانی عێراق، وەك سیستانیو حەکیمو کوڕی سەدر، کە لەسەردەمی دەسەڵاتی سەددامدا، نەیاندەوێرا دەمبکەنەوە، ئێستە

خەریکن بەخشکەیی، مافی نەتەوەی کورد پێشێلبکەن‌و، باشووری کوردستان‌و عێراق بگرنە دەست‌و، رژێمێکی شیعەگەرێتیی سەردەمی تاریکی، لەعێراقدا بنیاتبنێن، وەك چۆن خومەینی بەخشکەیی، کوردو هەموو هێزە بەرهەڵستکەرەکانی ئێرانی لەخشتەبردو، ئەوجا گوتی "جمهوری اسلامی، نەیك کلمە بیشـترو نەیك کلمە کمتر" (کۆمارێکی ئیسلامی، نە یەك وشە پترو، نەیەك وشە کەمتر)، کە دیارە خومەینی لەدەربەدەریدا لەپاریس، ئەم قسەیەی نەدەکرد، بەڵکو باسی ئازادی‌و مافی هەژارو لێقەوماوانی دەکرد. ئێستەش سیستانی، بەئاشکرا باسی "حکوومەتی ئیسلامی" ناکا، بەڵکو باسی "هەڵبژاردنی ئازاد" دەکا، چونکە دەزانێ "هەڵبژاردنی ئازاد" لەنێو گەلێکی بیر تەسك‌و نائازادو چەواشەکراودا، هەر بەسووتی داروودەستەکەی ئەو دەبێ‌و، دەبێتە هۆی دامەزراندنی دیکتاتۆرێتیەکی کۆمەڵی، کە گەلێك لە دیکتاتۆرێتیی تاکە کەسی دا خراپترو خۆراگرترە.

ئێستە، بۆ ئەوەی عەلی سیستانی کەمێك باشتر بناسین، دەبێ بزانین کە سیستانی عێراقی نییەو، لەبنەماڵەیەکی فارسی ئەسفەهانییە کە باپیرە گەورەی لەسەردەمی سەفەوییەکاندا چووەتە سیستان (سیستان‌و بلووجستان یەك پارێزگەن لەئێران)و، لەوێ بووە بە "شێخ الاسلام"ی سیستان. بەڵام عەلی سیستانی خۆی لە مەشهەد لەدایکبووەو، لەشاری قوم لەلای مەلا حسەینی بروجردی خوێندوویەتی‌و، دوایی چووە، بۆ نەجەف‌و، لەوێ بووە بەهاوکاری ئایەتوللای خۆیی‌و، پاش مردنی خۆیی‌و، مردنی مەلا سەبزواری کە جێنشینی خۆیی بوو، بوو بە "رێبەری شیعەکانی جیهان". جا هەرچەندە سیستانی‌و خۆیی، هەردووکیان بیرو بۆچوونیان لەبارەی ئاین‌و ئاینزاوە لەگەڵ خومەینی، وەك یەك بوو، بەڵام هیچیان لەگەڵ خومەینی دانوویان نەدەکولا. چونکە خومەینی خۆی بە

"ئیمامی ئوممەت" دەزانی، نەك خۆیی و سیستانی. بەڵام خۆیی و سیستانی لەسەردەمی سەددامدا بە "تەقییە"، کە بنەمای ئاینزای شیعەیەتیەو، بریتیە لەشاردنەوەی بیروڕا لەکاتی نەگونجاوو، مەترسیدا، لەگەڵ بارودۆخ دەچوون بەڕێوە. تەنانەت کە هێزی ئاسایشی بەعس، مزگەوتی "الخضراء"ی داگیر کرد، نەخۆیی و نەسیستانی، نەیانوێرا بڵێن "لەل"و، کە خۆییش مرد، بەدزییەوە ناشتیان. کە عەبدولمەجیدی خۆییش پاش 20 ساڵ ژیان و بازرگانیکردن لە لەندەن، گەڕایەوە نەجەف و، لەوێ لەسەحەندا کوژرا، وەك دەڵێن لەلایەن پیاوەکانی موقتەدا سەدرەوە، سیستانی و بنەماڵەی خۆیی، ئەمجارەش هەر بە "تەقییە" هاتنە دەست و، قورو قەپیانکرد لێی.

کە رژێمی سەددام رووخا، عەلی سیستانی لەپێشەوە هیچ دەنگی نەبوو، بەڵام کە دڵنیا بوو لەوەی بەجارێك رووخاوەو ناگەڕێتەوە، ئەوجا کەوتە قسە، لەسەرەتاوە، بەنێوی "ئایەتوڵا"ی سیستانییەوە، ئەوجا بەنێوی "ئایەتوڵڵاهولعوزما"ی سیستانییەوەو، لەم رۆژانەدا سەعدلعەجمی کە پەیامنێری رادیۆی "العراق الحر"ە لەکوێت و، بە پارەی ئەمریکا دەچێ بەڕێوە، باسی لە "الامام السیستانی" (ئیمام سیستانی) دەکرد. خومەینیش لەسەرەتاوە، ئایەتوڵا بوو، ئەوجا بوو بە ئایەتوڵڵاهولعوزما، ئەوجا بوو بە "نائب الامام"و، ئەوجا بوو بە "ئیمام". ئەمە لەکاتێکدا کە شیعەکان (12) ئیمامیان هەیەو، کەسێکیش مافی ئەوەی نییە خۆی نێو بنێ "ئیمام"، چۆنکە جێی ئیمامەتی تەنێ بۆ "ئیمامی زەمان" چۆڵەو، هێشتا چاوەڕوانی هاتنی دەکرێ، بەپێی باوەڕی شیعە دوانزە ئیمامییەکان.

**عەبدولعەزیز حەکیم، کە پاش کوشتنی براکەی محەممەد باقیر، بەدەستی تیرۆریستان، وەك جێنشینی وی، بوو بەسەرکردەی حیزبەکەیان، حەکیم**

**لەرۆژی 2/6 ئەمسالدا، لەوتووێژێکدا لەگەڵ رادیۆی "العراق الحر" لەبارەی فیدەراسیۆنەوە بۆ کورد گوتی: "بڕیاردان لەسەر ئەوەی کورد فیدەراسیۆنیان هەبێ، دەبێ بەدەنگی هەموو خەڵکی عێراق بێ‌و، بۆ هەموو خەڵکی عێراق بێ". ئەم قسەیەی حەکیم بەتەواوی ئەو مەترسییەیە کە لەچەند ساڵێك لەمەوبەرەوە، چەند جارو چەند جار باسمکردووەو، ئێستەش بەداخەوە دەبێژم کە قسەکانی حەکیم راست‌و قانوونین، هەرچەند ئەو، ئەو قسە هەقە بۆ ئەوە دەکا کە ناهەقییەکی پێ بشارێتەوە، چۆنکە کە ئێمە خۆمان بەعێراقی بزانین‌و، عێراق بەیەك دەوڵەت بزانین‌و، لەسەربەخۆییەوە دەستپێنەکەین، دیارە دامەزراندنی سیستەمی فیدەرالی، دەبێ لەهەموو عێراقدا دابمەزرێ‌و، بەدەنگی هەموو خەڵکی عێراق بێ‌و، عەبدولعەزیز حەکیمیش کە هێشتا نەبووە بە ئایەتوللا، زۆر باش دەزانێ کە لەدەنگدانێکی گشتیی هەموو عێراقدا، زۆربەی زۆری خەڵك فیدەراسیۆنیان ناوێ، مەگەر ئەوەی کورد سیاسەتێکی ژیرانە بگرێتەبەرو هەتا ئەمریکاو هاوپەیمانان لەعێراقدا ماون، بکەوێتە خۆی.**

عەبدولعەزیز حەکیم لەوەرامی پرسیارێکی دیکەدا گوتی: "دەبێ ئایینی ئیسلام ئایینی رەسمی عێراق بێ‌و، قانوونەکانی عێراق دەبێ شەریعەتی ئیسلامی بکەنە سەرچاوەی خۆیان".

**کورد لێرەدا دەتوانی حەکیم لە "قاف" دا بگرێ:**

1-دەوڵەت لەسەر بنچینەی ئاین دانامەزرێ، بەڵکو لەسەر بنچینەی هاونیشتمانێتی دادەمەزرێ. هاونیشتمانانیش دەبێ لەهەموو روویەکەوە لەبەردەم قانووندا یەکسان بن. کردنی ئاینێك بەڕەسمی‌و، ئاینەکانی دیکە بەناڕەسمی، مانای وایە، ئاینە کوردییەکانی وەك ئێزدێتی‌و کاکەیەتی‌و شەبەکێتی‌و هەقەیەتی‌و، هەروەها دیانەتی(مسیحێتی)و مەندایەتی

(سابیئتی لەخوارووی عێراق) دەبنە مرۆڤی پلە دوو و، ئەمەش نایەکسانی دەگەیەنێ.

2-ئیسلام، یەك ئاینزا (مذهب) نییە، بەڵکو گەلێك ئاینزای هەیەو هەر ئاینزایەکیش چەند ڕێبازێکی جیاجیای هەیە. ئاینزای سوننی، بریتییە لەڕێبازەکانی شافیعی و حەنەفی و مالیکی و حەمبەلی و، ئاینزای شیعەش گەلێك ڕێبازی هەیە، وەك: دوانزە ئیمامی و زەیدی و ئیسماعیلی و.. هتد. بێجگە لەوەش گەلێك تەریقەتی دەروێشی هەیە، وەك: قادری و نەقشبەندی و نوورسی و.. هتد. ئەوجا، هەر یەکێك لەم ڕێبازانە فیقهی خۆی هەیە کە لە هی ئەوی دیکە ناچێ، بەڵام سیستانی و حەکیم، کە هەردووکیان سەر بەڕێبازی جەعفەریی دوانزە ئیمامین، مەبەستیان ئەوەیە ڕژێمێکی سەر بەڕێبازەکەی خۆیان بەنێوی "ئیسلام"ەوە دابسەپێنن، وەك ئێران، کە نێوی "کۆماری ئیسلامی"یە، بەڵام بەپێی دەستووری بنچینەیی ئێران، "کۆماری شیعەی دوانزە ئیمامی"یەو، سوننیەکان مرۆڤی پلە دووش نین. لەبەر ئەوە، **دەبێ بە سیستانی و حەکیم بێژین کە بچن فیقهێکی یەکگرتوو بۆ ئیسلام دروستبکەن، کە موسڵمانانی هەموو جیهان لێی ڕازیبن، ئەوجا باسی ئەوە بکەن کە ئاینی ڕەسمیی عێراق ئیسلام بێ و، قانوونەکانی عێراق لە "شەریعەتی ئیسلام"ەوە سەرچاوە بگرن. چۆنکە لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، ئیسلام بەپێی کام ئاینزاو کام ڕێباز؟**

3-دارو دەستەی حەکیم و حیزبەکەی، کە لەئێران لەهەشتاکانی سەتەی ڕابوردوودا، بەفەرمانی خامەنەیی دروستکرا، لەچەند ئێرانییەکی دانیشتووی عێراق پێکهێنرا کە ڕایانکردبووە ئێران، وەك محەممەد باقیر حەکیم و ئاسەفی و هاشمی، ئەمانە ساڵانی ساڵ لەئێران مانەوەو، بەنانی ڕژێمی ئێران دەچوون بەڕێوەو، حیزبەکەیان کە بەفارسی نێوی "مجلس

اعلای انقلاب اسلامی عێراق" (ئەنجومەنی بەرزی شۆڕشی ئیسلامیی عێراق)ەو، چەکدارەکانیان کە ناویان نابوو "قوات بدر" لەژێر سەرپەرشتیی و کۆنترۆلی "پاسداران"ی ئێراندا بوون. **ئێرانێتی ئەمانە، کاتێك کەوتەڕوو، کە ئاسەفی کرا بەفەسەکەری وەزارەتی دەرەوەی ئێران و، هاشمیش ناوی راستەقینەی خۆی وەرگرت کە "شاهرودی" بوو،و کرا بەسەرۆکی دادپرسانی ئێران (قاضي القضات). لەبەر ئەوە حیزبێکی ئێرانی و، چەند سەرکردەیەکی شیعەی ئێرانی، مافی ئەوەیان نییە باسی چارەنووسی نەتەوەی کورد، یان خەڵکی عێراق بکەن.**

4-ئەو دەوڵەتەی  کە سیستانی و حەکیم و کوڕی سەدر دەیانەوێ لەعێراقدا بنیاتیبنێن، هەروەك رژێمی ئێرانی خومەینی دەبێ، کە "رێبەری پایەبەرز" (المرشد الاعلی) سیستانی، دەبێتە فەرمانداری لێنەپرسراو لە (ولایت مطلقه' فقیه)دا -وەك فارسەکان ناوی دەبەن-، ئەوکاتیش، هەر خۆی سەرکۆمار دادەنێ و، هەر خۆشی سەرکۆمار لادەباو، هەر کاتێکیش بیەوێ پەرلەمان هەڵدەوەشێنێتەوەو کابینەی وەزیرانیش دەڕووخێنێ. ئەگەر ئەندامانی پەرلەمان رەخنەیەکیان گرت، ئەوا دەخرێنە زیندانەوە، وەك ئێران. ئەمە بێجگە لەوەی کە هەموو هەڵسوکەوتێکی تایبەتی، وەك خواردن و خواردنەوەو جۆری جلك و پێلاوو چوونە سەر پێشاو و قسەکردن لەگەڵ یەك (بەتایبەتی دانوستاندنی نێوان پیاوو ژن) هەمووی لەلایەن رژێمەوە کۆنترۆڵ دەکرێ و، ئەوی پێچەوانە بوەستێتەوە، بەئاشکراو لەسەر شەقام دارکاری دەکرێ، یان پەنجەی دەست و پێی دەبڕدرێ، یان بەردباران دەکرێ تامردن، یان بەشمشێر ملی دەپەڕێندرێ. خۆ ئەگەر ژنێك سزادرا بە لەسێدارەدان و، هێشتا کچ بوو، ئەوا لەلایەن چەورەکانی رژێمەوە بەزۆر دەکرێ بەژن، بۆ ئەوەی بەپێی "شەرعی ئیسلام" بتوانرێ لەسێدارە بدرێ. نووسەران و رۆژنامەنووسانی

بەرۆمەت و رەخنەگر، یان دەخرێنە زیندان، یان تیرۆر دەکرێن. ئەو جۆرە سزایانە کەهی دەوری بەردن، هەموو رۆژێك لەئێراندا دەخرێنە کار. لەبەر ئەوە دەبێ سیستانی و حەکیم و کوڕی سەدر تێبگەیەندرێن، کە نەتەوەی کورد ملوینێك شەهیدی نەداوە بۆ ئەوەی خۆی تووشی رژێمێکی وابکاو، ئەمریکاییەکانیش تێبگەیەندرێن کە ئەگەر وریا نەبن، خومەینییەکی نوێ لەعێراقدا، بەخوێنی سەبازەکانیان، دەهێننە سەر کار، کە بێگومان جەنگێکی نێوخۆیی لێوە دروست دەبێ.

5-دەبێ ئەوە بزانین کە دامەزراندنی "ولایت فقیه"، تەنانەت بەپێی ئێزدناسی (الهیات)و فیقهی دوانزە ئیمامیی شیعەکان خۆیان، لەسەردەمی پێش هاتنی "ئیمامی زەمان"دا روونادات. هاتنی ئیمامی زەمانیش، لەگەڵ پەیدا بونی"جەجاڵە کوێرە" (الدجال الاعور)و "عەبدی سوفیان"و "دابة الأرض"و ئەم بابەتانەیە، کە ئەمانەش نیشانەی نێزیکبوونەوەی رۆژی "پەسلان" (قیامەت)ن تەنانەت یەکێك لەهۆنەرەکانیان لەسەردەمێکی زۆر کۆندا گوتوویەتی:

**لكل أمة دولة يَرقبونَها**

**ودولتُنا في آخر الدهر تَظهَرُ**

لەبەر ئەوە، دامەزراندنی حکومەتی ئیسلامی لەئێرانداو، لەکاتێکدا کە هێشتا ئیمامی زەمان سەریهەڵنەداوە، "بدعة"یەك بوو کە خومەینی دایهێناو گەلێك مەلای گەورەی شیعە، پەسندیان نەکردو لەدژی وەستان.

**ئەنفالی هەولێر دەریخست کە عەرەبەکانی عێراق (بەشیعەو سوننییەوە)، هەروەك عەرەبەکانی دەرەوەی عێراق، بەتوندی نەك هەر لەدژی فێدەراڵی، بەڵکو لەدژی هەموو مافێکی کورد دەوەستن. ئەمەش بەرۆنی ئەوە دەخاتە بەرچاومان کە ئەگەر هاتو فێدەراڵیش بەناچاری لەلایەن عەرەبەکانەوە پەسند کرا، ئەوا بەوپەڕی دڵنیاییەوە، هەر رۆژێك ئەمریکا لەعێراق**

**کشایەوە، دەستبەجێ فیدرالیی و میدرالی لەگەڵ خاکی کوردستان تەختدەکرێ.** پاش ئەمەش، پشتبەستن بەدەستوور، دادی کورد نادات. چۆنکە کە قاسم و بەعسیەکان و ناسرییەکان، کودەتای تەموزیانکرد، عێراق دەستووری هەبوو، بەڵام ئەوان بێ پرسی خەڵکی کوردستان، گۆڕییان و، عێراقیانکردە "بەشێك لەنەتەوەی عەرەب". کاتی خۆی لە 1958دا لەبەغدا بە مامۆستا برایم ئەحمەدی رەحمەتیم گوت، "کاکە برایم، تکایە لەگەڵ بەعسیەکان و کۆمۆنیستەکان و حیزبی نیشتمانیی دیمۆکراسیی چادرچی و.. هتد، ئیمزای ئەوە مەکە، کە عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب". کاك برایم فەرمووی: "ئەگەر ئەوە نەکەم، پێمان دەڵێن پیاوی ئەمریکا". بەداخەوە، مامۆستا برایم ئەحمەد، ئەو ئیمزایەی کرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو تۆمەتە ناڕەوایە نرا پێوەی.

**بەڕێزان، کاك مەسعوود بارزانی و مام جەلال تاڵەبانی، دەبوو ئێوە لە هەموو کەسێك باشتر ئەوەتان بزانیبایە کە سیستەمی فیدرالی لەوڵاتێکدا پێ دەگرێ، کە خەڵکەکەی فێری رەوشی دیمۆکراتی و، پێکەوە ژیانی بەئاشتی بووبن. لەوڵاتێکی دواکەوتووی وەك عێراقدا، کە وەزارەتی بەرگری (واتە لەشکر)و، وەزارەتی دارایی و، سیاسەتی دەرەوەو، سەرچاوە نەوەتەکان، هەمووی بەدەست حکومەتی نێوەندی بێ، چ مێشکێك ئەوە پەسند دەکا کە حکومەتێکی هەرێمی بێ لەشکرو، گەمارۆ دراو لەهەر چوار لاوە بەدوژمن، بتوانێ خۆی رابگرێ.**

پارتی و یەکێتی دەتوانن نەخشەو سیاسەتی خۆیان هەبێ و، ئەمەش مافی خۆیانە، بەڵام هیچ کامیان و، هیچ حیزبێکی دیکەش، مافی ئەوەی نییەو نابێ، ئەو نەخشەو سیاسەتە بەسەر نەتەوەی کورددا بسەپێنێ، چ بەزۆرو چ بەفێڵ، ئەمڕۆ رۆژی ئەوە نییە خەڵك بنێرنە سەرشەقامەکانی کوردستان و (دەرەوەی کوردستان)و پێیانبێژن: هاوار بکەن بۆ فیدرالی و،

دروشمی "سەربەخۆیی بۆ کوردستان" بەزۆر دابگرن وەك لە لەندەن کردیان‌و، زۆری نەمابوو ببێ بە هەرایەکی گەورە. بێگانە شارەزاکان گاڵتە دەکەن پێمان‌و، دەبێژن "ئێوە ئەمە 12 ساڵە بەشێوەیەکی پتر لەفێدەراڵی دەچن بەڕێوە، ئیدی فێدەراڵی چی؟ تکایە با ئەم فێدەرالیەش نەبێتە ئۆتۆنۆمییەکە، کە پەنجا ساڵی رەبەق خوێنی بۆ رێژراو دەستیش نەکەوت. تکایە کەمێك هۆش بهێننەوە بەر خۆتان‌و، لە تاقیکردنەوەی سەخت‌و خوێناوی پەند وەرگرن، پەند!

**ئەمڕۆ کاتی ئەوەیە، جەماوەری کورد، هەر رۆژە ناپۆژێ، بڕژێنە سەر شەقامەکانی کوردستان‌و ئەورووپاو ئەمریکاو ئوسترالیاو، داوای مافی بڕیاری چارەنووسی خۆو، سەربەخۆیی کوردستان‌و، کۆتاییهێنان بەنەخشەی بەعەرەبکردنی باشووری کوردستان‌و گەڕانەوەی کورد بۆ شوێنەکانی خۆیان بکەن، نەك داواکردنی فێدەراڵی. چۆنکە کە داوای فێدەراڵی بکەین، پێماندەبێژن: "بچن لەگەڵ عێراقییەکان‌و حکوومەتی رەوای عێراق، پاش هەڵبژاردنێکی دیموکراتی قسە بکەن، فێدەراڵی کێشەیەکی نێوخۆییە، نەك نێو نەتەوەیی". بەڵام ئەگەر هاتو کورد بەسەتهەزاران‌و بەملیۆن‌و بەردەوام کەوتە خۆنیشاندان بۆ سەربەخۆیی، ئەوا دیارە، ئەمریکاو بەریتانیاو هاوپەیمانان‌و، گەلێك لایەنی دیکە، بیر لەچارەسەرێکی بنچینەیی دەکەنەوە بۆ کێشەی کورد.**

کورت‌و کرمانجی، پێویستە سەرکردەکانی کورد بزانن، کە کورد ئیدی ئامادەی ئەوە نییە لەمە پتر خوێنی بڕێژرێ‌و، ئەوانیش هەر بەیت‌و بالۆرەی "یەکێتیی عێراق" لێبدەن. ئەگەر سیاسەتکارانی کورد ناتوانن کورد لەم قوڕاوە دەربهێنن کە تاگوێی تێیکەوتووە، با هێندە ئازایەتی‌و جوامێری‌و لەخۆبوردن بنوێنن‌و، دەست لەکار بکێشنەوەو، رێ چۆڵکەن بۆ ئەوانەی باشتر دەتوانن لەم بارودۆخە سەختە نازکەدا، کێشەی کورد بەرەو

چارەسەرێکی بەرۆمەتانە ببەن‌و، ئەمەش هیچ شەرم‌و شوورەییەکی تێدا نییە، بەڵکو مەردایەتییەکی گەورەیە کە مێژوو دەینووسێ بۆیان.
ئەوجا عەرەبەکانیش، ئەگەر پێیانوایە، لەپاڵ درۆو دەلەسەو بوختاندا، ئەم کارە تیرۆریستانەیان کە بەدرێژاییی مێژووییان، دژی کورد کردوویانە، کارێکی ئازایانەیان نواندووەو دەنوێنن، زۆر باش بزانن، ئەوە کردەوەیەکی یەکجار حیزانەیە. چۆنکە سەرکردە هەرە زلەکانیان، لەکون‌و کەلەبەردا خۆیان دەشارنەوەو، کەرپیاوو گەوج‌و مێشکپووتەکانیان، رەوانەی مردن دەکەن، بەهومێدی چەند "حۆری"یەکی بەهەشت. باشە! پیاوەکانیان وا. ئەی ژنە خۆکوژەکانیان، بەهیوای چەند "گەنجی لووس" ئاراستەی ئەودیو دەکەن؟.
**تیرۆری هەولێر، دوومەڵێکی زەقی لە لەشی کورددا تەقاند، کە هەڵوێستی نامرۆڤانەی دەوڵەتە عەرەبەکان‌و گەلەکانیان، کردوویەتە جەستەی کورد، ئەم تیرۆرە، ئەوەی پێشاندا کە کورد ئێدی ناتوانن لەگەڵ عەرەب لەسنووری دەوڵەتێکدا بژین،** کە ئەوان ئاغاو کوردیش نۆکەر بن. پێویستە باسی سەربەخۆیی بکەین‌و بیێنە سەر رێی راست.

بەرلین 2004/2/11

**میدیا**، ژ 156، 2004/2/15

# ئێران‌و ئاژاوەی موقتەدا سەدر

## ڕژێمی ئێران دەیەوێ دەوری خومەینی لەعێراقدا بەموقتەدا بگێڕێ

ئەم بارودۆخە نێوخۆییەی کە ئەوڕۆ عێراق خۆی تێدا دەبینێتەوە، لەگەڵێك رووەوە لە بارودۆخی سەردەمی پێش رووخانی رژێمی حەمەرەزاشای ئێران دەچێ. حەمەرەزاشا، خۆی‌و باوکی، سالآنی ساڵ، بەملهوڕی‌و دیکتاتۆرێتی، فەرمانڕەواییان دەکردو، هەر کەسێك سەری نارەزایی، کەمێك هەڵبڕیایە، بەرپەڕی توندوتیژییەوە، سەرکوتیاندەکرد. ئەم زۆرداری‌و بێدادییە، چارەی رژێمی شای وارەشکردبوو، کە بێجگە لە دەستەیەك کوڕی رۆژو ماستاوکەرو خۆبژێن‌و "بەڵێ گەورەم"، زۆربەی زۆری خەڵکی ئێران، نەمانی ئەو رژێمەیان بەئاوات دەخواست. ئەمەش هەلومەرجێکی باشی بۆ دوژمنە فرەکانی شا، بەتایبەتی چەپیەکان‌و، گەلانی نافارسی بندەست‌و، مەلا شیعەکان، رەخساندبوو، کە هەریەکەیان لەدەرفەتێك دەگەڕان بۆ پەلاماردان. بەڕێکەوت راپەڕینی خوێندکارەکانی هێندەك لەزانستگەکانی ئێران، بۆ هێنانەدی داخوازییەکانیان‌و، کوشتنی چەند خوێندکارێك بەدەستی پۆلیس‌و ساواکییەکان، کارێکی وایکرد کە ئاخوندەکان بکەونە رەخنەگرتن. یەکێك لەچوار ئایەتوڵڵا گەورەکەی ئێران، کازمی شەریعەتمەداری بوو، کە ترکێکی ئازەری‌و خاوەنی مریدێکی یەکجار زۆر بوو، لایەنی خوێندکارەکانی گرت‌و، ئەم لایەنگرییەش، جۆشی بەجەماوەردا، کە بێنە سەر شەقام‌و بکەونە خۆپێشاندان دژی رژێم. پەیامنێری تەلەڤزیۆن‌و رۆژنامەکانی دەرەوە، هەر رۆژە نارۆژێك وتووێژێکیان لەگەڵ شەریعەتمەداری بڵاودەکردەوە. ئەمە لەکاتێکدا کە خومەینی لە کوولەکەی تەرپیشدا نێوی نەبوو. شایانی باسە، خومەینی چەند ساڵێك لەوەبەر، بەهۆی نانەوەی ئاژاوەیەکەوە لەدژی مافی ژنان‌و کەمکردنەوەی دەسەڵاتی ئاخوندەکان، لەلایەن رژێمەوە، کە لەو ئاژاوەیەدا، چەند کەسێك کوژران، گیراو، شا بەتەمابوو لەنێوی ببا، بەڵام پێش ئەوە، پرسی بەشەریعەتمەداری کردبوو، تابزانێ بیروڕای وی چییە لەو

بارەیەوە.. شەریعەتمەداری بەشای گوتبوو: "نابێ بە هیچ جۆرێك دەست بۆ خومەینی ببرێ، خومەینی گەیشتووتە پلەی ئایەتوڵلاییو، کوشتنی خومەینی هەڵگیرسانی ئاگری بەدواوەیە". لەبەرئەوە شا لەو نیازەی خۆی پاشگەز بووەوەو، خومەینیی دەربەدەری ترکیا کرد. خومەینی، پاش ماوەیەك، ڕوویکردە نەجەفو لەوێ گیرسایەوەو، دوژمنایەتیی نێوان ڕژێمی شاو ڕژێمی سەددامی، ژیرکانە بەکارهێنا بۆ پروپاگەندە کردن بۆ "حکومەتی ئیسلامی"، کە گوایە حکوومەتی "داپەروەریو یەکسانیو ئازادی"یەو، لەوێوە قسەکانی خۆی لەسەر کاسێت تۆمار دەکردو دەیناردنەوە ئێرانو، ئەوجا کە شای ئێرانو سەددامی عێراق، ڕێککەوتننامەی جەزائیریان مۆر کردو، گلۆڵەی خومەینی لەعێراق کەوتە لێژی، ماوەیەك بە "تقیە" (واتە شاردنەوەی بیروڕاو ئامانج لەکاتی مەترسیدا، کە یەکێکە لە بنچینەکانی ئاینزای شیعەیەتی) سەری خۆی کز کرد. بەڵام کە لەساڵی 1979دا چاوی بەوە کەوت کە شەریعەتمەداری کەوتووەتە ڕەخنەگرتن لە ڕژێمی شاو، جەماوەر لەئێران کەوتووەتە جووڵە، ئەمیش بنەمای "تقیە"ی پساندو، کەوتە قسە. بەڵام سەددام، هەرچەندە لەدڵەوە لەدژی ئەوە نەبوو کە خومەینی شەڕی شا بکا، لەگەڵ ئەوەشدا نەیتوانی پتر لەو ماوەیە، ڕێ بە خومەینی بدا لەعێراقدا بمێنێتەوەو، داوایکرد لێی کە عێراق بەجێ بهێڵێ. ئەمجارە، خومەینی ڕوویکردە فەرەنسا، واتە ئەو وڵاتەی کە خومەینیو هاوکارەکانی بەوڵاتی کفرو دوژمنی ئیسلامو چی چی، دەیاندایە قەڵەم. هەوڵدانی خومەینی لە فەرەنساوە، بۆ دامەزراندنی ڕژێمێکی مەلا فەرمانی کە دەنگی هەموو ڕەخنەگرێك بەشیرو تیر کپبکا، وای لە چەپییەکانی فەرەنساو ئەورووپای ڕۆژاوای ئەو سەردەمە نەکرد، کە سنوورێك بۆ چالاکیی خومەینی دابنێنو، هەوڵی هاتنە سەرکاری سیستەمێکی دیموکراتیی ئازادیخواز لەئێراندا بدەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە، کەوتنە پەسندانی خومەینیو، ئامادەکردنی دەستاوێژ بۆ دەسەڵات وەرگرتنی. دەزگەکانی ڕاگەیاندنی

گشتی لەئەوروپا، چ تەلەفیزیۆن‌و چ رادیۆو چ رۆژنامە، شەرە زرتانێیان بوو لەسەر چوونە لای خومەینی‌و، وتووێژ کردن لەگەڵی‌و، بەم جۆرە خومەینیان لەجیهاندا بەنێوبانگردو، وەك "شۆرشگێر"و "رزگارکەری بندەستان"و "تێرکەری هەژاران" دایە قەڵەم. بەم جۆرە، خومەینی کە چەند تایبەتکارێکی تێدا هەبوو، وەك جەربەزەیەتی‌و بوێری‌و بێبەزەیەتی، توانی جڵەوی بزووتنەوە لەدەست شەریعەتمداری وەربگرێ، کە ئەو، ئەو تایبەتکارانەی خومەینی تێیدا نەبوو، ئەگەرچی ئەویش هەر وەك خومەینی، ئامانجی دامەزراندنی "دەوڵەتێکی ئیسلامی" بوو.

ئێستە ئێران، پاش ئەو تاقیکردنەوەیە بەدەستی خومەینی‌و، پاشئەوەی ئەوە (25) ساڵە، "حکوومەتی دادپەروەریی ئیسلامی"ی خومەینی، پێشانی هەموو جیهان دەدا، کە رێبەرەکەی، واتە، خومەینی، هیچ ئازادییەکی بە کەس رەوا نەدیتوە، بەڵکو تەنانەت رێ‌و شوێنی داناوە بۆ خەڵك، کە چۆن دەست بە ئاو بگەیەنن (تەماشای پەرتۆکی ﴿توضیح المسائل﴾ی خومەینی بکەن‌و، بزانن چەند لاپەرەی نووسیووە لەسەر چۆنیەتی دەست بەئاوگەیاندن بەپێی "شەرع")، ئێستە ئێران دەیەوێ ئەو تاقیکردنەوەیە لەعێراقدا دووبارە بکاتەوە، ئەمجارە بەدەستی موقتەدا سەدر. بەلام جارێ بابزانین ئەم موقتەدا سەدرە کێیە؟

**موقتەدا سەدر، هەروەك خومەینی، کابرایەکی مرومۆچی رووگرژی، تەنگە تیلکەی سەرچڵی جەربەزەی رکنەستوورە. بەلام بەپێچەوانەی خومەینیەوە، کە لە خوێندەواریی ئیسلامەوانیدا گەیشتبووە پلەی "ئایەتوللایی"، ئەم هێشتا پلەی "موجتەهیدێتی" تێنەپەراندووە، کە گەیشتن بە پلەی "ئیجتیهاد" مەرجێکی بنچینەییە بۆ فتوادان لای شیعەکان. ئەو سەرمایەیەی کە موقتەدا هەیەتی‌و پێوەی دەنازێ، ئەوەیە کە کورێ مەلایەکی شیعەیەکە، کاتی خۆی بە پیلانێکی سەددام کوژراوەو، ئەوەبوو هەر پاش رووخانی سەددام، ئەو کەسەی کە دەستی لەکوشتنی باوکیدا هەبوو، گرتی‌و بێ دادگاییکردن ( محاکمە ) کوشتی.**

موقتەدا، کە لەسەردەمی سەددامدا، سەری خۆی کز کردبوو، پاش ئەوەی ئەمریکاییەکان و هەڤاڵبەندەکانیان و، لەنێو ئەوانەدا، هەزاران سەربازی کورد، سەددامیان راوەدوونا، خۆی دەرخست و کەوتە جرتوفرت. سەرمەشقی چالاکییەکانی بەکوشتنی عەبدولمەجیدی خۆیی و زێوان (کلیدار)ی سەحەنی حەزرەتی عەلی، کە یەکەمین ئیمامی شیعەکانە، دەستپێکرد. چۆنکە بنەماڵەی خۆیی، هەر لەکۆنەوە لەگەڵ بنەماڵەی سەدر نێوانیان ناخۆش بوو، بەلام بنەماڵەی خۆیی لەگەڵ سیستانی نێوانیان خۆشە، کە موقتەدا، ئەگەر دەستی بڕوا، سیستانیش لەنێو دەبا. شایانی باسە، سیستانی و بنەماڵەی خۆیی دژ بە خومەینی بوون و ئێستەش دژی خامەنیین.

پاش ئەم خوێنڕێژییە، موقتەدا سەدر چوو بۆ ئێران و، پێوەندیی بەکاربەدەستانی ئێرانەوە کرد. بەپێی هێندەك سەرچاوەی هەواڵ، کاربەدەستانی رژێمی ئێران دەستەبەر بوون بەبڕینەوەی پارەیەکی باش بۆ خۆی و، بۆ هێزێکی چەکدار کە دروستیبکا لەشێوەی "پاسدارانی ئێران"دا، رێ لە کورد بگرێ و نەیەڵێ کەرکووك و مووسڵ و دیالە بگەڕێنەوە بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان. موقتەدا کە گەڕایەوە عێراق، یەکەمین کاری ئەوەبوو، چەند چەکدارێکی نارده کەرکووك بۆ پشتگیریی تۆرانییەکانی سەر بە "بەرەی ترکمانی"و، نەڕاندن دژی کوردو سەرکردەکانی و، هاوارکردن کە "کوردستان دوژمنی خودێیە"، داروەدەستەکەی هاواریاندەکرد: "لا اله الا الله، کردستان عدو الله". بەلام موقتەدا، بەفەرمانی ئێران، جاری پەلاماری ئەمریکاییەکانی نەدەدا، چۆنکە رژێمی ئێران، دوای خستنی سەددام، پێیوابوو، ئەمریکا رێکدەکەوێ لەگەڵی و، دەیکاتە بەشدار لە "ئاوەدانکردنەوەی عێراق"دا، چاویش دەپۆشێ لە تاقیکردنەوەی تەکنیکانە بۆ دروستکردنی چەکی ئەتۆمی. ئەمریکاش پێیوابوو، دەتوانێ لەڕێی خاتەمییەوە، ئێران بەرەو چاکسازی (ریفۆرم) بباو، ئێران وا لێبکا

واز لەبیری دروستکردنی چەکی ئەتۆمی بهێنێ‌و، پاسدارەکانی لە لوبنان، کە بەنێوی "حیزبوڵلا"وە خەریکی کاری تیرۆریستین، هەڵبوەشێنێتەوە،و واز لە پشتگیریی فەلەستینیە دەستوەشێنەکان بهێنێ. لەبەر ئەوە، ئەمریکا ماوەیەك لەئێران بێدەنگ بوو. رژێمی ئێرانیش، ئەم هەلەی بەکارهێناو، لەم ماوەیەدا، بەسنووری بەرەلای عێراقدا، هەزاران پاسدارو سیخوڕی خۆی ناردە نێو عێراقەوە، بەنێوی "زیارەتی گۆڕە پیرۆزەکان"ەوە. ئەمریکاییەکان، کە بەداخەوە، گەلێکی درەنگوەرگرن، کە بۆیاندەرکەوت رژێمی ئێران، بەموو لە ئامانجە خراپکارییەکانی خۆی لاناداو، دەستیدەستی بە ئەمریکا دەکات‌و، دەیەوێ کات بباتەوە، ئەوجا هاتن زۆریان لە ئەوروپا کرد کە مەترسیی کێشەی تاقیکردنەوەی ئەتۆمانەو، دەوڵەمەند کردنی یۆرانیۆم لەلایەن ئێرانەوە، بخەنە بەردەم ئەنجومەنی زێرەڤانیی کۆمەڵەی نەتەوە یەککگرتووەکان‌و، ئێران ناچار کرا کە رێ بدا، بنکە ئەتۆمییەکانی لەلایەن چاودێری نەتەوە یەککگرتووەکانەوە بپنە پشکنین، بێ ئەوەی کاربەدەستانی ئێران، پێشەکی لەوە ئاگادار بکرێن. ئەوجا ئێران بۆ بەربەرەکانێی ئەمریکا، فەرمانی دا بە موقتەدا سەدر، کە چەکدارەکانی نێو بنێ "لەشکری مەهدی"و، پێوەندیی ببەستێ بە سوننیەکانی فەلووجەوەو، لەگەڵ بەعسیەکان‌و تۆرانییەکان، بەرەیەکی یەککگرتوو دروستبکا لەژێر ئالای "لەشکری مەهدی"دا، کە ئەمەش ئەو شەڕو کوشتارەی لێ دروستبوو، کە سەتان خەڵکی عێراقی تێدا کوژرا، بێجگە لە سەربازەکانی هاوپەیمانان‌و، ئەنجامەکەشی بەوە گەڕا، کە نوێنەری هاوپەیمانان لە عێراق پۆل برێمەر، موقتەدا بەچەتەو رێگرو تاوانبار بداتە قەڵەمو، داوای ئەوە بکا لێی، خۆی بدا بەدەستەوە. موقتەداش، بەئاشکرا دەبێژێ کە "لەشکری مەهدی" باڵی سوپایی "حەماس"و "حیزبوڵلایە"و، ئەوانەی کە لەگەڵ هاوپەیماناندا هاوکاری

دەکەن‌و، لەنێو ئەوانەدا سەرکردەکانی حیزبە کوردییەکان، بە "مهدور الدم" دەداتە قەڵەم، واتە رشتنی خوێنیان حەڵاڵ دەکا، وەك چۆن خومەینی رشتنی خوێنی هەزاران کەسی حەڵاڵکردو بانگی "جیهاد"ی دا لەدژی کورد.

کاربەدەستانی رژێمی ئێران کە دەزانن، موقتەدای ئەڵقە لەگوێی ئەوان، لەسەر زەوییەکی رفۆك وەستاوە، دەیانەوێ ژیانی بپارێزن، بۆ ئەوەی دەورەکەی خومەینی پێ تەواو بکەن. لەبەر ئەوە بەهۆی چڵکاوخۆرەکانی خۆیانەوە، هەوڵی نێوبژێکردن دەدەن لەنێوان موقتەداو هێزی هاوپەیماناندا، بەوەی کە موقتەدا ببێ بە پەنابەر لەئێران‌و، دەیانەوێ لەرێی سووریاوە بیفرێنن بۆ ئێران. **بێگومان مەترسیی موقتەدا سەدر بەراکردنی بۆ ئێران نابڕێتەوە، بەڵکو پتر دەبێ، وەك چۆن مەترسیی خومەینی بەدەربەدەر کردنی پەرەی سەند، بێجگە لەوەش، موقتەدا سەدر، تۆمەتی کوشتنی عەبدولمەجید خۆیی‌و کلیداری سەحەنی حەزرەتی عەلی‌و، گەلێکی دیکەی لەسەرەو، رشتنی خوێنی مرۆڤ بەپێی قانوونی شارستانی، مافێکی گشتییە، تەنانەت ئەگەر کەسوکاری کوژراویش لێی خۆش بن، ئەوا دۆزگری گشتی (المدعی العام) ناتوانێ لێی خۆش بێ.** سەبارەت بەوە، هەوڵدان بۆ گرتنی موقتەدا سەدرو، دانی بە دادگە، فەرمانێکی قانوونییە. سیستانیش کە لەترساندا بێدەنگە، پێویستە بزانێ کە خومەینی لە پاداشتی ئەوەدا کە شەریعەتمەداری نەیهێشت شای ئێران بیکوژێ، ئەو، کە هاتە سەرکار، شەریعەتمەداری هەتا مردن دەستبەسەر کرد، موقتەدا سەدریش، ئەگەر رۆژێك دەستی بڕوا، ئاوا لە سیستانی دەکا، ئەگەر بەدەردی عەبدولمەجیدی خۆیی نەبا.

**سەرکردەکانی حیزبە کوردییەکانیش، کە موقتەدا سەدر، بە "نۆکەر"ی ئەمریکایان دادەنێ‌و، خوێنیانی "حەڵاڵ" کردووە، دەبێ بزانن کە نێوبژێکردنیان**

بۆ ڕاگرتنی ئەم ئاژاوەیە، تەنێ بۆ ماوەیەکی کاتی دەبێ‌و، بەزیانی خۆیان‌و کورد تەواو دەبێ. مانی موقتەدا سەدر مانای بوونی هێزێکی تیرۆریستانەیە وەك پاڵپشتێکی دڕندانەی "بەرەی تورکمانی"و عەرەبە کانی "تەعریب". ئەمانیشی خێری کوردو ئازادیخوازانی تێدایە. کاك مەسعودو مام جەلال دەبێ بزانن کە ڕێی ڕاست ئەوەیە، هێزە چەکدارەکانیان لە لەشکرێکی کوردستانیدا، بۆ وێنە بەنێوی "لەشکری بارزانی"یەوە یەکبخەن. (مەبەستم لە بارزانی سەرۆکی کۆچکردوو، مەلا مستەفا بارزانییە)و لە حیزبحزبێنە دووریبخەنەوەو، لەم دەرفەتە سووت وەربگرن‌و، لەشکرەکە بەچەکی مۆدێرن ڕەخت بکەن‌و، هێزێکی زۆر گەورە بنێرنە بەغداو، کاك مەسعوودو مام جەلالیش لە ئەمریکاییەکان بگەیەنن، ئەگەر خۆیان بە هەڤاڵبەندی کورد دەزانن‌و، دەیانەوێ بەسەری شکاوو قوونی دڕاوەوە، وەك کوردەکە دەبێژێ، لەعێراق دەرنەچن، گوێ لە ئامۆژگاریی هەڤاڵبەندە کوردەکانیان بگرن‌و، لەشکری کوردستان بەهێز بکەن‌و، سنووری ئێران‌و سووریا، بەجارێك دابخەن‌و، کۆنترۆڵ بخەنە سەر سنووری تورکیاو ئەردەن‌و حیجازو، خەڵکی ڕەشورووت‌و هەژار، کە لەبرساندا ڕاپەڕیون، لە تیرۆریستەکان جیا بکەنەوەو، تەڕو هێشك پێکەوە نەسووتێنن. پارووە نانێکیش بۆ ئەو هەژارانە مسۆگەر بکەن کە لەناو هەژاری بوونەتە دەسکەلای موقتەدا سەدر، چۆنکە برسێتی -وەك کورد دەبێژن- ڕەگی هاری پێوەیە. کاربەدەستانی کوردیش، پێویستە لەسەریان بەیەکخستنی هێزەکانیان‌و، یەکگرتنی بەڕێوەبەرێتییەکانیان‌و، وازهێنانیان لە بەرژەوەندیی تەسکوتروسکی حیزبایەتی، وا لەئەمریکا بکەن کە دۆزی ئاسایش لەهەموو عێراقدا بەکورد بسپێرێ.

بەرلین 2004/4/12

**میدیا**، ژ 160، 2004/4/15

# مەلا عەلی سیستانی زۆرزان و، کاربەدەستانی ساویلکەو لەکاروان بەجێماوی کورد

خوێنەرەوەکانی رۆژنامەی "میدیا" ئەوەیان لەبیرە، کە ئەز هەر پاش ئەوەی مەلا عەلی سیستانیی بێ نێوونیشان، وەك قارچك، لەپڕ، لەسەر شانۆی رامیاریی عێراق هەلتۆقی، دەستبەجێ لە چەند ژمارەیەکی "میدیا"دا، کەسایەتیی ئەم مەلایەم خستە بەرچاو،و خوێنەرەوەکانم لەوە ئاگادار کرد، کە عەلی سیستانی، مەلایەکی فارسی شیعەی هاوڕازی بیرو بۆچوونی خومەینی و خامەنەییەو، ئەمیش، هەروەك ئەوان، بۆ دامەزراندنی حکومەتێکی ئیسلامی، لەشێوەی "مەلا فەرمانی" (ولایت فقیە)دا، هەوڵدەداو، ئەوەشمگوت کە خومەینی چەندی پێبوو بۆ کورد، سیستانیش هەر هێندەی پێیە، ئەمەش بەتاقیکردنەوە راست دەرکەوت. هەروەها، ئەوەشم باسکرد کە جیاوازیی نێوان خومەینی و سیستانی، لەلایەکەوە، ئەوەیە کە هەریەکەیان "ئیمامەتی"و "مەرجەعیەت"ی شیعەکان، تەنێ بەخۆی رەوا دەبینێ، نەك بەوی دیو، لەلایەکی دیکەشەوە، ئەو سەرچڵی و جەربەزەیەتی و توندەدەمارییەی کە لە خومەینیدا هەبوو، لە سیستانیدا نییە. سیستانی لەسەرخۆو وردەنزمەو، هۆشیارانە دەجووڵێتەوە، ئەوەبوو کاتێك کە سەددام لەسەر کاربوو، سیستانی بەپێی سەرەتای "تقیە" (واتە، خۆشاردنەوەو خۆگۆڕین لەکاتی مەترسیدا، کە یەکێکە لەبناخەکانی ئاینزای شیعە) دەچوو بەرێوەو بەوە، خۆی لەدەستوەشاندنی سەددام پاراست، بەپێچەوانەی باوکی موقتدا سەدرەوە(سادق سەدر)، کە ماوەیەك نێوانی لەگەڵ سەددام باش بوو و، سەددامیش گەلێك هیوای پێبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی پێی لەبەرەکەی خۆی درێژتر راکێشا، سەددام لەنێوی برد.

ئەوجا، چۆن سەددام بیری لەوە دەکردەوە، مەرجەعیەتیەکی شیعەیی سەر بە بەعس، لەرێی باوکی موقتەدا سەدەرەوە، دژی ئێران لەعێراقدا دروستبکاو سەرنەکەوت، ئەمریکاییەکانیش، لە ناشێتیی و ناشارەزاییی خۆیانەوە، سەریان لەشتێکی وا دەخوراو، ئەمەشم هەر لە "میدیا"دا بڵاوکردەوە. ئەوەی وای لە ئەمریکاییەکان کرد، کە پێیانوابێ سیستانی ئەو پیاوەیە کە ئەو دەورە نەتوانێ بگێڕێ، ئەوەبوو، هەر زوو گوتی، کە بەتەما نییە حکوومەتێکی ئیسلامی لەچەشنی رژێمی ئێران، لەعێراقدا دابمەزرێنێ و، دەیەوێ لە هەموو عێراقدا هەڵبژاردنێکی ئازاد هەبێ، بۆ ئەوەی عێراقییەکان بەئارەزووی دڵی خۆیان سیستەمی فەرمانڕەوایی دەستنیشانبکەن. ئەم هەڵوێستەش کوتومت لەهەڵوێستی سەردەمی بێدەسەڵاتیی خومەینی دەچوو، چۆنکە خومەینی، کاتێك بەدەربەدەری و پەنابەری، لە فەرەنسا لەژێر درەختێکدا لەگەڵ رۆژنامەنووسان هەڤپەیڤینی دەکرد، دەیگوت "ئیسلام، مانای ئازادی و یەکسانییە"و جەختی لەسەر ئەوە دەکرد، کە پاش خستنی رژێمی شا، هەڵبژاردنێکی گشتی دەکرێ و، خەڵکی ئێران بەسەربەستی دەچنە هەڵبژاردنەوە، بۆ دیاریکردنی ئەو سیستەمەی کە دەیانەوێ.

راستیەکەشی ئەوەیە کە دامەزراندنی "کۆماری ئیسلامیی ئێران" خرایە دەنگدانەوە، چۆنکە خومەینی سەتی سەت دڵنیا بوو کە زۆربەی زۆری خەڵکی لەخشتە براوی ئەو سەردەمەی ئێران، دەنگ بۆ "کۆماری ئیسلامیی ئێران" دەدەن، بێ ئەوەی بزانن کە چییەو چۆنە. سیستانیش، هەروەك خومەینی، زۆر باش دەزانێ، کە زۆربەی زۆری شیعەکانی عێراق و گەلێك لایەنی دیکەش، پەرلەمانێکی وا کۆنەپەرستانە هەڵدەبژێرن کە بەدڵی مەلا عەلی سیستانی بێ و، بەمەش رەوایەتی دەدەن بە دیکتاتۆرێتیەکی گەلەکۆمەیی بەنێوی دێمۆکراسی و، مافی فەرمانڕەواییی زۆرێتی بەسەر کەمایەتیدا، کە دەمێکە پەنجەم بۆ ئەم باسە راکێشاوە.

بۆ گەیشتنە ئەم ئامانجە، مەلا عەلی سیستانی لە دوو لاوە زیرەکانە کەوتە کار، لەلایەکەوە، هەزاران و هەزاران خەڵکی بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە هێنایە سەر شەقامەکانی بەغداو خوارووی عێراق، بەنێوی شینی حەسەن و حسەین و پرسەی "عاشوورا"وەو، کە ئەوەش هەموو دەزگەکانی راگەیاندنی گشتیی لەجیهاندا سەرسامکرد. لەلایەکی دیکەشەوە، خۆی وا قورس راگرت، کە تەنانەت یەکجاریش، رێی نەدا بەوەی برێمەر، یان کاربەدەستێکی دیکەی ئەمریکایی، بچێ بۆ لای. سیستانی لە تێکۆشانیدا بۆ گەیشتنە ئامانجەکەی خۆی، بەتەواوی بەپێچەوانەی سەرکردەکانی دوو زلحیزبە کوردییەکەوە جووڵایەوە، کە رێیان نەدا بە جەماوەری کورد، چ لەکوردستان و چ لە بەغدا بکەونە سەرشەقامەکان و، داوای مافی خوراوی کورد بکەن، ئەمەش لەترسی ئەوەی دەسەڵاتی کوێخایەتییان لەدەستبچێ، بەڵکو لەجیاتی ئەوە، کەوتنە ماچوو مووچ لەگەڵ کاربەدەستانی ئەمریکاو، رێگرتن لە هەموو بزوتنەوەیەکی جەماوەرانە، کە ئەوە مافێکی سروشتی هەموو مرۆڤێکی ئازادەو، گەلانی رۆژاواییش نرخ بۆ خۆپێشاندان و مانگرتن و دەنگدان دادەنێن.

سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، لەباتی ئەوەی هەوڵبدەن سنوورێك بۆ کەینوبەینی سیستانی لەدژی کورد دابنێن، هەستان چوونە سڵاوی سیستانی و کەوتنە پەسندانی لەرۆژنامەکانی رۆژاوادا و، کردیان بەمرۆڤێکی "ئازادیخواز و دۆستی کوردو ئاشتیپەروەر"، ئازادیخوازی و دۆستایەتیی کوردو ئاشتیپەروەریی سیستانیش ئەوەبوو کە بوو بەهۆی ئەوەی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەیەك وشە باسی کێشەی کوردو کوردستان و "قانوونی بەڕێوەبەرێتیی کاتی" نەکا.

بەپێچەوانەی سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکەوە، کە بەشانازییەوە هاوکاریی خۆیان لەگەڵ لەشکری ترك دژی پێ کێ کێ دەگێرنەوە (کە لێرەدا هیچ مەبەستم ئەوە نییە لەسەر پێ کێ کێ بکەمەوە، چۆنکە خراپەکاریی هەموو

جۆرەی پیٚ کیٚ کیٚم لەبەرچاوە، بەڵام خراپەکاریی هەشتا ساڵەی رژێمی تركیشم هەر لەبەر چاوە، کە هەزار هێندەی خراپەکاریی پیٚ کیٚ کیٚ یە). با ئەوەش بیژین کە جێگری پارێزگاری نەجەف، لەبەر هێرشەکانی ئەمریکا بۆ سەر "سوپای مەهدی"و نەجەف، دەستی لەکار کێشایەوەو، مەلا عەلی سیستانیش، سەرەڕای ئەوەی حەز لەچارەی موقتەدا سەدرو بنەماڵەی سەدر ناکا، بەڵام تائێستە، نەك بەکردەوە، بەڵکو تەنانەت قسەیەکی خراپیشی لەدژی موقتەدا سەدر لەدەم دەرنەچووەو، بگرە سووتی لەکارو کردەوەی موقتەدا سەدر دیوەو، دەبینیٚ بۆ بەهێز کردنی جێپێی خۆیو، ئەوەتە کە دەزانیٚ هاسنەکە داخە، روویکردووەتە لەندەن، بۆ ئەوەی ناچار نەبیٚ لە نەجەف هەڵوێستێك بنوێنیٚ. ئەمەش نیشانەی زێهاتیو کارزانییو دووربینی سیستانییە، ئەگەرنا سیستانی ئەو نەخۆشە نییە کە بچێتە لەندەنو، دکتۆرەکانیشی دەبێژن کە پێویستی بە نەشتەرگەری نییە.

لەهەمووی نابەجێتر ئەمەیە، کە پاش ئەوەی سیستانی رووی راستینەی خۆی پێشانی کورددا، کەچی "یەکێتی" ژمارەیەکی زۆر لە مەلاکانی کوردستان، بە هەزاران ئیمزاوە رەوانەی لای سیستانی دەکاو، ئەوانیش دەچن لە سیستانی دەپاڕێنەوە، بۆ ئەوەی دژی بەعەرەبکردنی کوردستان هەڵوێست پێشانبدا، کەچی سیستانی بە مەلا کوردەکان دەڵیٚ "لە عەرەبە هاوردەکان خۆش بن". دیارە خۆ ناتوانیٚ جنێو بەکورد بدا، لەبەر ئەوە دەبێژیٚ کە "کوردی خۆش دەویٚ" چۆنکە دەزانیٚ ئەوە هەر قسەیەو، قسەش بە گوومرگەکەی برایم خەلیلدا تێناپەڕیٚ. لەگەڵ ئەوەشدا، مام جەلال ئەو قسە سەرزارییەی سیستانی دەکا بە بەڵگە بۆ پەسندانی سیستانی. ئەوەتا رۆژنامەی Neue Zürcher Zeitung، کە رۆژنامەیەکی بەنێوبانگی سویسراو هەموو ئەورووپایە، لەرۆژی 8/6دا وتووێژێکی لەگەڵ مام جەلال بڵاوکردبووەوە، کە لەوێدا مام جەلال گوتوویەتی:

"سیستانی پیاوێکی ژیرە، داخوازیی بوونی ئەنجومەنی سەرپەرشتی ناکا وەك لەئێران هەیە. ئایەتوڵڵای سیستانی بیری وایە کە فەرمانڕەواییی ئیسلام، کاتێك دێتە دی کە ئیمامی ونبوو، مەهدی، بگەڕێتەوە. دەربڕینەکانی (سیستانی) ئەوە ناگەیەنن کە ئەو داوای حکوومەتێکی مەلاکان دەکاو، ئایەتوڵڵای سیستانی پشتیوانی کوردە. ئەز چەند جارێك چاوم پێی کەوتووە، ئەو پشتگیریی گەلی کورد دەکا. لەچاوپێکەوتنی ئەم دواییەیدا لەگەڵ مەلا کوردەکان، پاکتاوکردنی ڕەگەزی مەحکووم کردو، داوای گێڕانەوەی عەرەبە هاوردەکانو دانەوەی زەویو زارەکانی بەکورد کرد".

ئێستە، با خوێنەرەوەکانی ئەم قسانەی مام جەلالو هەموو نەتەوەی کوردو، بەتایبەت ئەو مەلا کوردانەی کە بەداخوازیی یەکێتی، چوونە لای سیستانی، سەرپشك بن لە بڕیارداندا، بەڵام زۆر دەترسم کە سیستانی بەم زووانە، وەك سەددامی جاران، بکرێتە سەر پشك (حُکْم)!!! ڕاستییەکەی، ئەگەر یەکێتی مەبەستی خزمەتی کوردو، هێنانەدی ئاواتی کوردە کە ئەوەش گەیشتنە بە پلەی سەروەرێتی، نەك کوێخایەتیی سەرکردەکان، نەبوو مەلاکانی نەناردایە لای سیستانی، بەڵکو مەلاکانی بەملیۆنێك ئیمزاوە کە کۆکرایەوەو، خرایە چاوی مێژەوە، بناردایە بۆ کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان، لەو ڕۆژەدا کە باسی چارەنووسی عێراق دەکرا. سیستانی کاربەدەست نییەو، جارێ هیچ دەسەڵاتێکی دەوڵەتیی نییە، بەڵام ئەوە هەڵوێستی بوو بەرامبەر "فێدەراڵی"و "قانوونی بەڕێوەبەرێتی کاتی" کە فشە مافێکی بەکورد ڕەوا نەدی. خۆ ئەگەر ڕۆژێك بێ‌و بکرێتە نوێنەری "ئیمامی زەمان"، داخوا، چی بەسەری کورد بهێنێ. شایانی باسە کە کۆنگرەی ئەم دواییەی شیعەکان لە ناسرییەو لێدوانەکانی جێگری پارێزگاری بەسرە کە باسی جیابوونەوەی پارێزگەکانی باشووری لەعێراق کرد، وەك هەرێمێکی فێدەراڵی یان سەربەخۆ، نەبوو بەهۆی ئەوەی سیستانی لەدژی بوەستێ، بەڵکو قوڕو قەپی کرد لێی.

گوریسکێشەکێی بردنەوەی دەسەڵات لەعێراقدا، لەنێوان ئەیاد عەلاوی بەعسیو ئەحمەد چەلەبی لیبەرالدا، بەوپەڕی توندوتیژییەوە دەستیپێکردووە. عەلاوی، لەباری بیرو بۆچوونو شێوازی کارکردنەوە، بەعسییەکی تەواوە، وەك سەددام، بەڵام، بەپێچەوانەی سەددامەوە کەللەرەقو کەرپیاو نییەو، تاقیکردنەوەیەکی زۆری هەیە، کە لەساڵانی کار کردنیدا لەگەڵ دەزگەی سیخوڕیتیی ئەمریکاو بەریتانیا دەستیکەوتووە. عەلاوی، پاش ئەوەی بەپشتگیریی ئەمریکاو یارمەتیی سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، گەیشتە پلەی سەرۆکوەزیرانی عێراق، ئێستە دەیەوێ بەهێزی سوپایی ئەمریکا، دوژمنەکانی نێوخۆی لەنێوببا. هەڵکوتانە سەر چەکدارەکانی موقتەدا سەدرو، شەڕ فرۆشتن بە ئەحمەد چەلەبیو سالم چەلەبی، سەرپەڕەی کارەکانی نێوخۆیی عەلاوین. هەرچی ئەحمەد چەلەبییە، ئەوا دەیەوێ بە خۆڕێکخستن لەگەڵ موقتەدا سەدرو یارمەتیی ئێران، دەسەڵاتی خۆی فراوان بکاو، هەر ئەمەیە کە ئەترەشی عەلاوی بردووە، ئەگەرنا ئەو تۆمەتانەی دەخرێنە پاڵ ئەحمەد چەلەبی، وەك پارە پێداکێشانو ساختەکارێتی، ساڵانی ساڵە باسدەکرێن. فەرماندەرکردنیش بۆ گرتنی سالم چەلەبی، هەوڵدانێکە بۆ بێنرخکردنی دادگەی لێپرسینەوەی تاوانەکانی سەددامو هاودەستەکانی، کە دیارە، سەددام، وەك چۆن لەراڕەوی دادگەدا، تفێکی خەستی کردە رووی تاریق عەزیزو بەخاینی نێوبرد، یەك دوو قسەش لەگەڵ کۆنە هاودەستەکەی خۆی، ئەیاد عەلاوی، دەکاو عەلاویش لەمە زەندەقی چووە. ئەمە بێجگە لەوەی کە عەلاوی دەیەوێ رژێمێکی بەعسی بەسەر عێراقدا بسەپێنی، ئەوجا بەیارمەتیی کاربەدەستە لەسیاسەتدا کۆڵەوارەکانی ئەمریکا. سەردانی عەلاوی لە ئەردەنو سووریاو، هەوڵدانی بۆ نێزیککردنەوەی رژێمی بەعسی سووریا لەئەمریکاو، دوورخستنەوەی سووریا لەرژێمی ئێرانو، هەوڵدانی عەلاوی بۆ دروستکردنەوەی لەشکری کوردکوژی عێراقو، دەزگەی تیرۆریستی زێرەڤانیی عێراقو، گێڕانەوەی بەعسییەکانی لایەنگری خۆی بۆ

سەر کارو، چاوپۆشینێکی کاتی لە چەکدارەکانی پارتی‌و یەکێتی، تا خۆی کۆدەکاتەوە بۆ هەلکوتانە سەر کوردستان، ئەمانە هەموو نموونەی ئەو چاو وڕاوە دوژمنانەیەیە کە دوژمنانی نەتەوەی کورد، لەناسیۆنالیستە عەرەب‌و ترك‌و فارسەکان، دەیانەوێ پێکەوەو ئەمجارە، بەهەلخلەتاندنی ئەمریکا،‌و سووتوەرگرتن لەساویلکەیەتیی کوێخاکانی کوردستان، بۆ لەنێوبردنی کورد بیبەنەسەر.

ئا لەم رۆژە تەنگانەو چارەنووسسازانەدا، کە ئەرکێکی گران دەخەنە سەرشانی هەموو کوردێکی بەتەنگەوە هاتوو، بۆ ئەوەی بیر لەدوارۆژی نەتەوەکەی‌و وڵاتەکەی بکاتەوە، ئەو پێشنیازەی خۆم کە لەنامەکەمدا بۆ بەڕێزان کاك مەسعوود بارزانی‌و مام جەلال تالەبانی کردبووم، دووبارە دەکەمەوەو، داوادەکەم لێیان، دان بەهەلەی خۆیاندا بنێن‌و تا کار بەجارێك لەکار نەترازاوە، رێ بەجەماوەری کوردستان بدەن کە کاری خۆیان بگرنە دەست خۆیان، چۆنکە، ئەگەر کەسانێك نەتوانن، یان نەیانەوێ لەماوەی 12 سالٚ سەربەخۆییدا، دوو شار بەیەك بەڕێوەبەریتی ببەستن بەیەکەوە، بەدلنیاییەوە، ناتوانن یان نایانەوێ کوردستانێکی گەورەو بەرین رزگار بکەن.

بەرلین 2004/8/12

**میدیا**، ژ 168، 2004/8/6

# ئەگەر ئەمریکا لەعێراق بکشێتەوە!

هەرچەندە جۆرج دەبلیو بوش، چەند جار گوتوویەتی، کە عێراق بەجێناهێڵێ هەتا فەرمانی سەرشانی خۆی بەجێنەهێنێ، لەگەڵ ئەوەشدا، بردنە سەری ئەم بەڵێنەی بوش، کە کاتێکی سنووردارى بۆ دانەنراوە، بەدەست بوش خۆی نییە، بەڵکو بە گەلێك بارودۆخی نێوخۆیی‌و دەرەوەی ئەمریکاوە بەندە. گرنگترینیان ئەوەیە، ئایا بوش‌و کۆمارخوازەکان لە هەڵبژاردنی مانگی نۆڤەمبەری ئەمساڵدا، کە هەمووی دوو مانگێکی ماوە، شەڕی دەنگدان دەبەنەوە یان نا؟ خۆ ئەگەر نەیبەنەوە، ئەوا دژبەرەکەیان، جۆن کیریی سەر بەحیزبی دیموکرات، سیاسەتێکی دیکە دەبا بەڕێوەو، دیارە ئەو بەڵێنەی خۆی بەجێدێنێ کە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر دای‌و گوتی: "ئەگەر بوو بە سەرکۆمار، لەماوەی چوار ساڵەکەی سەرکۆمارێتیی خۆیدا، لەشکری ئەمریکا لەعێراق دەکێشێتەوە"و، هەر لەو بوارەشدا گوتی "شەڕی عێراق شەڕێکی هەڵە بوو، لەشوێنێکی هەڵەو لەکاتێکی هەڵەدا". ئەوەتە، هەر لەئێستەوە هەوڵدەدا کە کوژرانی سەربازەکانی ئەمریکا لەعێراق، کە ژمارەکەی خۆی لەهەزار سەربازێك دەدا، بکاتە هەوێنی ترساندنی خەڵکی ئەمریکا، بۆ ئەوەی دڵیان لە جۆرج بوش کرمێ بکا، وەك چۆن خۆزێ لویس زەباتیرۆ (سەرکردەی حیزبی گوایە سۆسیالیستی ئیسپانیا) کوژرانی چەند هاوولاتێکی ئیسپانیای، بەهۆی تەقاندنەوەی شەمەندەفەرێکەوە، دوو سێ ڕۆژ پێش هەڵبژاردنی پەرلەمان، کردە کوتەکی دەستی خۆی دژی خۆزێ ماریا ئەزناری سەرکردەی حیزبی گەل، کە ئەو دەمە سەرۆکوەزیرانی ئیسپانیا بوو،و لایەنی ئەمریکای دەگرت لەجەنگداو، بەو هۆیەوە زەباتیرۆ هەڵبژاردنی بردەوەو ئەزناری خستو، هەر دوای سەرکەوتنی بەماوەیەکی کورت، گورج 1300 سەربازەکەی خۆی لەعێراق کێشایەوەو، بەمەش ئاوی کرد بەئاشی تیرۆریستاندلو تێیگەیاندن کە تیرۆرو دەستوەشاندن

بەکەڵك دێن، بەتایبەتی دژی مرۆڤی کورتبین‌و چەواشەکراو بۆ سووتی سیاسەتکاری هەلپەرست.
ئەمە لەکاتێکدایە کە ئەگەر جۆرج بوش بیدۆڕێنێ. خۆ ئەگەر جۆرج بوش ئەمجارەش بیباتەوە، ئەوەش بەمەرجێك کە هەتا رۆژی هەڵبژاردن، کارەساتێکی وا نەقەومێ کە رووی ئەمریکاییەکان لە جۆرج بوش وەربگێڕێ، ئەوا، لەم بارەشدا، جۆرج بوش‌و حیزبەکەی، ناتوانن هەتا هەتا سەربازەکانیان لەعێراقدا بهێڵنەوەو هەر رۆژە، یەك دوانێکیان لێبکوژرێ، چۆنکە ئەمریکاییەکان نرخی خەڵکی خۆیان دەزانن‌و، دووریش نییە کە عەرەبەکانی عێراقیش، هەتا ئەو کاتە، بەیارمەتیی ئەمریکاو ئەردەن‌و میسرو ئەوروپا، لەشکرو پۆلیس‌و دەزگەی زێرەڤانیی شۆڤێنیستانەی خۆیان دروستبکەنەوەو، بەیارمەتیی دەوڵەتە عەرەبەکان‌و رژێمی ترك‌و ئێران، پەلاماری کورد بدەنەوەو، ئەو عێراقەی کە پاش هەرەسهێنان‌و نابووتبوون، بەدەستی شێتانەو نابەرپرسیارانەی کاربەدەستانی دوو زلحیزبەکە دامەزرایەوە، دەبێتەوە دۆژە (جهنم)یەکی سەر زەوی بۆ کورد، ئەوجا هەریەکەیان لەم دوو زلحیزبە، ئەوی دی گوناهبار دەکا، وەك ئەوەی قەل بەقەل بێژێ: "بڕۆ رووت رەش بێ"!!!
ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجدان‌و مەترسییەکی گەورەیە، ئەوەیە کە کاربەدەستانی دوو زلحیزبە فەرمانڕەواکەی باشووری دوولەتکراوی کوردستان، هەتا ئەوڕۆ، کە ئەوڕۆیە، هیچ نەخشەیەکیان نییە بۆ ئەو رۆژەی کە ئەمریکا لەعێراق دەچێتە دەرەوەو جڵەوی دەستەڵات دەداتە دەست عەرەبەکان‌و، کوردیش فت دەکا، وەك چۆن فەرەنسا لەنێوەڕاستی چلەکانی سەتەی رابووردوودا، جڵەوی دەستەڵاتی لەسووریای دەستکرددا، دایە دەست عەرەبەکان‌و کوردی فتکردو، ئینگلیزەکانیش لەسەرەتای بیستەکاندا، جڵەوی دەستەڵاتیان لەعێراقی دەستکرددا، دایە دەست میر فەیسەڵی عەرەبی خەڵکی حیجازو پشتیانکردە کورد.

بەڕاستی، ئەز کە ئەو ڕۆژە ڕەشە دەهێنمە بەرچاوی خۆم، یەکسەر سەردەمی پێش هەرەسەکەی شۆڕشی ئەیلوول دێتەوە یادم، کاتێك کە بە کاربەدەستانی پارتیم دەگوت "ئەگەر هاتو شای ئێران لەگەڵ سەددام ڕێککەوت، ئێوە هیچ نەخشەیەکتان هەیە بۆ ئەو دەمە،" دەستبەجێ دەیانگوت: "هیچ کاتێك شای ئێران لەگەڵ سەددام ڕێکناکەوێ". دەمگوت: "ڕەنگە ماوەکە زوو نەبێ‌و درێژخایەن بێ، بەڵام با ئێمە وەك گریمانەیەك (فرچیە)، وادابنێین کە سبەینێ ڕێکدەکەون، ئایە ئێوە چیتان ئامادەکردووە؟ دەیانگوت: "ئەو حیزبەی شۆڕشی هەڵگیرساند، دیارە بیری لەو ڕۆژەش کردووەتەوە". بەڵام هەرەسەکە ئیسپاتیکرد کە هیچ کونوکەلەبەرێك نەگیرابوو،و بیر لەدواڕۆژیش نەکرابووەوە، ئەگەرنا شۆڕشێکی 14 ساڵی بەخۆی‌و سەتوبیست هەزار پێشمەرگەوە، لەشەوو ڕۆژێکداو، بەڕوو وەرگێڕانی شایەك لێی، هەروا بەهاسانی بڵاوە پێنەدەکرا.

کێشەی کورد، پاش هەرەسهێنانی عێراق وەك دەوڵەت‌و، داگیرکرانی لەلایەن هێزی سەربازیی ئەمریکاو هەڤاڵبەندەکانییەوە، تادەهات، بەرەو کێشەیەکی نێو نەتەوەیی دەچوو، بەڵام پارتی‌و یەکێتی، بەبیرو بۆچوونی تەنگەبەرانەو، بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی نانەتەوەییی کوێخایانەی خۆیان، کردیانەوە بەکێشەیەکی نێوخۆیی عێراق‌و، ڕەوایەتیان بۆ دەوڵەتی دەستکردی عێراق دروستکردەوە، بێ ئەوەی خۆیان هیچ ڕەوایەتییەکیان هەبێ، کە بەنێوی خەڵکی باشووری کوردستانەوە قسە بکەن، چۆنکە هیچ حیزبێك، لە هیچ وڵاتێکی جیهاندا، هەرچەندە جەماوەری فرەبێ، مافی ئەوەی نییەو نابێ، بەنێوی نەتەوەیەك‌و خەڵکی وڵاتێکەوە قسە بکا، مەگەر ئەو حیزبە لەهەڵبژاردنێکی ئازاددا، زۆربەی زۆری دەنگەکانی وەدەستهێنابێ‌و، حکوومەتێکی لەڕێی پەرلەمانەوەو بەپێی قانوونێکی دیموکراتانە پێکهێنابێ، ئەوجا ئەو حکوومەتە، نەك ئەو حیزبە، دەتوانێ تا لەسەر کار مابێ، بەنێوی

خەڵكی ئەو وڵاتەوە قسە بكا. جا، لەبەرئەوەی پارتی و یەكێتی، هەشت ساڵە رێیان لەهەڵبژاردنێكی ئازادو گشتپرسییەكی (رەفراندوم) ئازاد لەكوردستاندا گرتووە، رەوایەتییان لەدەستداوە. لەبەر ئەوە، هەموو وتووێژێكیان، لەگەڵ هەر لایەك بووبێ، كە هەمووی هەر بەنهێنی و دزە خونجێنانەو، لە گەل شاراوە بووە، رەوایەتیی پوولێكی قەڵبیان نییە. ئەوجا، ئەگەر ئەمانە بەڕاستی نیشتمانپەروەرن و، نایانەوێ چارەنووسی كورد بخەنە گۆمەوە، دەبێ تازووە، دان بە هەڵەی خۆیاندا بنێن و، چەكدارەكانیان هەڵوەشێننەوەو، رێ بە دروستبوونی لەشكرێكی كوردستانی بدەن و، رێ چۆڵكەن بۆ گشتپرسییەكی ئازاد لەكوردستاندا، تا بزانرێ خەڵكی كوردستان چییان دەوێ. ئەوجا لەهەڵبژاردنێكی ئازاددا، پەرلەمانێك و حكوومەتێكی یەكگرتووی كوردستانی دروستببێ، كە ئەو حكوومەتە بتوانێ لێكۆڵینەوەیەك بخاتە گەڕ، تابزانرێ، هۆی تێكڕژانی كوردو كورد، چی بوو، و بەرپرسیارانی كێ بوون، كە ئەنجامەكەی كوژرانی هەزاران گەنجی كورد بوو، هەروەها بزانرێ، سەردەستەی تالان و بڕۆیی و دزێتی و جەردەیەتی كێ بوون، تابزانرێ، بەرپرسیارانی ژنكوژی كێن، كە هەر رۆژە ناڕۆژێ، ژنێك بەرچەقۆ، یان بەرگوللە دەدرێ، یان بە پرێمز دەسووتێ و، كەسیش بەكەس نالێ "كاكە كەرت بەچەند؟"، تابزانرێ، چارەنووسی ئەو ملیار دۆلارانەی كە لەم 14 ساڵەی دواییدا، داهاتی كوردستان بوون، كەوتنە چ چاڵێكەوە؟ تابزانرێ بۆچی بەقسە، باسی دێمۆكراسی دەكرێ، كەچی رێنادرێ بە هاتنەكایەی رۆژنامەگەرییەكی سەربەخۆ و، رێنادرێ بەهاتنەكایەی كۆمەڵگەیەكی شارستانی (مدنی)و، رێنادرێ بەرەخنەگرتن لە كاربەدەستانی دوو زلحیزبەكەو، رێنادرێ بە هەڵبژاردنی سانديكای سەربەخۆ!

ئەگەر دوو حیزبە دەسەڵاتدارەكە دەیانەوێ بەڕاستی خزمەتی خەڵكی كوردستان بكەن، دەبێ ئەو رێیە بگرنەبەر كە باسكرا، ئەگەرنا خەریككردنی خەڵك بە بالۆرەی هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقەوە، كە كوردستانیش، وەك

بەشێك لەعێراق بخرێتە هەڵبژاردنەوە، مێخێکی دیکە دەبیٚو دەکوترێٚ بەتەرمی هیواو ئاواتی نەتەوەی کورددا.
ئەوڕۆ، کە ئەم وتارە دەنووسم، ڕۆژی 11ی ئەیلوولە، یادی شۆڕشی ئەیلوولە بەسەرۆکایەتیی مەلا مستەفای بارزانی، یادی هەزاران و هەزاران پێشمەرگەی کوردستانە، یادی ئەو مەلا مستەفایەیە کە بێکەس و بێپشتیوان و، بەجووتیٚ کەڵاشی شڕەوە، ڕازینەبوو کەرکووك لە کوردستان جیابکرێتەوەو، درێژەی بەشۆڕش دا، چۆنکە بارزانی و پێشمەرگەکانی، ڕۆمەت و ئاوڕووی خۆیان و نەتەوەی کوردیان، لەسەروەرێتیی نەتەوەی کورددا بەسەر تەواوی خاکی کوردستاندا دەدی. ڕاستیەکەی مرۆڤی ڕۆشنبیرو لەژیانگەیشتوو، ڕۆمەت و ئاوڕوو، لەئازادی و سەربەخۆیی و سەروەرێتیدا دەبینن، نەك لەنێوان دوو لنگی ژناندا.

بەرلین 11ئەیلوولی2004

**میدیا**، ژ 170، 2004/9/16

# که ئەمریکاو هاوپەیمانان خۆیان لە عێراق کێشایەوە

بەڕاستی، نازانم تف بەرەو کوێ هەڵدەم. بەهەر لایەکدا هەڵیدەم، هەر ڕەشەبایەو ڕەشەبا. دیارە، تفی بەرەو با ڕیش دەگرێتەوە. سەیرەکەش لەوەدایە کە خۆم ڕیشم نییە، لەبەر ئەوە، تفەکە یەکسەر بەردەموچاوم دەکەوێ. بەڵام، چاریشم نییەو، وەکو کوردەکە دەبێژێ: "نەدەمم ببێ هاکەمو، نە پێم ببێ ڕاکەم، ئەی قوڕی کوێ بەسەر خۆمدا کەم!!". کێشەکەش ئەوەیە، کە گلەییم لە بێگانان و داگیرکەران نییە، چونکە ئەوان نێوی خۆیان بەخۆیانەوەیە. گلەییەکەم لەکاربەدەستانی کوردەکە خۆیەتی، کە بەهەزار ڕەخنەو گازندەو سیخورمەو نوقورچ و تێوەژەندەن و نەقیزە، باکیان نییەو، وەك کاسەی چەوریان لێهاتووە، بەهیچ ئاوێك تەڕ نابن.

ئێستە، بابێینە سەر چەقی بابەتەکە. سەر باسی وتاری جاری پێشووم لە "میدیا"دا (ژ 170، 2004/9/16) ئەوەبوو "ئەگەر ئەمریکا لەعێراق بکشێتەوە". بەڵام سەرباسی ئەمجارەم بە "ئەگەر" دەستپێناکا، بەڵکو بە "کە"ی "کات" دەستپێدەکا. چونکە، چەند ڕۆژێکی کەم، دوای بڵاوبوونەوەی وتارەکەم، وەزیری بەرگریی ئەمریکا دۆناڵد رامسفێلد، بەئاشکرا باسی لەشکرکێشانەوەی ئەمریکای لەعێراق کرد، تەنانەت ئەگەر باری ئاسایشیش لەعێراقدا هێشتا دانەمرکابێ. پاش ئەمیش، چەند جارێك لەئەمریکاو بەریتانیا، باس لە بەجێهێشتنی عێراق کرا. لەبەر ئەوە، ئەو مەترسییەی بەرەوڕووی کورد دەبێتەوە، لەنێزیکبوونەوە دایەو، بەبڕوای من، هیچ ئامادەکارییەك بۆ بەرەنگاریکردنی ئەو ڕۆژە ڕەشە نەکراوە. مەگەر ئەوەی ئەو هەواڵە ڕاست بێ کە گەورەو بەرپرسێك گوتی ئەمریکا بەتەمایە بنکەیەکی سوپایی هەمیشەیی بهێنێتە کوردستانەوەو، دەمێکە لە"میدیا"دا ئاماژەم بۆ پێویستی ئەوە کردووە.

لێرەدا، پرسیارێکی زۆر ڕەوا خۆی دێنێتە پێشەوە، ئەوەیش ئەمەیە: ئایا کورد لەهەڤاڵبەندێتیی ئەمریکاو بەریتانیا، پاش ڕووخانی ڕژێمی سەددام، چی دەستخۆی خستووە، کە لەوەپێش نەیبووەو، چی لەدەستچووە، کە لەوەپێش هەیبووە؟

بێگومان، لەوەرامی ئەم پرسیارەدا، دەبێ ئەوە بخەینە بەرچاو، کە لابردنی ڕژێمی سەددام، بەهەر لایەکدا لێکی بدەینەوە، هەر بەسووتی کوردە، خۆ ئەگەر کورد هەڤاڵبەندێتیی ئەمریکاو بەریتانیاشی نەکردایە لەجەنگدا، ئەوا لەرژێمی سەددام هەر ڕزگاری دەبوو، لێرەدا، هیچ گلەییەکم لە ئەمریکا نییە. ئەمریکا، برای باوکی کەس نییەو، ئامانجی لەخستنی ڕژێمی سەددام هەرچییەك بوو بێ، کارێکە جێی سوپاس‌و پێزانینە. ئەوجا کە کورد ئەو هەلە بەنرخەی بەڕاستی بەکار نەهێنابێ، گوناهی خۆیەتی، نەك گوناهی ئەمریکا.

بەڵام با جارێ دەستکەوت‌و تێکەوتەکانی پێش‌و پاش سەددام بخەینەڕوو:

پێش ڕووخانی سەددام، دوو زلحیزبە کوردییەکە فەرمانڕەواییی تەواویان بەسەر سێ ستانی باشووری کوردستانەوە دەکرد، وەك دەوڵەتێکی بەشێوەی دێفاکتۆ defacto سەربەخۆ. کێشەی کورد لەعێراقدا بەرەو بوونە کێشەیەکی نێونەتەوەیی دەچوو. سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، پێوەندیی دیپلۆماسی‌و بازرگانی‌و ڕامیارییان بەگەلێك لە دەوڵەتە گرنگەکانی جیهان‌و دراوسێکانی کوردستانەوە هەبوو. بەشێك لە لە 13٪ی داهاتی "نەوت بەنان" دەچووە گیرفانی ئەم دوو زلحیزبەوە، ئەمە بێجگە لەپارەی گوومرگ‌و سەرانەو کەرانەو ئەو شتانە. ئەوەی کە بەدەست ئەم دوو زلحیزبەوە نەبووە، تەنێ دەسەڵات بوو بەسەر ستانەکانی کەرکووك‌و مووسڵ‌و دیالەو کووتدا، کە دەکەونە سنووری جۆگرافیایی کوردستانەوە، ڕژێمی سەددام، خەریکی بەعەرەبکردنیان بوو و، جاروبارێکیش هەڕەشەی لە "هەرێمی نەفڕین" دەکرد، بەڵام نەیدەوێرا پەلاماریبدا. کورد لەو سەروەدەمەدا، دەیتوانی هاتوچۆی بەغداو نێوچە عەرەبنشینەکانی عێراق بکاو، خۆ ئەگەر کوردێك لەدژی ڕژێم

نەبووایە، دەیتوانی لەنێو عەرەبدا بژی، با بەکولەمەرگیش بێ، هەر ڕۆژە ناڕۆژێکیش، عەرەبەکان چەند کوردێکیان گۆشاو گۆش سەرنەدەبڕی، وەك ئەوڕۆ.

پاش کەوتنی رژێمی سەددام، هەر سێ ستانەکە بوونەوە بەپارچەیەکی دانەبڕاو لەعێراق. کێشەی کورد بووەوە بەکێشەیەکی نێوخۆیی عێراق، نەك کێشەی نەتەوەیەکی دیلکراوی نیشتمان دابەشکراو. هەرچی چارەنووسی کەرکووکە، کە لەکن سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، "دڵی کوردستان"و "قودسی کوردستان" بوو، وا لەنێوەڕاستی ئاسمانو زەویدا گیرساوەتەوەو، کوردە دەربەدەرکراوەکان، کەمەیەکی کەمیان نەبێ، ئەوانی دیکە نەگەڕاونەتەوە شوێنی خۆیان، ئەوی گەڕاویشەتەوە، لەژێر چادرو خێوەتدا دەژیو، عەرەبە هاوردەکەش، مێش میوانی نییە. ئەوجا ژیانی کورد، نەك هەر لەبەغداو تکریتو سامەڕاو فەلووجە، وا لەمەترسیدایە، بەڵکو لەنێو کوردستانەکە خۆشیدا لەمەترسیدایە، لەو شوێنانە، کورد بەجۆرێك سەردەبڕن، کە مەڕو بزن بەوهاسانییە سەرنابڕن.

کە هێشتا سەددام لەسەر کار مابوو، ئەوانەی بەخۆیان دەگوت "بەرهەڵستکارانی عێراق" دەهاتنە سلاوی کوردو، بەهۆی کوردەوە کۆنفرانسو کۆبوونەوەیان، چ لەکوردستانو چ لەئاوارە دەبەستو، زۆریان دەستیان لەکورد دەگرتەوە بۆ پارەو یارمەتیو پەنابەرێتیو ئێرەییان (حەسادەت) بەکورد دەبرد، بەلام ئەوڕۆ بەسایی عێراقچێتیو کورتبینیو کوێخاڕەوشتێتیی سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکەو، شەڕە زرتانێی نێوخۆو خۆکوژیی کوێرانەو خۆبەزلزانییان بەرامبەر بەیەکو، خۆ بەکەم زانییان بەرامبەر بێگانە، ئەو "بەرهەڵستکار"ە بێدەسەلاتە دەستندەخۆرە ئاوارانەی دوێنێ، بوونەتە سەرگەورەی عێراقی ئەوڕۆ، کە بەدەستی گۆجو ناپیرۆزی سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە دامەزرایەوە، بێ هیچ جۆرە

گەرەنتی و دەروێستییەك بۆ مافی كورد، ئەمە لەكاتێكدا، كە هەڵوێستی فەرمانڕەواكانی ئەوڕۆی عێراق، هیچ چەپی نییە لەهەڵوێستی سەددام و، بگرە خراپترو ترسناكتریشە. چۆنكە، سەددام بەتێرۆریست ناسرابوو، بەڵام ئەمان بە "خێریٚ" بە "دێموٚكرات" دەدرێنە قەڵەم. ئەوەتا، ئەیاد عەلاویی كۆنە هاوڕێی سەددام و كۆنە ئەندامی حیزبی بەعس، دەچیٚ لە شای ئەردەن دەپاڕێتەوە كە كۆمەڵێك بەعسیی راكردوو بۆ ئەردەن، بنێرێتەوە بۆ عێراق، بۆ ئەوەی لەحكوومەتی عێراقدا بەشداریی بكەن، هەروەها دەچیٚ بۆ سووریاو لەبەعسییەكانی هاودەنگی داوای یارمەتیدەكا دژی "جیابوونەوەخوازانی" كورد.

ستانداری باقووبە، ئەو باقووبەیەی كە نێوەكەی لەبنەڕەتدا "باگۆڤە"و كوردییە (باگۆڤە- باگۆ (خودیٚ) + ڤە <ڤا <ئاڤا- باگۆاڤا- خودیٚ ئاوەدانكردوو)و، سەتساڵێك پێش ئێستە شارێكی كورد بوو، وەك شارەبان و جلەولاو مەندەلی و زەرباتی، دەیەویٚ عەرەبە هاوردەكانی خانەقین، كە پاش رووخانی رژێمی سەددام، خانەقینیان بەجێهێشت، بگێڕێتەوە بۆ خانەقین و، هۆزە عەرەبەكان و تۆرانییەكانیش بەئاشكرا لەتكریت كۆدەبنەوەو، بڕیار دەردەكەن لەدژی كوردو، دەیانەویٚ بارودۆخی كەركووك بگێڕنەوە بۆ سەردەمی سەددام. ئەمە لەكاتێكدا كە لەهەولێری پێتەختی باشووردا، كۆبوونەوەی "برایەتیی كوردو عەرەب" دەبەستریٚ و باسی لێبوردن و پێكەوە ژیانی برایانەو چی و چی دەكریٚ، وەك ئەوەی كورد ئەنفالی لەعەرەب كردبیٚ و چەكی كیمیایی دژی عەرەب بەكار بردبیٚ و فەلووجەو سامەڕای "كورداوی" كردبیٚ، ئەوجا یەك دوو عەرەبی بەوپێژدان دێن قسەی باشدەكەن و، ژمارەیەكی زۆریش لەبابەتی ئەو شێخە كەبابخۆرەی، كە بەڕێز كاك خەفوور مەخمووری لە"میدیا"دا باسیكردبوو، دێنە كوردستان بۆ رابواردن بەكوردو پارە وەرگرتن (كە

پارەکە هی کوردە نەك هی سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە). لەولاشەوە، شێخ غازی عەجیل ئەلیاوەر دەفەرموێ "ئەوی باسی گشتپرسی (رەفراندوم) بکا بۆ بڕیاری چارەنووس، ئەو کەسە خاینە"و جەنابی "بەهەموو جۆرێك بەگژیدا دەچیٚ و لەنێوی دەبا،" واتە لەرێی بەکارهێنانی زۆرەوە، کورد سەرکوتدەکا، هەر وەك سەددام. ئەوجا ئەگەر زانیمان کە گشتپرسی، واتە بیروڕا دەربڕین بەسەربەستیو، بڕیاردان بۆ بڕینەوەی چارەنووسی خۆ، یەکێکە لەبنچینە هەرە سادەو سەرەتاییەکانی سیستەمی دێمۆکراسی، دەبێ بزانین کە شێخ غازی، هەر هێندەی سەددام دێمۆکراتییە. کە ئەوەشمان زانی، ئەو دەمە، ئەم پرسیارە دێتە پێشەوە، کە زۆر کەس ئەورۆ بەڕووی سەرکردەکانی کورددا هەڵیدەدەن: ئایا، ئەگەر شێخ غازی "زاوامان"، ئەمە بیروڕاو نیازی بێ بەرامبەر بەکوردو مافە سەرەتاییەکەی، ئێدی دەبێ چاوەڕوانیمان لەوانە چ بێ کە هێشتا نەچوونەتە پەردەوە لەگەڵ کچەکانمان؟ ئەمەش خالانەی چیرۆکی دوو مامۆستا کوردەکەی زانستگەی بەغدایە، کە هەردووکیان هەڵگری باوڕنامەی دوکتۆرا بوونو، لەنێو زانستگەدا تێرو پڕ لەیەکیاندابوو. کە هەواڵەکە گەیشتبووە رەجەبی قسەخۆش، گوتبووی: سەیرکەن، سەیرکەن! ئەگەر دوکتۆرەکانمان وابکەن، داخوا برینپێچەکانمان چی بکەن؟. شێخ غازییەك کە تادوێنێ بوو مووچەخۆری شێخەکانی کەنداو بوو،و نە لەلایەن گەلی کوردو، نە لەلایەن گەلی عێراقەوە هەڵبژێردراوە، بەڵکو لەلایەن "مجلس الحکم الانتقالی"ی دەستنێژی ئەمریکاو، بەپشتگیریی ئەو دوو زلحیزبە کوردییەی کە ئەوانیش دەمێکە رەوایەتیی ئەوەیان نەماوە بەنێوی کوردەوە قسە بکەن، نێونراوە "سەرکۆمار"، ئەوەش بۆ ماوەیەکی کاتی، ئەوەتا ئێستەو لەم رۆژەدا، کە هیچی بەدەست نییە، وا دەفەرمووێ، داخوا ئەگەر سبەینێ، خودێنەکا، کار کەوتە دەستیو، لەشکرو پۆلیسو فرۆکەو

پشتگیریی 23 دەوڵەتی عەرەبی هەبوو، دەبێ چ بەسەر کوردی کڵۆڵ بهێنێ؟ ئەز لێرەدا هیچ سەرم لە شێخ غازیی "زاوامان" سوور نامێنێ. چۆنکە، کاتی خۆی، زۆربەی زۆری کارگێڕانی حیزبی نازیی ئەڵمان، کە چەند ملیۆنێك جوولەکەیان کوشت، هەریەکەیان کچێکی جوولەکەی کردبوو بەهاوڕێی نوێنی شەوانەی خۆی. ئەم "هاوڕێتیەتی"یەی نازییەکان و کچە جوولەکەکان، نەبووە هۆی پاراستنی گیانی جوولەکەکان، لەخنکاندن بەگازو، سووتاندن لە "ئاگرگە" (محرقە)کاندا. بەڵام ئێوە وەرن سەیری رۆژنامەی "خەبات" بکەن کە ئەم هەواڵەی بەکەچوکرۆچی بڵاوکردووەتەوە، تابزانین، لەژێر چ سەرنێوێکدا بڵاویکردووەتەوە! "غازی یاوەر سەرکۆماری عێراقی فیدراڵ: لەعێراق هەر پرۆسەیەکی سیاسی بێ بەشداری عەرەبی شیعەو کوردو عەرەبی سوننە هاوسەنگ نابێت" (خەبات 1585، 2004/10/9، ل1) ئێوە جارێ واز لەم دەستکارییە بهێنن و بپرسن، ئایا کەی عەرەب بە عێراق دەڵێن "عێراقی فیدراڵ"!.
ئەمەیان واو، پاش ئەوەی دووزلحیزبەکە زانییان دەستیان لە هەمانەکە هاتووەتە دەرەوە، چاویان لەخۆپیشاندانی خەڵکی کەرکووك و سلێمانی و دهۆك پۆشی کە باس باسی سەربەخۆیی کوردستان و گێڕانەوەی کەرکووك بوو بۆ کوردستان. ئەمە وای لەوەزیری دەرەوەی بەریتانیا جاك سترۆ کرد کە بەپەلە بێتە کوردستان و هەوڵی ئەوەبدا کە دۆسێی کەرکووك بەهەڵواسراوی بهێڵێتەوە، لەبەر دڵی ترك و عەرەب و، سترۆ لەقسەی دیپلۆماسیانە بەولاوە، بەهیچ جۆرێك بەڵێنی نەدا کە کەرکووك بچێتەوە سەر کوردستان. کاربەدەستانی دوو زلحیزبەکە ئەم راستینەیەیان لەجەماوەری کورد شاردەوە، بەڵام کەوتنە دڵەڕاکەو کۆبوونەوەیەکی "پۆپە"یان لەدوکان رێکخست و، سەری هەزار جارە باسی "یەکریزیی"درۆزنەی پارتی و یەکێتییان کرد. خۆ ئەگەر بەڕاستی

سیاسەتکاربوونایە، هەر ئەو رۆژەی کە جاك سترۆ هاتە کەرکووك، نیو ملیۆن کوردیان دەخستە سەرشەقامەکان‌و، بەخۆپیێشاندانێکی جەماوەری، هاواریان دەکرد، "دیموکراسی بێ گشتپرسی‌و بیروڕا دەربڕین درۆو دەلەسەیە". "جاك سترۆ!! جاك سترۆ!! ئەو تاوانەی پاش جەنگی جیهانیی یەکەم لەکورد کرا، لەمڕۆوە بیوەستێنە"، "عێراق دەوڵەتێکی دەستکردە، کوردستان نیشتمانێکی داگیرکراوە" ئەوجا، بێگومان قسەکانی جاك سترۆ لەگەڵ سەرکردەکانی پارتی‌و یەکێتی‌و سەرکردەکانی ترك لە ئەنقەرە، شێوەیەکی دیکەیان بەخۆیانەوە دەگرت، چۆنکە دەوڵەتانی رۆژاوا، رێز لەزۆری ژمارە دەنێن، با ئەو زۆرەش بۆر بێ.

سەرکردەکانی کورد دەبێ ئەوە بزانن کە پشتبەستنی ئەمان بەقسەی ئەم کاربەدەست‌و ئەو کاربەدەستی بێگانەو، پشتکردنە جەماوەری کوردو، رێکنەکەوتن لەسەر یەکخستنی بەڕێوەبەرێتیەکی یەکگرتوو و، حکومەتێکی یەکگرتوو و، لەشکرێکی یەکگرتووی ناحیزبی، یاریکردنە بەچارەنووسی نەتەوەی کوردو خۆشیان، بەتایبەتی لەم کاتە چڕوپڕەدا، کە هێشتا لەشکری ئەمریکاو بەریتانیا نەکشاونەتەوە. هەر لەیەکنەگرتنی ئەم دووزلحیزبە 85٪ پتری ئەو دەرفەتەی بۆ کورد هاتە پێشەوە لەدەستچوو، چۆنکە بێ یەکگرتن‌و، بێ بوونی سەرۆکێکی بەرپرسیاری باوەڕپێکراو، نە وتاری رامیاریی یەکگرتوو دروست دەبێ‌و، نەئامانجێکی نەتەوەییی یەکگرتوو چلوورە دەبەستێ‌و، نەدەوڵەتانی جیهانیش متمانەیان بەکورد دەبێ. خۆ ئەگەر هاتو هێزێکی دەرەوە، دۆست، یان نەیار، کەوتە قسەکردن لەگەڵیان، ئەوا ئەو وتووێژو راگۆڕینەوەیە، وەك ئەوە نابێ کە لەگەڵ سەرۆکی وڵاتێك، یان نوێنەری نەتەوەیەك بکرێ، بەڵکو وەك "سەرکردەی" حیزبێك، یان "سیاسەتکارێك"ی کوردو بەس. بۆ نموونەو، وەك مشتێك لەخەروارێك- ستانداری باگۆڤە لەوەرامی

ڕەخنەکانی مەلا بەختیاردا، کە هەموورشی قسەی هەق بوون، گوتی: مەلا بەختیار، نوێنەری کۆمەڵێکی تایبەتییەو نوێنەری گەلی کورد نییە. ئەم قسەیەی ستانداریش، مخابن، راستە. کورت‌و کرمانجی، سەرکەوتنی کورد لەوەدا دەبێ کە پێوەندیی دیپلۆماسیانەی حیزبایەتی لەگەڵ دەرەوە بگۆڕدرێ بەپێوەندیی دیپلۆماسیانەی نێو حکوومەتان، نەك نێو ئەم حیزب‌و ئەو حیزب. خەم ناکا، باحیزبییش، ببێ، بەڵام بەرژەوەندیی حیزبی، لەسەروو بەرژەوەندیی نەتەوەو نیشتمانەوە نەبێ. لەبەر ئەمە، سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، دەبێ، خۆشیان بێ‌و ترشیان بێ، بەزووترین کات سەرۆکێك بۆ حکوومەتی کوردستان دەستنیشان بکەن، کە جێی متمانەی زۆربەی زۆری خەڵکی کوردستان بێ، ئەوجا ئەو سەرۆکە، سەر بەم حیزبە، یان ئەو حیزبە، کوردە یان ناکوردە، موسلمانە، ئێزدییە، کاکەییە، شەبەکە، ئەلەوییە، دیانە، جووە، زەردەشتیە، ژنە یان پیاوە، دەوڵەمەندە یان هەژارە، سەپانە، جۆتکارە، کرێکارە، هەرچیەك هەیە هەیە، هیچ گرنگ نییە. هونەر لێوەشاوەیی‌و دڵسۆزییە بۆ کوردستان. سەرۆکێکی وا کە بتوانێ، تا ئەمریکاو بەریتانیا لەناوچەکەدان، لەڕێی گشتپرسییەکەوە، کۆنفرانسێکی نێو نەتەوەیی بۆ باسی چارەنووسی هەموو کوردستان، داخۆیانی بکا، نەك هەر بۆ باشووری کوردستان، چۆنکە باشوور هەر ملکی خەڵکی باشوور نییە، بەڵکو ملکی هەموو نەتەوەی کوردو هەموو خەڵکی کوردستانەو، هی هەموو نەوەکانی دوای ئێمەشە. ئەو کۆنفرانسە دەتوانێ بڕیاربدا کە چی بکرێ‌و چی نەکرێ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەخورهەڵاتی ناڤیندا. بەڵام بەداخەوەو زۆر بەداخەوە، ئەوەتا دەبینین کە سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە خەریکی بەستنی ئەو جۆرە کۆنفرانسە نێو نەتەوەییەن بۆ باسی چارەنووسی عێراق، نەك کوردستان. کۆنفرانسێکی نێونەتەوەیی ئاوا، پێویستییەکی

ژیارییه بۆ دۆزینەوەی ڕێ‌و شوێن بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کوردستان‌و، بەڵگەنامەیەکی مێژوویش دەبێ بەدەست نەتەوەی کوردەوەو، هیوایەکیش دەبەخشێ بەخەڵکی کوردستان. ئەگەرنا هەرکەسێك لەئەورووپاوە هەستێ بچێتە کوردستان‌و بێژێ کە "سەرکردەی کۆمەڵێکی نێو نەتەوەیی"یەو، نێویکی زل‌و زەبەلاح لەخۆی بنێ‌و، 10-15 کەسیشی لەدەوروبەر نەبێ‌و، سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە بکەونە هەڵدان بەشان‌و باڵیداو بەڵێنی "هەموو جۆرە یارمەتی"یەکی بدەنێ، ئەوە دەرمانی دەردی کورد ناکاو، هەر کات‌و وزەو پارە بەفیڕۆ دانەو هیچی دی. چۆنکە ئەگەر ئەو جۆرە کەسانە کارەو کار لەدەستهاتوو بوونایە، هەتا ئێستە دەبوو، بیانتوانبایە "لۆبی"یەك بۆ کورد دروست بکەن، کە کورد هەتا ئەوڕۆ لۆبی نییە.

ڕاستە، کەسانێك هەن لەئەورووپا، کە دۆستی کوردن، بەڵام ئەوانە تاکە کەسن، نەك "لۆبی" هێندێکیش هەن، دۆست نین، بەڵکو دەیانەوێ بەهۆی دەستخستنە نێو کێشەی کوردەوە، نێویك‌و نانێك بۆ خۆیان بپچڕن. سیاسەتی دەوڵەتە ئەورووپاییەکان بە "لۆبی"یەکی بەهێز دەگۆڕێ، کە هاوکارانی ئەو لۆبییە لەدەزگەکانی دەوڵەت‌و نێوەندی ئابووری‌و زانستدا دەستڕۆیشتوو و قسە ڕۆیشتووبن. ئەگەرنا، هەموو کەسێك لەئەورووپا دەتوانێ کۆمەڵێکی چەند کەسی دابمەزرێنێ‌و، کۆمپیوتەرێك‌و فاکسێك بکڕێ‌و، دوکانێك بگرێ بەکرێ‌و، جاروبار بلاڤۆکێك دەربکاو، جاروبارێکێش بەیارمەتیی کوردەکە خۆی، خۆپێشاندانێکی پەنجا کەسی لەبەردەم دەزگەیەکی حکوومەتیدا بخاتە سەرپێ، بەڵام ئەم نێوی گەورەو دێی وێرانە، سووتی بۆ کوردتێدا نییە. ئەز بەدڵنیاییەوە ئەم قسەیە دەکەم، چۆنکە، شارەزاییەکی باشم هەیە لەم ڕووەوە. کورد نابێ باوەڕ بەهەموو قسەیەك بکەن‌و تەفرەبخۆن.

چەند رۆژێك لەمەوبەر، رۆژنامەی "خەبات" وتووێژێکی لەگەڵ بەڕێز زیگفرید مارچ کردبوو، کە ئەم بەڕێزە ئەڵمانیێکەو سەر بەحیزبی کەسکەکانە، ئەو حیزبەی کە وەزیرەکەیان، یوشکافیشەر، لەبەردەم جڤینێکی نێو نەتەوەییدا، کە بەڕێز هۆشیار زیباری قسەی تێدا دەکرد، گوتی "باوەڕ بەقسەی زێباری نەکەن، چۆنکە زێباری کوردە". کەچی ئەم مارچە بەڕێزە، داوا لە کورد دەکا کە کار بدەن بە کۆمپانیاکانی ئەڵمانیا – چۆنکە ئەڵمانیا گرنگییەکی زۆر دەدا بەئابووری– ئەوجا ئەڵمانیا، بەقسەی وی، هەڵوێستی خۆی دەگۆڕی بەرامبەر بەکورد.. (ئاوا) بێجگە لەوەش، داوای گەرەنتی دەکا لە کورد بۆ ئەو کۆمپانیانەو، هەر لەو وتووێژەشدا خۆی واپێشاندەدا کە بەرپرسێکی گەورەیە لەکۆمپانیەکدا بەنێوی کۆمپانییەکانی مارچ (خەبات 2004/9/29)و گوایە کۆمپانیاکەشی نوێنەرێتی گەلێك کۆمپانیای بەنێوبانگی ئەڵمانیا دەکا.

ئێستە لێرەدا نامەوێ، دوای ئەم قسانەی بەڕێز مارچ بکەوەمو لەڕاستی و ناڕاستیێیان بکۆڵمەوە، چۆنکە ئەوە کاری من نییە. بەڵام هەر هێندە دەبێژم کە ئەو سەردەمێك ئەندامی پەرلەمان بوو لەلایەن حیزبی کەسکەوە، کە حزبێکی کچکەیە لەئەڵمانیا, وادیارە، ئێستە بووە بەبازرگان، بەڵام ئەو کە گوایە ئەو هەموو دەسەڵاتەی هەیەو، وەکو ئەندامی حیزبی کەسکەکان، با هیچ نەبێ بەحیزبەکەی خۆی، کە لەحکومەتدایە لەگەڵ سوسیالدێموکراتەکان، بێژێ کە حکوومەتی ئەڵمانیا، دەبێ داوای پاکانە بکا لەکورد بە بۆنەی ئەوەوە کە 81 فابریقەی ئەڵمانیا یارمەتیی رژێمی تیرۆریستی سەددامیان دا بۆ پڕ چەککردنی، کە بەو چەکانە هەزاران کورد کوژران. پاش ئەوەش، ئەڵمانیا دەبێ جارێ نیاز چاکی خۆی بەشتێکی کچکە دەربخا، بۆ وێنە دامەزراندنی زانستگەیەکی تێکنۆلۆژی لەهەڵەبجە، وەك چۆن واخەریکە لە عەممانی پێتەختی ئەردەن کۆلێجێکی پیشەسازی

ئەڵمانی دادەمەزرێنێ. کاتی خۆشی لە ئەفغانستان زانستگەیەکی گەورەی دامەزراند. ئەو دەمە دەتوانرێ قسە لەپێوەندیی ئابووری‌و بازرگانیی کوردو ئەڵمان بکرێ‌و، بەڕێز مارچیش دەبێ ئەو بنچینە سادەیەی ئابووری بزانێ، کە دەبێ بەر لەهەر شتێك، لەکوردستاندا بازاڕێکی ڕێکخراوی پارەو بورس ببێ‌و نرخی دراویی کورد (کە هی عێراقە) لەدەرەوە ڕێکخراو بێ. ئەوجا، بۆ ئەوەی سەرمایەی دەرەوە بهێنرێتە کوردستان، پێویستە سیستەمی فەرمانڕەوایی، بەتایبەتی سیستەمی دادگەیی، لەسنوورێکی نێو نەتەوەییدا، جێی متمانەو باوەڕ بێ، واتە هەموو شتێك بەدەست کاربەدەستانی دوو زلحیزبەکە نەبێ. ئەمانە جارێ هیچیان نین. لەبەر ئەوە ناتوانرێ گەرەنتی بدرێ بە فابریقە بێگانەکان. بەڵام ئەو پرسیارەش هەیە، ئایا ئەو گەرەنتییەی کە ئەو فابریقانە دەبێ بیدەن بەکورد چییەو چۆنە. بەڕێز زیگفرید مارچ خۆی لەو باسە ناگەیێنێ، ئەمە لەکاتێکدا کە ژمارەیەکی زۆر لەکۆمپانییەکانی ئەڵمانیا، وەك هێرتی.. کڤێلە بەرەو نابووتی دەچن. شایانی باسە، باشترین‌و لەبارترین دەوڵەتان کە کورد پێوەندیی ئابووری‌و بازرگانی ببەستێ لەگەڵیان، چین‌و ژاپۆن‌و کۆریای باشوورە. بەتایبەتی چین بەرهەمەکانی باش‌و هەرزانن‌و، چین زلهێزی دواڕۆژە.

چمکێکی دیکەی کێشەکانی ئەوڕۆی کورد، دۆزی هەڵبژاردنە کە دوو زلحیزبەکە ماوەیەکە مێشکی کوردیان پێوە خەریککردووە. باشە، هەڵبژاردن چۆن دەکرێ، کە هێشتا کێشەی سنووری هەرێمی کوردستان نەبڕابێتەوە؟ هەڵبژاردن چۆن دەکرێ، ئەگەر سەرژمێرییەکی تەواو نەبێ لەبارەی خەڵکی باشووری کوردستان‌و عێراقەوە؟ هەڵبژاردن چۆن دەکرێ، ئەگەر تائێستە ژمارەیەکی کەمی کوردە دەرکراوەکان گەڕابنەتەوە شوێنی خۆیان‌و، ژمارەیەکی یەکجار زۆری عەرەبە هاوردەکان لەجێی خۆیان مابن؟

چۆن دەبێ کورد ڕازی بێت بەهەڵبژاردنێك، کە دەنگدان بەپێی کۆبۆنی خۆراك بێ وەك عەرەبەکان‌و مەلا سیستانی فارس داوایدەکەن، چۆنکە عەرەبەکان‌و مەلا سیستانی دەزانن، کە سەتهەزاران کوردی دەربەدەری ڕژێمی سەددام، یان کۆپۆنی خۆراك سەندراوەتەوە لێیان، یان هەر نەیاندراوەتێ، یان لەوڵاتی بێگانە لەدایکبوون، کاتێك کە باوك‌و دایکیان لەو وڵاتانە پەنابەر بوون.

بەڕاستی ئەم هەڵبژاردنە ئەگەر بکرێ، لە چێشتە قولێی منداڵان دەچێ‌و، هیچ جۆرە ڕەوایەتییەکی نابێ. دوایی هەڵبژاردن لەکوردستان‌و لەعێراقدا هەمووی لەیەك کاتداو، بەیەك قانوون‌و بەڕێکەوتنی دوو زلحزبەکە لەگەڵ چەند حزبێکی عەرەب، کارێکە بۆ تەفرەدانی کوردو لەبیر بردنەوەی مافی گشتپرسی. شایانی باسە، بیری گشتپرسیی کوردستان بیری دوو زلحیزبەکەو داروەدەستەکانیان نییە، بەڵکو بیست ساڵ لەمەوبەر لەلایەن سیاسەتکاری هێژاو ناسراوی کورد جەواد مەلاوە هێنرایە گۆڕەپانی خەبات‌و، ماوەیەکی دوورو درێژ دوو زلحیزبەکە خۆیان کەڕ کرد لێی‌و، لەژێرەوە بەربەرەکانێیانکرد. ئەوجا کە دییان جەماوەر دەیەوێ، ویستیان لەرێی دەسکەلاکانی خۆیانەوە، بۆ ئامانج‌و مەبەستی حیزبایەتیی خۆیان بەکاریبهێنن. پاش ئەوەش، ڕازیبوون بە هەڵبژاردنی سەرتاسەری، مانای ڕازیبوونە بەوەی عێراق دەوڵەتێکە زۆربەی عەرەب‌و کەمینەی کوردەو، چۆن کورد مافی ئەوەیان هەیە بچنە سامەڕاو تکریت‌و باگۆڤە دابنیشن‌و، هەر لەوێ شەهید بن، عەرەبەکانیش مافی ئەوەیان هەیە، بەملیۆن بێنە کوردستان‌و نیشتەجێ بن‌و کەبابی گەرم‌و ماستاوی سارد بخۆن، مافی نیشتەجێبوونی عەرەب لەکوردستان کە کوردستان بەشێك بێ لەعێراق مافێکە قانوون ڕێی پێدەدا. ئەمەش دەستووروو نەریتی هەموو دەوڵەتەکانی جیهانە. ئەوەشم پێش بیست ساڵێك لەسمیناری "دۆزی

ناسیۆنالی کورددا" باسکردووه. ئەگەر باشووری کوردستان، وەك پارچەیەك لەعێراق، بمێنێتەوە، رۆژێك دێ 90٪ی عەرەب دەبێ. لەبەر ئەوە هەموو قسەیەکی چەواشەکەرانەی سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، کە دەبێژن یەکگرتنی کوردو عەرەب "یەکگرتنێکی ئارەزوومەندانە"یە قسەیەکی زۆر نابەجێیە. چۆنکە ئەوان لەلایەکەوە دەبێژن، کورد مافی ئەوەیان هەیە، دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان هەبێ، بەلام ئەورۆ دەسەلاتی ئەوەمان نییە، ئەو دەوڵەتە داخۆیانبکرێ، کەچی لەلایەکی دیکەشەوە دەفەرموون، کوردو عەرەب بەشێوەیەکی "ئارەزوومەندانە" یەکیانگرتووە. جا کە شتێك بە زۆر بێ‌و کورد لە بێ دەسەلاتی خۆی دەستینەکەوتبێ، ئیدی چ جۆرە "ئارەزوویەکی" تێدایە، لەبەرتان مرم!

بەڕاستی کاتی ئەوە هاتووە، کە دەست لەپاراستنی ترەکەڵەکێی عێراق هەڵبگیرێ‌و، باسی سەربەخۆیی کوردستان بکرێ، تا لەشکری نێونەتەوەیی لەعێراقدان‌و، لەشکری عەرەب هێشتا خۆی نەگرتووەتەوەو، هەر کەسێکیش خۆی لەمەگێل بکا، فڕی بەسەر سیاسەتەوە نییە. دامەزراندنی دەوڵەتی کوردستانیش پێویستی بەوە نییە کە ئەمریکاییەکان زەریای ناڤین بگوێزنەوە بۆمان بۆ سەر سنووری باشووری کوردستان، وەك برای بەڕێز مام جەلال دەبێژێ. دامەزراندنی ئەو دەوڵەتە پێویستی بەوەیە کە کاربەدەستانی کورد بیرو بۆچوونی خۆیان بگۆڕن‌و هەر لەکوێخایەتیدا بەسەر سلێمانی‌و هەولێرەوە قەتیسی نەکەن، بەڵکو بیگۆڕن بەبیری سەروەرێتیی‌و بیگوێزنەوە بۆ هەموو لایەکی کوردستان‌و زەریای ناڤینیش وا لەسەر سنووری رۆژاوای کوردستان،‌و ئەو حەلە شەپۆلەکانی زەریاکە کەنارەکانی دەوڵەتەکە ماچ دەکەن.

بەرلین 2004/10/10

**میدیا**، ژ 172، 2004/10/16

## مەلا عەلی سیستانی ئێرانی، لە بێدەنگییەوە بۆ خۆسەپاندن بەسەر عێراق و کورددا

خوێنەرەوەکانی ڕۆژنامەی "میدیا" دەزانن، کە هەر لەسەرەتای پەیدابوونی دیاردە (ڤاهرە)ی مەلا سیستانییەوە، پەنجەم خستە سەر کەسایەتیی مەلا سیستانیو، ئامانجە نهێنییەکانیم خستەڕوو، گوتم ئەم پیاوە یەکێکە وەك خومەینیو، خومەینی چی دەویستو بەرەو کوێ هەنگاوی دەنا، ئەمیش هەر ئەوەی دەوێو، هەر بەرەو ئەوێش هەنگاو دەنێ، واتە مرخی لەدامەزراندنی دەوڵەتێکی تۆتالیتێری مەلا فەرمانیی وەك ئێران خۆشکردووە، ئەگەرچی، ئەو جەربەزەیەتیو سەرچڵییەی کە لە خومەینیدا هەبوو، لە سیستانیدا نییە، تا ڕەپوڕاست قسە بکا. جارێ، بەر لە هەموو شتێك، سیستانی ئاخوندێکی فارسی ئێرانییەو، عێراقی نییەو، مافی دەستێوەردانی لەکاروباری نێوخۆی عێراقدا نییە، بەڵام لەنێو شیعەکانی عێراقدا دەسەڵاتدارە، چۆنکە شیعەکان، لە هەر کوێیەکی جیهاندا بن، ڕوودەکەنە ئەو بنکەیەی کە پێیدەیەژن "مەرجەعییەت". "مەرجەعییەت"یش بریتیە لە کەسایەتییەکی ئاینی، کە لەبارەی ڕەوشتوخووی تایبەتیو، پسپۆڕیی لەئاینی ئیسلامو، شارەزاییی لەبەڕێوەبردنی کاردا، لەلایەن کۆمەڵگەی شیعەوە جێی باوەڕو پەسند کردن بێ. ئەوجا، ئەو مەرجەعییەتە، فارسە، عەرەبە، هیندییە، یان لە چ وڵاتێك دادەنیشێ، ئەوە بەلایانەوە گرنگ نییە، لەگەڵ ئەوەشدا، فارسەکان، هەتا ئێستە، توانیویانە، ئەو مەرجەعییەتە بۆ خۆیان بپچڕن. بۆ وێنە سەید موحسینی حەکیمو ئایەتوڵلای خۆیی، کە هەردووکیان لەعێراق نیشتەجێبوون، ئێرانی بوون.

هێژای گۆتنییە، کە هۆی مانی مەلا عەلی سیستانی لەسەردەمی سەددامدا، ئەوەبوو کە پەنای بردبووە بەر بنەڕەتی "تەقییە" (تَقیە)، کە یەکێکە

لەبناخەکانی ئاینزای شیعەیەتی. بەپێی ئەم بنەڕەتە، کە شیعەیەك دەکەوێتە تەنگانەو، خۆی لەبەردەم مەترسییەکی گەورەدا دەبینێتەوە، دەتوانێ بیروڕای راستینەی خۆی دەرنەبڕیٚو بیکا بەژێرەوەو، بەم بیروڕا شاردنەوەیە، دەگوترێ "کتمان" (کیتمان)، کە بەمانای "دەرنەبڕین"و "لەدڵدا هێشتنەوە"یە. هەر لەبەر ئەوەش بوو کە مەلا سیستانی، ماوەیەکیش پاش رووخانی رژێمی سەددام، هەر خۆی دەرنەدەخست، بەڵام کە زانی بارگۆڕاوە، ئەوجا، بەنێوی شینی حەسەن‌و حسەین‌و شەهیدی کەربەلاوە، بەهەزاران خەڵکی خستە سەر شەقامەکان‌و، بەوە کارێکی وایکرد کە دەزگەی راگەیاندنی گشتی لەهەموو جیهاندا، واقیان وڕماو، چاویانبڕییە شیعەکانی عێراق. تەنانەت لەم کاتەشدا، هێشتا هەر بەوریایی کەوتە قسەکردن‌و، بەنێوی، گوایە خێرخوازیٚو مافی ئازادی بۆ "هەموو کەسێك"، هاتە مەیدان‌و، خۆی واپیٚشاندا کە توخنی سیاسەت ناکەویٚو لایەنگریی هیچ لایەك ناکاو، دەست ناداتە دەست نوێنەرانی "هێزی داگیرکەر"و، ئەوە بوو، بۆ یەکجاریش رێی نەدا بەکاربەدەستانی ئەمریکاو بەریتانیا بچنە لای. بەڵام هیچ خەمی لێنەنیشت کە چوو بۆ بەریتانیای "داگیرکەر"و، بەبیانووی نەخۆشییەوە، ماوەیەك لەوێ مایەوە. ئەمە، لەکاتێکدا کە نەخۆشییەکەی دەردێکی واگران نەبوو، کە لەوڵاتێکی وەکو میسر، چارەسەر نەکرێ. چوونی مەلا سیستانی بۆ بەریتانیا، هەروەك چوونی خومەینی بوو بۆ فەرەنسا. ئەوەش خالآنەی ئەو قسە نەستەقەیە کە دەڵێ "گۆشتەکەی ناخوا، بەڵام گۆشتاوەکەی دەخوا". دژی کافران‌و کولتووری کافران دەجەنگن، بەڵام فڕۆکەو ئۆتۆمۆبیلی گوللە نەبڕو کۆمپیوتەرو دەرمان‌و نەخۆشخانەی کافران، بەدوکتۆرو سیستەرە بێپێچەو کراسکورتەکانییەوە، بەکاردێنن.

هەرچەندە مەلا سیستانی خۆی واپیشاندەدا کە لەسەر ریبازی خومەینی و رژیمی ئیران ناڕوا بەڕیوە، بەڵام هەتا ئەوڕۆ، بەیەك وشەش، نە دژی رژیمی ئیران قسەیکردووەو، نەدژی دەستوەشاندنەکانی دەسکەلای رژیمی ئیران، واتە، موقتەدا سەدر، دەمی کردووەتەوە. بۆ خۆشاردنەوەش، خۆی وا دەخاتە بەرچاو، کە مەبەستی نیوبژیکردنە لەنیوان موقتەدا سەدرو هیزی هاوپەیمانانندا، بەڵام ئامانجی ئەم نیوبژیکردنە ئەوەیە، چەکدارەکانی موقتەدا سەدر لەنیو نەچن، چۆنکە دەزانیّ کە چەکدارەکانی موقتەدا سەدر، لەشکری تەنگانەی ئەو "دەوڵەتە"ن، کە بەتەمایە بەخشکەیی، لەعیراقدا بنیاتیبنیّ.
راستییەکەی، ناشییتی کاربەدەستانی ئەمریکاو، بەتایبەتی شەڕی نیوخۆییی وەزارەتی دەرەوەو وەزارەتی بەرگریی ئەمریکا (کۆڵن پاول و دۆنالد رامسفیلد)، بوو بەهۆی لابردنی فەرماندارێکی ژیهاتی وەك جی. گارنەرو هانینی بریمەر، کە فڕی بەسەر بارودۆخی عیراق و رۆژهەلات و کوردستانەوە نەبوو و، کەوتە ژیر کارکردی کەسایەتیی سیستانی، ئەمە پتر هیزو گوڕی دا بە مەلا سیستانی، هەتا وایلیهات، لەدژی قانوونی بەڕیوەبەریتی کاتی کەوتە قسە، ئەو قانوونەی کە هیندەك مافی نیوەناچڵی بۆ کورد دەستنیشانکردبوو. هەڵویستی سیستانی دژی کوردو، نامە ژەهراوییەکەی بۆ کۆمەڵەی نەتەوە، گوایە "یەکگرتووەکان"، کاریکی وایکرد کە مافی کورد بەجۆریك بخریتە ژیر پیّ، کە بەیەك وشەش نیوی کوردو کوردستان و، تەنانەت نیوی قانوونی بەڕیوەبەریتیی کاتیش نەهینرا. کەچی، ئەم هەڵویستە دوژمنانەیەی مەلا سیستانی بەرامبەر بە کوردو کوردستان، کاریکی واینەکرد، کە مام جەلال چەند جارو چەند جار، بەشان و باڵی مەلا سیستانیدا هەڵنەداو بە"دۆستی کورد"و "پشتگیری فیدەرالیزم"و "پیاویکی مۆدیرات (معتدل)"ی نەداتە قەڵەم،

نەپارێتەوە بۆیو، نەڵێ "ئایەتوللای سیستانی وەك خومەینی نییەو، دەوڵەتی ئیسلامی ناوێ". لەولاشەوە، کاك هۆشیار زێباری، کەوتە کێبەرکێ لەگەڵ مام جەلالو لەبەردەم کۆمەڵەی نەتەوە "یەکگرتووەکان"دا، گەلێك پەسنی مەلا سیستانی دا. ئەم هەموو پیاهەڵدانەش نەبوونە هۆی ئەوەی کە مەلا سیستانی نەبێژێ: ئەو بەهیچ جۆرێك لەگەڵ مام جەلال باسی فیدەرالیزمی نەکردووە. کەچی، سەرەڕای ئەمەش، یەکێتی تاقمێك مەلای خەڵکی کوردستانی ناردە لای سیستانی، کە ئەوەبوو بەدەستی ڤالا (بەتال) گەڕانەوە. ئەوجا، ئێستە مەلا سیستانی هەنگاوێکی دیکەی ناوەو بەمەش ئەمجارە، لایەکی دیکەی رووی راستینەی خۆی پێشاندەداوەو، دەفەرمووێ: دەبێ خەڵك هەموو بچن بۆ هەڵبژاردن، ئەوی نەچێ، ئەوا "خیانەتی کردووەو خائینە"و، هەڵبژاردن "داخوازییەکی شەرعییە". ئەوی نەیکا، دەبێتە "کافر"و "دەچێتە دۆژەخ" (جهنم).

بەڕاستی، مرۆڤ کە گوێی لەم قسانە دەبێ، دڵی تێکەڵدێو مووچڕك بە لەشیدادێ، چۆنکە، کافر بەو کەسە دەڵێن کە باوەڕی بە بوونی خودێ نەبێ. باشە، بۆچی دەبێ کەسێك کە لەهەڵبژاردندا بەشدارینەکا، بۆ وێنە: لەبەر ئەوەی ئەوانەی خۆیان پالاوتووە بۆ هەڵبژاردن، بەدڵی وی نینو، خۆشی سروشتی ئەوەی تێدا نییە کە خۆی بپالێوێ، ئیدی بۆچی ئەو دەمە دەبێتە کافر، واتە باوەڕی بەخودێ نامێنێ. خودێو هەڵبژاردن بۆ پەرلەمان، چ پێوەندییەکیان بەیەکەوە هەیە ئاغای سیستانی؟ بێجگە لەمەش، چوونە بەهەشتو چوونە دۆژە، بەپێی ئێزدناسیی (إلهیات)ی ئیسلام، لەڕۆژی پەسلان (قیامەت)دا دەبێ، کە عەرەبەکان رۆژی "حەشر" (الحشر)ی پێدەڵێنو، تەنێو تەنێ، خودێ فەرماندەدا کە کێ بچێتە بەهەشتو کێ بچێتە دۆژە، باشە خودێ، لەکەینێیەوە مەلا سیستانی

ردووه به بریکار (وەکیل)ی خۆی، که ئەمیش وا بەئارەزووی خۆی، خەڵك
ەوانەی بەهەشتو دۆژه دەکا؟ لێرەدا، دەبێ ئەوەش بزانین که یەکێك
ەکافر درایه قەڵەم، سزا (جزا)ی ئەو کەسه لەمه دنیا، ئەگەر خودێ نەکا،
ۆژێك بێ و، دەست ببێته دەستی مەلا سیستانیو هاوکارانی مەلا
سیستانی، چ دەبێ؟ ئێرانی ئەورۆ نموونەیەکی خۆیایه بۆ ئەمە، که لەم
ۆژانەدا کچێکی کوردی سیانزه ساڵەی خەڵکی مەریوان، فەرمانی
کوشتنی دراوه، به بەردە بارانکردن چۆنکه، گوایه، زگی پڕ بووه. ئەرێ .
کچێکی سیانزه ساڵه.. ئەی باشه، ئەگەر یەکێك بەکافر بدەنه قەڵەم،
ـاخوا چی لێبکەن.
شایانی باسه، ئەو سیستانییه "ئاشتیخوازه" له "سیاسەت دووره"،
ـەیەوێ لیستەیەك دروستبکا بۆ ئەوانەی که گوێڕایڵەیی وی دەکەن. بۆ
ئەمەش دارو دەستەکەی پێوەندییان بەکوردە شیعەکانەوه کردووەو
پێیانگوتوون، ئەوان دەبێ شیعه بن بەر لەوەی کورد بن. هێندێك لەو
کوردە شیعانەش گوتبوویان: ئەوه سیستانی لەکوێ بوو، کاتێك سەددام
چەکی کیمیایی لەسەر کوردە فەیلییەکان تاقیدەکردەوە؟ کەواته سیستانی
لیستەیەك دروستدەکات، ئەو لیستەیه دەخاته شەڕی هەڵبژاردنەوه.
ئەوجا دیاره، ئەوی بۆ لیستەکەی بەرێزی دەنگنەدا، کافر دەبێو دەچێته
دۆژەوه. بێگومان هەر بەپێی ئەو جۆره بیرکردنەوەیەش، ئەو کەسه
تەڵاقیشی دەکەوێ، چۆنکه کافر مافی ئەوەی نییه ژنی موسڵمان، یان
مێردی موسڵمانی هەبێ. ئێسته وەرن بزانن، چ کوێرەوەرییەك چاوەڕوانی
کورد دەکا، ئەگەر بێتو کورد لەسنووری دەوڵەتێکی "عێراقی"دا بژی، که
ئەوانه دەستەڵاتدار بن. شایانی ئاماژە پێکردنه که مەلا موسڵمانه سوننییه
تەنگەتیلەکەکانیش دەبێژن، هەڵبژاردنی ئەمجاره لەعێراقدا، پیلانی
ئەمریکاو ئیسرائیلەو، هەر کەسێك بچێ بۆ هەڵبژاردنو، دەنگبدا بەوانەی

خۆیان پالاوتووه، دەبێتە کافرو دەچێتە دۆژه. جا تۆش کوردی قوڕبەسەر، وەرە ئەم کەرەت لەو قوڕاوه دەربهێنە!!! ئەمەیە بەزمی "بین حانە ومانە، چاعت لحانا"!!.

ئا لەم هەلومەرجە نازکانەدا کە چارەنووسی نەتەوەی کورد بەسەر پردێکی یەکجار تەسکوتروسکدا تێدەپەڕیّو، داگیرکەرانی کوردستانیش تیرو شیر دەسوون لەکوردو، چاوەڕوانی رۆژی پەلاماردانن‌و، بەهەموو جۆرێك خۆیان پڕ چەك دەکەن‌و، ئەوەتە ئێران بەراکێتی "شیهاب"ی دوو هەزار کیلۆمەتری دابین نابیّ کە گوللەکەی دەگاتە نێو جەرگی ئیسرائیل‌و ئەورووپا، بەڵکو بەرێوەیە بۆ گەیشتنە بەرهەمهێنانی چەکی ئەتۆمی‌و، رژێمەکانی ترك‌و عەرەبستانی سعوودیش، لەترسی ئێران، هەوڵی پەیدا کردنی چەکی ئەتۆمی دەدەن‌و، ئیسرائیلیش کە هێزێکی ئەتۆمییە، بەئاشکرا دەبێژیّ، کە ئەمجارە، ناتوانیّ وەك ساڵی 1981، کە بنکەی ئەتۆمی عێراقی وێرانکرد، بنکەی ئەتۆمی ئێران بەتەنیّ وێرانبکاو، تا هەندازەیەکیش سەری بۆ داخولزیی فەلەستینییەکان شۆڕ کردووە. لەولاشەوە، ئەمریکاو بەریتانیاو هاوپەیمانەکانیان کەوتوونەتە گێژاوێکی سەختەوەو، هەتا ئێستە، هیچ گەرەنتی‌و بەڵێنێکیان نەداوە، بەکوردو، سەرکردەکانی عێراقیش کە دەستنێژی ئەمریکان‌و، بەدەنگی دوو زلحیزبە کوردییەکە، ئەو پایەو پلەیەیان وەرگرتووە، تەنانەت ئامادەنین شوێنەواری بەعەرەبکردن لەکوردستاندا لابەرن، بەپێی ئەو قانوونەی کە خۆیان ئیمزایانکردووە.

ئا لەم کاتەدا دەبینین، کە سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، هەر لەخەمی نیوە بەنیوەو، پارە کۆکردنەوەدان‌و، لەولاشەوە، خەریکی پاشقولگرتنن لەیەکدی، وەك ئەوەی لەم دواییەدا هێندەك لەکاربەدەستانی یەکێتی کەوتوونەتە سەرکەڵکەڵەی "سنوور دانان" بۆ دەسەڵاتی مام جەلال‌و

رەخنەگرتن لێی، وەك ئەوەی تۆ بڵێیت، هەرچییەك لە یەكێتیی و بەدەستی یەكێتی روویدا بێ، هەر گوناهی مام جەلال بووبێ و، ئەوانی دیكە هەموو "شێخی سەنعان" بن. ئەمانە ئەوە لێكنادەنەوە، كە مام جەلال، نە لە بنەماڵەیەكی بەنێوبانگەو، نە خاوەن هۆزێكی دەستڕۆیشتووەو، نە دەسەلاتێكی ئاینیشی هەیە. ئەو دەسەلاتەی مام جەلال هەیەتی، حیزبەكەی، واتە سەركردەكانی حیزبەكەی پێیانداوەو، ئەگەر مام جەلال گوناهبار بێ، گوناهی ئەوانە. لەبەر ئەوە، دەبێ جارێ بێدەنگ بن، هەتا كورد لەم "پردە سیراتە" دەپەڕێتەوە. چۆنكە، هەموو ئاژاوە نانەوەیەكی نێوخۆیی، بەتایبەتی لەسەر كوێخایەتی، لەم رۆژەدا خیانەتە. ئەوجا ئەگەر كورد لە پردەكە پەڕییەوە، ئەوا دڵی كورد گەورەیەو لەگەڵێك گوناەو تاوان خۆشبووەو خۆشدەبێ. خۆ ئەگەر كەوتە خوارێ، ئەوا دڵنیابن كارنامەی هەموو لایەك دەخرێتە بەردەم خەڵكو، ئەشكەوت لەخراپەكاران دەكرێتە كونەمشك. رۆژ رۆژی كاركردنە لەسەر بنچینەی یەككگرتن و گشتپرسی بۆ سەربەخۆیی و دووركەوتنەوە لەحیزبحزبێنە، كە بەڵای سەری نەتەوەی كوردە.

سەركەوتن لەسیاسەتدا لەڕێی دەستپێشكەریی ژیرانەو بڕیاری نیشانشكێنەرانەوە دێتە دی، نەك لەڕێی چاوەڕوانیی دەرفەت لەدەستدەرانەو، دڵی خۆخۆشكردن بە بەڵێنی ئەمو ئەوو، ماستاوكردن بۆ نەیاران، لەجیاتی دیپلۆماسێتی ژیرەكانە. سیاسەتكاری و سیاسەتزانی، دوو شتی لەیەكجیاوازن. سیاسەتكار كاتێك سەركەوتوو دەبێ، كە سیاسەتزان بێ. كورد، نامەخوا، سیاسەتكاری فرە زۆرو، سیاسەتزانی، بەداخەوە، گەلێك كەم. ئەوجا، سیاسەتكاری سیاسەتزانی گەلێك كەمتر. هەر بۆ نموونە، كە سیاسەتكارانی دوو زلحیزبەكە، سیاسەتزان نین، ئەوەیە، سالانی ساڵە داوا دەكەم لێیان، كە رێبدەن جەماوەر بێتە

سەرشەقامەکان‌و داوای سەربەخۆیی کوردستان بکا، بەتایبەتی لەکەرکووک‌و مووسڵ‌و بەغدا، کەچی ئەوان لەم دواییەدا، لەترەکەڵەکێی دامەزراندنەوەی عێراق گەیشتوون‌و، دەفەرموون "ئەگەر جەماوەری کورد داوای سەربەخۆیی بکەن"، ئەوان "ناچارن سەر بۆ داخوازییەکەیان شۆڕ بکەن"و لەم رۆژانەدا، رێیان بەجەماوەری کەرکووک دا بێتە سەرشەقامەکان. سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە پێیانوابوو، ئەگەر جەماوەری کوردستان هاتە سەرشەقامەکان‌و باسی سەربەخۆیی کوردستانی کرد، ئەو دەمە داگیرکەران‌و هاوپەیمانان پێیاندەڵێن "گەل لەگەڵ ئێوە نییە" ئێوە باسی فیدرالی دەکەن‌و، گەلەکەتان باسی سەربەخۆیی دەکا،و ئەودەمە، روو وەردەگێڕن لێیان. ئەمە لەکاتێکدا، پێچەوانەی ئەم بۆچوونە راستە. چۆنکە، ئەو حەلە، دەچوون هانایان دەبردە بەر دوو زلحیزبەکە، بۆ ئەوەی خەڵکی کوردستان بەشتێکی کەمتر لەسەربەخۆیی رازیبکەن. سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، دەبوو هیچ نەبێ لەخەڵکی دارفۆرەوە وانەیەك فێربن. بەڵام چ بکەین، نێچیر، هەموو دەمێك بۆ راوکەر هەڵناکەوێ، بەڵام بۆ..... هەڵدەکەوێ.

بەرلین 2004/10/29

**میدیا**، ژ 173، 2004/11/1

## هەڵبژاردنەکانی ئەمریکاو ئەو هەڵبژاردنانەی دووزلحیزبە کوردییەکە بەتەمان بیکەن

سەرەڕای گەلە کۆمەیەکی چڕوپڕی نێونەتەوەیی، دژی جۆرج دەبلیو بوش، بەنیازی فڕێدانە خوارەوەی لەتەختی فەرمانڕەواییی ئەمریکا، جۆرج بوش توانی لەهەڵبژاردنێکی ئازاددا سەربکەوێ‌و، پلەی سەرکۆمارێتی خۆی بۆ ماوەی چوار ساڵی دیکە دابینکاو، بەمەش کوێرایی هێنا بەچاوی دژ بەرەکانیدا، کە هەموو جۆرە فرتوفێڵ‌و کەینوبەینێکیان بەکارهێنا بۆ سەرنەکەوتنی.

ئەوەی شایانی سەرنجدانە لێرەدا ئەوەیە، ئەم گەلەکۆمەیە کە لەدژی هەڵبژاردنەوەی بوش کرا، بەرەیەکی یەکجار فراوانی گرتبووە خۆی‌و، وەك چێشتی مجێوری کورد، لەهەموو بابەتێکی تێدا بوو، هەر لەو چەپییانەوە بیگرە، کە بەدەم دژی هەموو جۆرە بندەستی‌و ناڕەواییەکن‌و، تیروشیر لەهەموو راستڕۆو سەرمایەدارێك دەسوون، هەتا دەگاتە بەرەی ئەو راستاژۆیانەی کە بەخوێنی سەری هەموو چەپییەك تینوون‌و، هەروەها عەرەبە شۆڤێنیستە فاشستەکان، کە لەکوشتن‌و لەنێوبردنی کورددا، خۆشیی ژیان دەبینن‌و، ئەو موسڵمانە دەستوەشێنە تەنگەتیلەکانەی کە "فتوا"ی گەلکوژی کورد دەدەن‌و، لەسەتەی بیستویەکدا، فەرمانی بەردبارانکردنی کچی سیانزە ساڵە دەدەن. هەر ئەمانەش بوون کە "فتوا"یاندەرکرد بۆ عەرەب‌و موسڵمانە ئەمریکاییەکان، کە بەپێی "تەکلیفی شەرعی"، پێویستە لەسەریان، دەنگ بۆ بوش نەدەن‌و، حکومەتی بوش بڕووخێنن. شانبەشانی ئەمانەش سۆسیالدێمۆکرات‌و لیبەراڵ‌و حیزبە کەسکەکانی ئەوروپا، کە بەهەزار دەم باسی دێمۆکراسی‌و ئازادی دەکەن‌و، بەکردەوەش هەزارو یەك بیانوویان هێنایەوە بۆ

پاراستنی رژێمی تیرۆریستی سەددامو بەربەرەکانیی بوش‌و بلێرو ئەزنارو، بەنیوی پاراستنی گوایە "ئاشتیی جیهان"و "دژایەتیی کردنی جەنگ"ەوە، بەملوێن خەڵکی سادەو ساویلکەو لەگوێیگادا نوستوویان هێنایە سەر شەقامەکانی ئەوروپا، بۆ سووکایەتیکردن بەسیاسەتی بوش‌و بلێر. ئەوجا ئێستە کە بوش سەرکەوتووە، هیچ شەرم ناکەن‌و دەبێژن، "ئامادەن هاوکاریی بوش بکەن دژی تیرۆریزم". بەڕاستی قسەیەکی نەستەقی جوانە، کە دەڵێ: "مرۆڤ کە شەرمی نەکرد، دەتوانێ هەموو شتێك بێژێ‌و هەموو شتێکیش بکا"و، هەر کاتێك پێویستی کرد، بابداتەوە. چۆنکە، ئەو جۆرە کەسانە، هەر "ببوورە" یەکیان لێدەردەچێ‌و لەدەستدەچێ.

ئەز، وەك مرۆڤێك، کە ماوەیەکی دوورو درێژە لەنێو ئەوروپاییەکاندا دەژیم‌و، لەنێزیکەوە دەیانناسم‌و، لەشێوەی ژیان‌و بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتیان بەتەرازوویەکی زانستانە دەکۆڵمەوە، سەرم لەم هەڵوێستەیان سووڕ نامێنێ. چۆنکە، ئەو گەلە کۆمەیەی کە لە بوش‌و بلێر کرا، ساڵانی ساڵە، لەدژی ئازادیی کوردو سەربەخۆییی کوردستان‌و گەیشتنی کورد بەمافە رەواکانی دەکرێ، بەتایبەتی مافی بڕیاری چارەنووسی خۆی، ئەو مافەی کە ئەمانە، بەهەزار زمان دەیڵێن‌و دەیڵێنەوەو، کەچی بەکردەوە لەدژی دەوەستن. هەر بۆیەش بەزەییم بەو مرۆڤە راستگۆیانەدا دێتەوە، کە بوونەتە نیشانەی واتە واتەو بوختان‌و درۆو دەلەسەی مرۆڤی بێویژدان‌و خۆبژێن‌و پنتی، با ئەو مرۆڤە راستگۆیانەش، بیرو بۆچوونیان لە هی من جیاواز بێ‌و، هیچ جۆرە ئامانجێکی هاوبەشیشمان نەبێ. لێرەدا، ئەگەر کەسێك ویژدانی سەگ نەیخوارد بێ، سا ئیدی، دۆستی بوش‌و بلێر بێ، یان نەبێ، دەبێ دان بەوەدا بنێ کە ئەم دوو کەسە، مەردی مەیدان‌و پێلە سەرجێیخۆو قسە

لەڕوو و، ورەبەرزن، ئەمە بێجگە لەوەی کە بە ڕماندنی ڕژێمی سەددام، ئاواتێکی گەورەی خەڵکی کوردستان و هەموو دژبەرانی دیکتاتۆرێتی و ملهۆڕییان هێنایەدی.

ئەری . . بوش گۆی هەڵبژاردنی بردەوە. بەڵام هەڵبژاردنی ئەمریکاو سەرکەوتنی بوش لەوەدا، هەر تەنێ ئەو ڕاستینەیان دەرنەخست، کە زۆربەی ئەمریکاییەکان پشتگیریی سیاسەتی بوش دەکەن، بەپێچەوانەی پڕۆپاگەندەی ژەهراویی ئەو گەلەکۆمەیەی لەسەرەوە باسکرا، بەڵکو ئەو ڕاستینەیەشیان خستەڕوو، کە گەلی ئەمریکاو سیاسەتکارانی، دێمۆکراتیخوازو هۆشیارن و، لە گۆڕەپانی شارستانێتیدا هەنگاوی گەورەیان ناوە، کە بەڕاستی، لەمەدا ئێرەییان پێدەبەم.

ئافەرین لەگەڵ ئەمریکاو، هەزاران ئافەرینیش لە جۆن کێری، ئەو جۆن کێرییەی کە تا هەڵبژاردن تەواو بوو، دژبەرێکی سەختی جۆرج بوش بوو، بەڵام کە زانی دۆڕاندوویەتی، ئەگەرچی بەڕێژەیەکی یەکجار کەمیش، بەڵام یەکسەر تەلەفۆنیکرد بۆ جۆرج بوش و، پیرۆزباییکرد لێی و، هەستی خۆی وادەربڕی کە، وەك هاوولاتییەکی سادەی ئەمریکا، ئامادەی هاوکارییە لەگەڵ جۆرج بوش. ئەم جۆرە کەسانە، ئەگەر خۆشەویستیش نەبن لای دژبەرەکانیان، شایانی ڕێزوقەدر زانینێکی یەکجار بەرزن. ئەم هەڵوێستەی جۆن کێری، قوڕیدا بەدەمی هەموو ئەوانەدا کە ڕمڵیان لێدەدا بۆ پەیدا بوونی گێروگرفت و درێژەکێشانی ئەنجامی هەڵبژاردن و سەرهەڵدانی ئاژاوە. هەر ئەم ڕێبازە ڕامیارییە بەرزەی کە ئەمریکاییەکان پێشانیاندا، ئەوە دەخاتەڕوو کە ئەمریکا، هەر بەچەکی ئەتۆم و مووشەکی دوورهاوێژ و سەتان جۆرە پیشەسازیی مۆدێرن، نەبووە بەو ئەمریکایەی کە بەگەورەترین هێزی جیهان دادەنرێ، بەڵکو بەخووڕەوشتی دێمۆکراتانەی گەل و حکومەتەکەی لەنێوخۆی وڵاتەکەیاندا.

ئێستە بابێین بەراوردێکی گەڕی هەڵبژاردنی ئەمریکا، لەگەڵ ئەو هەڵبژاردنانەدا بکەین، کە دەڵێن لەکوردستان‌و عێراقدا لەمانگی یەکەمی ساڵی 2005دا دەکرێ‌و، سەرنجێکی ئەو هەواڵانەش بدەین، کە لەم ڕۆژانەدا دەیانبیسین، لەبارەی جرتوفڕتی دوو زلحیزبەکەوە، ئەوسا تێدەگەین کە کۆمەڵگەی لەتکراوی باشووری کوردستانی بندەستی ئەم دوو زلحیزبە، چەندە بەشخوراوو ماڵوێران‌و بەدبەختە. ئەوەتە، پاش ئەم هەموو کوردکوژی‌و ئاوڕووچوون‌و دەرفەت لەدەستدانە، دوو زلحیزبەکە بەتەمان دیسانەوە، لەسەر "دەسەڵات"، شەڕی نێوخۆیی تازە بکەنەوە. بەڵێ. . . لەسەر "دەسەڵات"، وەك کاك عیماد ئەحمەد، ئەندامی مەکتەبی سیاسی ی.ن.ك، ڕەپوڕاست دەبێژێ کە "کەس ناتوانێت گەرەنتی هەڵنەگیرسانەوەی شەڕی نێوخۆ بکات". هەی لەبەر "دەسەڵات"تان مرم!! دەسەڵات بەسەر کێدا کاك عیماد؟ "دەسەڵات" بۆ دەمکوتکردنی ڕەشوڕووتی کوردو، هەموو ئەو ڕۆشنبیرانەی کە ڕەخنە دەگرن لێتان‌و، بەئاواتەوەن کە لەژیاندا کوردستانێکی ئازادو سەربەخۆ ببینن، یان "دەسەڵات" بەسەر ئەوانەدا کە لەکەرکووك‌و مووسڵ‌و سامەڕاو بەغداو دیالە کوردی بێتاوان، وەك مەڕو بزن سەردەبڕن؟ بەرامبەر بەوانە هیچتان لەدەستنایەت، بەڵام ئێوە، وەك کوردەکە دەبێژێ، بە "کورتان" شێرن!!! زۆریش هەن، گوناهی ئەمریکا دەگرن، کە هیچ حسێبێکی بۆ کورد نەکردووە، بەڵام ئەو پرسیارە لەخۆیان ناکەن، کوردێك کە دەستڕۆیشتووەکانی، ئاوا کوژراوی "دەسەڵات"ی کوێخایەتی بن‌و، لەپێناوی ئەوەدا گیانی هەزاران خەڵکی وڵاتەکەیان بکەنە قوربانی، ئیدی بۆچی ئەمریکا دەبێ لەڕێی ئەمانەدا دڵی گەلێك لایەن لەخۆی بیەشێنێ‌و، بەرژەوەندییەکانی خۆی بخاتە ژێر پێوە؟؟؟

رەنگە کاربەدەستانی دوو زلحیزبەکە پێیانوابێ کە، تازە کردنەوەی شەڕی نێوخۆیی، هەروا هاسانە، وەك رابوردووی سەردەمی سەددام. بەڵام با دڵنیابن لەوەی کە، هەر لەگەڵ هەڵگیرسانی ئەو ئاژاوەیەدا، دەستوەشێنەکانی مووسڵ‌و کەرکووك‌و بەغداو سامەراو وڵاتەکانی دراوسێش، خۆیان دەگەیەننە نێو جەرگی باشوورو، ئەو دەمە بەزمێك دروستدەبێ، کە هەموو دوژمنانی کورد چاوەڕوانی دەکەن، ئەوەش پەلاماردانی کوردستانە لە هەموو لایەکەوە. کە بێگومان ئەو دەمە هەر هەژارو نەداری ئاشتیخوازی کورد لەنێوناچێ، بەڵکو هەڵگیرسێنەرانی دەسەڵاتخوازی کوێخاییش، بەئاگری جەنگی خۆیان دەسووتێن.

ئەگەر دوو زلحیزبەکە لەو خەیاڵەدان، کە وەك جاری جاران، پێکەوە دەسەڵات لەسەر بنچینەی پەنجا پەنجا بەشبکەن‌و، چەند کەسێکی دیکەش "بەخێری خۆیان"، بخەنە پەرلەمانەوەو، رێژەیەکیش بەسەر حیزبەکانی دیکەدا بسەپێنن، ئەوا خەیاڵیان خاوە. سەپاندنی رێژە، مافی لایەنێکی رەوایەتیدارە، کە ئەو لایەنە ئەوڕۆ لەکوردستاندا نییە، چۆنکە پەرلەمانەکەی دوو زلحیزبەکە، هەشت ساڵە رەوایەتی نەماوە. لەبەر ئەوە، باشترین شت بۆ هەردوو زلحیزبەکە ئەوەیە، بەر لەهەموو شتێك رێ بەگشتپرسییەك (رەفراندۆم) بدەن، تا جارێ بزانرێ خەڵکی باشوور چیاندەوێ. ئەگەر خەڵکی باشوور، سەربەخۆییان ویست، ئەوا چوونە هەڵبژاردنێکەوە لەگەڵ عێراقییەکان، کارێکی نابەجێیە. لەبەر ئەوە، چوونە هەڵبژاردن، پێش گشتپرسی، خاپاندنی خەڵکی کوردستانەو، رەوایەتیدانە بەوەی کە باشووری کوردستان بەشێکە لەعێراق، بێ ئەوەی هیچ پرسیارێك لەخەڵکەکەی کرابێ. شایانی باسە، ی.ن.ك‌و ئەوجا پ.د.ك، تەنێ لەم دواییەدا کەوتنە سەر باسی رەفراندۆم، ئەو رەفراندۆمەی کە کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان، بەسەرۆکایەتیی هێژاو

تێکۆشەری نێوداری کورد جەواد مەلا، لەساڵی 1985وە باسی دەکاو، دوو زلحیزبەکە، یان راستەوخۆ، لەدژی دەوەستان، یان دەیانخستە پشتگوێ. کەچی لەم دواییەدا، یەکێتی چەند دەسکەلایەکی خۆی کردە دەمڕاستی رەفراندۆم، بەڵام نەك بۆ سەربەخۆییی کوردستان، وەك کاك هەڵکەوت عەبدوڵلا، بەئاشکرا گوتی: "ئێمە (واتە ئەوان) رەفراندۆممان بۆ سەربەخۆیی کوردستان نەکرددووە"، واتە وەك گوشارێك بەدەست دوو زلحیزبەکەوە بۆ سەر حکومەتی نێوەندیی عێراق. ئەمە لەکاتێکدا کە، حکومەتی نێوەندیی عێراق، گوشاری وان بە پوولێك ناکڕیۆ، هەتا ئەوڕۆ، کە ئەوڕۆیە، یەك بەندی قانوونی بەڕێوەبەرایێتیی کاتی، جێبەجێ نەکردووەو، بەعێراقیش ناڵێ "عێراقی فیدرالی"، وەك دوو زلحیزبەکە. شوێنەواری عەرەباویکردنی کوردستان، هەر لەجێی خۆیەتیو، زمانی کوردیش، کە گوایە زمانی فەرمیی عێراقە، لەپاڵ زمانی عەرەبیدا، تەنانەت لەکوردستانەکەشدا، وەك کەرکووكو مووسڵو خانەقین، رێزی ناگیرێو بەکار ناهێنرێ. ئەمەش لەرۆژگارێکدایە، کە لەشکری هاوپەیمانان لەعێراقدانو، یاوەرو عەللاوی دەستیان بەسەر گەڕەکێکی بەغدادا ناڕوا، کەچی، ئەمە هەڵوێستیانە بەرامبەر بەکوردو، دوو زلحیزبەکەش، نێزیکەی سەتهەزار چەکداریان هەیە، بەڵام بەکاریناهێنن بۆ رزگارکردنی نێوچە داگیرکراوەکان، لەم هەلە هەڵکەوتووەدا، بەڵکو بیر لەوە دەکەنەوە، کە چۆن لەدژی یەکدی، چەکدارەکانیان بخەنە کار بۆ دابینکردنی کوێخایەتیی خۆیان. . . بەڕاستی، کوردستان لەتەنگانەدایەو، چاوەڕوانی تێکۆشانی دڵسۆزانەی رۆڵەکانێتی.

بەرلین 2004/11/16

**میدیا**، ژ 174، 2004/11/10

## دابڕان لەهەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراق و، رووکردنە گشتپرسی(رفراندۆم) دواتیری نێوکەوانی خەڵکی باشووری کوردستانە

پاش ئەوەی قوربانییەکانی ئەنفال و چەکی کیمیاییی ساڵانی هەشتاکان و، راپەڕینی جەماوەرانەی بەهاری 1991ی باشووری کوردستان و، گەلڕەوی ملیۆنی ئەو ساڵە، لەپاڵ گەلێك هەلومەرجی لەباری ئیقلیمی و نێودەوڵەتییەوە، بوونە هۆی راکێشانی سەرەنجێکی ئینتەرناسیۆنالی بەلای کورددا، لەئەنجامدا کشانەوەی لەشکری سەددام لە سێ ستان (لیوا)و، دوای ئەوەش بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ دامەزراندنی "نەوای ئارام"، یان "هەرێمی نەفڕین" No Fly Zone لەبەشێکی باشووردا، سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە (پارتی و یەکێتی)، کە ئەو دەمە لەئێران و سووریا پەنابەربوون، هاتنەوە "سەر شار"و، چوونەوە سڵاوی سەددام، و کەوتنەوە دەهوڵ لێدان بۆ ئۆتۆنۆمی و، خۆسەپاندن بەزۆری چەك، بەسەر رەشووڕوتی کورددا،و ئەو قوربانییە مەزنانەیان، کردە قوربانی حیزبحیزبێنەو، لەسەر دەسەڵاتی کوێخایانەو لەرکی یەکدی، لەشکری داگیرکەرانی ترك و فارس و عەرەبییان هێنایە هەرێمەوەو، بەرشتنی خوێنی هەزاران چەکداری هەردوولا، 12 ساڵی رەبەق بوونە فەرمانڕەواو، کردیان و خواردیان و بردیان و، ملیان بۆ هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەك نەدا. ئەوجا، لەسەردەمی پەلاماردانی ئەمریکاو هاوپەیمانانی بۆ سەر عێراق و، ناچاربوونی ئەمریکا بە پەنابردنە بەر دوو زلحیزبەکەو، لەباتی ئەوەی، ئەو دەرفەتە مێژووییەی بۆ کورد هەڵکەوتبوو، دەستبەجێ بقۆزنەوە، بۆ پێکهێنانی یەك حکوومەت و یەك لەشکرو یەك نوێنەری هەڵبژێردراو و، هەنگاونان بەرەو سەربەخۆیی کوردستان، کەوتنە عێراقچێتیەکی واخەستوخۆڵ، کە تەنانەت عەرەبە بەعسییە شۆڤینستەکانیشیان شەرمەزار کرد. ئەمە لەکاتێکدا کە هەموو

کەسێك دەزانی، کە ئەو دوو زلحیزبە هیچ رەوایەتییەکیان نەماوە، بەنێوی کوردەوە قسە بکەن، چۆنکە پەرلەمانەکەیان هەشت ساڵە ئێکسپایەر بووە. بێجگە لەوەش، هەر خۆشیان دان بەوەدا دەنێن کە خەڵکی کوردستان، سەربەخۆییان دەوێ، نەك ئەوەی ئەوان پێیدەڵێن "یەکگرتنی ئارەزوومەندانە" بەشێوەی فیدراڵی، کە هیچ جۆرە ئارەزوومەندییەکی تێدا دیار نییە. لەبەر ئەوە، پێداگرتنیان لەسەر یەکێتیی عێراق و، دەستهەڵگرتنیان لە کەرکووك و موسڵ و دیالەو کووت و، پشتکردنە یەك ملیۆن و نیو کوردی بەغداو خوارووی عێراق و، چاوپۆشی بەرامبەر سەربڕینی کورد لەکەرکووك و مووسڵ و دیالەو کووت و نێوچەکانی عێراقداو، چوونە نێو هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراق، بێ گشتپرسییەکی (رفراندوم) ئازادانە لەباشووری کوردستان و کوردی عێراقدا، لە ملهوڕی و کەڵەگایی بەولاوە، هیچ مانایەکی دیکەی نییە، چونکە ئەگەر کورد خۆیان، بەپێی خۆیان بچن دەنگ بۆ پەرلەمانێکی عێراق بدەن، بێ گەرەنتیکردنی هیچ مافێکی بنچینەییی نەتەوەی کورد لەلایەن ئەمریکاو بەریتانیاوەو، بێ دیاریکردنی سنووری راستینەی باشووری کوردستان. مانای وایە، ئەو بەڵگە مێژوویی و قانوونییەی کە تا ئەوڕۆ بەدەست کوردەوەیەو، دەبێژێ "ئێمە بەزۆر کراوین بەعێراقی"، ئێدی هیچ کارکردو نرخێکی نامێنێ و، کورد دەبنە کەمایەتییەك لەنێو دەوڵەتێکی عەرەبیی ناسیۆنالیستی و ئاینگردا، کە عێراقە. ئەوجا، ئێستە جەماوەری کوردستان، چ لە وڵات و چ لەهەندەران، لەبەردەم دوو ڕێیانێکدا وەستاون، کە ڕێیەکی سێیەمی نییەو، ماوەیەکی زۆر کورتیش ماوە بۆ بڕیاردان و، تەنێ یەك تیر لەکەوانی کورددا ماوەتەوە، کە ئەوەش بۆیکۆتی (مقاگعە) هەڵبژاردن و دەنگدانە بۆ سەربەخۆیی، لەڕێی گشتپرسی (رفراندوم)یەکی ئازادەوە. خۆ ئەگەر کورد بچنە هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقەوەو،

بەفرتوفێڵی دوو زلحیزبەکە بخەڵەتێن، ئەوا دەبێ خۆیان بۆ چەند ئەنفالێکی دیکەو لەنێوچوون‌و راکردن لەکوردستان، ئامادە بکەن. دڵنیاشبن کە ئەورووپا، ئەو ئەورپایەی جاران نییە، هەر وا بەئاسانی پەنابەر وەربگرێ. ئەورووپا بەدەست ملیۆنان بێکارو، تەنگوچەڵەمەی ئابوورییە وە دەناڵێنێ‌و، لەمەودوا پەنابەر وەرناگرێ. قسەش هەیە، ئەوانەی داوای پەنابەرێتیدەکەن، لەئەفریقا بیانخەنە ژێر خێوەت‌و چادرەوە. جا لەبەر ئەوە، کورد دەبێ بیرەکی کوور لەدواڕۆژی خۆیان بکەنەوەو، ئەو تیرەی لەکەمانگەیاندا ماوە، واتە، بیری دابڕان لەهەڵبژاردن‌و، پێداگرتن لەسەر گشتپرسی (رفراندوم)، نە دۆڕێنن‌و، بزانن کە پەشیمان، وەك کورد دەبێژن، شاخی لێ دەڕوێ.

بەڕاستی، جێی داخو خەفەتە کە زلحیزبە کوردییەکان، نەك هەر تەنێ پارتی‌و یەکێتی، بەڵکو ئەوانەی رۆژهەلات‌و رۆژئاواو باکوورو، تەنانەت هێندەك لە حیزبۆلکەکانیش، لەباتی ئەوەی ببنە خزمەتکارو چرا بەدەست، بۆ رۆنکردنەوەی بەرپێی خەڵکی کوردستان، کەچی بوونەتە بەلای سەری کوردو، مێردەزمەو، وەکو گەنە بەربوونەتە گیانی ئازار دراو،و جەستەی بریندارى ئەم نەتەوە بەشخوراوە. لەبەرئەوە، پێویستیی سەرشانی هەموو هاوولاتێکی کوردستانیی دڵسۆژو سەربەرزو خۆ نەفرۆشتوو و ئازادیخوازو یەکسانیخواز ئەوەیە، لە رێی کەمپێنەکانی رفراندومەوە. کە لە لەندەن لە 12/5و لەسلێمانیدا دەکەرێتە گەڕ، هەڵوێستی خۆی دەربخاو، بەرەی ژێر خۆی لە بەرەی ملهوڕان‌و چڵکاو خۆرەکانیان، جیا بکاتەوە.

چەند جار لەمەوبەر، ئەوەم گوتووە، کە ئەمریکا زلهێزێکە بەرژەوەندیی رامیاری‌و ستراتیژی‌و ئابووریی خۆی هەیەو، برای باوکی کەس نییەو، ئێستەش دەیەوێ بەزووترین کات هەڵبژاردنێك لەعێراقدا بخاتە سەرپێ،

تا پەرلەمانێك بێتە كایە، بۆ ئەوەی لەشكرەكەی لەعێراق بكێشێتەوە. كورد نابێ بەرژەوەندیی خۆیان بكەن بەقوربانی بەرژەوەندیی هیچ لایەك، نەك وەك بەڕێز رزگار عەلی، ئەندامی سەركردایەتیی یەكێتیو ئەندامی كۆڕی شارەوانی كەركووك كە لەبەرلین لەرۆژی 11/6دا گوتی: "ئەگەر ئێمە نەچینە هەڵبژاردنەوە"، پێمان دەڵێن "كورد بوونە هۆی سەرنەگرتنی هەڵبژاردن". گوتم: جا با پێمان بڵێن" ئەوەش خاڵانەی ئەوەیە، كاتی خۆی، كە بەو جۆرە بەڕێزانەم دەگوت: "سڵاوات لەدیاری رژێمی سۆڤێت مەدەن، سۆڤێت رژێمێكی سۆسیالیستی نییە، بەڵكو رژێمێكی تۆتالیتێرو دیكتاتۆرو دوژمن بەئازادیو ئاشتییەو، چەند جار ئەنفالی لەكورد كردووە"، كەچی دەیانگوت: "ئەگەر ئێمە وا بێژین، پێمان دەڵێن، ئێوە بۆرژوازیو نۆكەری ئەمریكاو زایۆنیزمن". ئەو دەمەش، هەر پێمدەگوتن: "دەبا وابڵێن، تا سەری بۆشیان هەڵدەگرێ"، بەڵام چ دەكەیت لەگەڵ بێ خەبەران!! هەر دەبێ بڵێی "كەشكەك سڵاوات".

بەرلین 2004/11/17

**میدیا**، ژ 175، 2004/12/1

# خەونێك بوو دیمان، بەڵام هەر نیوەی راستدەرچوو

کە لەنێوەڕاستی پەنجاکاندا مامۆستا بووم لەقوتابخانە نێوەندییەکانی موسەللاو رۆژهەڵاتو رۆژاوای شاری کەرکووك، جاروبار، بەئێواران دەچوومە چایخانەیەك کە کەوتبووە خوار قەلاوە، لەسەر رێی سلێمانی. هەرچەندە، چایخانەکە هیچ تابلۆیەك بەسەر دەرگەکەیەوە هەڵنەواسرابوو، بەڵام لەنێو خەڵکدا بە "چایخانەی ئازادی" بەنێوبانگ بوو. گەلێك هۆنەرو نووسەرو رۆشنبیری کوردی کەرکووکی، لەوێ کۆدەبوونەوە، لەوانە، چەند هۆنەرێکی وەك هیجری دەدەو عەلی باپیر اغاو عەبدولسەمەد خانەقاو عەبدولخالیق ئەسیری (کە ئەو دەمە سەربنووسانی دادگەی شەرعی کەرکووك بوو) هەروەها مامۆستایان، دوکتۆر زەنوون پیریادیو مستەفا نەریمانو عەبدولڕەحمان رەزاو ئیحسان عەبدولحەمیدو ژمارەیەك لەقوتابییە چالاکەکانیش، وەك عەلی عەسکەریو جەبار جەباری (کە هەردووکیان، وەك گەلێك قوتابیی دیکە، لەلای من فێری رێنووسی کوردی بەتیپی لاتینی بوون)، دەهاتنە ئەوێ.

لێرەدا، مەبەستم ئەوە نییە کە باسی ئەو رۆژە چڕوپڕە خۆشانەی ئەو سەردەمەی ژیانی خۆم بگێڕمەوە، چۆنکە ئێرە جێی ئەوە نییەو، بێجگە لەمەش، هاوڕێی هێژاو لەبیر نەچووم، دوکتۆر زەنوون پیریادی، چەند ساڵێك لەمەوبەر، لاپەڕەیەکی لەدیرۆکی ئەو دەمەی، لەگۆڤاری "رەنگین"دا بڵاوکردبووەوە، بەڵکو مەبەستم چیرۆکێکە لەو چیرۆکە پڕ لەپەندانەی کە رەوانشاد، عەلی باپیراغا دەیگێڕانەوەو، چیرۆکەکەش ئەمەیە:

کابرایەکی دڵپاكو بێزیان، خۆیو ژنەکەیو منداڵەکانی خانوویەکیان دەبێ لەگەڕەکێکی شارێکدا، کە خەڵکی ئەو گەڕەکە، هەموو خزمو کەسوکاری یەکدەبن. لە پڕ زۆردارێکی ملهۆڕ، لەگەڕەکێکی دوورەوە پەیدا دەبێو، تەنگ بەخەڵکی ئەو گەڕەکە هەڵدەچنێو، زۆربەیان لەگەڕەکەکە

دەردەکاو، ئەوانەش کە بێماڵ دەمێننەوە، دەبنە چادرنشین‌و، ئەوجا سەرە دێتە سەر ئەم کابرایەو، زۆردارەکە پێیدەڵێ "دەبێ خانووەکەت چۆڵبکەیت‌و لەم گەڕەکەش نەمێنیت، ئەگەرنا منداڵەکانت دەکوژم". کابرا، بەقسەی زۆردارەکە ناکا، زۆرداریش هەردوو منداڵەکەی دەکوژێ‌و، پێشیدەڵێ، "ئەگەر خانووەکەی چۆڵنەکا بۆی، ئەوا ئەمجارە خۆی‌و ژنەکەشی دەکوژێ"، کابرا، لەترسی ژیانی خۆی‌و ژنی، شتومەکە بەنرخەکانی لەسنووقێکی گەورەدا کۆدەکاتەوەو، خۆی بۆ ئاوارەیی ئامادە دەکا. بەڵام زۆردارەکە، رێی نادا سنووقەکە لەگەڵ خۆی بباو، بێ کەلوپەل، رەوانەی ژێر چادرەکانی دەرەوەی گەڕەکەکەی دەکا.

شەوێکیان، کابراکە، بەخەیاڵی تۆڵە کردنەوە لەزۆردارەکە، خەونێکی سەیر دەبینێ. لەخەونیدا، ئەم ملهۆڕە، کۆنە هاوبەشکار (شریك)ێکی یەکجار دەسەڵاتداری دەبێ، کە لەوەوپێش، زۆر یارمەتیی ملهۆڕەکەی داوە، لێ، ناکۆکییەك دەکەوێتە نێوانیانەوە، هاوبەشکارە دەسەڵاتدارەکە، رکیەهەڵدەستی لە ملهۆڕو، هەوڵی نەمانی دەدا. ئەوجا، بۆ ئەوەی بچێتە سەری، دەبێ بەگەڕەکەکانی دەوروبەری ئەو گەڕەکەدا بڕوا، کە ملهۆڕ داگیریکردبوو، بەڵام ئاغاکانی گەڕەکەکانی دەوروبەر، سا، یان لەبەر راگرتنی بەرژەوەندیی خۆیان، یان لەترسی ملهۆڕ، رێ بەدەسەڵاتدار نادەن بەزەوییەکانیاندا بڕوا. دەسەڵاتدار دادەمێنێ‌و، ناچار دەبێ، روو بکاتە چادرنشینەکان‌و، داوای یارمەتی‌و پێکەوە کارکردن بکا لێیان. چادرنشینەکانیش، چۆنکە هێندە دڵیان پڕە لە ملهۆڕ، بە کراسی بەری خۆیانەوەو، بێ هیچ مەرجێك دەکەونە جرموجۆڵ، دەسەڵاتدار دەبێژێ، دەبێ هەموومان پێکەوە پەلامار بدەین. بەڵام ئەوان گوێنادەنە قسەی دەسەڵاتدارو، لەنێو خۆشیاندا خۆیان رێکناخەن‌و، هەر یەکەیان بەجیا، روو لەگەڕەکە کۆنەکەی خۆیان دەکەن. کە لەشکری دەسەڵاتدارو

چادرنشینان دەردەکەون، ملهۆڕو چەوەکانی، خۆیان لەکونوکەلەبەردا دەشارنەوەو، کابرای زۆرلێکراویش ڕوودەکاتە ماڵە کۆنەکەی خۆیو، سنووقەکەی دەدا بەکۆڵیداو، دەکەوێتە ڕێ، بێئەوەی بیر لەوە بکاتەوە کە لەماڵە کۆنەکەی خۆیدا، دیسانەوە نیشتەجێببێ. بەڵام سنووقەکە هێندە قورس دەبێ، کابرا لەژێریدا دەپسێو، چەند تەپێك دەکا بەخۆیداو، دەرپێیەکەی پڕ دەکاو، لەو دەمەدا خەونەکەی دەپچڕێو، دەقیژێنێ. ئا لەمەدا، ژنەکەی کە لەتەنیشتیەوە نوستووە، رادەچڵەکیو دەڵێ: ئەوە چییە؟ ئەوە چییە؟ چ قەوماوە؟ کابرای کڵۆڵ، نیوە خەواڵوو، نیوە هۆشیار، دەست بەم لاو بەولادا دەکوتێو، دەبێژێ: کوا سنووقەکە؟ ژنەکەی دەبێژێ: سنووقی چی پیاوەکە؟ وادیارە تۆ شێت بووی، پیاوەکەی دەڵێ: چۆن؟ ئەو سنووقەی کە بەکۆڵمەوە بوو؟ ئەوجا ژنەکەی تێدەگا کە خەونی دیوەو، کە بۆن دەکاو، بۆگەن لەپیاوەکەی هەڵدەسێ، دەبێژێ: ئەی ئەو بۆگەنە چییە، ئەوجا، پیاوەکە خەونەکە بۆ ژنەکەی دەگێڕێتەوەو، دەڵێ "لەخەونیدا سنووقەکە هێندە قورس بووە، بەرگەی نەگرتووە، کردوویەتی بەخۆیدا". لەمەدا، ژنەکەی بەناهومێدییێکەوە دەڵێ: "دەباشە. کەواتە، نیوەی خەونەکەت راستدەرچووە!!!".

ئێستا، ئەگەر، لەم چیرۆکە هوردببینەوە، دەبینین، ئەمە چیرۆکی ماڵوێرانیو دەربەدری کوردە لەباشووری کوردستاندا، بەدەستی لەشکری عەرەبی داگیرکەر، بەسەرکردەیەتیی سەددامو حیزبو دارودەستەکەی. هەروەها چیرۆکی هەڤاڵبەندێتیی کوردە، لەگەڵ کۆنە هەڤاڵبەندی سەددام، واتە ئەمریکا، ئەو ئەمریکایەی کە سالانی ساڵ پشتگیریی سەددامو ڕژێمی تركو شای ئێرانی کرد، بەڵام دوایی، لەباری ناچارییەوە، ڕوویکردە دوو زلحیزبە کوردییەکە، بەڵام دوو زلحیزبەکە، لەباتی ئەوەی، گشت ناکۆکییەکی نانەتەوەییانەی نێوانیان، بخەنە ئەولاوە، ئەو

دەرفەتەی هەڵکەوتووە بۆ بەرژەوەندیی خەڵکی لێقەوماوی کوردستان بقۆزنەوەو، داوا لە ئەمریکا بکەن بەرامبەر هاوکارییان لەگەڵی، پەیمانێك بە مۆرو ئیمزاوە ببەستیٚ لەگەڵیان بۆ دیاریکردنی دواڕۆژی کورد (ئەوەشم پێگوتن، بەر لەوەی ئەمریکا پەلاماری عێراق بداو، لە "میدیا"دا بڵاومکردەوە)، کەچی ئەوان هەر لەسەر دووبەرکیو هەڵمەتە کاسەییو هەرزانفرۆشیو رەوشتی کوێخایانەی خۆیان رۆیشتنو، بیٚ هیچ گەرەنتییەکی ئەمریکا، خۆیان دا بەدەستەوەو، هەر لەیەکەم رۆژی پەلاماردانەوە، بوونە کەوڵسۆری بەرلەشکری ئەمریکاو، بۆ گەیشتنە کەرکووكو مووسڵ کەوتنە بۆڕبۆڕێن دژی یەكو، ئەوەبوو هەر لەیەکەم دەستوەشاندنی ئەمریکاوە، هەژدە چەکداری پارتیو، لەنێویاندا کاك وەجیە بارزانی، بەر گوللەی ئەمریکای هەڤاڵبەند کەوتن، گوایە بە "هەڵە"و، ئەمریکاش کە لە هەرزانفرۆشیی کورد باش تێگەیشتووە، وەك خوێنبیانەی ئەو هەموو قوربانییە، پارچە هاسنێکی کرد بە بەرۆکی کاك وەجیە بارزانیدا، کە لەشی وا تێکشکابوو، ئێستەش جێی خۆی نەگرتووەتەوە. ئەمەش هەموو پاداشەکە بوو، کەچی رۆژنامەی "خەبات"، ئەم پارچە هاسنەی وا زلکرد، وەك ئەوەی "باوەڕنامەی سەربەخۆییی کوردستان" بیٚ.

هەر لەئەنجامی ئەم هەڵسوکەوتە نانیشتمانیانەی پارتیو یەکێتییەوە بوو، کە کەرکووك، هەر لەیەکەم رۆژەوە کرا بەچوار بەشو، کورد بەدەستی کورد خۆی، کرا بەچواریەكو مووسڵیش بەفتوای هۆشیار زیباری، بەخوتو خۆڕایی، کرا بە "شاری عەرەب"و، کێبەرکێیی ئەم دوو زلحیزبە گەیشتە رادەیەك کە کاربەدەستێتی هێندەك لەشارۆچکە کوردەکان لەهەڵبژاردندا درانە دەست عەرەب. هەموو ئاواتێکی ئەم دوو زلحیزبە ئەوەبوو کە پایەی سەرۆکوەزیران، یان سەرکۆماری عێراق ببەخشن پێیان،

بەڵام ئەمریکا کە دەمێکە دەیانناسیٚ‌و، باوەڕی پێیان نییە، ئەو پایەیەی نەبەخشی پێیان‌و، ئەمانیش بیٚ دەنگ‌و بیٚ سەنگ بە پایەی "جێگری" رازیبوون، کەچی ئێستەش وازیان لەو خەیاڵە خاوە نەهێناوەو، هەر بەتەمای یەکێك لەو دوو پایەیەن. راستە "کوێر هەتا دەمریٚ هەر بەتەمای چاوە". لەگەڵ ئەمەشدا، با وا دابنێین کە پارتی، یان یەکێتی، یەکێکیان لەو دوو پایەیەی دەستکەوت، ئەمەش دوای هەڵبژاردن‌و بەرازیبوونی عەرەبەکان، کە ئەوەش شێمانییەکی (احتمال) یەکجار دوورە، دەی باشە، ئەوجا چی؟ ئەو سەرکۆمارە، یان ئەو سەر وەزیرە، دەبیٚ هەر باسی عێراق بکاو، بەهیچ جۆرێك باسی کورد نەکا، نەوەك "گوناهبار بکریٚ" بەوەی بەلای کورددا دادەتاشیٚ. نموونەی ئەمەش کاك هۆشیار زێبارییە، کە نازانم بێژم "كَبَّرَ اللهُ خيره" یان "قَصَّرَ اللهُ خيره". کە کاك هۆشـــیار بوو بەوەزیری دەرەوەی عێراق، نێوەکەی لە زێبارییەوە کرا بە "الزيباري". وەك چۆن نەسرین بەرواری، پاش ئەوەی بوو بە First Ladyی "کاتی" (مۆقت)ی عێراق، نێوەکەشی بوو بە "البرواري"و، لەچکێکیشی کردە سەری، گەلێك ئەستوورترو پانتر لە عەگالی مێردەکەی. هەموو بەرهەمەکەی کاك هۆشیاریش ئەوەبوو، عێراقی رووخاوی، بەتکاو پاڕانەوە لەدەوڵەتە عەرەبەکان، کردەوە بە ئەندامی "جامعە الدول العربيه"و، بەدەمی خۆشی دەیگوت "العراق في بيئته العربيه"و، لەبەردەم کۆمەڵەی "نەتەوە یەککگرتووەکان"یشدا، بەجۆرێك کەوتە هەڵدان‌و پەسندانی مەلا عەلی سیستانی دژ بەکورد، وەك ئەوەی مەلا عەلی سیستانی، رێبەری ئاینیی کورد بیٚ. ئەوجا ئەوەتە ئێستە یەکێکی وەك عەبدولعەزیز ئەلحەکیم هەڵوێستی کاك هۆشیار دەکا بە بەڵگە بۆ ئەوەی کە عێراق دەوڵەتێکی عەرەبییەو، دەبێژی کوردەکان خۆیان ویستیان عێراق ببێتەوە بە ئەندامی "جامعە الدول العربيه"و، راستیش دەکا، ئەگەرچی، ئەم قسەیەی حەکیم

وەك ئەوە وایە کە دەبێژێ "کلمە حق ارید بها باگل" چۆنکە، حەکیم خۆی لەبنەماڵەیەکی فارسەو، ئەوانیش خۆیان کردووە بە "ئەلحەکیم"و، لەبەر خاتری ئێرانە کە ئەو قسەیە دەکا. چۆنکە داگیرکەرانی فارس زۆر لەدابەشبوونی عێراق دەترسن. ئەوەتە رژێمی ئێران لەم رۆژانەدا داوای لەرژێمی سووریا کردووە، کە پێکەوە رێ لەبەر دابەشبوونی عێراق بگرن. وەزیری دەرەوەی مەلاکانی ئێران، خەرازی، پاش سەردانی سووریا، چوو بۆ ئەنقەرە، بۆ باسی "بارودۆخی عێراق"، واتە، گەلەکۆمەی ترك‌و فارس‌و عەرەب دژی کورد.

راستییەکەی ئەوەیە، ئەمریکاییەکان پاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوت، ناتوانن ئەو ئاگرەی لەعێراقدا، کە بەپشتگیریی دەرودراوسێیەکانی عێراق هەڵگیرساوە، بکوژێننەوەو، ئێرانیش دەست لەهەوڵدان بۆ بوونە خاوەنی چەکی ئەتۆمی هەڵناگرێ‌و، واز ناهێنێ لەدەستێوەردان لەکاروباری عێراق‌و ئەفغانستان‌و لوبناندا، دەیانەوێ رژێمی ئێران بگۆڕن، بەڵام نازانن چۆن‌و، لەوەش دەترسن کە پەلاماردانە سەر ئێران، عێراقێکی دیکە دروستبکا بۆیان، چۆنکە باوەڕیان بەوە هێناوە، کە بەرهەڵستکارانی رژێمی ئێران، ئیدی شاپەرستەکان بن، یان کۆماریخوازان بن، یان لەبەرەی ناسیۆنالیستانەکان (جبهە ملی) بن، یان ناسیۆنالیست- ئاینخواز (ملی- مژهبی) بن، یان لایەنگرانی حیزبە کوردییەکان بن، یان، "موجاهیدنی خەڵك" بن، یان پاشماوەی چەپییەکان بن، ئەوا هیچیان بایی ئەوە نین کە بتوانن لەرێی راپەرینەوە، یان لەرێی کودەتایەکی سوپاییەوە، رژێم بگۆڕن‌و فەرمانڕەواییەکی پتەوو نەلەرز دابمەزرێنن، لەگەڵ ئەمەشدا چارەسەرێکی دیکە، بێجگە لەگۆڕینی رژێم لەم رۆژەدا نابینن. لەبەر ئەوە شارەزا گەورەکانی ستراتیژێتیی ئەمریکا خەریکی لێکۆڵینەوەی چۆنێتی گۆڕینی رژێمی ئێرانن. مانگانامەی ئەمریکایی The Atlantic Monthly

چمکێکی ئەو نەخشەیەی لەژێر سەر نێوی Wargame (گەمەی جەنگ)دا بڵاو کردووەتەوە، کە ئەو شارەزایانە (وەك سام گاردینەر- مامۆستای ئەکادیمیاکانی جەنگ لەئەمریکاو، مارك گریشت ئەندامی کۆلێژی Enterpriseی ئەمریکا) هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕی کە ئێران بەهەموو جۆرێك تێدەکۆشێ بۆ وەدەستهێنانی بۆمبای ئەتۆمی، ئەگەر تائێستە بەدزییەوە بەرهەمی نە هێنابێ. ئەوجا، کە ئەو بۆمبایەی کەوتە دەست، بەربەرەکانێکردنی یەکجار زەحمەت دەبێ. لەبەر ئەوە پیلانێکی سێ پلەییان بۆ رووخاندنی رژێم داناوە. لە پلەی یەکەمدا بۆمبابارانکردنی لەشکرگەکانی پاسداران، ئەوجا بۆمبارانکردنی داودەزگەکانی ئەتۆم، وەك پلەی دووەمو، لەپلەی سێیەمیشدا پەلاماردانی ئێران لەڕێی سنوورەکانی ئەفغانستانو ئازربایجانو عێراقەوە، کە لەمەدا جارێکی دی پێویستیان بەکورد دەبێتەوە، چۆنکە ئەو دەمە، نەك هەر کوردی باشوور، بەڵکو کوردی رۆژهەڵاتی کوردستانیش دەکەونە گۆڕەپانی جەنگەوە. ئەمە لەکاتێکدا کە ئەمریکاییەکان زۆر باش دەزانن کە کورد، وەك گەل، کەمباوەڕن بەدۆستایەتیی ئەمریکا. ئەگەرچی گوناهی هەر گەورە دەکەوێتە ئەستۆی زلحیزبە کوردییەکان، بەتایبەتی، پارتیو یەکێتی، نەك ئەمریکا، چۆنکە ئەمریکا، وەك چەند جار گوتوومە، برای باوکی کەس نییەو، زلهێزێکی خاوەن بەرژەوەندییەو، بەدوای هەڤاڵبەندێکدا دەگەڕێ کە ئەو بەرژەوەندییانەی ئەمریکا بپارێزێ، ئەوجا دەکەوێتە سەر ژیرەکیو چالاکیی ئەو هەڤاڵبەندە، کە بتوانێ سووت لەو دەرفەتە وەربگرێت. پارتیو یەکێتی، زۆر بەداخەوە، لەسەر بەرژەوەندیی کەمنرخو ناکۆکیی پڕوپووچی کاتیی خۆیان، ئەو دەرفەتە مێژووییەی کە پەلاماردانە سەر رژێمی عێراق، هێنایە پێشەوە بۆ کوردستان، لەدەستیاندا. ئێستەش، مەترسیی ئەوە هەیە کە لەکاتی پەلاماردانی ئێران لەلایەن ئەمریکاوە،

کورد خۆیان بکەنەوە بە کەوڵسۆری بەر لەشکر بەرامبەر بەهیچو کوردستان بەجارێك کاوڵ ببێ.

ئا، لەم هەلومەرجە نازکانەدا، کە دەبوو ئەوانەی، تائێستە، بە کەڵەگایی و بەوپەڕی ناڕەواییەوە، خۆیان کردووە بەدەمڕاستی کورد، هەموو بەرژەوەندییەکی تایبەتیی خۆیان و بنەماڵەیان و حیزب و هۆزو نێوچەیان، بکردایە بەقوربانی بەرژەوەندیی نیشتمانیی کوردستان و، بەهەموو هێزێکیانەوە هەوڵیانبدایە بۆ هێنانە کایەی کەشوهەوایەکی وا لەبار، کە دەوڵەتێکی کوردستانی بکەوێتە سەر پێ، تازە، بەخێری، خەریکن جارێکی دی و لەسەر بنەمای "فیفتی- فیفتی"یەکەی جاران، بەڵام ئەمجارە "چلویەك بە چلویەك" پارەو دەسەڵات بەسەر خۆیاندابەشدەکەنەوە. ئەوجا، دەسەڵات بەسەرکێدا، نەك بەسەر ئەوانەدا کەوا (170) هەزار کوردی کەرکووکی لە دەنگدان بێبەش دەکەن، نەك بەسەر ئەوانەدا کە هەموو رۆژێك چەند کوردێك دەفڕێنن، یان چەند کوردێك دەکوژن، نەك بەسەر ئەوانەدا کە ئاڵای کوردستان دادەگرن و سووکایەتی بەکورد دەکەن، نەك بەسەر ئەوانەدا کە نیو ملیۆن کوردی دەرەوەی عێراق لەدەنگدان بێبەش دەکەن؟، بەڵکو دەسەڵات بەسەر رەشوڕووتی چادرنشینی کورددا، یان بەسەر ئەو رۆشنبیرە ئازایانەدا کە ئامادە نین، بەچڵکاوی ئەوان بەڕێوەبچن و، سەرشۆڕ ناکەن بۆیان.

پاش هەزارو یەك کۆبوونەوەی پارتی و یەکێتی و، لەباتی ئەوەی تۆبە لەرابوردوو بکەن و، بڕیاری دامەزراندنی حکوومەتێکی کاتیی سەربەخۆو، لەشکرێکی یەکگرتوو بدەن و، خۆشیان دەستلەکاربکێشنەوە، هەتا پەرلەمانێك لەهەڵبژاردنێکی ئازاددا دێتە کایە، کەچی، کەوتوونەتە عێراقچێتیەکی خەستوخۆڵ و، بوختان و درۆو دەلەسەو قسەی ناشیرین، بەوانەی دژی هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقن، پێش یەکلاییکردنەوەی

کێشەی کەرکووک‌و مووسڵ‌و دیالەو کووت‌و، کێشەی لەملوێن پتری کوردی بەغداو کوردی دەرەوەی وڵات‌و کوردە فەیلییەکان‌و، دەفەرموون ئەوی، دژی هەڵبژاردن بێ "خاینە" یان نۆکەری بێگانەیە، وەك ئەوەی یەکێك لەئەندامەکانی "مەکتەبی سیاسی" پارتی، لەتەلەڤیزیۆنەکەیانەوە گوتی: ئەوانەی دژی هەڵبژاردن بن، یان "جاهیلن" یان "بێگانە فێری کردوون"و "ئەوانە نۆکەری بێگانەن". ئەرێ ئەمە ئەو دیمۆکراسی‌و ئازادیی بیروڕا دەربڕینەیە کە دوو زلحیزبەکە شەووڕۆژ دەهۆڵ لێدەدەن بۆی؟ وادیارە، هەموو پێموانەیەك لای وان پێچەوانەیە.
ئەوەی راستی بێ، کورد لەبەشداریکردنیان لەهەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقدا، هیچیان دەستناکەوێ ئەوە نەبێ کە رەوایەتیبدەن بەقسەی دوژمنەکانیان، کە کورد لەنێو عێراقدا، کە دەوڵەتێکی عەرەبییە "کەمینە"ن‌و، ئەمەش هەڵخلیسکانێکی رامیاریی وا سەختە کە کورد ملیاندەشکێ تێیدا. جا بۆ پووچکردنەوەی ئەم مەترسییە گەورەیە کە خۆی لەبەردەمی کورددا قوتکردووەتەوە، باشترین شت ئەوەیە، رۆژی هەڵبژاردن، ئەگەر هەڵبژاردن کرا، بکرێ بەرۆژی گشتپرسی (ریفراندۆم) بۆ وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە: "ئایا دەتەوێ، کوردستان سەربەخۆ بێ"؟ وەرام: "ئا"، یان "نا"و هیچی دی. ئەمەش کارێکە، نابێ دوابخرێ. چۆنکە هێندەك لەدەسەڵاتداران‌و قسەڕۆیشتووانی ئەمریکا هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی کە تڕەکەڵەکەی "یەکێتیی عێراق" سەرناگرێ‌و، بیر لە پارچە پارچە کردنی دەکەنەوە، بەڵام هێزێکی یەکگرتووی کوردی نییە کە پشتیببەستن پێی، لەبەر ئەوە دوو دڵن، نازانن رێبدەن بەدامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی، بەسەرکردیەتیی پارتی‌و یەکێتی، کە لەساڵی 1998ەوە بەڵێنیانداوە بە ئەمریکا، حکوومەتێکی یەکگرتوو لەڕێی پەرلەمانێکی هەڵبژێردراوەوە بخەنە سەرپێ‌و، ئەمە شەش ساڵە

نەیانکردووە، یان چرای کەسك نیشانی رژێمی ترك بدەن کە بکشێتە نێو باشووری کوردستان‌و، نیشانەی ئەمەش دەرکەوتووە، کە رژێمی ترك خۆی ئامادە کردووە بۆی‌و، ئەوەتە لەلایەکەوە بڕوبیانوو دەدۆزێتەوە بۆ دەستدرێژیکردن، وەك تۆمەتبارکردنی پارتی بەوەی دەستی هەبووە لەکوشتنی چوار ئەفسەری ترکدا؛ بێ ئەوەی ئەوەمان پێببێژێ، ئەم ئەفسەرانە چ کارێکیان بە مووسڵ بووە، یان ئەگەر ویستوویانە بچنە بەغدا، بۆچی بەفڕۆکە نەچوون؟ لەولاشەوە بڵند ئێجەفێتی دوژمن بەکورد، لەم رۆژانەدا چووەتە لای سێزەر، سەرکۆماری ترکان‌و پێیگوتووە کە دەبێ "لەشکری ترك باکووری عێراق داگیر بکا" ئەوجا، ئەگەر ئەم سیناریۆیە سەربگرێ، ئەوا دەبێ بێژین ئەو خەونەی کە کورد دیبیان، بەئازادی‌و رزگاربوونی بەشێکی کوردستانەوە، "هەر نیوەی راستدەرچووە". داخەکەم.. پەیکەری سەددامی ملهوڕ کەوت، بەڵام کورد لەشووەتییەکە، هەر نیوە گەنیوەکەی بەرکەوت.

بەرلین 2004/12/24

**میدیا**، ژ 177، 2004/12/30

# نامەیەکی خۆشەویستانە بەهۆی هەفتەنامەی "میدیا"وە، بۆ کاکە فەرهاد شاکیر مەجرووم

کاکە فەرهادی خۆشەویست، هەزاران سڵاو لە خۆت و لەگیانی مامە شاکیری باوکت بێ. نامە شیرینەکەت، کە لەژمارە (179)ی رۆژنامەی "میدیا"دا بڵاوکرابووەوە، یادێکی شیرینی پەنجا ساڵ لەمەوبەری، لەخەزێنەی بیرەوەریمدا هەژاند. یادی ئەو رۆژانەی کە میوانی ماڵی ئاوەدانی ئێوە بووم لە رەواندزی سەربەرز. یادی ئەو رۆژانەی کە هەرسێکمان، تۆو کاکە عەزیزی برامان، پێکەوە چووینە سەردانی شوێنەوارەکانی میرنشینی سۆران. ئەوەبوو، پاش ئەوە، مامۆستا رەفیق حیلمیش هاتە سەردانی ئێوە، هەر بۆ ئەم مەبەستە. هەر لەو هاوینەشدا بوو (هاوینی ساڵی 1956) کە لەگەڵ دوو هاوڕێی سەردەمی منداڵی و قوتابخانەم، شێخ ئەحمەد نەقیب و عەزیز محەممەدی برای ئەرکان، چووینە سەردانی شێخ مەحموودی کۆنە شای کوردستان لەداریکەلی. راستییەکەی، مامە شاکیر مەجرووم و مامۆستا رەفیق حیلمی، هەر لەسەردەمی شانشینی شێخ مەحموودەوە، هەردووکیان، دوو دۆستی نێزیکی باوکم بوون و، هەردووکیان منیان بە برازای خۆیان دادەنا، رەوانی هەر سێکیان شادبێ.

مامە شاکیر، بێجگە لەوەی کە کەشکۆڵێکی پڕو رازاوەی هۆنراوە نیشتمانییە بڵاو نەکراوەکان و بەسەرهاتە نەنووسراوەکانی سەردەمی شێخ مەحموود بوو، شارەزاییەکی باشی لە تەکنیکی دەزگەکانی پێوەندیکردندا هەبوو، کە ئەم لێزانییەی لەو کاتەوە وەدەستهێنابوو، کە لە لەشکری عوسمانیدا ئەفسەر بووبوو. لەبەر ئەوە کە شانشینی باشووری کوردستان دامەزرا، مامە شاکیر، لەپاڵ پێشمەرگەیەتیدا، وەزیری پۆستە و تەلگورافی کوردستان بوو. کە داگیرکەرانی عارەب، بەپشتگیریی هێزی

ئاسمانیی بەریتانیا پەلاماری دەوڵەتەکەی کوردستانیان دا، مامە شاکیر، دەزگەی تەلگورافناردنەکەی، ئەم چیاو ئەو چیا دەگویزایەوە. ئەمانە قسەی مامە شاکیر خۆی نەبووە، بەڵکو پیاوە کۆنەکان ئەمانەیان بۆ من دەگێڕایەوە. بەڵام تۆ ورە بزانە، کورد ئەوڕۆ لە کن خۆی، "دوو حکوومەتی" هەیە، ئایا، هیچ کامێکیان بیریان لەوە کردەوە، کەلاوە کۆنێك، شەقامێکی قیرتاو نەکراو، یان قوتابخانەیەکی بیٚ دەرگەو دیوار، بەنێوی شاکیر مەجروومەوە نێو بنێن؟ خۆ ئەگەر ئەوەش بکەن، ئەوا، مامە شاکیر، کە چووەتە دیوانی ئاهوڕامەزدا، هیچی پێنابڕیٚ، بەڵام پێزانین، تەنانەت پاش کۆچیدواییش، هەر بۆ کەسوکاری ئەو مرۆڤەی کە لەژیانیدا خزمەتی خەڵکی کردووە، خۆشە.

مامە شاکیر، لەپەنجاکاندا، جاروبار دەهاتە بەغداو، هەر جارێك کە بهاتایە لەدوکانەکەی بەشیر موشیر (ئوستاد) کە بووبوو بە یانەی بە یەکگەیشتنی کوردان لەبەغدا، چاومان بە یەکدەکەوت،و، گەلێك باس،و چیرۆکی رۆژانی فەرمانڕەواییی شێخ مەحموودی دەگێڕایەوە بۆم،و، لەنێو ئەو باسانەشدا، هێندەك لەو هۆنراوانەی کە هی ئەو زەمانە بوون،و هەموو جارێکیش تکای ئەوەمدەکرد لێی، کە ئەو شتانە بنووسێتەوە، بۆ ئەوەی، وەك بەشێکی گرنگ لەمێژووی کورد لەنێو نەچن. ئەو تکایەشم لە مامۆستا رەفیق حیلمی دەکرد. ئەوەبوو، ئەو، زنجیرەیەك پەرتۆکی لەژێر نێوی "یادداشت"دا بڵاوکردەوە، هیوام وایە کە مامە شاکیریش ئەو کارەی کردبیٚ،و، ئێوەش، رۆژیٚ لەرۆژان، بتوانن ئەو کەلەپۆرە بەنرخە بخەنە بەردەست خەڵکی ئەوڕۆی کوردستان.

وەك تۆی خۆشەویست،و برامان کاکە عەزیز، دەزانن، مامە شاکیر خۆی خەڵکی نێوچەی سلێمانی بوو، بەڵام داگیرکەرانی عێراقی،و پاڵپشتە ئینگلیزەکانیان، پاش رووخاندنی دەوڵەتی کوردستان، تەنگیان بە

باوكارانی شێخ مەحموود هەڵچنی بوو. مامە شاكیریش ناچار بووبوو سلێمانی بەجێبهێڵێ‌و، ڕەواندزیشی بۆیە هەڵبژاردبوو، وەك هەوارگەی خۆی، چۆنكە ئەو كاتە چەند سەركردەیەكی كوردپەروەری سەر بە بنەماڵەی شەمزینی لەوێ نیشتەجێبوون‌و، مێژوونووسی گەورەی كوردیش، داماوی موكریانی، بەخۆی‌و چاپخانەكەیەوە ڕووی كردبووە ئەوێ. مامە شاكیرو داماوی موكریانی لەوێ یەكیانگرتبوو بۆ خزمەتی كولتووری كوردو دەرهێنانی گۆڤاری "زاری كرمانجی".

شایانی گۆتنە، كە ئەو گەڕانەمان بەنێو شوێنەوارەكانی میرنشینی سۆراندا، بوو بەهەوێنی نووسینی ئەو باسەی كە لەكۆتاییی شەستەكاندا لەهەمبورگ، بەزمانی ئەڵمانی لەبارەی كەسایەتیی میری كۆرەوە نووسیومە، لەبەر ڕۆشنایی سەرچاوە ڕۆژهەڵاتی‌و ڕۆژاواییەكاندا، براو هاوبیری هێژام، فەخری سەلاحشۆر، كە یەكێكە لەدامەزرێنەرانی "ئەكادێمیای كوردی بۆ زانست‌و هونەر" لەسوێد لەنێوەڕاستی هەشتاكاندا، ئەو ئەركەی خستە سەر شانی خۆی‌و، كردی بەعەرەبی، كە بۆ جاری یەكەم لەهەولێر لەساڵی 1994دا چاپكرا، وەك بڵاوكراوەیەكی ئەكادێمیای كوردی بۆ زانست‌و هونەرو، جاری دووەمیش، ساڵی پار، لەلایەن بنكەی چاپەمەنیی "ئاراس"ەوە، چاپكرایەوە، ئەم چاپەی "ئاراس" بەبێ پرسكردن بە من بوو، كە ئەوەش كارێكی ناقانوونییەو، لەمەش خراپتر ئەوەیە كە پڕە لەهەڵەی زۆر سەخت‌و قێزەوەن. هەڵەكانیش هەر لەبەرگی پەرتۆكەكەوە دەستپێدەكەن. بۆ وێنە نێوی من وا دەنووسرێ Nebez كەچی ئەوان بە Nebes نووسیویانە. نێوی كاكە فەخریشیان هەر بە هەڵە نووسیبوو، لەباتی "سەلاحشۆر" نووسیویانە "سەلاحشۆڕ"! ئەز باوەڕ ناكەم، ئەمە لە نەزانینەوە بێ، واتە مرۆڤ هێندە نەزان بێ Nebezو Nebes لەیەك جیا نەكاتەوە؟ یان "سەلاحشۆڕ"و "سەلاحشۆر"، كە دوو

وشەی بەتەواوی پێچەوانەی یەکن؟ "سەلاحشۆڕ" بەڕێی قەڵەو (ڕ) بەکەسێك دەڵێن کە لەشەڕدا شکابێ‌و چەکەکەی شۆڕ کردبێتەوە. بەڵام "سەلاحشۆر" بەرێی سووك (ر) بەمانای "خاوەنی چەکی تیژە"، چۆنکە "شۆر" لەزمانی کوردیدا بەمانای "تیژ"و "توند" دێ. تەنانەت کە چێشتێکی شلە خوێی زۆر تێدا بێ، دەگوترێ "شۆر"ە، وشەی "سوێر"یش هەر لە "شۆر"ەوە وەرگیراوە. ئەم بابەتەشم لەسەمیناری "کوردو شۆرش" داخستووەتە بەرچاو، کە لەگەڵ چەند سەمینارێکی دیکە چەند ساڵێك لەمەوبەر لە لەندەن لەلایەن بنکەی "کوردنامە"وە چاپکراوە. ئەزموونی تاڵ‌و تفت‌و ناخۆشیی من، لەگەڵ بنکەی "ئاراس"دا کە بنکەیەکی بەڕێوەبەرێتیی هەولێرە، باسێکە بۆ خۆی‌و، جێی ئێرە نییەو، بەبۆنەی چاپکردنەوەی پەرتۆکی "کوردستان‌و شۆرشەکەی"یەوە، وەك پاشگۆتنێك دەیخەمە بەردەم ویژدانی نەتەوەی کورد.
ئێستە با بێینەوە سەر ئەو هۆنراوانەی کە لە مامە شاکیرم بیستبوو، کە ئەو ئەو دەمە لەبەریکردبوو، تا ئەو ئەندازەیەی کە بیری مابوو، یەکێك لەو هۆنراوانە، هۆنراوەیەك بوو کە لەرۆژی گەڕاندنەوەی شێخ مەحمووددا بوو لە هیندستانەوە بۆ سلێمانی، لەژێر گوشاری خەڵکی کوردستاندا، کە بەم جۆرەیـە:

ئەو شەمعی جەمعی عالەمەی، دوێنێ کۆژایەوە،
ئەمڕۆ بە لوتفی حەزرەتی حەق، هەڵکرایەوە.
هەی جەژنە، هەی شادمانییە، هەی تەرەبە،
سنجاقی فەتح‌و نوسرەتی کورد، هەڵکرایەوە.
ئەی مونکیران خەجاڵەتی دیوانی هەق دەبن،
ئەم جستوجۆو کەشاکەشە، بەسیە، بڕایەوە.

سەرنج: وەك مامە شاكیر دەیفەرموو، مەبەست لە "مونكیران" جلخوارەكان بووە، كە ویستوویانە، كوردستان سەربەخۆ نەبێ، بەڵكو هەروەك بەشێك لەدەوڵەتی عوسمانی بمێنێتەوە، بەڵام بەسەركردەیەتیی حیزبی "اتحادوترقی"ی جۆن تركەكان. دەبێ ئەوەش بزانین كە وشەی "جلخوار" كە دەمێكە ئاماژەم كردووە بۆی، لە "جلكی خوار"ەوە نەهاتووە، بەڵكو "جر" بەمانای "خوو رەوشت" دێ. لەهێندەك نێوچەی باكووردا دەبێژن "جرێ وی گەمارە" واتە رەوشتی خراپە. دیارە، وشەی "جڕت"یش پێوەندییەكی ریشەیی بەمەوە هەیە.
شایانی باسە، كە شێخ مەحموود، لەو سەردانەماندا كە لەمەوبەر باسمكردو، وتارێكم لەو بارەیەوە لە مانگنامەی "سمكۆ"دا، كە لە بەرلین دەردەچوو، بڵاوكردووەتەوە، فەرمووی "جلخوارەكان تاقمێك سەرسەری و بێناموس" بوون.
هۆنراوەیەكی دیكە لەبارەی ئەوەوەیە، كە جارێكیان ئەمین زەكی بەگ، پاش ئەوەی دەبێتە وەزیر، بەرپرسی كاربەدەستانی بەریتانیاو عێراق گەشتێكی كوردستان دەكاو هەوڵی ئەوە دەدا كە خەڵكەكە وا لێبكا داوای ئەوە بكەن كە خوێندن لەقوتابخانە سەرەتاییەكانیشدا، وەك نێوەندییەكان، ببێتە عارەبی، بەو بیانووەوە كە منداڵی كورد، زمانی خۆیان لەباوكو دایكیانەوە فێردەبن‌و لەدەستیاننا چێ، بەڵام ئەگەر لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بەكوردی بخوێنن، ئەوا تووشی گەلێك زەحمەت دەبن لە قوتابخانەی نێوەندی‌و قوتابخانە بەرزەكاندا، كە ئەو دەمە هەر لە بەغدا هەبوون‌و، بەزمانی عارەبی بوون. كە ئەمین زەكی دێتە سلێمانی‌و ئەو قسەیە دەكا، هۆنەرێك رادەپەڕێ‌و، ئەم هۆنراوەیەی خوارەوەی بۆ دەخوێنێتەوە. مامە شاكیر دەیفەرموو، ئەمین زەكی، مەلایەكی خەڵكی سلێمانی كە نێوەكەیم بەباشی نایەتەوە بیر، بەڵام.. كێ.. (م) سەفوەت

نێوێك بووە، لەگەڵ خۆیان دەبەنە هەڵەبجەو ئەویش لەخوتبەی هەینیدا، بە خەڵکەکە دەڵێ، زمان زمانی قورئانە، منداڵەکانتان لەزمانی قورئان بێبەش نەکەن.. هۆنراوەکە درێژە، هەر هێندەیم لەبیر ماوە:

تو خوا مەڵێن بە عارەبی با دەرز بڵێنەوە،

میللەت دڵی برینە، دیسان مەیکولێنەوە.

جوێبوونی قەومی ناوێ، کەسێ، لە حەمییەت جیا نەبێ،

داناکەوێ لە قەومی، کەسێك بێحەیا نەبێ.

وەڵلاهی، ئەو بەهەشتە کە کوردی تیا نەبێ،

بڕۆ نامەوێ، جەهەننەمی لێ پڕ، بەقینەوە.

لەبارەی مەلاکەشەوە ئەمە گوتراوە:

بردیانە هەڵەبجە، بە سەڵای جومعەوە دوێنێ،

ئاخ! قەترەی منداڵییە، کەوا قەترە دەتکێنێ،

نامەوێ کورد بێ، دەبڕۆ، با خوتبە بخوێنێ.

دەمەوێ ئەوەش بێژم کە لەبارەی خودێ لێخۆشبوو، ئەمین زەکی بەگەوە، شتێکی دیکەشم لە پەنجاکاندا لەبەغدا، بیستووە، ئەمەیان لە دوکتور نووری فەتووحی، کە لە بنەماڵەی خیرەومەندو بەرێزی کەریمی ئەلەکە بوو،و زۆر جار دەچووم بۆ "عەیادە"کەی لەشەقامی رەشید لە بەغدا، جارێکیان، باسی ناسیاوێکی خۆی گێڕایەوە بۆم، کە لەهەڵەبجە، لەسەر کوردایەتی تووشی دەردەسەری هاتبوو، دوکتور نووریش ئەوکاتە لەهەڵەبجە دوکتور بووبوو. دوکتور، ئامۆژگاری ناسیاوەکەی کردبوو کە بچێتە بەغدا بۆ لای ئەمین زەکی بەگ، بەنامەیەکی راسپێریی دوکتورەوە. کە ناسیاوەکەی لە بەغداوە گەڕابووەوە هەڵەبجە، بە دوکتۆری گوتبوو "کە چوومە لای ئەمین زەکی بەگو چیرۆکەکەم گێڕایەوە بۆی، دەستبەجێ تووڕە بوو لێمو گوتی: تۆ پێتوایە هەر تۆ کوردیت. تۆ دەبێ دەمی خۆت

بگریت‌و، چاوەڕوان بکەیت، هەتا ئینگلیزەکان دێنە سەر ئەوەی کە ڕێ بە دەستکەوتنی مافی کورد دەدەن. جارێ دەبێ بێدەنگ بیت‌و گوێڕایەڵیی حکوومەت بکەیت".

ئێستە دەبێ ئەوەش بڵێم، کە چەند جار لە خودێلێخۆشبوو، مامە عەلی کەمالم بیستووە، کە شێخ مەحموودو ئەمین زەکی، حەزیان لەچارەی یەکنەکردووە، لەبەر هەڵوێستی هەردوولایان بەرامبەر بەدەسەڵاتی بەریتانیا. لێرەدا دەبێ ئەوەشی بچێتە سەر، کە پەرتۆکەکەی ئەمین زەکی بەگ "خۆلاسەیەکی تەئریخی کوردو کوردستان" کە درێژەیەکی ئەو وتارەیە کە مینۆرسکی لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا بڵاویکردووەتەوەو، محەممەد عەلی عەونیش، گەلێك دارتاشیی وەستایانەی تێدا کردووە، هەر باسی مێژووی کورد دەکا، تا دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق‌و، وەك خۆشی لەسەرەتای پەرتۆکەکەدا دەبێژێ، بۆ ئەوەی دڵی کەس نەیەشێنێ.

لەکۆتاییدا دەمەوێ ئەوەش بە کورتی بخەمە بەرچاو، کە ئەم باسەو، گەلێك سەرنجی خۆم لەبارەی میتۆلۆژیای کوردییەوە، کە لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆم بوو، کاتی خۆی دام بە دوکتۆر عێزەدین مستەفا ڕەسووڵ، ئەوەش لەسەر داوای خۆی کە بیبا بۆ بەغداو، لەوێ، لەگۆڤارێك یان ڕۆژنامەیەکدا، وەك خۆی بڵاویبکاتەوە. بەڵام دوایی، وەك بۆم دەرکەوت، یەکێك هێندەك لەو شتانەی بەنێوی خۆیەوە بڵاوکردبووەوە، بەرامبەر بەم دزێتییە سەرم سووڕما. کە جارەکی دی چاوم بە عێزەددین کەوتەوە، دامەڕووی، ئەویش هەر هێندەی گوت "بەخوا... بڵێم چی!". لەبارەی لێکۆڵینەوەکانیشەوە کە دزرا بوون، گوتی" تۆ بڵێی (**توارد الخاطر**) نەبووبێ.

بەرلین 2005/2/12

**میدیا**، ژ 180، 2005/2/15

# باشووری کوردستان دوای هەڵبژاردن

(باشووری کوردستان دوای هەڵبژاردن) ناونیشانی ئێوارە کۆڕێك بوو کە لەلایەن زاناو پرۆفیسۆرو دامەزرێنەری بیری نەتەوەیی کورد، دکتۆر (جەمال نەبەز)ەوە لە شاری بەرلین لەهۆڵی مەڵبەندی ئاوەدانی لەبەرواری 2005/2/16 ڕۆژی چوارشەممە کاتژمێر 17.30 بەئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە کەسێتی کوردپەروەرو ئەکادیمی پێشکەش کرا. لەبەر گرنگی سیمینارەکە بەپێویستم زانی کە خوێنەرانی هێژاش لە بیروڕاکانی ئەم (بیریار- مفکر)ەی کورد بەئاگا بن.

ڕەنگە پێویست نەبێت تیشك بخرێتە سەر ناسینی کەسێتی زانای کورد جەمال نەبەز، چونکە ئەو لای زۆربەی خوێنەران و ڕامیاریکارانی کورد، ناسراوە بەوەی گەنجینەیەکی بەنرخ و پڕ بەهایە بۆ بیری نەتەوەیی کوردو هاوکات لەبواری زمانەوانیشدا جێدەستی خۆی نەخشاندوە بەئاستێك کە نووسراوەکانی وەك سەرچاوە بەکاردەهێنرێن بۆ تۆکمە کردنی هەر ئارتیکلێك کە پەیوەندیداربن پێوەی.

ئەم مرۆڤە هەموو تاڵەمووەکانی سەری، لەخەمی بێکەسیی نەتەوەی کوردو دۆزی کورددا سپی کردووە، خاوێنترین رابوردووی هەیەو لەخانەی هیچ گروپ و ڕێکخراوێکی ڕامیاریدا نییەو بەرژەوەندی باڵای نەتەوەی کورد ئامانجی ئەوە بێ جیاوازی پارچەکانی کوردستان، بۆیە پێموایە کە شیاوترین کەسە بۆ سەرۆکایەتی کوردستان، یان دەوڵەتی کوردی، دکتۆر نەبەز بێت، نەك کەسانێك کە بازرگانی بە ئەنفال و هەڵەبجەی جوانەمەرگ و.. دەکەن، نەك ئەوانەی پەراسووی پێشمەرگەیان کردووە بە پەیژەو بۆ بەرژەوەندیی خۆیان پیایدا سەردەکەون، نەك کەسانی ناحاڵی و نەخوێندەوار، کۆمەڵگەی کوردی بە بەرخەل، یان مێگەل دەزانن و سوکایەتییان پێدەکەن.

**تەوەرەکانی ئەم سیمینارە:**

1-ئەگەر کورد لەپرۆسەی هەڵبژاردنەکەی عێراقدا بەشدار نەبووایە، چی دەبوو؟

2-ئایا ئەم هەڵبژاردنە کێ کردی؟ کورد، عێراق، یان ئەمریکا؟

3-ئایا ئەم هەڵبژاردنە، تا چەند رەوایەتی دەدات بەدوو پارتە باڵادەستەکەی باشوری کوردستان واتە (ی.ن.ك)و (پ.د.ك)؟
4-ئایا دوای هەڵبژاردنەکە، دوو زلحیزبەکە، هەر لەسەر هەمان داخوازی فیدرالیزم دەمێننەوە یان ملکەچی خواستی کۆمەلانی خەڵك دەبن کە بەپێی ریفراندومەکە 98٪ی کورد داوای سەربەخۆیی کرووە؟
5-ئەگەر دەنگی نزیکەی دوو ملیۆن کورد بۆ سەربەخۆیی پشتگوێ بخرێت، تا چەند ئەو دوو زلحیزبە رەوایەتی دەدەن بە فیدرالیزمو رێز لە ریفراندۆمەکە ناگرن؟
6-ئایا دەنگدان بۆ عێراق وەك عێراقی، کۆکە لەگەڵ دەنگدان بۆ سەربەخۆیی؟
7-ئەگەر داخوازییەکانی دووزلحیزبەکە جێبەجێ نەکران، ئەمریکاش زۆری بۆ هێنانو شیعەو سوننەی رازیکرد، ئایا ئەو دوو زلحیزبە چی دەکەنو ئەلتەرناتیڤیان چییە؟
8-ئایا بەراست ئەو دوو زلحیزبە بەتەمان ئیدارەکانیان بکەنەوە بەیەك؟ ئەگەر نەیانکردەوە بەیەك، چۆن دەتوانن کێشەی کەرکوكو بەڵێنەکانی تریان جێبەجێ بکەن؟
9-ئایا پرۆگرامو پلانی ئەوان دوای کشانەوەی هێزەکانی هاوپەیمانان چییە؟
10-ئایا ئەگەر ملکەچ بینو داخوازییەکانمان نەیەنە دی، نابێتە هۆی ملکەچکردنێکی (تنازل)ی دیکەیش؟

**پوختەی ئاخافتنی مامۆستا جەمال نەبەز:**

بەشداریکردنی کورد لەپرۆسەی هەڵبژاردن، واتە بەعێراقیبوونی کورد، واتە دروستکردنەوەی ئەو زیندانەی جینۆسایدی کوردی تیاکرا، واتە ئەگەری دووبارەبوونەوەی ئەزموونی تاڵی (85) ساڵ لەمەوبەر لەئەنفالو کیمیابارانو گۆڕی بەکۆمەڵو... کارەساتەکانی دیکە.

هەڵبژاردن راست نەبوو، بەڵکو ریفراندۆم (راپرسی- گشتپرسی) راست بوو کە پێش (15) ساڵ لەلایەن (کۆنگرەی نیشتمانی کوردستان)ەوە لە لەندەن ساڵی

(1998) بەکۆی دەنگ بڕیاری لەسەر درا، کە نزیکەی (500) کەسێتی کورد بەشداری تیاکردبوو.
ئەم بەڕێزانە دامەزرێنەری بیرۆکەی پرۆسەی گشتپرسی بوون: د.جەوادی مەلا، پرۆفیسۆر حەمە ساڵح گابوری، د.عەزیز ئاکرەیی، لەتیف مەریوانی، پاشان وەك پرۆژە خرایە بەردەم (مام جەلال و کاك مەسعود) بەڵام مەخابن، ئەوان پەراوێزیان خست و بەهەند وەریان نەگرت.
دەبوایە کورد بەبێ بەرامبەر بەشداری هەڵبژاردنەکەی نەکردایە، چونکە هیچ گەرەنتییەك نییە بۆ گەڕانەوەی ناوچەکانی دیکەی کوردستان بۆ ژێر دەسەڵاتی کوردی، ئەمریکا زۆر پێویستی بەکورد هەبوو، چونکە عەرەبی سوننەی عێراق بایکۆتی پرۆسەکەی کردبوو، ئەگەر کوردیش بایکۆتی بکردایە، ئەوسا ئەمریکا لەئاستی رای گشتی و پراکتیزەکردنی دیموکراتی دۆڕاو دەبوو، بۆیە ئەگەر کورد هەر مەرجێکی لەسەر ئەمریکا هەبووایە، ئەمریکا قبوڵی دەکرد، بەڵام مەخابن تائێستاش جەوهەری کێشەکان هەر بەهەڵواسراوی ماونەتەوەو کوردیش بەدەستی خۆی، خۆی کرد بەعێراقی.
ئەز زۆر پشتگیری هەڤاڵبەندێتیی ئەمریکا دەکەم، بەڵام ئێمەی نەتەوەیەکی بندەست، دەبوو بزانین چۆن ئەم هەڤاڵبەندییە بکەین، ئەمریکا ساڵانی ساڵ هەڤاڵبەندی سەددام بوو، هاوکات دژی خواستەکانی کوردیش بوو، تائێستا هیچ کەسێك ئەو دێکومێنتانەی نەدیوە کە لەنێوان کوردو ئەمریکاو ئینگلیزدا واژوو (ئیمزا) کراوە بۆ کارپێکردنی بەندی (58) بۆ بنبڕکردنی کێشەی ناوچە بەعەرەبکراوەکانی کوردستان.
لەڕاستیدا ئەمریکاو شیعەی عێراق پێویستیان بەهەڵبژاردن بوو، فاکتۆرەکانیشی ئاشکران، ئەوانەی بەرژەوەندیان هەبوو لەگەڵ سەددامدا بەتایبەتی فەرەنساو ئەڵمانیا، دژی لێدانی سەددام بوون، بۆیە حەزیان نەدەکرد ئەمریکا سەرکەوتوو بێت، ئەمریکا لەڕووی سەربازییەوە سەرکەتوو بوو، بەڵام پێویستیشی بەم هەڵبژاردنە هەبوو تا رەوایەتی بداتە عێراق و بەڕای گشتی بڵێت: ئەوەتا دیموکراتییەت هەیە.

شیعەکان (سیستانی ئێرانی) لەگەڵ ئەمریکا ڕێك بوون، ئەمانە (مەرجەعییەت)یان هەیە، (مجتهد) بیردەکاتەوەو دەنووسێت، (مقلد)یش جێبەجێی دەکات. مەرجەعییەت بڕیاردەری یەکەمو کۆتاییە، کە بەپێی پرەنسیپی ویلایەتی فەقیە. لەزەمانی فەتاح عەلی شا، کابرایەکی ئاخوند (مەلا) کە بە مەراغی ناویان دەبرد، وتی شیعەکان زارۆکن (صغیر)ن پێویستیان بە دەمڕاست هەیە، ئیتر ئەو دەمڕاستە هەرچی بڵێت، دەبێت دەمودەست پراکتیزە بکرێت.

هەرچەند ئەمان بەئاشکرا ئەمە ناڵێن، بەڵام دەخوازن دینی ئیسلام لەدەستوری هەمیشەییدا بەشی شێری بەرکەوێتو نایەنەوێت دین لەدەوڵەت جیابکەنەوە، (عەلمانییەت- سیکولاریزم) ڕەتدەکەنەوە، ئەوان ئێستاش زنجیر لەخۆدانەکەی (1400) ساڵ بەر لەئێستا دەمەزەرد دەکەنەوە، بۆیە ئەگەر شیعەکان لەگەڵ سوننییەکان ڕێکبکەون، دەبێت ئێمە فاتیحە بۆ سیکولاریزم بخوێنین.

لەم پرۆسەیەدا (هەڵبژاردن) تەنیا شیعە براوەیە، چونکە هەموو کاتێك دەتوانن بەبێ کورد حکومەتی خۆیان دروستبکەنو ئەوانی دیکە بە ئۆپۆزسیۆن دەمێننەوە.

ئەوەی مەخابنە زۆربەی (دیان- فەللە- مەسیحی)ەکان دەنگیان بۆ کورد نەدابوو، لەکاتێکدا ئەوان لەسایەی کوردەوە دەستکەوتی چاکیان هەبووەو، هەرکاتێك لێیان قەومابێت پەنایان بۆ کوردستان هێناوەو کوردیش زۆر ڕێزیان لێگرتوون، تێناگەم بۆ؟ ڕەنگە پەیوەندی بەڕۆشنکاری کوردییەوە هەبێت، چونکە کورد ڕۆشنکاری کەمە.

گەرچی کەم نین ئەوانەی گەشبینن بە ئەنجامەکانی دەنگدانەکە، بەڵام دواڕۆژ گرنگە، مەرج نییە هەمیشە ژمارەی زۆر ڕاست بکەن، یان لەسەر هەق بن. ئەز (45) ساڵ لەمەوبەر دەموت ڕوسیا دەوڵەتێکی سۆسیالیستی نییە چونکە سۆسیالیزم واتە ئازادیو یەکسانی، بەڵام ڕوسیا دژی داخوزییەکانی کورد بوو. ئەوانەی دژم وەستابونەوەو لەگەڵم کۆك نەبوون، ئێستا پێمدەڵێن تۆ ڕاستت کرد. بەڵام پاش باران کەپەنك.

دەبێت ئێمە بزانین چی دەکەین، ئەگەر فیدرالیزمیش وەربگرین، مافت نابێت بەعەرەبێك بڵێیت لەسلێمانی دانەنیشێت، چۆنکە (سلێمانیش) هەر عێراقە، تەنانەت ئەوەی لەیاسای کاتیدا باسکراوە کە (کوردیو عەرەبی) دووزمانی فەرمین لەعێراقدا، زۆر خراپە، چونکە کە عەرەبەکان بەژمارەیەکی زۆر لەکوردستان نیشتەجێبوون، ئەوکاتە بەزمانی عەرەبی خوێندنگایان بۆ دەکرێتەوەو ناسنامەی کوردی شارەکە بەرەو کاڵ بوونەوە دەچێت، (150) ساڵ بەر لەئێستا لە تەورێز یان بەعقوبە زمانی کوردی بەکارهاتووە، بەڵام ئێستا وانەماوە.

ئەوەی کرا لەلایەن دوو زلپارتەکەوە بۆ پرۆسەی هەڵبژاردنەکانی کوردستان، دیموکراتیانە نەبوو، لیستۆکراتیانە بوو، چونکە دەبوو هەر پارتەو بەتەنیا بەشداری هەڵبژاردنەکانی بکردایە نەك پێشوەخت هەموویان لەناوخۆیاندا دابەشکردبا، جگە لەمەش لەناو لیستەکاندا سیخوڕو کۆنە خۆفرۆش هەن ئیتر چۆن بتوانین ڕەوایەتی بدەینێ، یان لێپرسینەوەی توندوتیژ لەگەڵ خەڵکدا کراوە لەسەر ئەوەی بۆچی دەنگی بۆ فلان داوە، یان بۆچی دەنگی نەداوە، بێنەوەی بزانن، دەنگدان مافە، نەك ئەرك.

ئەوەی زۆر جێی سەرسوڕمانە، لەیەك کاتدا دەنگ بۆ سەربەخۆیی کوردستانو بۆ عێراقیش دراوە، ئەمە هیچ کاتێك لەگەڵ یەك کۆك نینو یەکناگرنەوە. 98٪ی دەنگدەرانی کورد بۆ سەربەخۆیی کوردستان دەنگیان داوە، لەکاتێکدا دوو پارتە باڵادەستەکە سوورن لەسەر فیدرالیزم کە خواستی شەقامی کوردی نییە. ئیتر نازانم چۆن ئەمە بەڕەوا دادەنرێت؟

دەبێت خۆمان لەخۆمان بپرسین، ئەگەر نزیکەی دوو ملیۆن کورد سەربەخۆییان بوێت، چۆن ڕەوایە سەرانی ئێمە لەسەر فیدرالیزم سووربن؟

ئەگەر مام جەلالیش سەرۆکی عێراق بێت، ناتوانێت وەك کوردێك بدوێت، هەروەك چۆن دەبینین هۆشیار زێباری وەك عێراقییەك کار بۆ عێراقی عەرەب دەکات، ئاواش مام جەلال یان هەر کوردێکی دیکە پێویستە لەخزمەتی عێراقدابێت کە 75٪ی عەرەبە، ئەگەرنا هیچ ڕۆڵێکی دیکە نابینێت بۆ کورد.

ئەوەی زۆر هەستیارو گرنگە ئەوەیە کە ئەگەر کورد داخوازییەکانی نەهاتەدیو ئەمریکا لەگەڵ سوننەو شیعە رێکبکەوێت، کورد هیچ ئەلتەرناتیفێکی پێ نییە؛ کورد هەرگیز پلانی بۆ دواڕۆژ نییە، هەروەك چۆن بۆ هەرەسەکەی 1975 هیچ بیرێکمان لە ئەگەرەکانی نەکردبووەوە، کوردی کلۆڵیش بەودەردەچوو کەچوو، بەدووری نازانم کە ئەمریکا پشت لە کورد بکات، من پێش ساڵێك ئەمەم وتبوو کە رەنگە ئەمریکا پێویستی بە شیعە هەبێت بۆ چاوسورکردنەوەی دراوسێ سوننیەکانو شەقکردنی شیعەکانی ئێران، چونکە ئەمریکا بەرژەوەندییەکانی بە ملیگرام دەپێوێت، لەکوێداو کەیو لەگەڵ کێ بەرژەوەندی زیاتری هەبێت، روو لەو دەکات.

ئێمە کاتێك دەتوانین مەرجی خۆمان بسەپێنین کە ماڵی خۆمان یەکخەین، کورد سەرۆکێکی نەتەوەیی نییە، من بەگومانم لەوەی ئەم دوو ئیدارەیە یەکخرێن. چەند ساڵە لە میدیاکانیانەوە دەڵێن دەیکەیەن بە یەك، کەچی هەر نەیانکرد، یان دەڵێن چەند وەزارەتێك لەماوەی چوارمانگی تردا دەبنەوە بەیەك. ئێستاش لەسلێمانی ئالأی عێراق (کە سوورە بەخوێنی کورد) دەشەکێتەوە کەچی لەهەولێر نییە، ئەمە ناتەبایی دەگەیێنێت، کەواتە هێشتا کۆك نین. من چەندین جار بە (مام جەلالو کاك مەسعود)م وتووە کە دەبێت یەکێکتان سەرۆك بنو ئالأکە بە یەکێکتان بێتو دان بەیەکتردا بنێن، مەخابن هێشتا ئەم هەنگاوە چارەنووسسازانە نەنراون.

ئەگەر ئەوان نەتوانن حکومەتێك دروست بکەن، ئەی چۆن دەتوانن کێشەکانی کەرکووكو کووتو موسڵو... چارەسەر بکەن.

جارێکیان دکتۆر جەوادی مەلا لە لەندەن گلەییەکی زۆر لە کاربەدەستێکی باڵای ئینگلیز دەکاتو پێیدەڵێت: ئێمەی کورد هەڤاڵبەندی ئێوەین، کەچی هێشتا هەر دژمان دەوەستنو ناهێڵن کەرکووكو ناوچەکانی دیکە بخرێنەوە سەر سنوری کوردستان، ئەویش پێیدەڵێت باشە بیخەینە سەر کام کوردستان هی تاڵەبانی، یان بارزانی؟ ئەویش پێیدەڵێت گرنگ نییە کامیان بێت، گرنگ ئەوەیە بخرێتەوە

سەر کوردستان. بێگومان ئەمە خاڵی لاوازی ئێمەیە، بۆیە پێویستە دەستبەجێ چارەسەری بکەین.

پێویستە کورد لەشکرێکی چارەکە ملیۆنی هەبێتو لەژێر یەك ئاڵاو یەك فرمان، پارێزەری سنوورەکانی کوردستان بن‌و، یەك سەرۆکمان هەبێت کە نوێنەری گەلی کوردستان بێت.

دراوسێکان دەیانەوێت لەگەڵ عەرەبی عێراقدا رێکبکەون، حکومەتێك دابمەزرێنن کە بە دڵی ئەوان بێت، چۆنکە ئەوان هەمیشەو هەمیشە لەئاستی کێشەی کوردو دژ بەکورد هاوهەڵوێست بوون‌و دەبن.

لەماتماتیکدا، ئەگەر لەهەنگاوی یەکەمدا هەڵەت کرد، ئیتر هەنگاوەکانی تریش بەدوای یەکدا ئەنجامێکی هەڵەی دەبێت، لەسیاسەتیشدا بەهەمان شێوە، بۆیە کورد هەر لەسەرەتاوە دەبووایە هەرزانفرۆش نەبووایەو واژۆ (ئیمزا)یان بۆ دروست کردنەوەی عێراق‌و لکاندنەوەی باشووری کوردستان نەکردایەو هەرزوو ماڵی خۆمان بکردایە بەیەك‌و خاوەنی یەك وتاری رامیاری بووینایەو، نوێنەری راستەقینەی کورد بەناوی کوردەوە کاری دبلۆماتی بکردایە، نەك بەناوی حزبەوە.

رایسی وەزیری دەرەوەی ئەمریکا وتی: "دوارۆژی کەرکووك عێراقییەکان بڕیاری لەسەر دەدەن"، منیش دەڵێم عێراقییەکان کێن؟ وەڵام: 75٪ی عەرەبن، بەو پێیەش ئەستەمە ئەوان بڕیارێك بدەن بۆ کورد باش بێت. من لەدواڕۆژی باشووری کوردستان رەشبین‌و بێئومێدم.

ئەگەر ئەمجارە لێمان قەوما، هەستانەوەمان ئاسان نییە، وەك جارانیش دراوسێکان کەمپمان بۆ ناکەنەوە، بەڵام ئەمریکا کە جەنگی ڤێتنامیشی دۆڕاند، ئەمریکا هەر ئەمریکا مایەوە. ئەڵمانیا دوو جەنگی دۆڕاندووە، کەچی وڵاتەکەی زۆر ئاوەدانە، بۆ؟ چونکە ئەوانە زلهێزن، بەڵام کورد چی هەیە؟

کورد لەبەردەم دووڕیانێکی زۆر زەحمەتدایە، دەبێت نووسەران‌و رۆشنبیرانی کورد زۆر وردو وریایانە بیر لە دواڕۆژو پێشهاتەکان بکەنەوە، هەر نەتەوەیەك، رۆشنبیرەکانی هەلپەرست بن، ناتوانێت بەئامانج بگات.

کاتێك لە تەلەفزیۆنەکانی کوردستانەوە، دەمبیست دەیانوت: هەرچی دەنگ نەدات خائینە، ئەز پێکەنینم دەهات، چۆنکە باش دەزانم کە ئەز خائین نیم. سیستانی وتی: دەنگدان تەکلیفێکی شەرعییە، واتە پێویستە بکرێت، کەچی مەلا سوننیەکان وتیان: هەرچی دەنگ بدات کافرە. ئیتر ئەی کوردی قووڕبەسەر، دەنگ بدەی هەر کافری، نەیدەی هەر کافری.

جەزا چنگیانی لەسەر کۆمەڵگەی خۆرهەڵاتی ناوین وتارێکی زۆر جوانی هەیە، ناوی ناون کۆمەڵگەی مێگەل، واتە شوانەکە، سەرۆك خێڵەکە، سەرۆکەکەیان چ فرمانێك بدات، ئەوان دەیکەن بێ بیرکردنەوە لەئاکامەکانی، جا، کۆمەڵگەی ئێمەش بەداخەوە لەو جۆرانەن.

لەکۆتاییدا، ئامادەبووان داوای ئەلتەرناتیڤیان بۆ ئەو رەوشەی ئێستا لە بەڕێزی کرد، ئەویش بە کۆنکرێتی وتی: هەرچەندە هەلی زۆرمان لەدەست داوەو هەڵەی زۆر قەبەشمان کردووە، بەڵام وەك کیسنجەر وتی پێویستە کورد گەرەنتی ئەوەی هەبێت، کە دەوڵەتێك بۆ خۆی دروست بکات، تا ئەوەی دەستمان کەوتووە، بیانپارێزین‌و لەدەستمان نەچن، ئەوەش بە لەشکرێکی یەکگرتووی گۆشکراو بەبیری نەتەوەیی، سەرکردەیەکی نەتەوەیی، جیاکردنەوەی سنوور، حکومەتێکی یەکگرتوو کە هەموو پارتەکان تیایدا بەشداربن.

هیوای سەرکەوتن‌و سەرفرازی بۆ نەتەوەی کورد دەخوازم‌و هیوادارم دەوڵەتی کوردی بەچاوی خۆم ببینم‌و هەمووان تیایدا ئازادو سەرفرازو یەکســـان بین لە ماف‌و ئەرکەکانماندا.

asokurd@web.de

## میدیا، ژ 181، 2005/3/1

## ئاسۆ حەمە سالح- بەرلین

سرنج: ئەم وتارە لە لایەن نووسەر بەڕێز ئاسۆ حەمە سالح ەوە نووسراوە لە بارەی کۆڕێکەوە کە لە رۆژی 2005/2/16 دا بۆ جەمال نەبەز لە بەرلین بەستراوە. وتارەکەی جەمال نەبەز بەدەمی پێشکێشکراوە و لە سەر کاغەز نە نووسراوەتەوە.

## ساڵیادی "میدیا"و چەند سەرنجێکی پێویست

# وڵاتی بێڕەخنەگر وڵاتێکی نادیمۆکراسییە

لەگەڵ پێچدانی خولی وەرزو، شکانی بڕبڕەی پشتی سەرماو سۆڵەی نەفرینی زستانو، گەڕانەوەی سەردەمی هەتاوو گوڵو نەورۆزو بەهار، ساڵیادی "میدیا"ش دێتە پێشەوە. بەم بۆنەیەوە پیرۆزبایی لە نووسەرانو چاپکەرانو خوێنەرەوەکانی "میدیا" دەکەم، بەتایبەتی لە هاوبیری خەباتکارو رۆشنبیرو چالاک، ئاکۆ محەممەد، کە هەرچەندە "میدیا" لەپێشدا، "دوو هەفتەنامە"و، ئێستەش بووەتە "هەفتەنامە"و، هێشتا نەبووەتە "رۆژنامە"، تاکو هەموو رۆژێك هەواڵو دەنگوباس بە گەرموگوڕی پێشکێشبکا، لەگەڵ ئەوەشدا، توانیوێتی "میدیا" بەگەلێك بابەتی باڵکێش بڕازێنێتەوەو، سەرەڕای ئەو سنوورەی کە لەلایەن کاربەدەستانی تەنگەتیلکەوە بۆ راگەیاندن کێشراوە، توانیوێتی، ئازایانە، پەنجەی رەخنەو گلەیی بخاتە سەر گەلێك لە کەموکورتیەکانی کۆمەڵگەو، هەڵوێستی نابەرپرسیارانەی کاربەدەستان بخاتەڕوو.

بێگومان، لەوڵاتێکدا کە رەخنەگر نەبوو، یان رەخنەگر هەبوو، بەڵام بۆی نەبوو، یان نەیوێرا، بیروڕای خۆی بەزمان، یان بەنووسین بخاتەڕوو، یان، زاتی ئەوەیکرد کە پێچەوانە بوەستیو، پەردە لە گەندەڵییەکان لابدا، بەڵام کەوتە بەرگێژاوی لێپرسینەوەو هەڕەشەو گوڕەشەو نانبڕین، یان، مەترسیی گرتنو ئازاردانو کوشتن، ئەوا، لەو وڵاتەدا دیمۆکراسی، بوونی نییە، چۆنکە دیمۆکراسی بریتییە لە بوونی رەخنەگر لەرژێمی فەرمانڕەواو، بوونی بواری گۆڕینی فەرمانڕەوا، لەڕێی هەڵبژاردنی ئازادەوە، ئەوجا، لەبەر ئەوەی داوو دەزگەکانی راگەیاندنی گشتیی، وەك رۆژنامەو رادیۆو تەلەفیزیۆن، رۆڵێکی بنچینەیی دەگێڕن لە دروستکردنو

کارتێکردن‌و پەرەپێدانی بیروڕای گشتیدا، دیارە، ڕۆژنامەو رادیۆو تەلەفیزیۆنی ئازاد، دەبنە ئامانجی دەستلێوەشاندنی رژێمە نادیمۆکراسییە ملهۆڕەکان‌و، ئەو دەمە، رۆژ دەبێتە رۆژی هەلپەرست‌و خۆبڕێن‌و خاوەنانی زمان‌و قەڵەمی بەکرێگیراو، دەزگەکانی راگەیاندنیش دەبنە گۆڕەپانی بەشانوباڵ هەڵدانی ئەم زۆردارو ئەو ملهۆر.

ئەگەر سەرنجێکی سەرپێیی لەو داوودەزگە راگەیەنەرانە بگرین، کە بەهی کورد دەدرێنە قەڵەم، دەبینین، هەموویان بەپارەی کورد بەڕێوە دەچن، بەڵام هیچ کامێکیان سەربەخۆ نین‌و، دەنگی رەخنەگری کورد راناگەیەنن، بەڵکو هەریەکەیان رێبازی حیزبێك، یان دەسەڵاتێك دەنوێنێ‌و، زۆربەی بەرنامەکانیان کات بەفیڕۆدانەو پارە لەبەردردانە. وەرن، هەر بۆ نموونە، تەماشایەکی هەر سێ تەلەفیزیۆنە کوردییەکە "کوردسات"و "کوردستان تی ڤی"و "رۆژ" بکەن، کە هەریەکەیان ئۆرگانی حیزبێکەو پرۆپاگەندە هەر بۆ ئەو حیزبە دەکا. خۆ ئەگەر جاروبار، بەرنامەیەکی "زیندی" دابنێن‌و، یەکێك لەدەرەوەی بازنەی حیزب تەلەفۆنێك بکا، ئەوا پێشکێشکەری بەرنامە، ئەگەر زانی، ئەو کەسە رەخنەگرەو قسە لەڕووە، ئەوا دەفەرموێ، "تەلەفۆنەکە پچڕا"، یان دەنگەکە ناگاتە گوێگر. خۆ ئەگەر ئەو کەسەی نەناسی‌و، ئەو کەسەش هێندەك شتی گوت، کە بۆ حیزبی دەسەڵاتدار قووتنەدرا، ئەوا، دەفەرمووێ: "کاکە، کات نەماوەو زۆر سوپاست دەکەین"و یا ئەو حەلە فەرمایشتەکەی بە تەرسەقول پێدەبڕێت‌و، تەلەفۆنەکە بەڕوویدا دادەخاتەوە.

راستییەکەی ئەوەیە، کاربەدەستانی حیزبەکان نایانەوێ گوێیان لە رەخنە بێ، چونکە هەموو جۆرە رەخنەیەك بە دوژمنایەتیدەزانن، ئەمە لەکاتێکدا کە هێندەك رەخنە هەن، لەدڵی پاگژەوە دێنە دەرەوەو، پێڕەویکردنیان بە سووتی گەل‌و ئەو حیزبانە خۆشیان تەواو دەبێ. کاربەدەستانی

حیزبەکان، هەموو رەخنەیەك بە بوومەلەرزەیەك دەبینن کە جێی کورسییەکانیان شلۆق دەکا. کاربەدەستانی حیزبەکان، خۆیان لە هەموو کەسێك بەزاناترو، لە هەموو مەیدانێکیشدا خۆیان بە "ئاشوەستا" دەزانن. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کاربەدەستانی حیزبەکان، راستە، هەموو سیاسەتکارن، بەلاّم سیاسەتزان نین، سیاسەتکاری‌و سیاسەتزانی دوو شتی زۆر جیاوازن لەیەك، هەر کەسێك پارەی هەبوو و، توانی ئۆتۆمۆبێلێك بکڕێ، مانای ئەوە نییە دەتوانێ ئۆتۆمۆبێلەکە بهاژوێ، بەڵکو دەبێ جارێ فێری هاژۆتن بێ‌و ببێتە هاژۆر (سائق). سیاسەتکاریش دەبێ خۆی فێری هەڵسوکەوتی سیاسەتزانانە بکا، ئەوجا دەبێتە سیاسەتکارێکی سەرکەوتوو. کەس لەپڕێ نابێتە کوڕێ. ئەگەر سیاسەتکارانی کورد، سیاسەتزان بوونایە، ساڵانی ساڵ شەڕیان بەیەك نەدەفرۆشت‌و، دەستیاننەدەچووە خوێنی یەکدی، بەڵکو لەگەڵ یەك رێکدەکەوتن‌و، لەباتی دوو حکوومەت‌و دوو لەشکرو دوو جۆر ئالاّو دوو مەسرەف‌و دوو سەرکردەیەتی، یەك حکوومەت‌و یەك لەشکرو یەك ئالاّی نیشتمانی‌و یەك مەسرەف‌و یەك سەرکردەیەتییان دەبوو. ئەگەر سیاسەتکارانی کورد سیاسەتزان بوونایە، لەو دەرفەتە مێژووییەدا کە بۆ کورد هاتە پێشەوە، کورد بوونە هاڤالبەندی ئەمریکاو، دەوڵەتی عێراق لە گرێژەنە دەرچوو،و بەجارێك هەرەسی هێنا، باسی فیدەرالی‌و میدراڵییان نەدەکردو، بێ هیچ مەرج‌و پەیمانێك نەدەچوون، دەوڵەتی عێراق سەرلەنوێ دابمەزرێننەوەو بیشیکەنەوە ئەندامی "جامعه الدول العربیه"و، ئەوجا بچن دەست لەوانە پان بکەنەوە، کە تا دوێنێ بوو، ئەوان دەستیان لە کورد پاندەکردەوە. ئەگەر سیاسەتکارانی کورد سیاسەتزان بوونایە، هەر دەستبەجێ ستراتیژی خۆیان دەگۆڕی‌و لەگەڵ سەردەمی نوێدا دەیانگونجاندو، یەکسەر داوای مافی بڕیاری چارەنووس‌و گشتپرسی‌و

سەربەخۆییی کوردستانیان دەکرد، ئەوجا با ئەو مافەش لەو رۆژەدا دەستنەکەوتایە، بەڵام ماف هەر مافەو، تۆش کە مافت هەبوو، دەبێ داوایبکەیت، دەتدرێتێ، یان ناتدرێتێ، ئەوە بابەتێکی دیکەیە. ئەگەر سیاسەتکارانی کورد سیاسەتزان بوونایە، هیچ کاروبارێکیان بە دزەخونجێنەو لەخەڵك شاردنەوە نەدەکردو، داوای یارمەتییان لەشارەزایان دەکردو، ئەو دەمە، نەدەچوون، ئەو قانوونە سەرو پێ شکاوەی کە پێی دەبێژن "قانون الادارە المؤقتە" ئیمزا بکەن، بەڵکو دەیاندایە دەست ژمارەیەك لە قانوونزانو لێزانو، ئەو حەلە بە جۆرێك دەستکاریدەکرا، کە ئەورۆ هیچ بڕوبیانوویەك بۆ ناحەزو نەیار نەدەمایەوە. چۆنکە ئێستە، ناحەزو نەیار دەتوانن، هەر بەپێی ئەو قانوونە، پێی کورد بخەنە پێوەندەوە. ئەگەر سیاسەتکارانی کورد سیاسەتزان بوونایە، باوەڕیان بە عەلاوی‌و یاوەرو جەعفەری نەدەکرد، چۆنکە یەکەمیان بەعسی‌و، دووەمیان ئاغایەکی کۆنەپەرستی عێراقچی‌و، سێیەمیشیان گوێرایەڵی ئەڵقە لەگوێی سیستانییە. کە سیستانیش ئێرانییەو، هەر لەیەکەم رۆژەوە ئاگادارمکردن کە سیستانی هەر وەك خومەینییەو، خومەینی چەندی پێ بوو بۆ کورد، سیستانیش هەر هێندەی پێیە، کە ئەم ئامۆژگاریەشیان بگرتایە بەرچاو، نەدەچوون پەسنی سیستانی بدەن‌و، بەدۆستی کوردو مۆدێرات (معتدل)و لایەنگری فیدراڵی بیدەنە قەڵەم، بەڵکو بە سیستانییان رادەگەیاند کە ئەو بێگانەیەو لەعێراق میوانەو مافی دەستێوەردانی لەسیاسەتدا نییەو پێیاندەگوت: "یاغریب کُن ادیب". ئەگەر سیاسەتکارانی کورد سیاسەتزان بوونایە، نەدەچوونە هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقەوە، بێ هیچ مەرج‌و بەڵێنێکی نێو نەتەوەیی‌و، بەلایەنی کەمەوە ئەمریکا، بەڵکو دەیانزانی کە نەچوونە هەڵبژاردن، هیچ زیانێکی بۆ کورد تێدا نییە، بەڵکو ناڕەوایەتی دەدا بە هەڵبژاردن لەعێراقدا

که هەر شیعەکان بە پەلە بوون لێی، چۆنکە دەیانزانی هەڵبژاردن بە سووتی وانە. بێجگە لەوەش دەیانزانی کە هەڵبژاردن هەبێ‌و نەبێ، بۆ شیعەکان هەروەك یەکە. ئەوان دەیانەوێ دەوڵەتی شیعەگەرێتی لە عێراق دابمەزرێنن، وەك ئێران، بەڵام جارێ بەپێی پرنسیپی "تقیە" (واتە خۆشاردنەوە لەکاتی مەترسی‌و تەنگانەدا) دەچن بەرێوە. ئەوەتا عەبدولعەزیز حەکیم کە لەبنەماڵەیەکی فارسەو خۆی کردووە بە "الحکیم" یەکەم قسەی لە پەرلەمانی عێراقدا ئەوە بوو کە گوتی "الشعب العراقی المسلم"، واتە، هەموو دیان‌و ئێزدی‌و کاکەیی‌و شەبەك‌و هەقەو سوببە (مەندایی) لەدەفتەری ئاغای حەکیم دا جێیاننابێتەوە. ئەمەش دێمۆکراسی حیزبی دەعوەو "مجلس اعلای انقلاب اسلامی عراق"ە، کە لە هەشتاکاندا لەلایەن خامەنەییەوە دروستکرا، بەسەرکردایەتیی چەند ئێرانییەك، وەك باقر حەکیم‌و حەمید رەزا ئاسەفی‌و هاشمی شاهرودی. کە ئێستە حەمید رەزا ئاسەفی بووە بە قسەکەری رژێمی ئێران‌و شاهرودیش بووە بەسەرۆکی دادگەکانی ئێران (قاچی القچاە). تۆیش کوردی کوڵۆڵ، چاوەڕوانی ئەوەیت، کە حیزبی دەعوەو "مجلسی اعلای انقلاب اسلامی عراق"، کە دوو دەسکەلای رژێمی ئێرانن، مافت بدەنێ.

ئەگەر سیاسەتکارانی کورد سیاسەتزان بوونایە، نەیاندەگوت کەرکووك دەکەینە برۆکسل، بەڵکو دەیانگوت بەغدا دەکەینە برۆکسل. ئەوان کە مێژووی بەلچیکاو شاری برۆکسل نازانن، بۆچی جارێ ناچن پرسیار بکەن، خۆ پرسیارکردن شەرم نییە.

ئەگەر سیاسەتکارانی کورد سیاسەتزان بوونایە، نەیاندەگوت کە پشتگیریی لە فیدەراڵێتی سێ ستانی ئەنبارو سەلاحەدین‌و مووسڵ دەکەن، لەکاتێکدا کە مووسڵ ستانێکی کوردستانەو بەشێکی گەورەی ستانی سەلاحەدین کۆنە نێوچەکانی کەرکووکە کە سەددام بەزۆر لە

کەرکووکی دابڕێ، بەڵکو دەبوو سیاسەتکارانی کورد، داوای ئەوە بکەن کە ستانی مووسڵ‌و سەلاحەدین بچنە سەر هەرێمی کوردستان، چۆنکە 80٪ی خەڵکی ئەو ستانانە کوردو کوردستانین، واتە، کوردو ترکمان‌و ئاشووری‌و کلدانین، بەڵام ستانی ئەنبار ستانێکی عەرەبانە.
ئەگەر سیاسەتکارانی کورد سیاسەتزان بوونایە، هەوڵی ئەوەیان نەدەدا کە زمانی کوردی‌و عەرەبی، هەردوو لەهەموو عێراقدا، وەك یەك، ببنە زمانی فەرمی (رەسمی). بەڵکو زمانی کوردی لەکوردستاندا فەرمی‌و، زمانی عەرەبیش، وەك زمانی دووەم، زمانی عەرەبیش لەنێوچە عەرەبییەکاندا فەرمی‌و زمانی کوردیش زمانی دووەم. ئەو حەلە دەکرا لە پەرلەمانی عێراق‌و ستانی بەغداو دەزگە فیدرالییەکاندا هەردوو زمان وەك یەك فەرمی بن. دیارە، دەبێ لەکوردستانی دواڕۆژدا، لەپاڵ زانستگەیەکی ترکمانی‌و، پاش ئەوەی پارێزگەی مووسڵ چووە سەر باشووری کوردستان، زانستگەیەکی کلدانیزمان‌و، زانستگەیەکی عەرەبیزمانیش ببێ، بەڵام ئەو زانستگەیە هەر بۆ عەرەبە رەسەنەکانی کوردستان دەبێ، نەك بۆ عەرەبی دەرەوەی باشووری کوردستان. ئەو عەرەبانەی دێنە کوردستانەوە، دەبێ بە زمانی کوردی بخوێنن‌و، ئەو کوردانەی دەچنە نێوچە عەرەبییەکانی عێراق، بێجگە لە بەغدا، دەبێ ئەوانیش بەعەرەبی بخوێنن. بوونی زمانی عەرەبی بەزمانی فەرمی، وەك کوردی، مانای بەعەرەبکردنێکی سەربەخۆی کوردستانە.
ئەگەر سیاسەتکارانی کورد دەیانەوێ کارێك بۆ دواڕۆژی خەڵکی کوردستان‌و تەنانەت خۆشیان بکەن، وا بەباش دەزانم سەرنجێکی ئەم پێشنیازانەی خوارەوە بدەن، کە زۆر جار باسمکردوون، بەڵام هیوام وایە، دووبارە کردنەوەی بێکەڵك نەبێ:

1-کورد دەبێ پێ لەسەر ئەوە دابگرن کە رامیاری‌و ئاین، بەتەواوی، لەیەك جیابکرێنەوە. واتە، دەستووری عێراق، لەهیچ بەشێکیدا نابێ پەنا ببا بۆ سەرچاوەیەکی ئاینی. چۆنکە، ئاین، سا هەر ئاینێك بێ، لەسەر بنچینەی باوەڕ وەستاوەو، شتێکی تایبەتی‌و کەسی (شەخصی)یەو، ناکرێتە پێوانەیەکی گشتی، کە وەك دەستوور بەسەر خەڵکی وڵاتێکدا بچەسپێندرێ. کەواتە:

دەستووری عێراق، دەبێ دەستوورێکی سێکولار (علمانی) بێ، لەهەموو روویەکەوە. خۆ ئەگەر کورد رازی بن بەوەی ئاین ببێتە سەرچاوەیەکی دەستوور، ئەو حەلە شیعەکان، ئەو دەرفەتە، دەکەنە بیانووەکەی مەلای مەزبوور، کە تکای لە دراوسێیەکەی کردبوو، رێیبدا تاکە سنگێك بەدیواری حەوشەی دراوسێکەیدا دابکوتێ‌و، کە دراوسێ رێیداپێی، مەلا بۆ رۆژی دوایی، کەرەکەی هێنایە حەوشەی دراوسێکەو، بەگوریس بەستی بەسنگەکەوەو، ئاخوڕێکیشی بۆ هەڵبەست. کورد، پاش ئەوەی چەند جارو چەند جار، لەلایەن ئەمانەوە دەستیبڕدراوەو، "درۆی شەرعی" لەگەڵ کراوە، نابێ رێبداپێیان، کەری خۆیان لەکوردستاندا بەگوریسی "درۆی شەرعی" ببەستنەوە.

2-کورد نابێ هەرزانفرۆشانە لە حکوومەتێکدا لەگەڵ شیعەکان بەشداربیکا، تەنانەت ئەگەر شیعەکان ئامادەشبن، بە سوێندو تەڵاق‌و ئیمزاو مۆریش بەڵێنبدەن. چۆنکە بەڵێنەکانیان بەکورد هەموو "درۆی شەرعین". بەر لەوەی حکوومەت دابمەزرێ، دەبێ رەوشی کەرکووك‌و نێوچە بەعەرەبکراوەکانی دی، گەڕابنەتەوە ئاستی راستینەی خۆیان‌و، بێ چۆن‌و بۆچی، خرابنەتەوە سەر هەرێمی باشووری کوردستان. هەر کاربەدەستێك ئەم لایەنە دوابخا، خیانەت لەکوردستان دەکاو، مافی ئەوەی نامێنێ کە لەسەر کار بمێنێ.

3-لەدەستووری عێراقدا دەبێ بەئاشکرا سنووری هەرێمی کوردستان دیاریکرا بێ. رەشنووسی دەستوورەکە دەبێ پێش بەشداریکردنی کورد لەحکوومەتدا، لەلایەن بەرەی شیعەکانەوە، بەگەرەنتی ئەمریکا، ئیمزاو مۆر کرابێ‌و، لەرادیۆو رۆژنامەو تەلەفیزیۆن‌و لە پەرلەماندا رابگەیەندرێ، بەرەی شیعە دەستەبەر بووبێ کە لەحکوومەتدا پشتگیری لێدەکا.

4-دەبێ لەدەستووری عێراقدا بنووسرێ کە کورد لەعێراقدا بەشێکن لە نەتەوەی کوردو، مافی یەکگرتنیان هەیە، بەخۆیان‌و خاکیانەوە، لەگەڵ بەشەکانی دیکەی کوردستان، هەر کاتێك زۆربەی خەڵکی باشووری کوردستان (نیوە+ یەك دەنگ) بڕیاریان بۆ ئەوەدا.

5-دەبێ حکوومەتی عێراق، ئەگەر بەو مەرجانەی سەرەوە دامەزرا، دەستەبەرببێ کە بڕی (250) ملیار پاوەنی ئینگلیزی لەماوەی (25) ساڵدا بدا بە خەڵکی باشووری کوردستان، وەك بژاردنەوەیەك بۆ ئەو وێرانکارییەی کە دەوڵەتی عێراقی عەرەب لەماوەی (80) ساڵدا لەباشووری کوردستاندا کردوویەتی. ئەم پێشنیازەم دە ساڵێك لەمەوبەر، لەرێ هەڤپەیڤینێکدا لەگەڵ رۆژنامەی "کوردستانی نوێ" بڵاوکرایەوە. دیارە ئەم بۆ بژاردنەوەیە، دەبێ شان بەشانی داننانی حکوومەتی عێراقدا بێ، بەوەی دەوڵەتی عێراقی عەرەب گەلکوژی لە کورد کردووەو، ئامادەیە سزادان بگرێتە خۆی بەرامبەر ئەنفال‌و بەکارهێنانی چەکی کیمیایی دژی کورد. سزادانەکەش دەبێ لەرێی دادگەیەکی نێو نەتەوەییەوە بێ.

6-دەبێ لەدەستووردا، بە گەرەنتیی ئەمریکاو کۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان، گەرەنتی ئەوە هەبێ کە ئەگەر دەستوور گۆڕدرا، ئەو بڕگانەی پێوەندییان بە سنووری باشووری کوردستان‌و، مافی جیابوونەوەی کوردستان‌و، سیستەمی سیکۆلار، دەستیانلێنەدرێ‌و وەك

خۆیان بمێننەوە. خۆ ئەگەر دەستیانلێدرا، ئەوا کورد مافی دەستبەجێ جیابوونەوەی لەعێراق هەبێ.

7-دەبێ کورد داوا لە مەلا سیستانی بکەن، کە بەنووسینو ئیمزای خۆیو، بێ پێچوپەنا، بیروڕای خۆی دەربڕێ بەرامبەر سنووری باشووری کوردستانو، کێشەی بەعەرەبکردنی کوردستانو لەنێو ئەوەشدا گێڕانەوەی هەموو عەرەبە هاوردەکان بۆ شوێنی خۆیانو، یەکگرتنی خەڵکی باشووری کوردستان لەگەڵ عێراق بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانەو، مافی جیابوونەوەی باشووری کوردستان، وەك لەسەرەوە باسکرا. هەروەها دەبێ بە ئیمزای خۆی، دان بەوەدا بنێ کە دژی حکوومەتێکی ئیسلامییە لەعێراقدا. خۆ ئەگەر ئەوەینەکرد، ئەوا هەموو رێککەوتنێکی کورد لەگەڵ شیعەکان، دەبێتە مایە پووچی بۆ کورد. چۆنکە شیعە مەرجەعییەکان، بەمێشکی خۆیان بیر ناکەنەوە، بەڵکو مەلا سیستانی بیر دەکاتەوە بۆیانو، ئەوانیش دوای وی دەکەون. خۆ ئەگەر کورد رازینەبوو حکوومەت دروستبکا لەگەڵیان، ئەوا ئەو لایەنانەی کە لەگەڵ شیعەکان یەکیانگرتووە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان، لێیانجیادەبنەوەو، بەوە بەرەی شیعە پارچە پارچە دەبێو، ئەو دەم ناچار دەبن لە بێهێزیی خۆیان ملبدەن بۆ داننان بەو مافانەی کورددا، کە ئێستە دانیپێدانانێن. کورد نابێ پەلە بکەن لەدامەزراندنی حکوومەتی عێراقدا. مەلا سیستانی شەووڕۆژ کەوتووەتە پەلە بۆ دامەزراندنی حکوومەت.

8-پارتیو یەکێتی، دەبێ لەوە بگەن، کە ئێدی، کاتی ئەوە نەماوە، پتر چاوشارکێ لەگەڵ بەرژەوەندییە باڵاکانی خەڵکی کوردستان بکەن، چۆنکە هەموو ناکۆکییەكو لادانێك لەشاڕێی ئەو بەرژەوەندییە، دەبێتە هۆی هەڵگیرسانی ئاژاوە لەکوردستاندا، کە ئەمجارە بەزیانی پشتشکێنی ئەوان تەواو دەبێ، ئەوجا بەچارەڕەشیی خەڵکی کوردستانو، کوردیش

باشیانگوتووه "ئەگەر کەسە، ئەلفێك بەسە". هەموو ڕێککەوتنێك لەگەڵ شیعەکان، دەبێ ڕەزامەندی گەلی کوردی لەسەر بێ.
دوا وشەشم ئەوەیە کە نابێ نەسیر کوڕی خودێلێخۆشبوو کامیل چادرچی بخرێتە پشتگوێ. ئەگەر هیچ کوردێك نەسیر نەناسێ، مام جەلال زۆر باش دەیناسێو دەزانێ کە کاتێك لەزانستگەی بەغدا خوێندکار بووین، نەسیر چۆن پشتی کوردی دەگرتو، هاوڕێی زانستگەو دوکانەکەی بەشیر موشیر (ئوستاد)مان بوو.
نەورۆزو ساڵیادی "میدیا" پیرۆزبێو، ئاهورامەزدا کوردو خەڵکی کوردستان بخاتە سەر ڕێی یەکێتیو چاکە.

بەرلین 2005/3/21

**میدیا**، ژ 184، 2005/3/29

# وشەی ( ژن ) یان ( ئافرەت ) کامیان راستە؟

ئاسۆ حەمە سالّح- بەرلین/ زاناو پرۆفیسۆر دکتۆر جەمال نەبەز لەشاری بەرلین لەهۆلّی مەلّبەندی ئاوەدانی لەسەر ئەم بابەتەو چەندین بابەتی دیکەی زمانەوانیو تایبەت بەرەوشی ژن, سیمینارێکی بۆ کوردەکانی دانیشتووی شاری بەرلین پێشکەێش کرد کەتیایدا چەندین راستی مێژوویی لەسەر هەندێك زاراوەی کوردی خستەڕوو کە رەنگە پێشتر زۆربەمان پێمانوابووبێت کە ئەو وشانە کوردی نین, بەلاّم یەکە یەکە چووە ناو بنج و بناوانی ئەم وشانەو بۆی سەلماندین کەوشەکان کوردین و خەلّکانی ناکورد لەئێمەوە وەریانگرتووە, سەرەتا لەسەر وشەی (ژن) و (ئافرەت) چیرۆکێکی سەردەمی زووی خۆی گێڕایەوەو وتی: سەرەتای پەنجاکان (ئەحەی تەقی) کە سەر بەجل خوارەکان بوو، واتە ئەوانەی دژایەتی مەلیك مەحمودیان دەکردو نەیاندەویست دەولّەتی سەربەخۆ دروست بکات بەلّکو دەیانویست لەگەلّ ترك رێك بکەون, هات لەدەرگای مالّەکەمانیدا, منیش دەرگاکەم لێکردەوەو پێموت فەرموو وەرە ژوورەوە, وتی نایەم کارێکی بەپەلەو گرنگم بە باوکت هەیە, وتم خێرە وتی دەمەوێ بزانم (تۆفیق ئاغا حاجی فەتحوللا کە ئاسیاوی باوکم بوو،ولەبەر لوتبەرزی پێیان دەگوت باری تەعالا) سەر بە چ پارتێکە؟ وتم بۆ؟ وتی چونکە ئەگەر ئەو سەر بەپارتی مەردان بێت، ئەوا من ئەچمە پارتی گەوادانەوە.

بەکارهێنانی وشەی (ژنو ئافرەت، یان خوێندکارو قوتابیو... هتد) وەك گرێدەرونییەکەی لێهاتووە, سەردەمی (دیّ دیّ ئیّر)یش واتە ئەو کاتەی ئەلّمانیای (بەنێو) سۆسیالیستیو دێمۆکراتی هەبوو لە پالّ ئەلّمانیای فیدرالیدا)، هەولّیان دەدا کە لەراگەیاندن و رۆژنامەکانیاندا چەند زاراوەیەك بەکاربێنن کە لەیەکتری نەچن, لەکاتێکدا هەردوولایان هەر سەر بە نەتەوەی ئەلّمان بوونو بەزمانی ئەلّمانیش دەدوان, زۆر جاریش لە

نەتەوەیەکدا بەهۆی جیاوازی ئاین، یان ئاینزا یان، پارتی باڵادەست، دوو زمانی جیاواز هاتووەتە کایەوەو، سەر ئەنجام نەتەوەکە بووە بە دوو بەشەوە. لەباشووری کوردستانیش سەد حەیف و مەخابن ئەم دیاردە ترسناکە تەشەنەی سەندووە، بۆیە هیوا خوازم لەگەڵ یەکگرتنەوەی پۆست و دەسەلاتەکاندا, هاوکات زاراوەکانیش لەسەر بنەما زانستیو مێژووییەکانی خۆیان بەکاربێنن, نەك وەك ئەحەی تەقی لەرقەبەرایەتیکردنی ئەوی دیکە، کوێرانە بڕیاربدەن.

وشەی (ژن) لەژینەوە دێت, واتە ئەو کەسەی کە ژیان دەدات بەخەڵكو, ئەم وشەیە زۆر کۆنە بەزمانەکانی (روسیو بولگاری)یش، بەژن دەوترێ ژنو، ئەم وشەیە هیچ گومانێکی لەسەر نییە بۆیە چاکتر وایە هەموو کورد بەکاریبێنێت, (ئەوەتا)، بەکرمانجیش هەر (ژن) بەکاردێت، زۆربەی کوردیش کرمانجن, بۆیە لەهەموو حاڵەتێکدا وشەی ژن لەوشەی ئافرەت راستترەو, ژن واتە کاڤان- کابان- یان گەورەی ماڵو, وشەی کاك (یش، کەهاوڕەگی کاڤانە) بۆ گەورە بەکاردێت, تەنانەت لەسەردەمی ئەکەدییەکاندا (کا) بۆ گەورە بەکارهاتووەو, ئەگەر بەردێك گەورەبێت پێیدەڵێن گابەرد.

بەلام وشەی ئافرەت تائێستا ساغ نەبووەتەوە واتاکەی چییەو, زۆر کەس وای بۆ دەچن کە وشەی ئافرەت لەئەفراندن- خەلقبوون- وەهاتبێت، یان لەعەورەتی عەرەبییەوە وەرگیرابێت, بەلام ئەمانە هەمووی گریمانەن و هێشتا ساغ نەبووەتەوە بۆیە بەباشی نازانم ئێمەی کورد وشەیەك بەکاربێنین کە بەگومان بین لێی, کەواتە وشەی ژن راستترو گونجاو ترە.

ئەم وشەی ئافرەت و ژنەش، لەرێی حزب حزبێنەوە هاتووەتە ئاراوە, ئەم حزبانە هەر بەوەوە نەوەستاون کوردستان دابەش بکەن, بەڵکو هاتوون و هەوڵیان داوە لەقینی یەکتر زمانەکەشمان دابەش بکەن کە سەر ئەنجام

بەماڵوێرانی کورد تەواو دەبێت. لەباکووری کوردستان وشەی (پیرەك- واتە پیرۆز یان بەرێز) بۆ ژن بەکاردێت, تەنانەت وشەی (پیر) کە (شێخ)ە هەر لەهەمان زاراوەوە وەرگیراوە.

رەنگە زۆربەی کورد لایان وابێت وشەی لەهجە عەرەبییە, بەڵام وانییە, راستییەکەی ئەم وشەیە کوردییە، بۆ نمونە لەکوردیدا لاژە- لاوژە- گرەلاوژە هەیەو زۆرجار تیپی (ژ) جێی (ج) دەگرێتەوە, هەروەها لە ئینگلیزیدا لێنگویج واتە زمان هەیە، بەڵام چۆنکە کورد خاوەنی دەوڵەتی خۆی نەبووە, زۆرجار لەوشە کوردییەکانی خۆمان بەگومان دەبین و بیرمان دەچێتەوە کەهی ئێمەن, چەندین ساڵە عەرەب و تورك و فارس گەلێك وشەی کوردی بەکار دەهێنن, کەچی لامان وایە کوردی نین بۆ نمونە عەرەب (هەڵمەت)ی ئێمەی کردووە بە (حملە), وەکو چەندین وشەی دیکە.

پاش ئەوەی عەرەب هاتن کوردستانیان داگیرکردو هەوڵیاندا ئاینی ئیسلام بڵاوبکەنەوە تا ئەندازەیەکی زۆر کورد لەگەڵیان نەبوون, تەماشای هەندێك وشەی ئاینی بکەن کە لەکوردیدا هەروەك خۆیان ماونەتەوەو عەرەب نەیانتوانی بیسەپێنن بەسەر کورددا بۆ نمونە: خودێ- نەبوو بە الله کە لەئیلۆهیمی عیبرییەوە وەرگیراوە, یان دۆزەخ -دۆژەك- نەبوو بە جهنم کە جەهەنەم خۆشی کوردییە ولە "جێی نزم" ەوە هاتووە واتە "اسفل السافلین", یان پەیامبەر نەبوو بە رسول, یان فریشتە- نەبوو بەملائکە، چۆنکە کورد بەر لەئیسلام بۆ خۆی جۆرە کولتورێکی ئاینی خۆی هەبووە.

وشەی شەیتان کە لەساتانی عیبرییەوە وەرگیراوە، زۆر جیاوازە لەوشەی شەیتانی کوردی کە لەراستیدا وشەکە بە کوردی لە (شاتەن)ەوە هاتووە کە شا -خوایەو تەن- لەشە (واتە لەشی گیانێکی خوایەتی تیدایە) وئەمەش بۆ رێزو پیرۆزیی و گەورەیی بەکاردێت، بەپێچەوانەی شەیتانی ئیسلام و جولەکەوە کە بۆ کاری بەدو شەڕانگێزی بەکاردێت.

عەرەب زۆر وشەی دیکەیان لەعیبرییەوە وەرگرتووە بۆ نموونە: یم (زەریا) یان نور ( روناکی) لە "ئوور"ەوە کە وشەی (اوارها) لەقورئاندا بە شێوەیگەل (جمع) بەکارهاتوو یان رواه- روح، یۆمێر- یامر، و چەندین وشەی دیکەی.

وشەی "عەلەوی" لەئەلێڤەوە هاتووە واتە هالأوی ئاگر یان ئاوی گەرم، هالأۆ- ئالاو- ترک کردوویەتی بە ئەلێڤ چونکە لای عەلەوییەکان ئاگر پیرۆزەو کوردیش کاتی خۆی خوای ئاگری پەرستووە نەک ئاگر. ئاگر لای ئیسلامیش پیرۆزە.

لەراستیدا وشەی زۆرمان هەن کە کوردین و لەلایەن نەتەوەکانی ترەوە بەکاردێن. ئەرکی سەرشانی هەموومانە کە یەکە یەکە لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکەین و بۆ نەوەکانی دوارۆژمان ساغیان بکەینەوەو لەپوکانەوەو بیرچوونەوە بیانپارێزین، هیواخوازم هیچ حزب و تاقم و گروپێک بۆ خۆ جیاکردنەوە لەوی دی کوێرانە زاراوەی سەیرو سەمەرە بۆ خۆیان دانەتاشن و زمانەکەمان لەت و پەت و لاواز نەکەن.

**میدیا**، ژ 191، 2005/5/17

# چەند هوردەکارییەك دەربارەی جلخوار

**کاکی هێژاو بەڕێز شێمحەممەد باڵەك**

ڕێزو سڵاوی شیرینم بۆ جەنابت

زۆر سوپاس بۆ ئەو بەدواداچوونەی لەبارەی ڕۆنکردنەوەی بنەچەو ڕەچەڵەکی وشەی "جلخوار"ەوە نووسیوتانە. دیارە، ئەم هەوڵەتان ئەوە دەگەیەنێ کە بەڕێزتان بە تەنگ خزمەتکردنی زمانی کوردییەوە دێن. لەگەڵ ئەمەشدا، دەخوازم سەرنجتان بۆ ئەوە رابکێشم کە بۆچی ئەز ڕەگی ئەم وشەی "جلخوار"ە دەبەمەوە سەر "جرخوار"و، نەك ئەو "جلخوار"ەی کە ئێوە باستانکردنەوەو، لەنێوچەی باڵەکایەتی باوە.

ڕاستییەکەی، ئەم وشەی "جلخوار"ەی کە لەسلێمانی لەسەردەمی شانشینیی کوردستاندا هاتووەتەکایەو، وەك ئێوە فەرمووتانە، بەمانای "جاش"ی ئەوڕۆ بەکارهاتووە، هەر لەسەرەتای منداڵیمەوە، کە لەسلێمانیدا بەسەرمبردووە، بووەتە جێی پرسیاری من لەپیاوە پیرەکانی ئەو ڕۆژگارە، بەڵام هەریەکە وەرامێکی دەدایەوە، زۆر دوور لەم لێکۆڵینەوە بابەتانەیەی بەڕێزتان. هۆی ئەمەش ئەوەیە کە وشەی "جل" لەسلێمانی بۆ بەرگی مرۆڤ بەکاردێ، نەك بۆ هی ئاژەڵ، ئەگەرچی وشەی "جلەگا"ش هەیە. ئاشکرایە کە لەڕۆژانی منداڵیمدا نەمدەزانی کە لەهێندەك نێوچەی کوردستان "جل" بۆ بەرگی "چوارپێ" بەکاردێو، ئەوەی لەسلێمانی پێیدەڵێن "جل" لەو شوێنانە "جلك"ەو لەباکوور "کنج"و "چەك"یش بە کاردێ.

لەسەرەتای پەنجاکانەوە کە لەزانستگەی بەغدا دەستمکرد بەخوێندن، بەهۆی دوکانەکەی ڕەوانشاد بەشیر موشیر (ئوستاد)ەوە، ژمارەیەکی بەرچاو کوردم ناسی، کە هەریەکەیان ڕابوردوویەکی، یان ڕامیاری، یان

خوێندەواری، یان پیشەیی، یان...، یان هەبوو. تێکەڵبوونم لەگەڵ ئەم بەڕێزانە، بوو بەهۆی ئەوەی گەلێك شت فێر بم، گەلێك زانیاریش کۆبکەمەوە، کە دەتوانم بڵێم، ئەگەر ئەو هەڵسوکەوتەو پێوەندییانە نەبوونایە، ئەوا ئەو زانیارییانە لەگەڵ مردنی ئەو کەسانە دەچوونە ژێر خاکەوە، چونکە نەیاننوسیوەتەوە. تەنانەت، یەکێکی وەك مامۆستا ڕەفیق حیلمی، بەتکاو هاندانی من، بەشێکی کەمی بیرەوەرییەکانی خۆی لەژێر ناوی "یادداشت"دا بڵاوکردەوە.

سەرت نەیەشێنم، یەکێك لەو کوردانەی کە هاتوچووی دوکانەکەی "ئوستاد"ی دەکرد، کۆنە ئەفسەر جەمال عارف کەرکووکی بوو، کە برای دادوەر (حاکم) ڕەشاد عارف بوو. ڕەشاد عارف لەسەردەمی قاسمدا بووبوو بەئەندامی "کۆڕی سەروەرێتی" (مجلس السيادە). ئەم جەمال عارفە لەسەردەمی عوسمانییەکاندا، لەئەکادێمیای لەشکریی ئەستەمووڵ، پلەی ئەفسەری وەرگرتبوو و، پاش دامەزراندنی شانشینیی کوردستان، لەگەڵ دەستەیەك ڕۆشنبیری کوردی ئەو سەردەمە، وەك جەمالی عیرفان و کامیلی حەسەنەفەندی و قالەی ئایشەخان و ڕەشید شەوقی (برای مامۆستا عەلی ئاگاو دەرهێنەری گۆڤاری "پەیژە" کە لەسەمیناری "پێوەندارێتیی کوردی"دا باسمکردووە) و مەحموود جەودەت و شاکیر مەجرووم و ڕەفیق حیلمی و شێخ نووری (باوکی شەهید شەهاب) و پیرەمێرد و جەنەراڵ مستەفا پاشای یامولکی و ساڵح زەکی ساحێبقران و ئەحمەدی خواجا، چووبوونە سلێمانی بۆ لای شێخ مەحموود، بەنیازی خزمەتکردنی لەشکرو حکوومەتی کوردستان، کە خۆیایە، ئێرە جێی ئەوە نییە باسی ئەم بەڕێزانە بکەم، بەڵام هێندە دەبێژم، جارێکیان لەکاتی قسەکردندا لەگەڵ جەمال عارف، وشەی "جلخواری" بەدەمداهات و، بەشێوەی "جرخوار" ("جر" بە ڕێی لاوان) دەریبڕی. کە وشەکەم دووبارە کردەوە

پێی و، گوتم مەبەستت "جلخوار"ە. ئەمجارەش گوتی" ئا.. جرخوار".
ئەوجا لێمپرسی "جرخوار" لەچییەوە هاتووە، گوتی نازانم. بەڵام گوتی "ئەم جرخوارە، جەمالی عیرفان دایهێناو، لەپێشەوە، لە جەمالی عیرفانەوە داکەوت". شایانی باسە، جەمالی عیرفان، وەك لە پیاوە پیرەکانی سەردەمی منداڵیی خۆم بیستووە، فەیلەسووف و ماتماتیکەوان و ئەستێرەناس و ئەفسەرو رۆشنبیرێکی گەورەی کورد بووە، بەهەموو مانای وشە. ئەفسەر ئەحمەد بەهجەت (مامی دایکم) کە یەکێك بوو لەدەرچووانی ئەکادێمیای سوپایی ئەستەموولّ و ئەفسەری لەشکری شانشینیی کوردستان و، نووسەری چەند پەرتۆکێکی ماتماتێك بوو بۆ قوتابخانە سەرەتاییەکانی کوردستان پاش دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، دەیگوت جەمالی عیرفان "جیهانێك بوو پڕ لەزانست و عیرفان". جەمالی عیرفان، بەگەنجی و لەرۆژانی فەرمانڕەوایەتیی شێخ مەحموودداو، لە هەلومەرجێکی تاریکو نووتەکدا بەدەستێکی تاوانبار کوژراوە. کاتی خۆی زۆر هەوڵمدا بزانم تاوانی کوشتنی ئەم کوردە مەزنە تاکهەڵکەوتووە، لەئەستۆی کێ، یان چ لایەنێکدا بووە، بەڵام داخەکەم، تەقەلاکەم بێسوود بوو. چۆنکە هەر کەسە چیرۆکێکی دەگێڕایەوە، جیا لەچیرۆکی ئەوی دی.
لێرەدا دەبێ ئەوە بێژم کە باوەڕ ناکەم جەمالی عیرفان هیچ پێوەندییەکی بەنێوچەی باڵەکایەتییەوە هەبووبێ، یان هاتوچووی ئەوێی کردبێ، بەڵام مانەوەو خوێندن و کارکردنی سالانی ساڵ لە ئەستەموولّ، هەلی ئەوەی رەخساندووە بۆی کە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لەخەڵکی باکووری کوردستان بکا. ئەمە ئەوەشی بچێتە سەر کە خەڵکی ئەو سەردەمەی سلێمانی "جلخوارەکان"ی بەبێڕەوشت دەدایە قەڵەم. تەنانەت کە لەهاوینی ساڵی 1956دا لەگەڵ هاوڕێی خۆشەویستم شێخ ئەحمەد نەقیب و مامۆستا عەزیز محەممەد (برای ئەرکان) چووینە خزمەت شێخ

مەحموودو، باسی جلخوڵران هاتە پێشەوە، شێخ مەحموود فەرمووی "ئەوانە تاقمێك سەرسەری‌و بێ ئەخلاق بوون". تکایە سەرنجی وشەی "بێ ئەخلاق" بدە.

بەڕاستی، پێموایە جەماڵی عیرفان، زۆر زاناتر بووە لەوەی ئەو دەستکەلایانەی داگیرکەرانی بێگانە لە کوردستاندا، لە "جاشەکەر"، یان "کەری خۆ لەخۆڵدا گەوزێن" بچوێنێ. مەگەر ئەوەی "کەرێتی"و "خیانەت‌و نۆکەرێتیی داگیرکەران"، یەك شت بن، یان ئەوەی هەموو خیانەتکارێك کەربێ. ئەوجا، کاکە شێمحەمەد، تۆ کە لەنێوچەیەکی وادا، ژیاویت‌و دەژیت کە، کاروباری ژیانی ڕۆژانەتان، بەزۆری بەهۆی کەرەوە دەچێ بەڕێوە، تائێستە چ خراپەو خیانەت‌و نامەردییەکت لەکەری قوڕبەسەر دیوە؟ پێشینان گوتوویانە: "مانگاو ماکەر، ماڵ ئاواکەر".ئەز بۆ خۆم، لەخزمەت‌و یارمەتیدان‌و بێزیانیی پتر، چی دیم، لەکەری بەستەزمان نەدیوە؟ ئەوانەی شان بەشانی سەربازانی داگیرکەری عەرەب، گوندەکانیان کاولدەکردو، ڕەشەکوژی‌و ئەنفالیان لەکورد دەکردو، پەلاماری ژنانی کوردستانیان دەداو، ئێستەش، وەك بەرزەکی بانان، بۆی دەرچوون‌و، چارەنووسی هەزاران فیداکارو خێزانی شەهیدو پیری پەککەوتەو ژنی پیاوو کوڕکوژراو، بەدەستی وانەوەیەو، تەنانەت کراون بەنوێنەری گەل، ئەوانە کەری چین، مەگەر وەك ئوستاد بەشیر موشیری ڕەحمەتی دەیفەرموو "کەری ئاقڵ گێ" بن، ئەوانە کەرنین، بۆ دەسکەوت‌و بەرژەوەندیی خۆیان، زۆر زیرەك‌و وریان، بەڵام ئەوانەی باوەڕ بەمانە دەکەن‌و، ڕیشی گەل دەدەنە دەست ئەمانە، دەبێ بێژین "خودێ ئەقڵ بەمنداڵیان بدا".

هێژای گۆتنێیە، کە وشەی "جاش" لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوولدا کەوتە سەر زمان، ئەم وشەیە، لەوەوە نەهات کە خەڵك ئەوانەی ڕژێمی عێراق بە

"غەیرە نیزامی"و، دوایی بە "فرسان صلاح الدین" نێوی دەبردن، بەکەرو جاشەکەر بداتە قەڵەم. نەخێر. "جاش" لەزمانی کوردیی هێندەك شوێندا، بەکەسێك دەڵێن، کە پیشەیەك بگرێتە دەستو، خاوەنی ئەو پیشەیە نەبێ. بۆ وێنە دەبێژن "جاش پۆلیس". واتە کەسێك کە پۆلیسی راستەقینە نییە، بەڵام یارمەتیدەرێتی. ئەمانەش لەگەڵ پۆلیسەکانو سەربازەکانی عێراق، پەلاماری خەڵکی کوردستانیان دەدا، کەچی نە پۆلیسی راستەقینەو نەسەربازی راستەقینە بوون، لەبەر ئەوە پێیاندەگوترا "جاش". دوایی وشەکە لەگەڵ تێپەربوونی کاتدا، مانای "جاشەکەری" وەرگرت.
ئەوجا دەمێنێتەوە سەر وشەی "گەمار" لەرستەی "جرێ وی گەمارە" کە بەڕێزت بە "گەماو" نووسیوتەو ئەوەش هەڵەی چاپییە. "گەم" شێوەیەکی دیکەی "گەن"و "گەنیو"ە، واتە "پیسو بۆگەنو گڵاو، کە دیارە وشەی گەماڵ (سەگی گەورەو نێر)یش پێوەندییەکی ریشەیی بەمەوە هەیە.
رێزو سڵاوم دووبارە دەکەمەوە.

بەرلین 2005/5/20

**میدیا**، ژ 192، 2005/5/24

# ئەفسانەی سەرۆکایەتیی هەرێم

بزووتنەوەی کوردایەتی، لەسەردەمەکانی سەتەی رابردوو،و چەند سەتەیەکیش لەوەپێش، لەلایەن رێبەرانێکەوە دەبرایەرێوە، کە لەنێو خەڵکی کوردستاندا بوو بوونە سیمبوڵ،و، وەك بووەیەکی پیرۆزو نەتەکین(1) (مصون) تەماشایاندەکرا. رێبەر، مۆتۆری بزووتنەوەکە بوو، هەر کاتێکیش ئەم مۆتۆرە لەکار بکەوتایە، سا، یان بە کوشتن، یان بە مردن، یان ناپا کیلێدەرکەوتن، یان بەوازهێنانی سەرکردەکە، ئەوا بزووتنەوەکەش لەکار دەکەوت،و دەوستا، هەتا سەرکردەیەکی دیکە دەبووە خاوەن کاریزما(2)و ئەو جێگەیەی دەگرتەوە. جەماوەر، گوێڕایەڵی فەرمانی رێبەر بوو. رەخنەگرتن لە رێبەر بەگوناهێکی گەورە دەدرایە قەڵەم. جا هەرچەندە دەستەیەك لە هەڵسوڕێنەرانی پارتی دیمۆکراتی کوردستان، لەساڵی 1964دا، بەسەرۆکایەتیی سکرتێری گشتیی برایم ئەحمەد لەهێڵی رێبەرێتیی مەلا مستەفای بارزانی، دەرچوون،و، ویستیان رێبەرێتییەکی دیکە بهێننە کایە، بەڵام بارودۆخ نەگۆڕدراو درێژەیکێشا، هەتا هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلوول لەبەهاری 1975دا، کە کۆتایی بەسەردەمی دەستەڵاتی تاکوتەنێی سەرکردەیەتیی کلاسیکی کورد هێناو، بوو بەهۆی ئەوەی هوردە بۆرژوای خوێندەواری شارنشینی سەر بەبیری مارکسزیمی ستالینتی، بتوانێ خۆی بنوێنێ،و، بکەوێتە رکەبەرایەتیی،و کێبەرکێی ئەوانەی دەیانویست هەر لەسەر ئەو رێسا کۆنە بمێننەوە، ئەوەبوو لەباشووری کوردستاندا، گەلێك حیزب،و کۆمەڵەی "پێشەڕویخواز" دروستبوون، گەورەترینیان یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان (ی.ن.ك) بوو، کە هەر لەسەرەتاوە، بزێوی،و چالاکییەکی بەرچاوی لەخۆی پێشانداو بەزۆری چەك کەوتە دەمکوتکردنی بیر جیاوازان. پارتی دیمۆکراتی کوردستان (پ.د.ك) کە لەتەوژمی

هەرەسەکەوە، جەزرەبەیەکی سەختی بەرکەوتبوو، بوو بووە نیشانەی رەخنەو تانووتو توانجو تەشەری هەموو لایەك، تەنانەت لەپلاری ئەوانەش رزگاری نەبوو، کە تارۆژی هەرەسەکە، خۆیان کاربەدەستی پلە دوو و پلە سێی شۆرش بوون. پ.د.ك وایهلێهاتبوو کە زۆر بەزەحمەت خۆی بەرامبەر شالاوی ی.ن.ك رادەگرت. بەتایبەتی، چۆنکە یەکێتی، قسەی سوار بوو بوو، پارتی شەری دۆراندبوو. کە یەکێك شەری دۆراند، گلۆلەی دەکەوێتە لێژیو، کەس خاسی پێنایەژیو، بێجگە لەوەش لەلایەن رژێمی سووریای دژ بە رژێمی عێراقەوە، پشتگیریی و پشتیوانی لێدەکرا، کە ئەوەتا ی.ن.ك هەتا ئەورۆش چاو بەرەو ژێرو سوپاسبژێری ئەو رژێمەیە. ی.ن.ك بە هەلگرتنی درۆشمی چەپاژۆی بریسکەداری بێکاکل، بازاری خۆی لەنێو خەلکی ساویلکەو تێنەگەیشتوودا گەرمکردبوو. ئەمە بێجگە لەوەی، ژمارەیەك مرۆڤی دلپاکو، بەهەق لەرەوتی نالەباری شۆرش، تووڕەو ناهومێدیشی لەخۆی نێزیکردبووەوە. زالبوونی بیرۆکەی مارکسیزمی سۆڤێتی بەسەر چینی خوێندەواری کورددا، لەپال هێندەك هۆی بابەتانەو نابابەتانەدا، رێی ئەوەیاننەدا بیرۆکەی سەربەخۆیخوازیی و ئاشتیی نەتەوەیی، لەکوردستان جەماوەر پەیدا بکا. بەم جۆرە، بەشی هەرە گەورەی مێژووی بزووتنەوەی، گوایە کوردایەتی، لەباشووری کوردستاندا، لەکاتی هەرەسەوەو هەتا ئەورۆ، بریتییە لەمێژووی شەڕو بەیەکدادانو، ئاشتبوونەوەو رێککەوتنو، تێهەلچوونەوە بەشەرو ئاشتیدا، لەلایەن ئەم دوو حیزبەوە، کە دیارە لەم پێناوەداو بۆ دەستگرتن بەسەر دەسەلاتی تاقانەدا، هەردوولا ناچار بوون پەنا ببەنە بەر داگیرکەرانی کوردستانو، هەر لایەنەش، بۆ خۆپاراستنو خۆ بەهێزکردن، هێندەك لەحیزبە گچکەکانی باشوورو، تەنانەت هێندەك لەحیزبە کوردییەکانی پارچەکانی دیکەی کوردستانیشیان بەخۆوە بەستووەو، داویانن بەشەر

دژی حیزبی دژ بەر. پێ بەپێی ئەمەو، لەئەنجامی شەڕو بەیەکداداندا، گەلێك لەکۆنە دەسکەلاکانی رژێمی بەعس‌و سیخوڕەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان‌و، کەسانی هەلپەرست‌و کوڕی رۆژو بەکرێگیراوو ئاژاوەگێڕو کۆنە جاش، کەوتوونەتە نێو ئەم دوو حیزبەوە، پلەو پایەشیان وەدەستهێناوەو، ئاگری شەڕی ساردو گەرم‌و کینەبەرایەتیان دژی یەك خۆشتر کردووە. هەر ئەم رەوشە نالەبارەش بووە کە بوو بەهۆی ئەوەی کورد لەدەرفەتی جەنگی هەشت ساڵەی نێوان عێراق‌و ئێراندا، نەك هەر هیچی دەستنەکەوێ‌و بەس، بەڵکو لەهەردوولای جەنگکەر زیانی پتر لێبکەوێ‌و، تووشی ئەنفال‌و چەکی کیمیایی‌و دەربەدەری‌و گەلڕەوی ملیۆنی ببێ. پاش ئەمەش لەشکانی لەشکری سەددام لەکوێت‌و، دامەزراندنی "هەرێمی نەفڕین"، کە بەڕاستی هەلێکی زێڕین بوو بۆ کورد، کە دەبوو کورد بەرەو سەربەخۆیی ببا، کەچی پاش چوارده ساڵ فەرمانڕەوایەتییەکی دوور لەدەسەڵاتی عێراق، هەر بەدەستی سەرکردەکانی ئەم دوو زلحیزبە، کرایەوە بە بەشێك لەدەوڵەتی دەستکردو داگیرکەری عێراق، بەرامبەر چەند درۆیەکی بێسەروبەر، کە هەر رۆژە تەونی درۆیینەی لەلایەکەوە شیدەبێتەوە. دەمێکە ئەو راستییەم لەرۆژنامەی "میدیا"دا نووسیوە، کە حکوومەتی عێراق لەلایەن چەند بنەماڵەیەکی شیعەی ئێرانییەوە دەربرێ بەڕێوە، وەك بنەماڵەی حەکیم‌و جەعفەری، کە فەرمان لە مەلا سیستانی فارس وەردەگرن‌و، دەمێکە ئەوەشم گوتووە، خومەینی چەندی پێبوو بۆ کورد، سیستانیش هەر هێندەی پێیە. جەعفەری، ئەوڕۆ دەستی ناڕواو، تەنانەت گەڕەکێکی بەغداشی بۆ دابیننا کرێ، کەچی دەچێتە ئەنقەرەو، بەڵێنی لەنێو بردنی کوردە هەڵاتووەکانی باکووری کوردستان بۆ باشووری کوردستان، دەدا بە رژێمی ترك. ئەم چوونەشی بۆ ئەنقەرە، وەرامێکی فارسانە بوو بۆ بۆ مام

جەلال، کە چوو سەری ئەردەنی دا. چۆنکە شیعەکان، ئەردەن بە دوژمنی خۆیان دەزانن، ئەوەبوو شا عەبدوڵڵا، باسی "هلال الشیعەی"ی کردو گوتی: شیعەکان بەتەمای یەکگرتنی ئێرانو عێراقو لوبنانو سووریاو شیعەکانی کەنداون (بە شیعەکانی حیجازیشەوە)و، شیعەکانیش، لە هەموو لایەکەوە کەوتنە قسە پێگوتنیو سووککردنی. ئەمە لەکاتێکدا، کە تیرۆر، لەهەموو نێوچەکانی عێراقدا (بەو نێوچەیەشەوە کە لەژێر دەسەڵاتی دوو زلحیزبەکە دایە)، رۆژ لەدوای رۆژ، توندوتیژتر دەبێ. کەچی دوو زلحیزبەکە، لەباتی ئەوەی لەئەمریکاو بەریتانیاو هەموو جیهانی بگەیەنن، کە عێراق، هەزار پینەشی بکرێ، نابێتەوە بەیەك دەوڵەتو، بیروڕای گەلێك لە سیاسەتکارانو کەسایەتییە جیهانییەکان (بۆ وێنە هەنری کیسنجەر) لەم بوارەدا بکەن بە بەڵگە، کەچی تازە خەریکی شەڕە دەنووکن لەسەر کێشەی سەرۆکایەتیی هەرێم. بەڕاستی، یەکێك کەمێ لە ئەلفوبێی رامیاریو قانوون بزانێ، دەزانێ سەرکردەی هەرێم، یان سەرۆکی هەرێم، لەدەوڵەتێکی دیمۆکراتیدا، نایەتە هەڵبژاردن، مەگەر بەپێی قانوونێك، کە ئەو قانوونە بەشێك دەبێ لەدەستووری ئەو دەوڵەتە، یان ئەو هەرێمە. بەڵام ئەوڕۆ ئەو قانوونو دەستوورە نییە. لەبەر ئەوە، هەموو باسکردنێکی کێشەی سەرۆکی هەرێم، باسێکی بێجێو دەوەنبەئاشە. بۆ دانانی ئەو قانوونو دەستوورەش، دەبوو پەرلەمان هەر دە رۆژ دوای هەڵبژاردن کۆببووبووایەوەو، حکومەتی یەکگرتووی پێکەوە بنایەو، دەستووری هەرێمی ئامادەو پشتڕاست (تصدیق) بکردایەو، لەو دەستوورەدا، دەسەڵاتەکانی سەرۆکی هەرێمی دەستنیشانبکردایە، دەستوورەکەشی بخستایە گشتپرسییەوە. ئەوجا بۆ هەرێمێکی وەك باشووری کوردستانو، لەو بارودۆخەدا کە کورد تێیکەوتووە، هەتا دەسەڵاتی سەرۆکی هەرێم زۆرتر بێ، باشترە. چۆنکە ئەگەر سوننییەکان

بەشداری هەڵبژاردن بکەن، لەوانەیە کورد ئەمجارە پلە سێ بینیو سەرکۆماری عێراق، کورد نەبێ. لەبەر ئەوە دەبێ دەسەلاتی سەرۆکی هەرێم بەرامبەری دەسەلاتی سەرکۆماری عێراق بێ. بۆ وێنە: سەرۆکی هەرێم دەبێ فەرماندەی هێزەکانی لەشکر بێ، بۆ ئەمەش، نە پارتیو نە یەکێتیو، نە هیچ حیزبێکی دیکە، مافی ئەوەیان نییە چەکدارو میلیشیایان هەبێ. خۆ ئەگەر دەڵێن پێشمەرگە میلیشیانین، فەرموو بابیانکەن بە لەشکرێکی یەکگرتوو. لەشکری وڵاتێك، هەریەك لەشکرەو نابێتە دووانو، هیچ وڵاتێك دوو لەشکری نییە. پاشان سەرۆکی هەرێم، یان لەلایەن پەرلەمانەوە هەڵدەبژێردرێ، یان لەلایەن گەلەوە، بەشێوەی دەنگدان. سەرۆکی هەرێمی باشووری کوردستان، ئەگەر بەهەڵبژاردن بێ، باشترە، وەك لەوەی بەبڕیاری پەرلەمان بێ. چۆنکە پەرلەمانەکە پەرلەمانی پارتیو یەکێتیەو، خۆ ئەگەر دەبێژن ئەندامی واهەن سەربەخۆن، یان سەر بەحیزبەکانی دیکەن، ئەوا دەبێژم، لەم بارەشیاندا، پەرلەمانەکە هەر دەبێ بە پەرلەمانی هەولێرو سلێمانیو دهۆك، چۆنکە هەتائێستا، نە کەرکووكو نە هیچ بەشێکی دیکەی باشوور، کە لەژێر دەستی سەددامدا بووە، نەخراوەتە سەر ئەم سێ ستانە. دوایی، بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم، کوردی دەرەوەی ئەم سێ ستانەو کوردستانییەکانی ئەو شوێنانەی کە کوردستانن، بەڵام ئەمڕۆ لەسنووری کوردستاندانین، دەتوانن دەنگ بدەن. بێجگە لەمەش سەرۆکی هەرێمێکی وا هەڵبژێردراو، پێویستی بەجێگر نییە. لەکاتی تەنگانەدا سەرۆکوەزیران، بۆ ماوەیەکی کاتی جێیدەگرێتەوە. ئەمەش لەکاتێکدا دەبێ، ئەگەر بوونی سەرۆکوەزیران شتێکی پێویست بێو، سەرۆکی هەرێم بەپێی قانوون، دەسەلاتی سەرۆکوەزیرانی نەبێ. ئەمەش، بەلای منەوە، بۆ هەرێمی باشووری کوردستان باش نییە، بەتایبەت، لەکاتی ئێستەدا. سەرۆکی هەرێم دەبێ

لەهەڵبژاردنێکی ئازادداو، پاش ئەوەی هەموو کاندیداکان بەرنامەی خۆیان بڵاوکردەوە، هەڵبژێردریٚو، دەسەڵاتێکی وای پێبدریٚ کە بتوانیٚ جڵەوی کەشتیی کوردستان لەم زلزەریا زریاناوییەدا، وەستایانە بەدەستەوە بگریٚ. ئەگەرنا، ئەگەر وانەبیٚو، ئەمەش ببێتە حیزبحزبێنەو نیوە بەنیوە، هەموو باسێکی سەرۆك هەرێمی، لەئەفسانەکەی پشت "قوللەی قاف" دەچیٚ.

پارتیو یەکێتی، پاش ئەوەی بەترساندنی خەڵك، کە ئەگەر نەچنە هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقەوە، ئەوا ژمارەی کورد لەپەرلەمانی عێراقدا کەمدەبیٚو کورد ناتوانن داخوازییەکانی خۆیان لەدەستووردا بچەسپێننو، هێندەك لەسەرکردەکانو بنکردەکانیشیان، مۆرکی خیانەتکارییان دەنا بەوانەوە کە نەچوونە هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقەوە بێمەرج. کە ئەز یەکێك بووم لەو "خیانەتکارانە"، ئەوجا ئەوڕۆ بەتەواوی دەرکەوت، کە مەبەستی هەردوولایان خزمەت نەبوو، بەڵکو هێشتنەوەی دەسەڵاتی خۆیان بوو. ئەوەتە نوێنەرەکانیان، وەك من، ناچنە پەرلەمان.. ئەز کە بە بەڵێنەکانی ئەم دووانە باوەڕم نەدەکرد، لەوەوە هاتبوو کە باشم دەناسین، چۆنکە هەشت ساڵی ڕەبەق (لە 1994-2002) خەریکی نێوبژیکردنو نێزیککردنەوەی هەردوولا بووم، لەپێناوی ئەوەدا کە گەلی ڕەشوڕووتی کوردستان هەناسەیەکی خۆشیی هەڵمژیٚ، بەڵام بۆمدەرکەوت، کە ئەو ڕێککەوتنە لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا، کارێکی لەکردن نەهاتووە، مەگەر دەستێکی ئاهۆڕایی پشتیوانی لێبکا. چۆنکە خوێنکەوتنە نێوی چل ساڵ بەدرێژیی‌و، بەگوێچکەدا خوێندنی مرۆڤی سادەو دڵشکاوو، ئەم لەو هاندان، بابەتێك نییە کە هەروا بەهاسانی لەبیر ببرێتەوەو، لەکار بخریٚ، بەتایبەتی لەکۆمەڵگەیەکی وەك کۆمەڵگەی کوردەواریدا.

دوو زلحیزبەکە، پاش ئەوەی بۆیاندەرکەوت کە ئەم عێراقچیێتیە خەست‌و خۆڵەیان، هیچ سوورتێکی نەبوو، پتر لەوە گەیشتن کە ئەم پەندەی ئەوان بەکوردییان داوە، ئەنجامی زۆر ترسناکی لێدەبێتەوە، ئەوجا، مقۆمقۆ کەوتووەتە نێوانیانەوەو، بەتایبەتی لەنێو ی.ن.ك دا کەسانێك پەیدا بوون، دەیانەوێ هەموو دەستە چەورەکەی خۆیان بە ملی مام جەلالدا بسوون، ئەگەرچی مام جەلالیش فریشتەی ئاسمان نییە، لەگەڵ ئەوەشدا، خۆیان لەبەردەم کاری کراودا دەبینن‌و، مۆتەکەی هەڵبژاردنی کۆتایی ساڵ، سەر سینگی گرتوون‌و دەزانن کە ئەمجارە، ئەگەر سوننییەکان بێنە کایەی هەڵبژاردنەوە، ئەمان رەنگە 10٪ی دەنگەکانیش وەدەستنەهێنن. چۆنکە، نەك هەر جەماوەرێکی هەڵخەڵەتاو دەنگ نادا بۆیان، بەڵکو ریزە کەلێنتێکەوتووەکەی خۆشیان، ژمارەیەکی یەکجار زۆری سەر بەحیزبەکانی خۆیانیشی ناهومێد کردووە. ئەوجا ئێستەو پاش ئەوەی کە بەمازوو تێشکاون، دەیانەوێ خۆیان بەسیچکان هەستێننەوەو، کێشەی "سەرۆك هەرێمی"یان هێناوەتە پێشەوەو ئەمەشیان کردووە بە ئەفسانەکەی پشت قوللەی قاف.

بە بیروڕای من، دەستێکی نهێنی، یان چەند دەستێکی نهێنی هەیە کە هەوڵی ئەوە دەدەن، چالاکیی تیرۆریستانەی کۆمەڵە دەستوەشێنەکان لەبەغداو نیۆچە عەرەبییەکانی عێراق، ناچار بەهەڵاتن بەرەو کوردستان بکەن‌و، بەتایبەتی بۆ نێو ئەو سێ ستانەی بەدەستی دوو زلحیزبەکەوەیە. ئەمەش لەپاڵ ناکۆکی‌و پشێوی نێوان ئەم دوو لایەنەدا. کە ئەمەش وایلێهات، ئەو دەمە دەتوانن هەموو ویستێکی داگیرکەرانەی خۆیان بەسەر کورددا بسەپێنن.

ئەوجا ئێستەو، پاش ئەوەی ئاشکرابوو، کە خەڵکی کوردستان بەم شێوەیە گاڵتە بەچارەنووسیان دەکرێ، هیچ چارەیەك نەماوە، ئەوە نەبێ

جەماوەری کوردستان بکەونە سەرکێشیی شارستانیانە، واتە، لەرێی خۆپێشاندانی بەردەوامی خۆیانەوە، بیخەنە بەرچاوی هەموو جیهان، کە خەڵکی کوردستان شتێکەو، دوو زلحیزبەکە شتێکی دیکەن‌و، داخوازییەکانی هەردوولایان لەیەك جیاوازن‌و، دەبا مووچەخۆرانی کورد، وەك بۆ زیاد کردنی مانگانەکەیان خۆپیشاندان سازدەکەن، کە شتێکی هەقە، بۆ چارەنووسی کوردستانیش بیکەن. دوکتۆر نووری تاڵەبانی‌و هەڤاڵە پەرلەمانتارەکانیشی، پێویستە هەرەشەکەی خۆیان بخەنە مەیدانی کردەوەو، ئیدی چاوەڕوان نەکەن‌و، بکەونە کۆبوونەوەو گازینامە ناردن بۆ ئەوانی دیکەو، ئەگەر نەهاتن، ئەوا بڕیار بدەن بۆ سەندنەوەی رەوایەتی لێیان‌و، ئەوجا دەستبەکاربن بۆ نووسینی دەستووری کوردستان‌و دڵنیاشبن هێدی هێدی جەماوەری کوردستان‌و دەرەوەی کوردستان لەدەوری خۆیان کۆدەکەنەوە، چۆنکە، هەر راستی سەردەکەوێ، ئەگەرچی هێنانەدیشی ماوەیەك دوابکەوێ.

1-"نەتەکین" لەباکووری کوردستان بۆ گۆڕی چاکێك بەکار دەبرێ کە کەس نەتوانێ دەستی ناحەزانە درێژ بکابۆی‌و بەپیرۆزی بزانێ.
2-"کاریزما" وشەیەکی یۆنانییە، "کرامات"ی عەرەبی لە "کاریزما"وە هاتووە.

بەرلین 2005/5/26

**میدیا**، ژ 193، 2005/5/31

## باشە! چرا هەڵکەین، چی تێدا ماوە، بەرپێزینە؟

کە مرۆڤ لەم رۆژانەدا، رۆژنامەی دوو زلحیزبەکە دەخوێنێتەوە، گوێبیستی قسەی سەرکردەکانیان دەبێ و، تەماشایەکی تەلەفیزیۆنەکانیان دەکا، کە بە پارەی رفێنراو، لەهەژاران و لیقەوماوانی کورد، دەچنبەرێوەو، تەپل و زورنا بۆ رێبازی چەوت و چەوێڵ و، چەواشەکەرانەی حیزبەکانیان لێدەدەن، هەست بەوە دەکا، کە ئەمانە پێیانوایە نهێنییەکی زۆر، شاراوەو گرنگیان دۆزیەوەتەوە، ئەوەش ئەوەیە کە، حکوومەتی برایم جەعفەری، "نیازی خراپە بەرامبەر بە کورد"، چۆنکە لەبەرنامەی حکوومەتەکەیدا، نەباسی "تایبەتمەندیی هەرێمی کوردستان" کراوەو، نە "ئاماژە کراوە بە قانوونی کاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەت" و نە "نێوی پەرلەمانی کوردستان" هێنراوەو، نە "ئاماژە کراوە بە مادەی 58ی قانوونی کاتی بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکووک"، ئەمە بێجگە لەوەی کە لەسوێندنانی وەزیرەکانی کابینەی جەعفەریدا، وشەی "فیدراڵی و دێموکراتی" پەڕێنرابوون. ئەوەشی بچێتە سەر، کە حکوومەتی جەعفەری، لەرێی وەزیری نێوخۆکەیانەوە، بەیان جەبر سۆلاخ، کە ترکمانێکی شیعەیەو، باوەڕپێکراوی رژێمی ئێرانە -ئەمەشم دەمێکە باسکردووە، بەتایبەتی لەوتووێژی رۆژی 12ی گولاندا لەگەڵ رادیۆی ئوسترالیا، کە رادیۆی "رۆژاڤا"ش چەند جارەکی دیکە بڵاویکردەوە- بڕیاری دەرکردنی دوو هەزارو پێنجسەت ئەفسەرو پۆلیسی کوردی لەکەرکووک داوە. ئەوەجا ئێستە دەبێ، قسە نەستەقە کوردییەکە بێتەوە بیرمان کە دەبێژێ "چرا هەڵکەیت، هەر گووی تێدا ماوە".

ئێستە ئەگەر یەکێك ویژدانی هەبێ و، رۆژنامەی "میدیا"ی خوێندبێتەوە، کە دڵنیام سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە دەیخوێننەوە، زۆر باش ئاگای لەوە هەیە کە دەمێکە باسی ئەوەمکردووە کە ئاغای جەعفەری فارسەو

گوێرایەڵو خزمی مەلا سیستانییە، بەپێی هەواڵێك كە رۆژنامەی "كیهان" (چاپی لەندەن 1057، 5/6- 2005/6/1) بلاویكردووەتەوە. كەمال خەرازی وەزیری دەرەوەی رژێمی مەلاكانی ئێران كە چووە بۆ عێراق، چووە بۆ سەردانی مەلا سیستانی، مەلا سیستانی زۆر بەگەرمیو دۆستانە پێشوازی لە خەرازیو هاورێكانی كردووەو، كاتێكی زۆری داوە پێیان بۆ مانەوە لەلایو خۆشەویستیی فرەی خۆی بەرامبەر بە خەڵكی ئێران پێشانداوەو گوتوویەتی هەموو كاتێك دوعای خێر بۆ گەلی ئێران دەكاو، بە (ئیئتیلافی یەكگرتووی عێراق) یشی گوتووە كە مافی "كەمایەتیی سوننی" ون نەكەن. بەراستی سیستانیو جەعفەری هەردووكیان هیچیان پێنییە بۆ كورد، پتر لە خاپاندنو دەستبرینو كاتبردنەسەرو خۆ كۆكردنەوە بۆ پەلاماردانی كورد، ئەوجا پەلامارێكی گەلێك خراپتر لە ئەنفالەكەی سەددام، چۆنكە، ئەمجارە، هەرچەندە بەسەر زاری، بەناوی دێمۆكراتیو هەڵبژاردنیی ئازادو بردنەوەی زۆربەی زۆری دەنگەكانەوە دەبێ، بەلام، لەبنچینەدا، ئامانجی ئەمانە، دامەزراندنی رژێمێكی دیكتاتۆرانەی ئاینیو گەلە كۆمەڵییە، كە ئەمەیان، گەلێك مەترسیدارترو دەستوەشێنترو خوێنرێژترە لەدیكتاتۆرێتیی تاكەكەسیو حیزبیو، ئەوەی وای لە جەعفەریو مەلا سیستانیو سۆلاخو موقتەدا سەدرو گەلەكۆمەی شیعەكان كردووە، كە جارێ هێمن بنو چاوەروان بكەن، ئەوەیە كە هێشتا لاوازو بێدەسەلاتنو، بەربەرەكانێی سوننییەكان لەدژیان بەهێزەو، ئەمریكاش لەعێراقدایە، ئەگەرنا، دەمێك بوو پەلاماری كوردستانیان دابوو. دەمێكە باسی ئەوەشمكردووە كە شیعەكان لەكاتی بێهێزیو دەستنەرویشتندا، پەنا دەبەنە بەر ئەو پرنسیپەی كە، نێویان ناوە "تقیە" واتە، خۆشاردنەوەو بێدەنگبوونو دەرنەبرینی مەبەستی راستینەی خۆیان، ئەمەش لەگەڵ تێپەربوونی سەتان ساڵدا بووەتە

پاڵپێوەنەرێك بۆ خووگرتن بەدرۆكردنەوەو، دانانی درۆ بە "حەلاڵ" بۆ خۆیان، كە بە "درۆی شەرعی نێوی دەبەن" هەر ئەم پەروەدەیەشە كەوایكردووە، كاتێك كە تۆ لەگەڵ فارسێكدا دەكەویتە قسە، لەباتی جارێك دەجار، "باڵێ، باڵێو چشمو چاكرتمو قوربانت بروم"و چیو چی دەبیسیت لێی، گومانت لەوە دەبێ، ئایا ئەم زمانە شیرینە چەورەی، ئاوێنەی هەستی دەروونێتی یان نا!!

دەڵێن، قسە قسە دێنێ... ساڵانێك لەمەوبەر، ڕۆژێكیان وارێككەوت لەگەڵ ئاسیاوێكی عەرەبدا، ماوەیەك بەسەر شەقامێكدا پێكەوە ڕۆیشتین، لەپڕ تووشی دۆستێكی فارس بووم، كە ڕووبەڕووی ئێمە دەهاتو، ماوەیەك وەستاین لەگەڵیەك‌و، هێندەك لەهەواڵی یەكدیمان پرسیو، كە جیابووینەوە، ئاسیاوە عەرەبەكە گوتی، "وادیارە ئەو كوڕە فارس بوو". گوتم: چۆنت زانی؟ گوتی: كەمێك فارسی تێدەگەم، چونكە لەنێویاندا ژیاوم". ئەمەشی بەجۆرێك گوت، كە ناچار بووم بێژم "پێموایە، دڵگرانیت لێیان". گوتی "ببوورە، بەڕاستی نامەوێ بزانم دۆستایەتیی تۆ لەگەڵ ئەو كوڕە فارسە چۆنە..." قسەكەم پێبڕیو گوتم" ئەو برادەرە دەمێكە دەناسمو، كوڕێكی زۆر باشەو دڵپاكە"، گوتی "ئەوە نازانم، بەڵام هەر كاتێك فارسێك ببینم، درۆم بیر دەكەوێتەوە".

نامەوێ زۆر لەسەر ئەم بابەتە بڕۆم، ئەوەندە نەبێ كە بێژم، سەرەتای "تقیە" كە "كتمان" (دەرنەخستن)یشی پێدەڵێن، لەئیسلامیشدا هەیە، ئەگەرچی بەم شێوەیە نییە كە شیعەكان بەكاریدەهێنن. ئەوەتا لە حەدیسێكی پەیامبەری موسڵماناندا هاتووە كە دەبێژێ: "إستعینوا علی قچاو حوائجكم بالكتمان، فإن كل ژی نعمۃ محسودً". لەگەڵ ئەمەشدا، پێدەچێ كە ئەم پرنسیپی "تقیە"و "كتمان"ەی، لای فارسەكان، مێژوویەكی كۆنی هەبێ، چونكە زەردەشت، ئاینێك‌و فەلسەفەیەكی

گەورەو گرانی لەسەر بنچینەی چوون بەگژدرۆدا دامەزراندووە، تەنانەت وشەی "درۆ" لەوشەی " درنج"ەوە هاتووە کە بە پەهلەوی "درۆژ"ە، (سەرنجی وشەی "دێوو درنج بدەن" کە دیارە دێوو درنج بەدوژمنی خودێ دراونەتە قەڵەم) وکوردیش، زۆر جار، "دزو درۆزن" پێکەوە بە کار دەبن.

پاش ئەم پێشەکییە، دەمەوێ چەند پرسیارێکی رەوا ئاراستەی دوو زلحیزبەکەو هەموو ئەوانەش بکەم کە بەفەرمانی ئەم دوو زلحیزبە، دەجووڵێنەوەو، هەموو ئەوانەش کە لەنێوەوەو دەرەوەی وڵات وهێندێکشیان بە ئاڵای کوردستانەوە چوونە هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقەوەو، بەدەستی خۆیان، خۆیان کرد بەعێراقیو، تکام ئەوەیە وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە، کە دەمێکە کردوومن، خۆ ئەگەر سووتیشیان نەبێ، زیانیان نییە:

* باشە! کە بەرنامەی حکومەتەکەی جەعفەری ئاوابێ، ئێدی بەڵگەی ئەم دوو زلحیزبە چییە بۆ مانەوە لەنێو حکوومەتی شیعەکانداو، چاوەڕوانکردنی بێکەڵکەو دواخستنی هێنانەدی مافەکانی کورد، هەتاکو جەعفەری، یان یەکێکی دیکە لەوپەڕگر (متگرف) تر، خۆی بەهێز دەکا کە بتوانێ، بەزۆری ژمارەی شیعەو، دەنگی دژ بەکوردی زۆربەی خەڵکی عێراق، کورد بیدەنگ بکاو داخوازییەکانی کورد بەشێوەیەکی "دێمۆکراتانە" پێشێلبکا؟ بۆچی دەبێ ئەم هەلە بدرێ بە ئاغای جەعفەریو داروودەستەی؟

* ئایا دوو زلحیزبەکە دەڵێن چی بەرامبەر بەوەی کە رژێمی ئێرانو رژێمی ترک رێککەوتوون، لەسەر ئەوەی بەیارمەتیی حکوومەتی جەعفەری شەڕ بەو گێریللایانەی PKK بفرۆشن کە پەنایان هێناوە بۆ چیای قەندیل؟ ئەمە لەکاتێکدا کە PKK وازی لەهەموو داخوازییەکی بنچینەیی خەڵکی

کوردستان هێناوەو، بەوە رازییە کە رژێمی ترك "لێبوردنێکی گشتی" دەربکا بۆیان و، ئەوانیش بگەڕێنەوەو بکەونە کار بۆ دامەزراندنی "کۆماری دێموکراتی ترکیا". ئایا دوو زلحیزبەکە لە جەعفەریان پرسیوە، کە چووە بۆ ئەنقەرە، باسی چی بەنهێنی کردووەو لەبەرچی هۆشیار زێباری لەگەڵ خۆی نەبردووە؟ ئایا رێزگرتنی لە "هەڤاڵبەندێتی"ی کورد ئەمەیە؟

* ئایا دوو زلحیزبەکە دەڵێن چی بەرامبەر بەو قسەیەی جۆرج دەبلیو بوش کە گوتی "دێموکراتیی ترکیا، نموونەیەکە بۆ هەموو رۆژهەلاتی ناڤین"؟ بۆچی سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، نەیانتوانیوە، یان نەیانویستووە، تائێستە، لە جۆرج بوش، یان لەو وەزیرانەی بوش کە هاتنە کوردستان بگەیێنن، کە ئەگەر "دێموکراتی ترکیا" ببێتە نموونە بۆ رۆژهەلاتی ناڤین، مانای وایە دەبێ کورد واز لە زمان و فەرهەنگ و خاك و تەنانەت بوونی خۆشیان بهێنن؟ ئایا ئەم قسەیەی جۆرج دەبلیو بوش، لەگەڵ ئەو قسەیەی خانمی کۆندا لیزارایس، یەکدەگرنەوە کە لەهەولێر باسی هاوڕێیەتیی گەلی کوردو گەلی ئەمریکای کرد؟ ئایا مام جەلال، کە چەند مانگێکی کەمی ماوە وەك سەرکۆمار، بیری لەوە کردووەتەوە کە ئەم دەرفەتە بەکاربهێنێ و چەند سەفەرێکی ئەمریکاو ئەورووپا بکاو، کێشەی کوردو کوردستان لەدەستەلاتدارانی ئەو ولاتانە بگەیەنێ؟ ئایا چوونی مام جەلال بۆ، ئەنقەرەو تاران و دیمەشق بەکاری کوردو کوردستان دێ؟.

* ئایا سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، هیچ کاتێك بیریان لەو کردووەتەوە کە هۆی هەرەسەکەی بەهاری حەفتاو پێنج، شل و فشەڵیی رێککەوتنی مارتی حەفتا بوو، کە چوار ساڵ کاتی دا بە سەددامو رژێمەکەی، تا خۆیان بەتەواوی کۆکردەوە؟ ئایا ئەگەر لەوە وانەیەك فێر بووبن، نەدەبوو جارێ نەچنە هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراقەوە، هەتا کێشەی کەرکووك و کێشەی خاکە بە عەرەبکراوەکانی دیکەی باشووری کوردستان تەواو

دەبوو؟ ئایا سەرکردەکانی کورد، بەرپرسیار نین لەوەی کە تا ئەڕۆ، جەعفەری، نەك هیچ هەنگاوێکی لەو بارەوە نەناوە، بەڵکو لەسەر نەخشەی بەعسییەکان دەڕوا بەڕێوە؟ ئایا ناکرێ ئولتیماتۆمێك (انڎار) بدەن بە جەعفەری‌و ڕەپوراست بێژن پێی، ئەگەر لە ئەوڕۆوە تا یەك مانگ، داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان جێبەجێنەکەیت، ئێمە لەحکوومەتەکەت دەردەچین؟ ئایا ئەو وریاکردنەوەیە کە ئەگەر بەڕاستی بێ، کورسی تەقولەقی جەعفەری تەقولەقتر ناکا؟ باشە، بۆچی دەبێ دۆخی عێراق‌و حکومەتی جەعفەری کە ئامانجی بەعەرەبکردنی کوردستان بێ، بەخوێنی سەربازی کورد بەرەو سەقامگیری ببرێ، بۆچی نابێ لیستی هاوپەیمانی کوردستان لەحکوومەتی جەعفەری بکشێتەوەو، حکومەتی جەعفەری تادرەنگ نەبووە، بڕووخێنرێ.

* ئایا دواخستنی دەستبەکاربوونی پەرلەمانی پارتی‌و یەکێتی بۆ ماوەی چوار مانگ‌و، یەکنەگرتنەوەی دوو بەڕێوەبەرێتیەکەی سلێمانی‌و هەولێرو ڕێگرتن لە دامەزراندنی بەڕێوەبەرێتیی پارێزگەی کەرکووك، لەبەر خاتری بەرژەوەندیی تەسکوتروسکی حیزبایەتی، نەبوو بەهۆی ئەوەی حکومەتی جەعفەریش‌و دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانیش، زات بدەنە بەر خۆیان‌و، یەك هەنگاو بەڕێی مافی کورددا نەیەنە پێشەوە؟ ڕۆژنامەی "خەبات"یش دەنووسێ: ڕۆشنبیران مافی ئەوەیان نییە بپرسن بۆچی وتووێژی دوو حیزبە سەرەکییەکە بێ ئەنجام بوو" یان بزانن "بۆچی ڕاگەیاندنی پێکهاتن دوادەخرێ" "خەبات" ئەمە بە کلکایەتی بۆ جەماوەر دادەنێ (خەبات ژ 1817، 6/7) واتە "خەبات" دەیەوێ ڕۆشنبیران قوڕوقەپ بکەن بەرامبەر کەڵەگاییی دوو زلحیزبەکە.

* ئایا نەدەبوو، پاش ئەوەی جەعفەری وشەی فیدراڵی‌و دیمۆکراتی لەسوێنددانی وەزیرەکانی لابرد، سەرکردەکانی کورد ڕێنەدەن

بەسوێندخواردنەوەی، بەڵکو وەزیرەکانیان بکێشنەوەو، ئەو وەزیرانەی کە بەو سوێندە نادروستە رازیبوون بخەنەبەر لێپرسینەوەو، هەروەها جەعفەری خۆشی بخەنە بەر لێپرسینەوەو، تەنانەت دادگەییکردنیش؟ بەرامبەر بە چ دەسکەوتێك ئەم مافە رەوایەی کوردیان، ئا بەو شێوەیە کردە قوربانیی هیچ؟

* چەند جارو چەند جار گوتوومەو نووسیمە، کە بنەماڵەی حەکیم لە نەجەف، بنەماڵەیەکی فارسن. "مجلس اعلای انقلاب اسلامی عراق" لەساڵی 1982داو لەئێران بەفەرمانی خامەنەیی دروستبوو. سەرکردەکانی ئەم "مجلس"ە، باقر حەکیمو حەمید رەزا ئاسەفیو هاشمی شاهروودی بوون. ئەمانە کە بەدرۆ، خۆیان بەعێراقی دەدایە قەڵەم، هەرزوو دەرکەوت کە ئەوانە فارسن، حەمید رەزا ئاسەفی ئێستە قسەکەری رژێمی ئێرانە لەتارانو، هاشمی شاهرودیش، سەرکردەی دادگەکانی ئێرانە (قاچی القچاە)ە. میلیشیای "بەدر"یش، چەند هەزار چەکدارێکن کە لەلایەن حیزبوڵڵای ئێرانەوە مەشقیان پێکراوەو بەشێکیان لەسەردەمی رژێمی سەددامداو، لەژێر سایەی حکوومەتی "یەکێتی"دا لەسلێمانی دەژیانو یەك گوللەیان نەناوە بەرژێمی سەدامەوەو، لەکاتی گرانیو بێنانیدا لەباشووری کوردستان، کە کورد شێوی شەویان نەبوو، ئەو "بەدرانە"، باشترین خواردنیان دەدرایەو، باشترین ژیان دەژیان. ئەوجا ئێستە کە دەرکەوتووە ئەمانە کێنو بنەماڵەی حەکیم بەرامبەر بە مافی کوردو بەتایبەت کەرکووك چ "دەفەرموون"، ئایا راستە، یەکێکی وەك مام جەلال بچێ پیرۆزبایی لە دارودەستەی "بەدر" بکاو پەسنیانبدا؟ ئایا ئەمە هەڵوێستێکی بەرپرسیارانەیە لە مام جەلالەوە؟ ئەمە لەکاتێکدا کە دارودەستەی حەکیم، نەچوون بۆ پیرۆزباییی پەرلەمانی پارتیو یەکێتیو، نەچوون بۆ سەرخۆشیی کەسوکاری قوربانییەکانی کاری تیرۆریستانەی

1ی شوباتیش‌و کەسیشیان نەناردە کوردستان؟ برای بەڕێز مام جەلال، دەبیٚ بزانیٚ کە ئەو بەدەنگی کورد بووە بە سەرکۆماری عێراق، نەك بەدەنگی چەکدارەکانی بەدرو بنەماڵەی حەکیم‌و جەعفەریی ئەڵقە لەگوێی مەلا سیستانی. مەلا سیستانی، لەلای مەلاکانی سلێمانی کە چووبوون بۆ لای، پشتگیریی عەرەبە هاوردەکانی کەرکووکی کردو، دژی قانوونی بەڕێوەبردنی کاتیی دەوڵەت پەیامی بۆ ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی نارد.

* کیٚ بەرپرسیارە لەوەی کە هەڵبژاردنی سەرۆکی هەرێم هێندە، دواخرا؟ ئایا دیاریکردنی سەرۆکی هەرێم لەلایەن پەرلەمانی پارتی‌و یەکێتییەوە، مانای ئەوە نییە کە سەرۆك هەرێم دەبێتە سەرۆکی سلێمانی‌و هەولێرو دهۆك‌و، ئەمەش وەك بەڵگەیەك دەکەوێتە دەست داگیرکەران‌و نەیاران‌و، ئەو حەلە دەبێژن: خۆتان ئەوەتانکردووە!! ئایا راستتر نەبوو، وەك لەوتاری "ئەفسانەی سەرۆکایەتیی هەرێم"دا نووسیبووم (میدیا ژ/ 194) سەرۆکهەرێم بەهەڵبژاردن بیٚ‌و، ئەوجا لەهەموو ستانەکانی کوردستانداو، هەروەها لەبەغداو ئەو شوێنانەی، کە کوردستانی‌و کوردی لێن، بەڵام کوردستان نین‌و، هەر لەو کاتەشدا بیروڕای کۆمەڵەو حیزب‌و رێکخراوو کەسایەتییەکانی هەموو پارچەکانی کوردستان‌و ئەورووپاو ئەمریکا وەربگیرایە، کە ئەمە دەبوو بە بەڵگەنامەیەکی قانوونی بۆ ئەوەی کە سەرۆکهەرێم، سەرۆکی هەموو کوردو کوردستانییەکانە، نەك سەرۆکی سیٚ ستان. سەرۆکهەرێم دەبیٚ بەو شێوەیەی سەرەوە هەڵبژێردریٚ‌و، دەسەڵاتێکی وایپێبدریٚ وەك سەرۆککۆمار. بەتایبەتی دەبیٚ فەرماندەی هێزەکانی لەشکری کوردستان بیٚ‌و، جێگری نەبیٚ، بەڵکو لەکاتی پێویستدا سەرۆکی پەرلەمان بریکاریی بکاو، باشتریش ئەوەیە سەرۆکهەرێم دەسەڵاتی سەرۆکوەزیرانیشی هەبیٚ‌و، واتە پایەی

سەرۆکوەزیران لابیرێ. بەڵام سەرۆکهەرێم دەبێ چەند راوێژکارێکی هەبێ، وەك راوێژکاری قانوونی، راوێژکاری رامیاری، راوێژکاری سوپایی، راوێژکاری فەرهەنگیو... هتد. بە بۆچوونی من دەبێ سەرۆکهەرێم ئاوا هەڵبژێردرێو، ئەو دەسەڵاتەشی هەبێ کە باسمکرد، ئەگەرنا، ئەگەر ئەمەش بکرێتە حیزبحزبێنە، ئەوا سەرۆکهەرێم نەبێ باشترە.

* ئایا ئەم هەموو هەوڵو تەقەلاو پاڕانەوەیە لەعەرەبە سوننیەکان بۆ بەشداریکردن لەحکوومەتی عێراقو بەشداریکردن لەنووسینی دەستوری عێراقدا، هیچ سووتێك بە کوردو کوردستانییەکان دەگەیێنێ، لەکاتێکدا کە هەڵوێستی زۆربەی زۆری سوننییەکان ئەوەیە کە عێراق وەك گەلو خاك بەشێکە لە "نیشتمانی عەرەب"و کەمەیەکی کەمیشیان لەبابەتی چیرۆکی شێخە کەبابخۆرەکەی کاك خەفوور مەخموورییە.

* ئایا پەرلەمانی پارتیو یەکێتی دەتوانێ خۆی بەنوێنەری کوردستان بزانێ ئەگەر ئاوا بەرامبەر تیرۆرکردنی زاناو خەباتکاری گەورەی کورد شێخ مەعشووقی خەزنەوی، بێدەنگ بێ؟ ئایا راستە کە ئەم پەرلەمانە لەکوشتاری رۆژی یەکشەممەی خۆپێشاندانی قامشلۆ بێدەنگ بێ؟

بەڕاستی، ئەگەر خۆمان نەخڵەتێنین، دەبێ دان بەوەدابنێین، کە کێشەی کورد، پاش ئەوەی تیشکی هیوایەکی بەر کەوت، ئێستە، بەسایەی حیزبحزبێنەوە بەرەو چارەنووسێکی لێڵو تەماوی هەنگاو دەنێ.

بەرلین 2005/6/10

**میدیا**، ژ 195، 2005/6/14

### هەباسەا لە ئێران و دەوروبەر، چ باسە؟

# کوردستان، لەبەردەم دووڕێیانی ئازادی، یان بە قوڕی رەشدا چوونە

پاش ئەوەی مەلا محەممەدی خاتەمی، سەرکۆماری ئێران، هەشت ساڵی رەبەق خەڵکی ئێرانی بەدرۆی "مردم سالاری مژهبی" (سەروەریی ئاینانەی گەل)و، "چاکسازیی" (ریفۆرم) تەفرەدا، بەرەی بەرهەڵستکاران و رەخنەگرانی دژ بەرژێمی مەلا فەرمانیی ئێران، چ کۆمارخوازان و چ شانشینخوازان و چ "موجاهیدینی خەلك"و چ داروودەستەی کۆنە چەپییەکان و، تەنانەت گەلێك لەرۆشنبیرانیش، دەیانگوت و دەیاننووسی، کە زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی ئێران، ناچن بۆ هەڵبژاردن و، ئەوەش دەبێتە بەڵگەیەك بۆ ناڕەوایەتیی رژێمی ئێران و، رێش دەکاتەوە بۆ گشتپرسییەك، کە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی "ویلایەتی فەقیە". کاربەدەستەکانی رژێمی ئێرانیش کەوتنە خۆیان و، بەئاشکرا بڵاویانکردەوە، کە ئەوی نەچێ بۆ دەنگدان، "وەك تیرۆریست" تەماشا دەکرێ و، بەشداریکردنیان لەهەڵبژاردندا، بە "تەکلیفی شەرعی" دایە قەڵەم. ئەم هەڵوێستەشیان کوتومت، وەك هەڵوێستی کاربەدەستەکانی دوو زلحیزبەکەی باشووری کوردستان بوو، کە دەیانگوت ئەوی نەچێ بۆ هەڵبژاردنی سەرتاسەریی عێراق و، دەنگنەدا بە لیستەکەیان، ئەوا "خاین و نۆکەری بێگانە"یە. ئەمە لەکاتێکدا، کە لەسیستەمێکی دێموکراتیدا، بەشداریکردن لەدەنگداندا بۆ پارلەمان، "ماف"ە، نەك "ئەرك". مرۆڤیش دەتوانێ، مافی خۆی بەکاربهێنێ، یان نەهێنێ، بێ ئەوەی ببێتە "تیرۆریست"، یان "خاین و نۆکەری بێگانە"، یان لەسەر ئەوە سزا بدرێ.

لێرەدا ئەگەر سەرنجێکی وڵاتە دیموکراتەکان بدەین، بۆ نموونە وڵاتەکانی ئەورووپا، دەبینین هیچ کاتێك، هیچ کەسێك بەزۆر نانێردرێ بۆ هەڵبژاردن. جاری واش هەیە کە لەو وڵاتانەدا، تەنێ 40٪- 50٪، یان لەو ڕێژەیەش کەمتر، دەچن بۆ دەنگدان، کەچی ئەو حکوومەتەی کە لەئەنجامی ئەو دەنگدانەوە دادەمەزرێ، هەموو لایەك دان بەڕەوایەتییدا دەنێن، تا هەڵبژاردنێکی دیکە. چۆنکە دەزانن کە، ئەو حکوومەتەی بەدەنگی خەڵك هاتووتە سەر کار، هەر بەدەنگی خەڵکیش لەکار دەخرێ‌و دەگۆڕدرێ. بەڵام لەوڵاتێکی دیکتاتۆریدا، ڕژێم بۆ پێشاندانی ڕەوایەتیی خۆی، پێویستی بە زۆربەی هەرە زۆری دەنگەکانە، تا "ڕەوایەتیی" خۆی بخاتە بەرچاو. لەبەر ئەوە، بەزۆری زۆردارەکی، خەڵك ناچار دەکا دەنگبدەن بۆی‌و، ئەوی زاتبکاو دەنگنەدا بۆی، دەبێ نانبڕین، یان زیندانی، یان کوشتنی خۆی لەبەرچاو بێ. هەر لەبەر ئەمەشە، کە جاری واهەیە، سەرکۆمارێك بە 99.99٪ دەنگەکان هەڵدەبژێردرێ، وەك سەددامی عێراقی‌و حافز ئەسەدی سووریا.

لەوڵاتێکی وەك ئێراندا، هەرچەندە دەسەلات بەدەست چینی مەلاکانەوەیە، بەڵام تاکە نێوەندێکی دەسەلات، هەتا ئەوڕۆ پەیدا نەبووە. جا ئەگەرچی خامەنەیی، وەك "ڕێبەر"و "جێنشینی ئیمام خومەیەنی"و "وەلی فەقیهی خاوەنی دەسەڵاتی بێسنوور" فەرمانڕەواتییدەکاو، لەدەستووریشدا دەسەڵاتەکانی چەسپێندراوە، بەڵام کەسانی دیکەی قسەڕۆیشتوو، هێشتا هەر هەن، یەکێك لەوانە عەلی ئەکبەری هاشمی ڕەفسەنجانی یە، کە یەکێکە لەدامەزرێنەرانی "کۆماری ئیسلامیی ئێران"و، هاوکاری خومەینی‌و، هەشتساڵیش سەرکۆمار بووەو، ئێستەش سەرۆکی "کۆڕی دەستنیشانکردنی بەرژەوەندیی ڕژێم" (مجمع تشخیص مصلحت نظام)ە.

هەروەها مەهدی کەڕووبی، کە کوردێکی لوڕییەو، ماوەیەك سەرۆکی "پەرلەمانی ئیسلامیی ئێران" بوو، لەگەڵ چەند کەسێکی دیکە.
شایانی باسە، نێزیکەی هەزار کەسێك خۆیان نێو نووسکرد بۆ چوونە نێو شەڕو گەڕی هەڵبژاردنەوە، بەڵام "شورای نگبهان" (کۆڕی چاودێری) تەنێ چوار کەسی لێهەڵبژاردن، کە یەکێك لەوانە ڕەفسەنجانی‌و، ئەویدیکەش مەحموود ئەحمەدی نەژاد بوو، لەپاڵ مەهدی کەڕووبی‌و، سەرلەشکر محەممەد باقیر قالیباف. بەڵام پاش ئەوەی خاتەمی کەوتە گلەیی، خامەنەیی فەرمانیدەرکرد، دوو کەسی دیکەش نێویان بخرێتە لیستەکەوە، کە یەکێکیان مستەفا موعینی سەر بە ڕێبازی "ریفۆرم"ی خاتەمی بوو.
بەکورتی 46.786.418 کەس مافی دەنگدانیان هەبوو، کە سەرەڕای هەموو هەڕەشەو گوڕەشەیەکی ڕژێم، تەنێ 29 ملوێن‌و 31742 کەس چوون بۆ دەنگدان، واتە 17 ملوێن‌و نیوێك بەشدارییاننەکردو، ئەوەبوو لەئەنجامی هەڵبژاردندا، هاشمی ڕەفسەنجانی 6.159.354و مەحموود ئەحمەدی نەژاد 5.710.374 دەنگیان هێناو، بەوە هەڵبژاردنی یەکێك لەو دووانە، کەوتە گەڕی دووەمەوەو، لەوەدا مەحموود ئەحمەدی نەژاد، پێش ڕەفسەنجانی کەوت‌و، ئەوەش بوو بەهۆی ئەوەی کە مەهدی کەڕووبی، لەنامەیەکدا کە بۆ خامەنەیی ناردبوو، باسی ئەوەیکردبوو کە کوڕی خامەنەیی، دەستی لەهەڵبژاردندا تێکەڵکردووەو، ساختەکارێتی کردووە بۆ بەرژەوەندیی کاندیدی سەر بەرژێم‌و، ڕەفسەنجانیش گوتی لەهەڵبژاردندا شتی ناشرین ڕوویانداوە، بەڵام ئەو "شکاتی خۆی دەباتە لای خودێ!".
هێژای گۆتنییە، کە ڕەفسەنجانی، ئەو پیاوەیە، چ لەلایەن دادگەی بەرزی ئەڵمانیاوەو، چ لەلایەن گەلێك لە بەرهەڵستکارانی ئێرانەوە، بەوە تۆمەتبار دەکرێ کە دەستی هەبووە لەکوشتنی دوکتۆر قاسملو لە ڤیەنناو، دوکتۆر

شەڕەفکەندی‌و هەڤاڵەکانی لەبەرلین. لەگەڵ ئەوەشدا، دارودەستەی خاتەمی، کە دییان مستەفا معین نەیبردووەتەوە، هەموو دەنگەکانیان دا بە ڕەفسەنجانی، بۆ ئەوەی مەحموود ئەحمەدی نەژاد نەیباتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ریسەکەیان بووەوە بە خوری.
ئەحمەدی نەژاد، وەك خۆی بەدەمی خۆی دەبێژێ، گوێڕایەڵی فەرمانی "وەلی فەقیە"، واتە، خامەنەییە. کاتی خۆشی، یەکێك بوو لە "قوتابیانی هێڵی ئیمام" (دانشجویان خگ امام) کە لە 1979دا پەلاماری سەفارەتخانەی ئەمریکایاندا لەتاران‌و، کاربەدەستانی سەفارەتخانەکەیان 444 ڕۆژ بەدەستبەسەری‌و تۆقاندن، لە خانووی سەفارەتخانەکەدا هێشتەوە. بێجگە لەوەش، وەك پاسدار، لە جەنگی کوردستاندا بەشداریکرد، پاش ئەوەی خومەینی بانگی "جیهاد"ی دا دژ بەکورد. لە پاداشی خزمەتەکانیدا بۆ ڕژێم، کرایە فەرمانداری شاری دە ملوێنی تاران.
ئەوەی لەم کابرایەی دەگێڕنەوە، ئەوەیە، ژیانێکی سادەو ساکارانەی بردووەتە سەرو، دژ بەدزێتی‌و بەرتیلخواردن بووەو، ئەمەش کارێکی وایکرد، کە بتوانێ جەماوەرێکی گەورەی خەڵکی گوندەکان‌و هەژارو دەستکورتەکانی تاران، لەدەوری خۆی کۆبکاتەوەو، دەنگەکانیان لەهەڵبژاردندا مسۆگەر بکا. ئەمە بێجگە لەوەی کە، خامەنەیی‌و پاسداران‌و بەسیج، هەموو پشتیوانیان لێکردو گرەوی لە ڕەفسەنجانی بردەوە، کە کەم کەس ئەمەیان بەخەیاڵدا دەهات، کە کەسێکی وەك ئەحمەدی نەژاد لەڕەفسەنجانی پتر دەنگبهێنێ‌و 29 ملوێن کەسیش بەشداری هەڵبژاردن بکەن، لەکاتێکدا کە حیزب‌و کۆمەڵە بەرهەڵستکارەکان بانگی بۆیکۆتی هەڵبژاردنیاندا.
گەیشتنی ئەحمەدی نەژاد بەپلەی سەرکۆمار، دەسکەوتێکی دیکەی ڕژێمی ئێرانە، لەکاتێکدا کە پارلەمان‌و، "شورای نگهبان"و، "مجمع

تشخيص مصلحت نظام"و، دەزگەی دادوەریو، دەزگەی دۆزگرێتی گشتی (الادعاو العام)و هێزی لەشکرو سوپاو بەسیج، هەمووی سەر بەرژێمە. جا ئەوەی لێرەدا پێوەندیی بە کوردەوە هەبێ ئەوەیە، رژێمی ئێران، لەمەولا پتر لەجاران، توندوتیژترو تەنگەتیلکانەتر دژی کورد دەوەستێو، دەسەلاتی رژێمیش بۆ پەلاماردانی کورد، گەلێك لەجاران پترە. بەتایبەتی، چۆنکە ئەو حیزبو کۆمەڵو دەستانەی کە دژ بەرژێمی ئێرانن‌و بە "ئۆپۆزیسیۆن" نیویانڕۆیوە، زۆربەی زۆریان، ئەگەر لەرژێمی ئێران خراپتر نەبن بەرامبەر بە کوردو داخوازییەکانی، بێگومان کەمتر خراپ نین. ئەوانە، ئەگەر دوو وشە بەسەر دەمیاندا بێ، بەدڵنیاییەوە، یەکێکیان "تامیت ارچی"، واتە "تەواوێتیی خاك"ەو، کوردستانیش، بە بەشێك لەولاتی خۆیان دەزانن‌و، کوردیش بە نەتەوە، یان گەل، دانانێن، بەڵکو بە "تیرەیەکی ئێرانی"و، هەوڵدەدەن زمانەکەیان، فارسی، کە لەهجەیەکی تێکەڵە لە عەرەبیو کوردیو ترکی، بەزۆری زۆردارەکی بەسەر کوردو بەلووچو ترکمان‌و عەرەبو ئەوانی دیکەدا بسەپێنن. لەبەر ئەوە، چاوەڕوانیی چاکەو خێرخوازی لەبەرەی ئۆپۆزیسیۆنی ئێرانی ناکرێو، ئەوانە، بەرامبەر بەمافی کورد، لەگەڵ رژێمی ئێران هاودەنگو هاوکارن‌و، رۆژنامەکەشیان "کیهان" کە لە لەندەن دەردەچێ، نموونەیەکە، وەك بەڵگە، بۆ ئەم بۆچوونەی سەرەوە.

وەك جارێکیان لە "میدیا"دا نووسیبووم، ئەمریکا دەیەوێ رژێمی ئێران بگۆڕێ، بەلام نازانێ چۆن. ئەوەی رژێمی ئێرانیش لێی دەترسێ، بوونی بەرهەڵستکارانی ئێرانی لەنێوەوەو لەدەرەوەی ئێران نییە، بەڵکو، بوونی لەشکری ئەمریکایە لە عێراقو ئەفغانستان‌و نێوچەی کەنداودا. لەشکری ئەمریکاش، هەتا لەم دوو ولاتەدا، زێتر لەقوڕدا بچەقێ، بەسووتی رژێمی ئێران تەواو دەبێ، لەبەرئەوە، رژێمی ئێران، هەموو توانستو هێزێکی

خۆی دەخاتە کار، تا ئەمریکا لەعێراق و ئەفغانستان و کەنداو سەرکەوتوو نەبێ، بەڵکو، بەسەری شکاوو پاشڵی دڕاوەوە، لەو وڵاتانە بچێتە دەرەوە. ئەوەی بووەتە پاڵپشتی ئێران لەم رووەوە، ئەوەیە زۆربەی زۆری عەرەبەکانی عێراق، شیعەو گوێڕایەڵی کابرایەکی ئێرانین کە مەلا سیستانییە. بێجگە لەمەش، سەرکردەکانیان، وەك برایم جەعفەری و بنەماڵەی حەکیم و شەهرستانی، هەموویان ئێرانین و، لەسەردەمی سەددامدا، لەئێران بوون و، چاوبەرەژێری رژێمی ئێرانن. ئەوەتا لەم رۆژانەدا، عەبدولعەزیزی حەکیم، بانگێشتنی مەحموود ئەحمەدی نەژادی کردووە، کە بیێ بە میوانی عێراق. برایم جەعفەریش، بەتەمایە بچێ بۆ سەردانی ئێران و، مەلا سیستانیش لەولاوە، خۆی کردەوە بە کەڵەگای خەڵکی عێراق و، دەبێژێ نابێ لەباشووری عێراقدا هیچ جۆرە بەڕێوەبەرێتییەکی فیدراڵی دابمەزرێ. لەولاشەوە، وەزیری دەرەوەی مەلاکانی ئێران، خەڕڕازی، کە هاتە عێراق، لەلایەن مەلا سیستانییەوە بەوپەڕی رێزەوە پێشوازی لێکرا. بەکورتی، رژێمی ئێران جێی خۆی قایمکردووەو، وەك چەند مانگێك لەمەوبەر، رۆژنامەکانی ئێران بڵاویانکردەوە، هەزاران کەس لەئێران خۆیان نێونووسکردووە، کە "ئامادەی خۆکوژین" لەپێناوی "چوونە بەهەشتدا". ئاشکراشە، ئەمانە ناچن لەنێوچەی دەسەڵاتی عەبدولعەزیزی حەکیم و موقتەدا سەدرو برایم جەعفەری خۆ بتەقێننەوە، کە سەر بەخۆیانن، بەڵکو دیارە دەست لەکێ دەوەشێنن. ماوەیەکیش لەمەوبەر، لە"میدیا"دا نووسیبووم کە نەخشەیەك هەیە بۆ ئەوەی کاری تیرۆریستی بگوێزنەوە بۆ ئەو شوێنانەی بەدەست کوردەوەن و، ئەوەبوو لەهەڵەبجەو بادینان و جارەکی دیکەش لەهەولێر، پەلاماردانی تیرۆریستانە روویاندا. ئەوەی پتر یارمەتی رژێمی ئێران و هەڤاڵبەندەکەی، واتە سووریای داوە، کە پێشڕۆیی بکەن، ئەوەیە کە

هەڵوێستی ئەمریکا لەگۆڕەپانی رامیاریدا، هەڵوێستێکی نەشارەزایانەو ناشییانەیە. لەبەرئەوە، ئەمریکاش، وەك کورد، نەمەکی سوێرە. ئەنجامەکەشی دەبینین، کە ئەوەتە، هەموو ئەوانەی کە ئەمریکا ساڵانی ساڵ خزمەتیکردوون‌و پاراستوونی، دژایەتی دەکەن. ئەڵمانیاو فەرەنسا دوو نمونەی دیارو بەرچاون‌و، دەوڵەتی ترکانیش، نموونەیەکی دیکەیە، کە ئەوەتە پەنجا ساڵ پترە، بەهۆی ئەمریکاوە توانیوێتی هەموو جۆرە دەستدرێژییەك‌و تاوانێك بەرامبەر بەکورد بکا، کەچی لەجەنگی عێراقدا، چەمۆڵەیەکی نا بەڕووی ئەمریکاوە. لەهەمووشی قێزەوەنتر ئەوەیە، لەم رۆژانەدا، رژێمی ترك، رێی داوە، کە لەئەستەمبوول، لە 6/24وە، "دادگەیەك" بەنێوی "دادگەی گەل"ەوە بکەوێتە کار، بۆ دادگەییکردنی جۆرج بوش‌و تۆنی بلێر، بەرامبەر "تاوانەکانیان" دژی گەلی عێراق‌و فەرماندانیان بە لەشکرەکانیان بۆ پەلاماردانی عێراق‌و داگیرکردنی عێراق. خۆیایە، ئەم دادگەیە، هەر بڕیارێك بدا، دەسەلاتی بەجێگەیاندنی نابیٚ، بەلام لەباری مۆرالییەوە، کار کردی خۆی دەبیٚ‌و، ئەمەش دوژمنایەتیی ئاشکراو بێپەردەی رژێمی ترك بەرامبەر بە ئەمریکاو بەریتانیا پێشاندەداو، ئەو پرسیارەش دێنێتە پێشەوە، کە تاکەی ئەمریکا پشتگیری‌و پشتیوانیی رژێمی ترکی دوژمن بەکورد دەکا، کە ئەوەتە نێزیکەی سەتەیەکە بۆ لەنێوبردنی کورد، بەهەموو شێوەیەك تێدەکۆشیٚ‌و، ئێستەش بەم کردەوانەی درێژە بە بەرگریکردن لەرژێمی تیرۆریستی سەددام دەدا؟ ئایا ئەمریکاو بەریتانیا ئامادەن هەڵوێستی خۆیان بگۆڕن بەرامبەر رژێمی ترك‌و، روویەك لەکورد بکەنەوەو یارمەتی کورد بدەن بۆ دامەزراندنی خانوویەکی کوردستانی لەخۆرهەلاتی ناڤیندا، کە ببێتە بنکەیەك بۆ ئازادی‌و دێموکراتی‌و ئاشتی؟ ئایا سەرکردەکانی حیزبە کوردییەکانیش ئامادەن، لەڕێی یەککگرتنێکی چارەنووسسازانەو،

دیپلۆماسیتێیەکی خەستوخۆڵو، وازهێنان لەعێراقچێتیو ئێرانچێتیو سووریاچێتیو حیزبحزبێنە، ئەمریکا دابینبکەن بەوەی، کە ڕێگە چارەی زاڵبوون بەسەر لێشاوی تێرۆردا، تەنێ، دامەزراندنی دەوڵەتێکی دێمۆکراتی ئازادیخوازی ئاشتیخوازە لەکوردستاندا، لەسەر بنچینەی بیرۆکەی شارستانێتیو دادی کۆمەڵایەتی؟ یان، هەروەك خوویان پێوەگرتووە، لەسەر حیزبحزبێنەی بۆگەنکردووی خۆیان دەچن بەرێوەو، ئەم دەرفەتەش لەدەست خەڵکی کوردستان دەدەنو، ئایا حیزبو کۆمەڵەکانی ڕۆژهەلاتی کوردستان، ئامادەن، هەموو یەکبگرنو چاوەڕوانی ئەو هەلە بکەن، کە لاساریو شەڕخوازیی ڕژێمی ئێران دەیهێنێتە پێشەوەو، دەتوانن، ڕێنەدەن بەوەی، شاپەرستەکانو کۆمارخوازەکانو دوژمنەکانی دیکەی کورد لەئێراندا، ئەو دەرفەتە بقۆزنەوەو، بەیارمەتی ئەمریکاو ئەورووپا، جێی مەلاکان بگرنەوەو، ئایا، بۆ وێنە، PKK ئامادەیە دەست لەکورد بەکوشتدان هەڵبگرێ، چ لەباکوورو چ لەباشوورو چ لەڕۆژهەلات، لەپێناوی کارێکی بێ پروگرامو بێ بەرنامەو بێ ئامانجێکی نەتەوەیی بەرچاوی وا، کە بهێنێ ئەم هەموو قوربانییە بدرێ بۆی، یان سۆرە لەسەر ئەوەی لە پێناوی "کۆماری دێمۆکراتی ترکیا"دا، کە هیچ کاتێك نایگاتێ، کوردستان لەوە پتر کاولتر بکاو، لیستەی شەهیدەکانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، درێژتر بکاتەوە؟ ئایا حیزبۆلکەکانی ڕۆژاوای کوردستان کە کەوتوونەتە بوختانکردن بەراپەڕینی جەماوەرانەی خەڵکی قامیشلۆو، داکۆکیکردن بۆ ڕژێمی کوردکوژی سووریا، ئامادەن دەست لەسیاسەتکردن هەڵبگرنو سەری کورد رەحەتکەن؟ ئایا دوو زلحیزبەکەی باشووری کوردستان ئامادەن بەڕاستی یارمەتیی خەڵکی باکوورو ڕۆژهەلاتو ڕۆژاوای کوردستان بدەن، بێ ئەوەی خۆیانبکەن بەدەمڕاستی خەڵکی ئەو نێوچانەو، ئامادەن، حیزبەکانیان بە پارە، یان بەهەڕەشە،

بێدەنگ نەکەن؟ بێگومان ئەو بارودۆخەی کە لەنێوچەی ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا سەریهەڵداوە، دووڕێیانێکی لەبەردەم دواڕۆژی کورددا هێناوەتە پێشەوە، کە یان، کورد سەربەرزانە بەئازادیی خۆی دەگات، یان بەجارێ بەقوڕی ڕەشدا دەچێتە خوارەوە.

ئەوجا، لەبەرئەوەی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان، بەتەمایە، کۆنگرەی پێنجەمی خۆی، لە 30ی ئەم مانگەدا (7/30) لەشاری لەندەن ببەستێ، پێویستە نوێنەرانی هەموو حیزبو کۆمەڵو ڕێبازە کوردستانییەکان، بەشدارییبکەن تێیداو، لەوتووێژێکی بابەتانەدا ڕێگە چارەیەك بۆ پێکەوە کارکردن بدۆزنەوە. هەموو لایەکیش دڵنیابێ، کە هیچ حیزبێك ناتوانێ بەتەنێ، کوردستان ڕزگاربکا، بەڵکو ڕزگارکردنی کوردستان بەهاوکاریی هەموو خەڵکی کوردستان دێتەدی. دەبا، هیچ حیزبێك، ئیدی کەڵەگایی نەنوێنیو شەڕی خۆتڕێن نەکا.

بەرلین 2005/7/1

**میدیا**، ژ 198، 2005/7/5

# کوردستانی سەربەخۆ، لەنێوان خەون و خەیاڵی هۆنەری گەورەی کورد، عەبدوڵڵا پەشێوو، و"واقیع بینی"ی سیاسەتکاری بەنێوبانگی کورد، مام جەلال تاڵەبانییدا

ئەوەی بوو بە پاڵپێوەنەری نووسینی ئەم وتارە، ئەو دوو هەڤپەیڤینە، دوا بەدواییەکە بوو، کە بەڕێز مام جەلال، جارەك لەگەڵ گۆڤاری "Der Spiegel" (ئاوێنە)ی ئەڵمانیو، جارەکی دی لەگەڵ ڕۆژنامەی ترکی "Akşam" (ئێوارە)دا کردبووی، کە ئەوەی "ئاکشام" لەژمارە 197 (2005/6/25)ی "میدیا"دا بەشێکی بەکوردی بڵاوکرابووەوە. مام جەلال لەهەردوو هەڤپەیڤینەکەدا گوتبووی، کە ئەو "بەدرێژاییی (58) ساڵ خەباتی خۆی، بیری لەجیابوونەوەی کوردستان لەعێراق نەکردووەتەوە"و گوتبووی "کوردستانی سەربەخۆ، خەونو خەیاڵی هۆنەرانو ڕەگەزپەرستانی کوردە"و، "ئەو خەیاڵەش، بەهەرەسهێنانی سەددام کۆتاییهاتووە" بێجگە لەوەش، گوتوویەتی، "کە کورد لەبەر هۆی جوگرافیایی، ناتوانن دەوڵەتی سەربەخۆ دروستبکەن"، چۆنکە، "ئەگەر وادابنرێ کە دەوڵەتی کورد دامەزرێندرا، چۆن دەتوانێ بژێ، ئێرانو عێراقو ترکیاو سووریا سنوور دادەخەن لەسەری و، ئەو دەمە، ئەو (مام جەلال) ناتوانێ لەگەڵ پەیامنێری "ئاکشام" (واتە حوسنی مەحەلی کە عەرەبێکی دژ بەکوردی خەڵکی ترکیایە) ، بچێ بۆ ئەستەمووڵ، بۆ ئەوەی لەوێ، پێکەوە ماسی بخۆن".

ئەگەر مرۆڤ ڕۆژنامەی "ئاکشام" بەهوردی بخوێنێتەوە، باش تێدەگا، کە پەیامنێرەکەی، حوسنی مەحەلی، ئەو کابرا عەرەبەی، کە ئەمریکای بە "ئیمپریالیستو داگیرکەری عێراق" دەداتە قەڵەمو، کوردیش بە "هاوکاریکردن لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئەمریکا" تۆمەتبار دەکاو، بەتیرۆریستە کوردکوژەکان، دەبێژێ" "بەرخۆدەر" (مقاوم)، پرسیارەکانی

بەجۆرێکن، کە دەیەوێ، ناڕاستەوخۆ، وەرامەکانی بخاتە نێودەمی مام جەلالەوە. بۆ وێنە، دەبێژێ: "کەواتە بەشداریکردنی کورد لەدەسەلاتدارێتیی بەغدادا، بەپێی بەڕێزتان، کۆتاییهێنانە بەخەونی کورد"، مام جەلال لەوەرامدا دەبێژێ: "ئەوە، بەتەواوی راستە. چۆنکە کورد بۆ یەکەمجار، بینیان‌و تێگەیشتن، کە ئەوان لەپلەی یەکەمدا، هاوولاتی عێراقن. ئێستەش هەر کەس بەعێراقێتی خۆی سەربەرزە".

بەر لەوەی بچمە نیوەڕۆکی باسەکەوە، دەبێ ئەوە بێژم، کە ئەز عەبدوللا پەشێوم، وەك هۆنەر، هەڵبژارد، چۆنکە ئەو بەڕێزە، لایەنگرێکی کۆنی بیری سەربەخۆیی کوردستانەو، سەر بەهیچ نێوەندێکی دەسەلاتی کوردی نییەو، جەماوەرێکی یەکجار زۆری کوردیش هەن، کە حەز بەگوێگرتن لەهۆنراوەکانی دەکەن.

ئێستە، بابێینە سەر شیکردنەوەی قسەکانی برای بەڕێز مام جەلال:

بەڕاستی زۆر سەیرە، سەربەخۆیی کوردستان، ئامانجی رەگەزپەرستەکانی کورد بێ. ئەمە لەکاتێکدا، کە هەوڵدان بۆ سەربەخۆیی هیچ ولات‌و نیشتمانێکی ژێر دەستەو داگیرکراو، نەك هەر رەگەزپەرستی نییەو بەس، بەڵکو کارێکی رزگاریخوازنەیەو، ئەوانەی ولاتێك داگیر دەکەن‌و گەلەکەی بندەستدەکەن، ئەوانە رەگەزپەرست‌و گەلدوژمنن، نەك گەلێکی کەنەفتکراوو، خەڵکی ولاتێکی داگیرکراو. دوایی تێناگەم، ئەوانەی رەگەزپەرستن لەنێو کورددا کێن؟ با زۆر دوور نەڕۆین‌و، باسی ئەحمەدی خانی‌و حاجی قادری کۆیی نەکەین، ئایا شێخ مەحموودی بەرزنجی‌و قازی محەممەدو شێخ سەعیدی پیران‌و عوسمان سەبری‌و سەید رەزاو، چەندین سەرکردەی دیکەی سەربەخۆیخوازی کورد، رەگەزپەرست بوون؟ ئایا هەزاران پێشمەرگەی خۆ بەختکەر کە گوێیان لەسروودی:

"پێشمەرگەین، بەهەڵمەتین
شێری ڕۆژی زیللەتین
لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستان
بەختدەکەین ژیانمان و ماڵ و گیان
لەپێناوی سەربەخۆیی کوردستان"
کە لەبەرهەمی، هۆنەری خودێلێخۆشبوو، خالید دلێرە، کە دلێر، خۆی یەکێك بوو لەئەندامانی حیزبی مام جەلال، ئایا، ئەمانە هەموو ڕەگەزپەرستبوون؟
ڕاستییەکەی، ڕەگەزپەرستی، نەك هەر لەنێو کورددا نییەو، کۆمەڵگەی کوردیش ئەو جۆرە ترادیسیۆنەی نییە، بەڵکو کوردی ناسیۆنالیستیش، وەك ناسیۆنالیستەکانی عەرەب و ترك و فارس، لەنێو کورددا، یان هەر نین، یان زۆر زۆر کەمن و، ئەمەش مایەی خۆشبەختییە.
بەڵێ، جەماوەرێکی زۆر فراوانی نەتەوەیی هەیە، بەلام بیری نەتەوەیی، وەك لەسەمیناری "بیری نەتەوەیی"دا ڕۆناکیم خستووەتە سەر، هیچ پێوەندییەکی بەبیری ناسیۆنالیزمی ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاواییەوە نییە. هیچ کوردێك تائێستە، داوای بەغداو ئەنقەرەو ئەستەمووڵ و دیمەشق و تارانی نەکردووە، ئەگەرچی لەم شارانەدا ملیۆنان کورد دەژین و، کوردی ڕەسەنی ئەو شوێنانەشن و، کەسیش ئەو شارانەی نێونەناوە "شاری برایەتی"!!!
باشە، بۆچی دەبێ بیری دامەزراندنی دەوڵەتێکی فەلەستینی، کە مام جەلال، بە کوڵودڵەوە، بۆ فەلەستینییەکان داوایدەکاو، لەوەشدا ئەز هەقی دەدەمێ، بەلام بیری دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردستانی، بیرێکی ڕەگەزپەرستانە بێ. یان، ئەمە خالانەی ئەوەیە، کە دەبێژن "ڕێوییەکە، دەمی نەدەگەیشتە هێشووە ترێکە بیخوا، دەیگوت، ترش و تاڵە"!؟

سەیر ئەوەیە، مام جەلال لەوتووێژەکەیدا لەگەڵ حوسنی مەحەلی، سنووری دیپلۆماسیێتی دەبەزێنیو، ئەگەر ترکەکان ئەو قسەیە بخوێننەوە، بەگاڵتەی دەزانن، چۆنکە قسەکە لە تەوس (تهکم) دەچێ، کاتێك دەبێژێ "سوننییەکانی عێراق، هەموو دەوڵەتە عەرەبەکانیان لەپشتە، شیعەکانیش ئێرانیان لەپشتە. ئێمەی کوردیش، ترکیا پشتیوانمانە.. هتد". نازانم ئەم پشتگیریو پشتیوانییەی دەوڵەتی ترك، لەکوێداو لەچیدا خوێ دەرخستووە؟ ئایا لەوەدا، کە ماوەی هەشتا ساڵ ترکمانەکانی عێراق، مافیان خورابوو،و ئەو مافەش کە دەستیانکەوت، تەنێ، پاش دامەزراندنی "هەرێمی نەفرین"و دامەزراندنی بەڕێوەبەرێتیی کوردستان بوو. کەچی رژێمی ترك، یەك وشەی دژ بەرژێمەکانی عێراق، لەدەم دەرنەچوو، بۆ پاراستنی مافی ترکمانەکان، بەڵام پاش ئەوەی کە کورد کەوتنە سەر رێی هێنانەدی هێندەك لەئامانجەکانیان، ئەوجا "بەرەی ترکمان"ی لەکورد راستکردەوەو، سەردەمی هەژاریو بێنانیی لەهەرێمی ئاسایشدا بەکارهێنا، بۆ ئەوەی نانو پیازێك بدا بەو خەڵکە برسییە، بەرامبەر بەوەی خۆیان بەترکمان نێونووس بکەنو، ئێستەش کە ئێستەیە، چاوی هەڵنایەت بەوشەی کوردستان. کەسانێك کە نێویان کوردستانەو خەڵکی باشوورنو، لەئەورووپاوە دەگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان، لەئەنقەرە، یان لە ئەستەمووڵ، دەیانگرێو، هەر بەفڕۆکە رەوانەی ئەورووپایان دەکاتەوەو، لەم رۆژانەشدا، نامیلکەیەك بە دەهەزار دانە لە ئامەد(دیاربەکر) بڵاوکراوەتەوە کە دەبێژێ، کورد مێژووی نییەو، بنەچەو رەچەڵەکی دیار نییەو، زمانەکەشی، زمانێکی سەرەتاییو کێوییەو، لەپاڵ گەلێك سووکایەتیی دیکەدا کە بەکوردی کردووە. بەرامبەر بەوە، بازرگانانی ترك لەباشووری کوردستان، قۆنتەراتی گەورە گەورە دەدرێ پێیانو،

هێندێکیان پارەی زۆریان لەکورد وەرگرتووەو، کارەکەیان بەجێهێشتووەو ڕەڤیاون.
مام جەلال، هەر خۆی سالآنی سالْ یارمەتیی "بەرەی ترکمان"ی داو، پارەی دابەشکرد بەسەریانداو زەوی‌و زاری دانیْ، بەلآم ئەوان، نەبوونە دۆستی مام جەلال، یان دۆستی کورد. چۆنکە ئەوان، بەڕاستی، بۆ مافی گەلی ترکمان هەوڵنادەن، کە ئەوەش مافێکی ڕەوایەو پێویستە هەموو کوردێك پشتگیریلێبکا، بەلْکو، دەیانەویْ خزمەتی ڕژێمی ترك بکەن‌و، وەك برای بەڕێز، کاك موەفەق سەرۆکی حیزبی شرووقی ترکمانی لەتەلەڤیزیۆنی کوردساتدا، فەرمووی، ترکمانەکان پێویستیان بە (وەصی) نییەو، ئەگەر کەسانێك هەبن بیانەویْ خزمەتی دەوڵەتی ترك بکەن، فەرموو با بچنە ترکیاو لەویْ ئەو خزمەتە بکەن‌و، خۆیان نەکەنە دەمڕاستی گەلی ترکمان.
ئەوجا ئێستە، با بێینە سەر "واقع بینی"ی برای بەڕێزم، مام جەلال:
ئەگەر مام جەلال، وەك خۆی دەفەرموویْ، بەدرێژاییی 58 ساڵی ژیانی رامیاریی خۆی، بیری لەجیاکردنەوەی باشووری کوردستان لەعێراق نەکردبێتەوە، دیارە ئەوە مافی خۆیەتی‌و، هەر کەسێکی دیکەش مافی ئەوەی هەیە، وابیر بکاتەوە. بەلآم کە مام جەلال، ئەو ڕێبازەی گرتووە، دیارە، کەسێکی دیکەش دەبیْ مافی ئەوەی هەبیْ، پێیبێژیْ، ئەگەر یەکێك بیر لەوە نەکاتەوە کە کوردستان لەعێراق جیابکاتەوە، دیارە ئەو کەسە باشووری کوردستان بەبەشێکی جیانەکراوە لەعێراق دادەنیْ. ئەوجا، ئەگەر ئەمە وابوو، ئەوا ئەو دەمە، هیچ پێویستی بەوە نەدەکرد کە مام جەلال نێزیکەی چل ساڵ خەریکی جەنگی چەکداری بیْ لەدژی دەوڵەتی عێراق‌و، لەپێناوی ئەوەدا ژیانی خۆی‌و هەزاران کەسی دیکەش، بخاتە مەترسییەوەو، دروشمی "یان کوردستان، یان نەمان" هەڵبگریْ.و ئەو کە

عێراقییە، بەر لەوەی کوردو کوردستانی بیّ، چ پێویستی بەدروستکردنی حیزب‌و کۆمەڵ، بەنێوی کوردستانەوە، هەبوو؟ خۆ ئەگەر ئەوەی نەکردایەو، هەر بەنێوی عێراق‌و عێراقێتیەوە کاری بکردایە، ئەو حەلە رژێمە یەکلەدواییەکەکانی عێراق، بەفڕۆکەو تۆپ‌و چەکی کیمیایی، پەلاماری کوردستانیان نەدەداو، کوردیش ناچار نەدەبوو، ئەو هەموو قوربانییە بدا، لەپێناوی پاراستنی سنووری عێراق‌و، یەکێتیی عێراقدا. چۆنکە ئەو دەمە، دەسەڵاتدارانی عەرەبی عێراق، ترسی جیابوونەوەی کوردستان نەدەنیشتلێیان‌و، لەوانەش بوو، کوردیش، وەك هاووڵاتیی عێراق، هێندەك مافی دەستبکەوتبایە. چۆنکە، ئەوەی عەرەبەکانی لەکورد هاندا، بکەونە قەلاچۆی کورد، ئەو درۆشمە نێرەمووکانەیە بوو کە پێیدەگوترێ "کوردستانی عێراق". کە نە کوردستانە، کوردستان بیّ‌و، نە عێراقیشە عێراق بیّ‌و، نێرەمووکیش، نە نێرە، نێر بیّ‌و، نە مێیە، میّ بیّ.

بەڕاستی سەیرە، جاران، سەرکردەکانی کورد، لەخودیّ دەپاڕانەوە، رۆژنامەنووسێکی بیانی، رێیبکەوێتە لایان‌و، وتارێك لەسەر کوردستان بنووسیّ، ئێستە، وەزیری دەرەوەو وەزیری بەرگریی ئەمریکا، بەفڕۆکە دێنە رۆژهەڵات‌و، بەر لەوەی بچنە بەغداو ئەنقەرە، روودەکەنە سەلاحەدین‌و دوکان‌و، کۆنگرەی رۆژنامەیی، لەگەڵ کاك مەسعوودو مام جەلال دەبەستن. سەرمایەدارانی ئەورووپا، روودەکەنە کوردستان‌و، ئامادەیی خۆیان بۆ ئاوەدانکردنەوەی کوردستان پێشاندەدەن. ئەمەش "واقیع"ەکەیەو، سەرکردەکانی کوردیش، پێویست بوو ساڵانێك لەمەوبەر، خۆیان لەگەڵ ئەو "واقیع"ە نوێیە بگونجێنن‌و، شەقێك لەحیزبحزبێنە هەڵدەن‌و، ریزەکانی خۆیان یەکبخەن‌و، بەڕێوەبەرێتی‌و هێزی چەکدارو رێبازی رامیارییان بەرامبەر دەرەوە یەکبخەن‌و ئەوجا، بەکردەوە، نەك بەقسە، دێموکرات‌و ئاشتیخوازو ملکەچی قانوون بن. ئەوەتا تائێستا،

هەردوو بەڕێوەبەریتییەکەیان نەکردووەتەوە، بەیەك، کەچی لەگەڵ حکومەتی شیعەکان موو بەنێوانیاندا ناچێ. ئەمە لەکاتێکدا ئەگەر سەریان لەسیاسەت دەربچوایە دەبوو دەمێك بووایە لەحکوومەتی شیعەکان بکشانایە دواوەو، حکوومەتی شیعەکانیان بخستایە، چۆنکە جارێکی دیکە کورد ئەو هەلەی بۆ هەڵناکەوێتەوەو، کە سوننەکان بەشداریی هەڵبژاردنو دەسەلاتیانکرد، ڕۆڵی کورد زۆر بێهێز دەبێ.

ئەمەیان واو، لەلایەکی دیکەوە، مام جەلال ڕاستدەکا کە دەبێژێ، ئەگەر وادابنێین دەوڵەتێکی کوردستانی دروستببێ، ئەوا دەوڵەتەکانی دەوروبەر، سنوور لەسەر کوردستان دادەخەنو، ئەو دەمەش ڕێنادەن بەهیچ کەسێك، نە بچێتە کوردستانو، نە لە کوردستان دەربچێ. ئەمەش ئەو "واقیع"ەیە کە مام جەلال باسیدەکا. بەلام هیچ "واقیع"ێك، "فەرمانی خودێ" نییە کە ببێتە ڕەوشێکی لەگۆڕاننەهاتوو. هەر "واقیع"ێك بگریت، بەستراوە بەشوێنو کاتەوەو، بەگۆڕانی شوێنو کات، "واقیع"ەکەش دەگۆڕێ. گۆڕینی "واقیع"ی ڕامیاریش، کارو ئەرکی هەموو سیاسەتکارێکە. چۆنکە "واقیع" بریتییە لە "باری وێستاو (الوضع الراهن) status qvuo و، سیاسەتکاریش هەوڵدەدا بۆ لابردنی "باری وێستاو"، تاوەکو خۆی ببێتە سەرکارو، "واقیع"ێکی نوێ بهێنێتە کایە. ئەو دەمە، ئەوەی دوێنێ لەخەیاڵو بیرو بۆچوونی ئەو سیاسەتکارەدا بووە، دەبێتە (واقیع). لەبەر ئەوە، سیاسەتکار دەبێ تێبکۆشێ بۆ ئامادەکردنی بارودۆخێکی وا، کە لەگەڵ شوێنو کاتی دواڕۆژدا، بگونجێو، کە هەلومەرجێکی لەبار هاتە پێشەوە، دەستبەجێ بکەوێتە جووڵە بۆ قۆزتنەوەی سەردەمی نوێ.

برای بەڕێزم مام جەلال، زۆر باش لەبیرێتی کە هات بۆ ئەڵمانیا، بۆ وتووێژ لەگەڵ هێندەك بەرپرسیارانی ئەمریکاییدا، ماوەیەك پێش کەوتنی ڕژێمی

سەددام، لە فرانکفۆرتەوە تەلەفۆنیکرد بۆم، بۆ هەواڵپرسی‌و، لەنێو قسەکانماندا، پێمگوت "تۆ نابێ بیر لەوە بکەیتەوە کە یەکێك بدۆزیتەوە بۆ سەرکۆماریی عێراق، پێویستە تۆ خۆت ببیتە سەرکۆماری عێراق. تۆ، چل ساڵە خەریکی بەربەرەکانێی رژێمی عێراقیت، لەم چیاوە بۆ ئەو چیاو لەو ئەشکەوتەوە بۆ ئەم ئەشکەوت، خۆ ئەگەر ئەو عەرەبانەی، وەك فارسەکان دەبێژن "منتقر السلگنتی"ن، مێژووی "شەرەشەقی سیاسییان" لە تۆ درێژترە، فەرموو، با شەرم نەکەن، بێنەپێشەوە. ئەوانە ناگەنە ئەژنۆی تۆ". ئا ئەو رۆژە، بوونی مام جەلال بەسەرکۆماری عێراق، خەون‌و خەیاڵ بوو، بەڵام ئەوا ئەو رۆژە بووە بە "واقیع". ئەوەی راستیش بێ، ئەز حەزمدەکرد، کە مام جەلال ببێتە سەرکۆمارێکی وەك جۆرج دەبلیو بوش، کە دەسەڵاتی سەرۆکوزەیرانیشی هەبێ‌و، فەرماندەی هەموو هێزە چەکدارەکانی عێراقیش بێ. بێجگە لەمەش، مام جەلال کە هاوڕێیەکی دێرینمە، زۆر باش دەزانێ، پەنجا ساڵ لەمەوبەر، پێمدەگوت رژێمی سۆڤێت، رژێمێکی ئیمپریالیستی دوژمن بەکوردو ئازادیی گەلانەو، رۆژێك دێ هەرەسدەهێنێ‌و لەنێو دەچێ. ئەو قسانەی ئەو رۆژەی من لەلای زۆر کەس بە "وڕینە کردنێکی کۆنەپەرستانە" دەدرایە قەڵەم، بەڵام ئەوڕۆ ئەو "وڕینەو خەون‌و خەیاڵانە" بوونەتە "واقیع". با لێرەدا بزانین، ئەز بۆچی وامدەگوت، چۆنکە دەمزانی کە دەوڵەتی سۆڤێت دەوڵەتێکی دەستکردەو، هەموو دەوڵەتێکی دەستکردیش، لە یەکەمین بوومەلەرزەی رامیاری، یان کۆمەڵایەتی، یان ئاینیدا، هەرەسدەهێنێ‌و دەبێتە چەند پارچەیەك. یۆگۆسلاڤیاو چیکۆسلوفاکیاو ئەندەنۆزیاش، چەند نموونەیەکی دیکەن. ئێستەش، دەتوانم بێژم کە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، بەرەو تەپین دەچن، چۆنکە دەستکردن. ئەوجا بۆ دەستوبردکردن لەو تەپینەش، پێویستە ژیرانەو زانایانە، هەوڵبدرێ‌و کار

بکریّ. دوای ئەمەش "واقیع"ەکەی ئەوڕۆ، هەر ئەوە نییە کە کوردستان لەلایەن داگیرکەرانەوە گەمارۆ دراوە، بەڵکو لەپاڵ ئەم "واقیع"ەدا، "واقیع"ێکی دیکەش هەیەو، ئەوەیە ئەو بارودۆخەی ئەوڕۆ کورد تێیدا دەژیو، بارودۆخی نێوەوەو دەرەوەی دەوڵەتە داگیرکەرەکانیان زۆر جیاوازن لەساڵانێك لەمەوبەر. بەڵام سەرکردەکانی حیزبە کوردییەکان، بەداخەوە، هەر بەهزرو بیری ساڵانێك لەمەوبەر، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان دەچن. مام جەلال دەفەرمووێ، پەرلەمانی کوردستان بڕیاری بۆ فێدەراڵی داوە، نەك بۆ سەربەخۆیی. راستدەکا. ئەوە وایە. بەڵام ئەو بڕیارە، ساڵی (1992) بوو کە هێشتا سەددام مابوو، دەوڵەتی عێراق مابوو، 11 سەپتەمبەر لەئەمریکا روونەدابوو، کاربەدەستانی ئەمریکا، سەر بەڕێبازێکی دیکە بوون، پێچەوانەی رێبازی بوش. ئێستە ساڵی (2005)ە. بەڕاستی، ئەم "بەتەناش"ەی لۆریی سیاسەتکارانی کوردم، وەك تەمەنەکەی تاریق عەزیز کوردی دێتە بەرچاو. کە بۆ یەکەمینجار تاریقم ناسی، ساڵی 1963 بوو، لەکۆنگرەی "خوێندکارانی کورد"دا لەمۆینخ. کە مام جەلال و محەممەد مەهدیی جەواهیریش لەو کۆنگرەیەدا بەشداربییانکرد. ئەو ساڵە لە تاریقم پرسی، ئەرێ تاریق تەمەنت چەندە؟ گوتی (36) ساڵە. ساڵی 1970 کە چوومە بەرلین و لەوێ نیشتەجێبووم، جارێکیان لەسەرشەقامی کوودام، لوتوبزووت تاریقم دیو، ماوەیەك چۆنی و چاکیمان لە یەککردو، گوتم ئەرێ تاریق تۆ چەند ساڵیت؟ گوتی: ئای! ئەی پێتمنەگوت (36) ساڵم. لەبیرتچووەتەوە؟. وادیارە رۆژژمێری سیاسەتکارەکانیشمان لەجێخۆی "بۆش" لێدەدا.

لەکۆتاییدا دەبێژم، کە هێندەك خەون و خەیاڵ هاتوونەتە دیو، بوونەتە "واقیع" کە سەردەمانێك بە نەبوو و نەکراو دادەنران، لەمانە رووخانی دیواری بەرلین و دامەزراندنی "هەرێمی نەفرین" لەلایەن کۆمەڵەی نەتەوە

یەکگرتووەکانەوە، لەسەر زەوی دەوڵەتێکی ئەندام لەکۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکانداو، پەلاماردانی رژێمی سەددام لەلایەن لەشکری ئەمریکاو، هاوپەیمانێتییکردنی ئەمریکاو کورد، کە ئەویان زلهێزەو ئەمیان ژێر دەستەو بێدەوڵەتە. بێگومان، گەلێك خەون و خەیاڵیش هەن کە نەهاتوونەتەدی. یەکێك لەوانە ئەوەبوو کە رژێمی ترك پاش شۆرشی ئارارات، پەیکەرێکی لەسەر ئەو چیایە دروستکردو، بەترکی لەسەری نووسی: موخەییەل کویردستان، بورەدە مێتفوندر" (کوردستان خەیاڵی لێرەدا نێژراوە). بەلام نێزیکەی هەفتا ساڵیش دوای ئەوە، ئەو خەون و خەیاڵە بەبادا چوو. بەلام دڵنیاین خەونەکەی عەبدوڵلا پەشێوو، ملوێنان خەڵکی دیکە لەکوردو دۆستانی کورد، دێتە دی و، کوردستانی ئازادو دیموکرات و ئاشتیخوازو مرۆڤدۆست، سەربەخۆیی خۆی دەستدەکەوی. چۆنکە کوردستان، خەون و خەیاڵ نییەو، لەسەر زەوی "واقع" چۆکیداداوە، هیوام وایە برای خۆشەویستم، مام جەلال تەمەنی درێژبی و ئەو کوردستانە "واقیعی"یە بەچاوی خۆی ببینێ. خۆ ئەگەر ئەز نەشیبینم، خەم ناکا، چۆنکە دڵنیام کە دێتە دی.

بەرلین 2005/7/7

**میدیا**، ژ 199، 2005/7/12

# نە ئاکۆ محەممەد، بە تەنێیەو،
# نە ڕۆژنامەی "میدیا"ش، ماڵی بێکەسانە

هەر ئەوڕۆ، 8/9ی مانگی تەباخ‌و، پاش گرتنی هاوبیری بەڕێز ئاکۆ محەممەد، سەرنووسەری ڕۆژنامەی "میدیا" لەلایەن کاربەدەستانی هەولێرەوە، بەتۆمەتی بڵاوکردنەوەی بیروڕای خەڵك لەبارەی کارڕاپەڕاندنی حکوومەت لە سێ مانگدا بەگشتی‌و کاری یەك بەیەکی وەزارەتەکان لەو سێ مانگەدا، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لەهاوبیران‌و دۆستان‌و ناسیاوان، پێوەندییانکرد لەگەڵم‌و، بێزاری‌و تووڕەیی خۆیان بەرامبەر بەو کارە ناڕەوایە دەربڕی، بەتایبەتی سەرۆکی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان، سەروەری بەڕێز جەوادی مەلا، هێندەك لە کۆمەڵە نێو نەتەوەییەکانیشی لەم ناڕەواییە ئاگادار کرد.

ئێستە، ئەگەر ئەرکی ڕۆژنامەیەکی ئازادیخوازْ ئەوەبێ، کە ببێتە هۆیەك بۆ بڵاوکردنەوەی بیرو بۆچوونی خەڵکی کۆمەڵگەیەك، بێدەستکاریکردن‌و تێکدان، هەروەها گواستنەوەی دەنگوباسی نێوخۆو جیهان بۆ سەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکە، ئەوا بەدڵنیاییەوە دەتوانم بێژم کە "میدیا" سەرەڕای هەموو گوشارو سنووردارییەك کە ڕۆژنامەکان، لەلایەن کاربەدەستانەوە دانراوە بۆیان، ئەو ئەرکەی لەسەریێتی، بەباشی بەجێیهێناوەو، هەر ئەمەشە کە ڕێزێکی زۆری بۆ "میدیا"و سەرنووسەرەکەی بەڕێز ئاکۆ محەممەد پێکهێناوە.

شایانی باسە، کە ڕاپرسیی، لەوڵاتە دیمۆکراسیەکاندا، دەستاوێژێکی زانستانەو قانوونییە، بۆ تێگەیشتن لەبیروڕای خەڵکەکە بەرامبەر کێشەیەك، یان بەرامبەر هەڵسوکەوتی کاربەدەستان کە بەهەڵبژاردن دەهێنرێنە سەر کار. هەر بۆ ئەمەش، گەلێك ئینستیتووت دامەزراون، کە کاریان هەر ڕاپرسییە. ئەوجا، کە "میدیا" ئەم ڕێیەی گرتووەو، بیرو

بۆچوونی خەڵکی، بێدەستێوەردان‌و شێواندن، هەروەك خۆی، خستووەتە بەرچاو خوێنەرەوەکانی، هیچ جۆرە تاوانێکی ئەنجامنەداوە، بەڵکو خزمەتێکی کاربەدەستانیشی کردووە، بۆ ئەوەی هەڵەو کەموکورتی خۆیان راستبکەنەوەو، دەبوو کاربەدەستان سوپاسیانبکردایە، نەك قۆڵبەستی بکەن، چۆنکە "میدیا" شێوازێکی دیمۆکراتانەی بەکارهێناوەو، شەڕە بەردی لەگەڵ کەس نەکردووەو، جنێویشی بەکەس نەداوە.
ئەز، کە ناسیاویم لەگەڵ بەڕێز کەریم سنجاری (راستییەکەی شەنگاری، کە لەبنەڕەتدا ژەنگاری یە) وەزیری نێوخۆ، لەنێوەڕاستی هەشتاکاندا لەسوێد پەیدا کرد، ئەوەش بەهۆی نێزێکی کاك کەریمەوە لە "ئەکادیمیای کوردی بۆ زانست‌و هونەر" کە لەو سەردەمەدا دامانمەزراندبوو، هیچ چاوەڕوانی ئەوە نەبووم، کە مرۆڤێکی وا ژیرو لەسەرخۆ، بوار بەو رووداوە دڵتەزێنە بدات، کە دوژمن پێبکەنن پێمان‌و، بەتایبەتی لەم رۆژەدا، کە خەڵکی کوردستان، لەبەر دووڕێیانی مان‌و نەماندا وەستاون‌و، ئەوەتا، نەك هەر سەگ، بەڵکو پشیلەش پێماندەوەڕێ. سالآنێکیش لەمەوبەر، پێشبینی ئەم رۆژەم کرد، بەڵام کاربەدەستان بەداخەوە، گوێیان لەئامۆژگاریی دڵسۆژانەم نەگرت. لەبەر ئەوەیە ئێمە ناچاربووین، ئەوڕۆ رووبکەینە بەغدا، لەکاتێکدا ئەمان، کاتی خۆی لەمەولێر پەنابەر بوون‌و، چاویان لەدەست‌و دەمی ئێمە بوو. ئێمە چواردە ساڵ سەربەخۆ بووین، کەچی سەربەخۆیی خۆمان کردە قوربانیی برایەتیی درۆزنە.
راستە، ئاکۆ محەممەد، پێنووس بەدەستەو چەك بەدەست نییە. هەژارو رەجاڵەو دەوڵەمەند نییە. هاووڵاتێکی ئاساییەو کاربەدەست نییە. بەڵام خاوەنی بیرێکی بەرزو رۆڵەیەکی ژێهاتیی ئەم نەتەوەیەیە. ئاکۆ تاکە کەس‌و بەتەنێ نییە، بەڵکو هەزاران هاوبیرو پشتیوانی هەیە. رۆژنامەی

"میدیا"ش بەم تەنگاوییەی بەسەریهێنرا، سەری بەرزی بەرزتر دەبێو، ژمارەی خوێنەرەوانی پترو، جەماوەرەکەشی فراوانتر دەبێ.

بەرلین 2005/8/9

**میدیا**، ژ 204، 2005/8/16

# دەستووری شەرمەزاری و کۆیلەیەتی

هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەقی رەشنووسی "دەستووری عێراق"، رەشەبایەکی توندو تۆڵی تووڕەیی و هەڵچوون، لەنێو چینی رۆشنبیری بەتەنگەوە هاتووی نەتەوەی کوردو خەڵکی کوردستاندا هەڵیکردو، لەهەموو لایەکەوە، هەستی گومان و دڵەڕاوکەو ناهومێدی و ماتەمینی، باڵیکێشا بەسەر رەشوڕووتی دەستخەڕۆکراوی کورددا. ئەریٚ... پاش دوو ساڵ هاش و هووش و بەڵێندان و خۆگیفکردن و سوێندخواردن و جاڕدانی ئەوەی کە نێویان نابوو "شەڕی دەستوور"، چیای دوو زلحیزبەکە ژانی گرت و مشکەکوێرەیەکی دەرفرتاند. منیش، هەروەك ئەو خەڵکە واقوڕماوە، خەفەت و پەژارەیەکی قورس، سەرو دڵمی داگرت و، ناشزانم بۆچی دەمودەست هۆنراوەکەی پیرەمێرد هاتەوە یادم، کە پاش رووخانی کۆماری کوردستان گوتوویەتی:

ئەی نائومێدی، ئەی نائومێدی

نەگبەتیی وەها، توخوا، ساکیٚ دی؟

هەر لەگەڵ ئەوەشداو، هەرچەندە ئەز شاعیر نیم، بەڵام ئەم "میعر"ەی خوارەوە هات بەخەیاڵمدا:

کوردە، دەتەویٚ، نەبی دەسخەڕۆ

بە ئاوات بگەی، نەبی رەنجەڕۆ

بەری خەباتت نەڕەوا بە فیڕۆ

بیٚ بیر کردنەوە، بەرێدا مەڕۆ

روو وەربگێڕە لە حیزبی پەڕۆ

باوی کۆیلەیی، نەماوە ئەمڕۆ

ئاخر مرۆڤ، دڵی بەچی خۆش بێ؟ چۆن دەبێ کەسانێك کە خۆیان کردووە بەدەمڕاستی نەتەوەو نیشتمانێك، هەڵسوکەوتیان ئاوا چەوتو چەوێڵ بێ؟ ئەوەتا، پاش پتر لە هەشتا ساڵ ژێردەستەیی و بەعەرەبکردنی کوردستان و بەتاڵانبردنی سەروەت و سامان و ئەنفال و گۆڕی بەکۆمەڵ و چەکی کیمیایی و فرۆشتنی ژنانی کورد لەبازاڕەکانی دەوڵەتە عەرەبییەکانداو، بێجگە لەوەش، وێرانکردنی 4500 گوندو شارۆچکەی کوردستان و، دەربەدەری و ماڵوێرانی هەزاران و هەزاران خێزانی کەرکووکی و خانەقینی و شەنگاری و ئێزدی و فەیلی و شەبەك و، پاش چواردە ساڵیش ژیانی سەربەخۆ، دەسکەوتنی ئەو دەرفەتە مێژووییە مەزنەی کە رووخانی دەوڵەتی داگیرکەری عێراق، وەك ڕێکەوتێك، هێنایە پێشەوە، چوون خۆیان خستەوە ژێر دەستی داگیرکەری عەرەب و، ئەو رەشنووسە پڕ لە شەرمەزارییەیان هێنایە کایەو، کەچی دەفەرموون، 98٪ی داخوازییەکانی کوردیان بە ئامانج گەیاندووە. ئایا، ئەمە بەجێهێنانی ئەو بەڵێنە بوو، کە هەموو رۆژێك، چەند جار دووپاتیان دەکردەوەو، دەیانگوت: "کورد نایەوێ ببێتە هاونیشتمانی پلە دوو". ئایا ئەمە بوو "هاونیشتمانێتییە پلە یەکەکە؟" بێجگە لەمەش، دەیانگوت "پێشمەرگە نێوێکی پیرۆزەو دەبێ بمێنێ و هەر دەمێنێش". کامەتە نێوی پێشمەرگە؟ بەڕێزینە! "پاسەوانی هەرێم و سنوور" شتێکەو، "پێشمەرگە" شتێکی دیکەیە. "پاسەوانی هەرێم" بەشێکە لە لەشکری عێراق و بەفەرمانی دەوڵەتی عێراق دەجولێتەوە. کامەیە ئەو بڕیاری چارەنووسەی کە دەیانگوت "دەبێ بچێتە دەستوورەوە، تا کورد پشت ئەستوور بێ بەوەی جارەکی دی ئەنفال و تەعریب نابینێتەوە"؟ خەڵك بەوە هەڵناخڵەتێن، کە لەجیاتی بڕیاری چارەنووس کە پێگە (منگلق)و تێگە (مفهوم)ێکی قانوونیی نێودەوڵەتییەو راستوڕاست، مافی جیابوونەوەو دامەزراندنی دەوڵەتی

سەربەخۆ دەگەیەنێ، ئەم رستەیە بفرۆشن پێی: "انّ الالتزام بهژا الدستور یحقق للعراق اتحاده الحر شعباً وارچاً وسیاده". کەی ئەمە باسی مافی بڕیاری چارەنووسە؟ کەر لەکوێ کەوتووەو کوندە لەکوێ دڕاوە!!

سەیر ئەوەیە، بەیەك وشە نێوی ئەو گەلکوژییە نایەت کە لەکورد کراوە لەسەردەمی سەددامدا. ئەوەتا، لەپێشەکیەکەیدا، باسی "مجازر"ی هەڵەبجە کراوە، "مجزرە" لەزمانی عەرەبیدا بە "قەسابخانە" دەگوترێ کە لەزمانی ئینگلیزیدا (massacre)ە، کە لەبنەڕەتدا وشەیەکی فەرەنسییە. لەکاتێکدا ئەوەی لە هەڵەبجەو بادینان و زەردیئاواو سەردەشت کرا، "مجزرە" نەبوو، بەڵکو گەلکوژی بوو، بەهەموو مانای وشە. گەلکوژی بە عەرەبی "الاباده الجماعیە"یە نەك "مجازر"و، بەزمانی ئینگلیزی (Genocide)ە، کە لەبنەڕەتدا وشەیەکی یۆنانیی- لاتینییە. ئەگەر، "ئەنفال" وەك Genocide لەدەستووردا جێگیربکرابا، بۆ داواکارییەکانی کورد لەدواڕۆژدا بەڵگەیەکی قانوونی دەبوو بەدەست کوردەوە.

ئەی ئەو بەڵێنەتان. چیلێهات، کە داتان بەخەڵك و دەتانگوت "نامانەوێ دەوڵەتێکی ئاینی لەعێراقدا دروستببێ و، دەوڵەت دەبێ سێکۆلار (عەلمانی) بێ"و "دەوڵەت"و "ئاین"، دەبێ لەیەك جیابکرێنەوە". ئەوەتا، دەستوورەکەتان دەبێژێ:

"الإسلام دین الدوله الرسمی، وهو مصدر اساس للتشریع".

"مصدر اساس"، لێرەدا، ئەوە دەگەیەنێ کە "اسلام" سەرچاوەی بنچینەیی هەموو قانووندانانێکە. ئەوەش فێڵێکی زمانەوانییە، کە ئاخوندە شیعەکان باش سەریان لێدەرچێ. چۆنکە، ئەگەر مەبەست، "یەك سەرچاوەی بنچینەیی" بوایە، وەك کاربەدەستانی دووزلحیزبەکە دەبێژن، دەبوایە بگوترایە "وهو مصدر بین المصادر الاساسیە الاخری للتشریع" یان "مصدر من المصادر الاساسیە للتشریع". ئەوجا، کە نێوی

سەرچاوەکانی دیکە نەهاتووە، ئەو رستەیە بەو شێوەیە، وادەگەیەنیٚ کە هەموو سەرچاوەکانی دیکە دەبنە سەرچاوەی لاتەنیشت "مصادر جانبیه" یان "مصادر فرعیه".
لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە، هەر لەپاش ئەو رستەیەی سەرەوە، ئەوەی خوارەوە هاتووە:
أ-لایجوز سن قانون یتعارچ مع پوابت احکام الاسلام.
بەڵام هەر لەژێر ئەمەدا لەبەشی (ب)دا دەبێژیٚ:
ب-لایجوز سن قانون یتعارچ مع مبادئ الدیمقراگیه.
ئێستە، کە ئەمە وابیٚو، هیچ قانوونێك دەرنەکریٚ کە دژی "فەرمانە نەگۆڕەکانی" ئیسلام بیٚو، هیچ قانوونێکیش دەرنەکریٚ کە دژی "سەرەتاکانی دێمۆکراسی" بیٚ، مانای وایە، "فەرمانە نەگۆڕەکانی ئیسلام"و "سەرەتاکانی دێمۆکراسی" هەر یەك شتن‌و وەك یەکن‌و، هیچ ناکۆکییەك نییە لەنێوانیاندا. بەڕاستی، ئەگەر یەکێك ئەم قسەیە بکاو، بەمەبەستی خاپاندنی خەڵك‌و چاوبەست نەبیٚ، ئەوا دیارە، نە لە ئیسلام گەیشتووەو، نە لە دێمۆکراسی. ئیسلام ئاینەو، بەپێی باوەڕی موسڵمانان، فەرمانی خودێیەو نەگۆڕەو، دێمۆکراسیش، سیستەمێکی فەرمانڕەوایی‌و کۆمەڵایەتییەو فەرمانی خەڵکەو لەگۆڕانێکی سەرومڕدایە، چۆنکە رامیاری، لەکۆمەڵگەیەکی دێمۆکراسیدا شێوای گۆڕانە، بەدڵی خەڵکەکەی.
ئیدی ئیسلام‌و دێمۆکراسیتان، چۆن کردە یەك، ماڵتان ئاوابیٚ؟
لەباسی "جنسیه"دا هاتووە:
ب- تسحب الجنسیه العراقیه من المتجنس بها فی الحالات التی ینص علیها القانون.
باشە، ئەو "حالات"ە (دۆخانە) چین؟ بۆچی باسنەکراون؟ ئایا، ئەمە نابێتە کوتەکێك بەدەست داگیرکەرانی عەرەبەوە، بۆ سەندنەوەی "جنسیه"

لەهەزاران و، بگرە سەتانهەزاران کورد، هەر کاتێك عەرەب دەستیانڕۆی، وەك لەعێراق و سووریا کردیان؟
لەلایەکی دیکەوە، لەدەستوورەکەدا هاتووە:
"لایمنح حق اللجؤ السیاسی الی المتهم بارتکاب جرائم دولیه او ارهابیه وکل من الحق چرراً بالعراق".
باشە! ئەمە مانای ئەوە نییە کە سبەینێ کوردێك لەئێران، یان ترکیا، یان سووریە، زۆرکرا لێی، کە لەسەر مافی خۆی هەڵبداتێ و، بەربەرەکانێی ئەو رژێمە داگیرکەرانە بکاو، لەئەنجامدا تەنگهەڵچنرا پێی و، ناچار بوو، رابکا بۆ عێراق، ئەو کوردە بە تیرۆریست (ارهابی) دەدرێتە قەڵەم و، دەگوترێ ئەو کوردە بەو کارەی کە کردوویەتی، کارێکی تیرۆریستانەی ئەنجامداوەو، بە پەنابردنی بۆ عێراق، دڵی ئەو دەوڵەتانەی لەعێراق ئێشاندووەو، زیانی گەیاندووە بەعێراق و، دەبێ، بدرێتە دەست ئەو دەوڵەتە؟
دواخستنی، گوایە چارەسەرکردنی کێشەی کەرکووك و نێوچەکانی دیکەی باشووری کوردستان، کە بەدەست دوو زلحیزبەکەوە نین، بۆ کۆتایی ساڵی 2007، جەزرەبیەکی کارایەو دراوە لەبڕبڕەی پشتی نەتەوەی کوردو خەڵکی کوردستان و بەتایبەتی کەرکووکییەکان. لێرەدا دەبێ بپرسین، ئایا، حکوومەتێکی عێراقی، کە ئەوڕۆ گەڕەکێکی بەغدای بەدەستەوە نییەو، سەرەڕای، چەند جار بەڵێندانی بۆ گێڕانەوەی کەرکووکییە دەرکراوەکان و عەرەبە هاوردەکان، بۆ شوێنی خۆیان، درۆیکردو شەرمینەکردو، هەر لەم رۆژانەشدا، فەرمانیدەرکرد بۆ دوورخستنەوەو لابردنی هەموو ئەو ئەفسەرو پۆلیسە کەرکووکییانەی کە لەکاتی سەددامدا لەکەرکووك دەرکرابوون و، دوایی گەڕانەوە کەرکووك و، خوێنی خۆیان کردە کاسەو، بوونە هێزێك بۆ پاراستنی خەڵکی کەرکووك و، کاتی خۆشی

هەر لەم رۆژنامەیەدا نووسیم، کە وەزیری نێوخۆی جەعفەری، بەیان جەبر سولاخ کە خۆی کردووە بە "زوبێدی"، ترکمانێکی شیعەی سەر بەرژێمی ئێران و دژ بەکوردە، ئایا لەم جۆرە کەسانە چاوەڕوانی ئەوە دەکرێ، پاش ئەوەی جێی خۆیان قایمکردو، دەسەلاتیان گرتە دەست، بەخێری "ئیمامی زەمان" کێشەی کەرکووك چارەسەر بکەن؟ بێگومان نا و نا! ئەمەش خالانەی ئەوەیە کە، وتووێژکەرانی شۆرشی ئەیلوول لەگەڵ سەددام حسەین، کە یەکێك لەوانە، بەڕێز دوکتۆر مەحموود عەلی عوسمان بوو، کە ئەوڕۆش هەر وتووێژکەری بلیمەتی ئەم دەستوورەیە، چوار ساڵ ماوەیان دا بە رژێمی بەعس، تا خۆی کۆکردەوەو، ئەوەبوو ژەهری ماری کرد بە گەرووی کوردو خەڵکی کوردستاندا. دانی ئەم دەرفەتەش بە رژێمی نوێی عێراق، شتێکە لەو بابەتەو کوێرەوەرییەکی دیکەیە بۆ رەشووڕووتی کوردستان و، بەتایبەتی خەڵکی لێقەوماوی کەرکووك.

لەشوێنێکی دیکەدا، دەستوورەکە رێژەی ژنانی لەپەرلەماندا، بە"لایەنی کەمەوە" 25٪، واتە چواریەکی پیاو داناوە، کەواتە 25٪ (مقبول)ە. ئێمە تائێستە، پێمانوابوو کە "ژن نیوەی پیاوە"و "شایەتیی دوو ژن لەبەردەم دادگەدا بەشایەتیی پیاوێك دەچێ"، بەلام نەماندەزانی ژنێك بووە بە "چارەکی پیاوێك". تۆ بڵێی ئەمەیان نەخستبێتە ئەستوێ "شەرع"و نەیانگوتبێ، باشە، کە پیاوێك مافی ئەوەی هەبێ، چوار ژن بهێنێ، دیارە بە ماتماتیك، هەر پیاوێك بەرامبەر چوار ژنەو، هەر بە ماتماتیکێکی سادەش، دەتوانیت بزانیت کە هەر ژنێك "روبعی" پیاوێکە. بەلام، بەڕاستی ئەز سەرم لەوە دەرناچێ، چۆن بەڕێز حەمیدە فەندی، وەزیری پێشمەرگە، ژنی پێنجەمی هێناوەو، فەرموویەتی بەپێی "شەرعی شەریف" ئەوەیکردووە. وادیارە، ئەم کێشەی "خومسە" (5/1) بۆیە لەدەستووردا باسنەکراوە، چۆنکە پێشمەرگە، لەمەودوا، دەچێتە ریزی، "ناسخ و

منسوخ"ەوەو، ئەوەش دیارە بە "فتوا"ی مەلا سیستانی، چۆنکە لەدەستوورەکەدا، وەك هەموو دەستووریکی "مۆدیرن"، باسی "فتوا"، واتە "مەرجەعیەت" کراوەو، تەنانەت بەپێی قانوون، دەکریٚ "فەرمانگەیەك" دابمەزریٚ، بەنێوی "مجلس الدولە"، کە کاری "فتوادان"یشی بەدەستبیٚو "نوێنەری دەوڵەت" بیٚ لەبەردەم دەزگە دادوەرییەکاندا. ئەریٚ، ئەمە ئەو پێشمەرگەیە بوو کە "هێزێکی پیرۆز" بوو و، "مساوەمە" نەدەکرا لەسەری. ئای... مەلا مستەفای بارزانیو هەزاران پێشمەرگەی شەهید بووی شۆرشی ئەیلوول، گۆڕ هەڵتەکێنن، کیٚ کردیو کیٚ خواردی؟؟؟

بەپێی دەستوورەکە، دەسەڵاتی هەرە گەورە لەدەوڵەتدا، بەدەست سەروکوەزیرانەوەیە، بەتایبەتی وەك فەرماندەری هێزە چەکدارەکانی هەموو عێراق. بەڵام سەرۆککۆمار، هەر بەپێی دەستوورەکە دەورێکی "تشریفاتیو احتفالاتی" پێدراوە، واتا، بۆ بەخێرهاتنکردنی مێوانانو بەشداریکردن لەئاهەنگەکاندا. ئەوجا ئەگەر زانیمان کە سەرۆکوەزیران، بەپێی دەستوورەکە، هەمیشە لەو حیزبە هەڵدەبژێردریٚ، کە زۆربەی زۆری ئەندامانی لەپەرلەمانەکەدا هەبیٚ، ئەوا دەبیٚ بزانین کە سەرۆکوزەیران، هیچ کاتێك لە کورد نابیٚ، چۆنکە ئاشکرایە، کە هیچ حیزبێکی کوردی، لەهەڵبژاردندا، زۆربەی زۆری ئەندامەکانی پەرلەمانێکی عێراقی وەدەستناهێنیٚ.

لەشوێنێکی دیکەی دەستوورەکەدا واپێشاندراوە کە ئەوی دەبیٚ بە پەرلەمەنتار، دەبیٚ "باوەڕنامە" (شهادە)ی بەرزی (زانستگەیی) هەبیٚ. لەبەر ئەوەو، بەم بۆنەیەوە، ئاگاداریی هەردوو برای بەڕێز خەفوور مەخمووریو حەمەی حاجی مەحموود دەکەم، هەتا زووەو بەپەلە، چەند کۆرسێکی خەستی فیزیكو ماتماتیكو کیمیاو زانستی ئاژەڵناسی

بخوێنن، تابتوانن به "خارجی" لەتاقیکردنەوەدا بەشداربن، بەڵکو بتوانن دیبلۆمی "کیمیای خەڵووز"، یان ماستەری "بەخێوکردنی هەنگ" وەربگرن، ئەگەرنا، ناتوانن ببن به "دەمڕاستی گەل"و، دەبێ دەمی خۆیان بگرن‌و، زۆر قسەش بکەن، بێ دیپلۆم‌و ماستەر، ئەوا "ئیجازە"ی حیزبەکانیشان به "فتوای مەرجەعییەت" لێدەسێندرێتەوە.

لەشوێنێکی دیکەی دەستوورەکەدا نووسراوە:

"تکفل الدوله تعویض اسر الشهداو والمصابین نتیجه الاعمال الارهابیه"

بێگومان "شهداو" (شەهید بووان) "والمصابین" (کەفتەکاران، کوڵەورانی رووداوێك)، شتێکی نادیارە. لێرەدا دەبێ رەپوڕاست بێژین، که سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە، وشەی "تاوانی نێودەوڵەتی"و "ئەنفال"و "بەکارهێنانی چەکی کیمیایی"یان بەخشیوە به "برایەتی"و پاراستنی کورسییەکانیان، که هەتا بێ، شەقولۆقتر دەبێ. ئەمەش بەئاشکرا دەڵێم که ناپاکییەکی گەورەیەو لەکورد دەکرێ، چۆنکە ئەو "ئەنفال"و "چەکی کیمیایی"یە، دوو بەڵگەی زۆر بەهێز بوون بەدەست کوردەوە، بۆ داواکردنی جیابوونەوەی خۆی لەدەوڵەتی عێراق. بەتایبەتی لەبەر ئەوەی ئەگەر دەوڵەتێك، هەوڵی تەفرو توونا کردنی گەلێکی ژێردەستەی خۆی بدا، نەك هەر مافی ئەوەی نابێ، جارەکی دی، ئەو گەله بخاتەوە چوارچێوەی خۆی، بەڵکو، پیاوێکیش، ئەگەر هەوڵی کوشتنی ژنی خۆی بدا، جارەکی دی مافی ئەوەی نییە داوا له ژنەکەی بکا سڵاو بکا لێی، بەڵکو دەبێ بخرێتە زیندانەوە، ئەوجار، که دەوڵەتی عێراق، وەك دەوڵەت، تائێستە حوکم نەدراوە، لەبەر ئەوەیە که دوو زلحیزبەکە چاویان پوشیوە لەو "دەعوا"یەو، دەبێ دەوڵەتی عێراق دادگەیی بکرێ، وەك چۆن ئەڵمانیای نازی، بەرامبەر هەڵگیرساندنی جەنگی جیهانیی دووەم‌و، کوشتنی چەند ملیۆنێك جوولەکە، دادگەییکراو سزادرا، دەبێ دەوڵەتی

عێراقیش سزا بدرێ. کوا سزادانی عێراق‌و مافی کوردتان بۆ کوێ برد، زلحیزبینه؟.
دەستوورەکە باسی نەتەوەکانی عێراق دەکاو دەبێژی:
"العراق بلد متعدد القوميات والاديان والمژاهب، وهو جزو من العالم الاسلامی، والشعب العربی فیه جزو من الامه العربیه".
کە عێراق، ولاّتێکی تێکەلّ بێ لە چەند "قەومیات"و "ئاین"و، بەئاشکرا نەگوترابێ کە پارچەیەکی کوردستان لەعێراقدایەو، بەلایەنی کەمیشەوە، نەگوتراوابێ "کە گەلی کورد لەعێراقدا بەشێکە لە نەتەوەی کورد"، بەلاّم گوترابێ کە "گەلی عەرەبی عێراق، بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب"و، لەلایەکی دیکەشەوە گوترابێ کە عێراق "بەشێکە لەجیهانی ئیسلام"، ئەو دەمە بەپێی دەستوورو، بە "فتوای مەرجەعییەت"، هەموو عەرەبێکی سۆدانی‌و میسری‌و سووری‌و یەمەنی‌و سعوودی‌و، هەموو موسڵمانێکی پاکستانی‌و ئەفغانی‌و ئێرانی‌و ئەندەنۆسیایی، مافی ئەوەیان دەبێ، بەنێوی "پاراستنی عەرەب‌و ئیسلام"ەوە، پەلاماری کوردو هەموو کەسێکی دیکەش بدەن کە دەم لە ئازادیخوازییەوە بدا. ئەوجا، ئێستە ئەو پرسیارە دێتە پێشەوە، ئایا، ئەوانەی ئەم دەستوورەیان سازداوە، بەڕاستی نوێنەری خەڵکی کوردستانن؟
لەمانەی سەرەوەش بترازێ، بەندێکی زۆر مەترسیدار لە دەستوورەکەدا هەیە، ئەوەش رێگە دانە بە هەر پارێزگەیەك کە بتوانێ ببێتە هەرێمێکی فیدراڵی، کێ دەیزانێ، ئەگەر کەرکووك ناحیەو قەزا لێبڕاوەکانی نەخرێتەوە سەرو، عەرەبە هاوردەکانی لێدەرنکرێ، نابێتە فێدەراڵییێکی سەربەخۆ لەدەرەوەی کوردستان، کە وەك دەڵێن مەلا سیستانی‌و ئەمریکا لەم رووەوە هاودەنگی یەکن.

بەڵێ، ئەم دەستوورە بەرهەمی ئەو هەڵبژاردنە بوو کە دەیانگوت، ئەوی نەچێ و دەنگ بۆ لیستەکەیان نەدا، "خاین"ەو، بەو چاوڕاو بەو بەڵێنە بێسەروبەرانە، هەزاران کوردستانی و هەزاران کوردی ئەوروپایان خاپاندو، ناچاریانکردن، خۆیان بکەنەوە بە عێراقی و، بچن پەساپۆرتی عێراقی وەربگرن و، بەوەش مافی پەنابەرێتییان لەدەستداو، کاتی خۆشی هاوبیری مێژا، سەروەر جەوادی مەلا، پەنابەرانی لەوە هۆشیار کردەوە، کە دەبوونەوە بە عێراقی و دەچوون بۆ وەرگرتنی پەساپۆرتی عێراقی پێیگوتن، ئەو پەساپۆرتە، بەڵگەی ناردنەوەیان دەبێ و، لەکوردستانیش کەس بەتەنگیانەوە نایەت. قسەکەی راستدەرچوو. ئەوەتا، ئەوڕۆ دەوڵەتەکانی ئەوروپا، گوشار دێنن بۆیان و، رەوانەی عێراقیان دەکەنەوەو، ئەمەش دەبێتە شێواندنی ژیانی هەزاران و هەزاران خێزانی کورد، کە لەئەوروپا بەکولەمەرگی، توانیویانە، منداڵانیان بنێرێنە قوتابخانەکان و، ژیانێکی سادە بۆ خۆیان پێکەوە بنێن. لێرەدا، پرسیار ئەوەیە، ئایا ئەمجارەش، کە کاتی هەڵبژاردن و راپرسی لەسەر "دەستوور" هاتە پێشەوە، خەڵك بەبەڵێنی وەك بەڵێنەکانی پێشوو، تەفرە دەخۆن، یان هەڵوێستیان دەبێ و، پەندە کوردییەکە دەبێ بەسەر مەشقی کاریان، کە دەبێژێ "ئەگەر جارەك منت خەڵەتاند، خودێ بتگرێ، خۆ ئەگەر جارەکی دی منت خەڵەتاند، خودێ خۆم بگرێ".

لەکۆتاییدا دەبێژم، ئایا پێویست بوو عێراق دەستووری هەبێ؟ یان باشتر وابوو، "بێ دەستوور" بێ و، لەنێوان زەوی و ئاسماندا بەهەڵواسراوی بمێنێتەوەو، سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکەو، "مَعَ لَفٍّ لَفَّهُم" لەباتی ئەوەی خەریکی عێراقچێتی و، رێکخستنەوەی نێو ماڵی سوننییەکان و شیعەکان بن و، لەگەڵ یەك ئاشتیانبکەنەوە، جارێ خەریکی رێکخستنەوەی نێو ماڵی خۆیان بن و، ئەو بەڵێنەی کە ساڵانی ساڵە دەیدەن بە کورد، بۆ

یەکخستنەوەی دوو حکوومەتەکەیان، بهێننەدی. کە هیچ کات نایهێننە دی. دەستنیشانکردنی سنووری کوردستانیش، قسەیەکی قۆڕە، هەتا ئەو دوو بەڕێوەبەرێتییە (واتە دوو حکومەتەکە) نەبنە یەك حکوومەت، لەبەر ئەوە، هەموو باسێکی کەرکووك‌و "نێوچە داگیرکراوەکانی دیکە"، تەنیٚ بۆ خاپاندن‌و بازرگانیکردنەو، ئەمەش وەك مەسەلەی فەلەستینە، کە دەوڵەتە عەرەبییەکان، سالآنی سالٚ بازرگانییان پێوەکردو، کردیانە بەڵگە بۆ دیکتاتۆرێتی‌و نەهێشتنی ئازادی‌و مسۆگەر کردنی ژیانی شاهانەی خۆیان‌و بنەماڵەیان.

* سەرنج: دەقی دەستوورەکە لە "موسوعە النهرین" ەوە وەرگیراوە.

بەرلین 2005/8/27

**میدیا**، ژ 206، 2005/8/30

# نا بۆ دەستووری رەش

تامان شاکر- ئەڵمانیا/ لەژێر دروشمی نا بۆ دەستووری رەش پرۆفیسۆر د.جەمال نەبەز لەشاری کۆڵن سیمینارێکی پێشکەش بە کوردانی دانیشتووی ئەو ناوچەیە کرد، هەرچەندە ئەندامانو لایەنگرانی هەردوو حیزبە دەسەڵاتدارەکەی کوردستان ئامادە نەبوون، بەڵام کۆمەڵێك خەڵکی رۆشنبیرو نووسەر ئامادەی کۆڕەکە بوون لەوانەش بەختیار عەلی، بەرزان هەستیار، سیروان رەحیم، بەکر شوانیو کۆمەڵیکیتر لەرۆشنبیران لەهەموو بەشەکانی کوردستانو چەند کەسانیکیش لەهۆڵەنداوە هاتبوون بۆ بەشدار بوون لەو سەمینارەدا.

سەرەتا هەڵسوڕێنەری کۆڕەکە بەڕێز رەزا حەمە بەخێرهاتنی میوانەکانی کردو لەدواییدا مامۆستا جەمال نەبەز هەندێك خاڵی سەرەکی نێو دەستوورەکەی هەڵسەنگاندو وتی: سوپاسی ئامادەبوونتان دەکەم کە ئەرکتان کێشاوەو ئامادەی ئەم سەمینارە بوونو پێموایە ئەوانەی لێرە ئامادەن کەسانی خەمخۆری نەتەوەی کوردنو دەیانەوێ لەم دەستوورە تێبگەن، کە چەند خزمەت بەنەتەوەی کورد دەکات.

لەوەو پێش وتارێکم نووسی کە لە رۆژنامەی (میدیا)ی ئازیزدا بلاوکرایەوە بەناوی "دەستووری کۆیلەییو شەرمەزاری"، پێموایە ئەم دەستوورە شەرمەزارییە بۆ ئەو کەسانەی پێیانوایە کە ئامانجەکانی نەتەوەی کوردی هێناوەتە دی.

هەندێ لەسەرکردەکانی کورد پێیانوایە زۆر لەئامانجەکانی گەلی کورد هاتووەتە دی، وانییەو ئەو شتانە نەهاتوونەتەدی، ئەوەی کە ئێمە ئێستا باسیان لێوە دەکەین هەموو ئەو شتە باشانە بەتاڵ دەکەنەوە.

**دەستوور بۆ گەلێکەرێزی دەستوور بکریٚ**

بەر لەوەی باس لەدەستوور بکەین دەبێت بپرسین دەستوور بۆ کێیە؟ مرۆڤ کە خانوویەکی دروست کردو باخێکی بۆ کرد، پەرژینێکیشی بۆ دەکات، کورد دەڵیٚ پەرژین بۆ مرۆڤی بەناموسە، ئەوی ناموسی نەبێت پەرژینەکە شەق لێدەدات و دێتە ناو باخەکەوە. دەستووریش بۆ گەلێکە کە رێزی دەستور بگرێت، بۆ گەلێکە کە ترادسیۆنی دیموکراسیانەو ئازادیخوازانەی هەبێت، گەلێک کە چەند نەوەیەك لەوەو پێش دیموکراسیەتی لەولاتی خۆیدا خستبیتە کار، بەلام گەلێك کە بەدرێژایی هەشتا ساڵ لەژێر رژێمی دکتاتۆریداو لەکۆمەڵگەیەکی دەرەبەگیداو لەسەر پێوەندیی کۆمەلایەتیی هەڵە دامەزرابێت و کەسێك ئەگەر خزم و کەسی بالاّ دەست نەبێت کاری پێنەدەن و، ئەگەر کەسێك دەمی کردەوە بەدڵی ئەوان نەبوو دەمی بگرن. کەواتە لە شەوو رۆژێکدا تۆ ناتوانی ئەو گەلە دیموکراسی بکەیت. دیموکراسی مانای ئەوەیە گەلێك رێزی دەستوور بگرێت، ئەگەر ئەو دەستوورە دەستوورێکی زۆر باشیش بوایە. دەکرا دەستوورەکە بەدڵی هەموو لایەك بووایە. کەوا بەدڵی هەموو لایەك بوایە دیسانەوە دەستوور هەر ئەوە نییە کە نوسراوەتەوە، ئایا دەخرێتە مەیدانی کارەوە، دەوڵەتانی عەرەب و ترك و فارس هەموو دەستووریان هەیە، بەلام هیچ کاتێك نەخراوەتە کارەوە.

لەعێراق بەپێچەوانەوە کە سیستەمی سەددام گۆڕا لەرێگای پەلامارێکی سەربازی. سیاسەتمەدارانی کورد بەبیٚ پرسی خەڵك هاتوون و دەستوورێکیان داناوە. بەرای من ئەوانە تەنها کار بەدەستن نەك کەسانی، وەك ئێمە کە کارمان بەدەست نییە. ئەوان کە دەڵێن ئێمە دەمانەویٚ نەتەوەی کورد بەرەو ئازادی و رزگاری ببەین، دەبوو بیریان لەوە بکردایەتەوە، ئایا پێویست بوو دەستوورێك بۆ عێراق دابنێن. لەدرێژەی باسەکانیدا جەمال نەبەز باسی لەسیاسەتی دووڕوانەی ئەڵمانیا کرد بەرامبەر بەلێدانی عێراق و، باسی ئەوەی کرد کە کابرایەکی وەك گێرهارد

شرۆیدەر دەیەوێ خۆی وەك کۆتری ئاشتی پیشان بداتو، لەخەڵکی بگەیێنێ کە ئەو دژی شەڕە... وگوتی:
ئەز پشتگیری ئەمەریکا ناکەم، پیاوی ئەوانیش نیم، چۆنکە هەر ئەمریکیەکان بوون شۆڕشی ئەیلولیان کۆتایی پێهێناو، هەر ئەوانن خاوەنی هیرۆشیماو شەری ڤیتنام، بەڵام ئەگەر سەیری سیاسەتی نوێی ئەمەریکا بکەیت تۆزێك بواری ئازادی تێدایە بۆ ئەوانەی بەدوایدا دەگەڕێن، ئەمریکا دەوڵەتێکی زلهێزەو بەدوای بەرژەوەندییەکانی خۆیدا دەگەڕێتو کوردیش دەبوایە بیری لەبەرژەوەندییەکانی خۆی بکردایەتەوە. ئێستا بوشو کۆندۆلیزا رایس لەسەر کارن، بەیانی ئەوان بڕۆن بارو زروفەکە دەگۆڕێت، بەداخەوە کورد نەیتوانی سوودی لێببینێت.
نەتەنها پارتیو یەکێتی، بەڵکو هەموو حیزبەکانی کوردستان زیاتر بایەخ بەحیزبەکانیان دەدەن وەك لە نەتەوەکەیانو، زۆرتر بیر لە حیزبایەتی دەکەنەوە نەك کوردایەتیو بەلای بەرژەوەندی نەتەوەوە ناچنو، هەریەکە وەك تاکە کەس دەیانەوێ کارێك بکەن. نمونەیەك دەهێنمەوە بۆ ئەو قسەیەم لەپێش هێزەکانی ئەمەریکا بەچوار سەعات پارتیو یەکێتی چوونە ناو کەرکووکەوە، کەچی تاڵانو بڕۆی لێپەیدا بوو و ئەوە بیانووی دایە ئەمریکییەکان کە هێزی کورد لەکەرکووك دەرکەن ئەگەر وا نەبووایە هەر ئەو دەمە عەرەبی هاوردە دەرۆیشتن.
هەر ئەو رۆژە نامەیەکم نووسی بۆ کاك مەسعود وتم کورد بەکراسی بەری خۆیەوە هاوکاری ئەمەریکا دەکات کەچی لە کەرکووك دەچنە دەرەوە، ئاخر سوار بوون عەیبێك و دابەزین هەزار عەیب، هەموو هاوکاریەك لەگەڵ ئەمەریکا پێویستە، بەڵام بەرێککەوتن. دیارە کورد نەیدەتوانی شەڕی ئەمەریکا بکات، بەڵام دەیتوانی وارێکبکەوێت کە بەرژەوەندییەکانی کورد بپارێزرێت. جێگای داخە ئەوان خەریکی هەڵمەتە کاسیی خۆیان بوونو

یەکسەر یەکێتی هاتو کەرکووکی کردە چوار کەرتو ئەوە دوو ساڵمان بەسەر بردو دوو ساڵی تر ماوە، بەڵام من بڕوام وانییە دوای دوو ساڵی تر کەرکووک بگەڕێتەوە سەر کوردستان. سەرەتا دەیانوت ئێمە ناچینە هەڵبژاردنەوە، کەچی درۆیان کردو وازیان لەخەڵکی کورد نەهیناو بەزۆر کردیاننەوە بەعێراقی. جا خستنەوەی کەرکووکیش بۆ سەر هەرێمی کوردستان، دەبێت کوردستان ببێت بە هەرێمێك ئەمەش کێشەیەکی ترە کاك مەسعود دەڵێت هەندێك کێشەی تەکنیکیمان ماوە بۆ یەکگرتنەوە، دەباشە پێمان بڵێن ئەو کێشانە چین ئەی خۆتان ناڵێن ئێمە شت لەخەڵك ناشارینەوە، باشە بۆ باسی ناکەن ئەو کێشانە چین؟

لەساڵی 1996 پارتیو یەکێتی پەنایان بۆ ئێران برد بۆ ئەوەی ئاشتیان کاتەوە لە د.کەمال فوئادم پرسی وتی ئێستا وامان لێهاتووە شەیتان بۆتە ناوبژیکەرمان.

کەواتە کێشەکە گەڕانە بەدوای دەسەڵات، بەسەر ڕەشووڕوتی کوردستاندا بەرامبەر بەبێگانەو داگیرکەران ئەو دەنگانە نابیستین.

دەبوا کورد بەدەستووری کوردستانەوە بچێتە بەغدا

لەدوای رووخانی سەددام دەبوایە کورد، بەدەستووری کوردستانەوە بچێتە بەغداو بڵێ ئێمە ئێراقی نینو بەزۆر لکێندراوین بەئێراقەوە، ئەگەر دەتانــەوێ دەوڵەتێکی ئێراقی دروست بکەین ئەوە دەستوورو مەرجەکانی ئێمەیە. ئەنجامی گشتپرسییەکانیان لەگەڵ خۆیان بردبا بۆ بەغدا. بیانوتایە کۆمەڵگەی ئێمە ئەوەی دەوێت.

جا بابزانین ئەم دەستوورە چی تێدایە، دەمەوێ لێرە ئاماژە بۆ چەند شتێك بکەم.

وشەی شەهید بەکار هاتووە لەدەستوورەکەو باسی شەهیدانی شیعەو سوننەو نەتەوەکانیتر دەکات. شەهید زاراوەیەکی ئیسلامییەو ئەو کەسەی

لەپێناوی ئیسلامدا بکوژرێت پێیدەڵێن شەهید لەدیباجەکەدا هاتووە، بەڵام ئەوەی بە کورد کراوە شەهید بوون نەبووە بەڵکو کۆمەڵکوژی بووە کە پێیدەڵێن جینۆساید ئەوەی لەهەڵەبجە، بادینان، بالیسان و لە کاتی ئەنفالەکاندا روویدا ئەوە کۆمەڵکوژیەك بوو بۆ لەناوبردنی خەڵکی کوردستان. لەدەستووردا ئاماژەی پێنەکراوە.

کورد دەیتوانی ئەم گەلکوژیە والێبکات کە هەر حکومەتێك هاتە سەرکار دان بەو گەلکوژیەدا بنێ‌و زەرەرو زیانی ئەوانەش بژمێرن.

بەڵام کەس گوێ ناگرێ، گەلێك کە دەیەوێ تۆ لەناو ببات چۆن دەبێ تۆ وەك خۆت تەماشای بکەیت‌و بەبرای دابنێیت. ئەوانەی لەناو عەرەب‌و ترك‌و فارس داوای ماف کورد دەکەن، لە نمونەی زانای گەورەی ترك بێشکچی کەمن. چونکە رژێمەکانی ئەو وڵاتانە رێگا نادەن خەڵك بەئازادی بیر بکەنەوەو سیستەمی دیموکراسیش پەیرەو ناکەن.

مەحمود عوسمان مافی ئەوەی نییە بڵێ جەمال نەبەز بۆی نییە قسە بکات ئەوەش کە مەحمود عوسمان دەڵی ئێمە خۆمان داوامانەنەکردووە ئەنفال بخەینە ناو دەستوورەوە، ئەگینا شیعەو سوننە هیچ مانعەتێکیان نەبووە.

ئەز نازانم مەحموود عوسمان نوێنەری کێیە، ئەو نوینەری پارتی‌و یەکێتی نییە، بەڵام لەوانەیە پێیان وتبێ وەرەدانیشە، سەیرم لەوە دێ کە مەحموود عوسمان دەچێ بۆ نووسینەوەی دەستوور کەچی د.نووری تاڵەبانی کە لەیاسای نێودەوڵەتیدا پسپۆرە نابەن، یان کەسێکی وەك کامیل ژیر نابەن بۆ بەغدا کەچی کەسێکی وەك مەحمود عوسمان دەبەن بۆ بەغدا، ئەو سیاسەتکارە نەك یاساناس. لەدەستوورەکەدا گەلی عێراق بەیەك نەتەوە ناونراوە نەك وەك یەکێتی‌و پارتی دەڵێن "گەلانی عێراق".

لەدەستوورەکەدا هاتووە کە گەلی عێراق کە ئەو ئەرکەی گرتۆتە سەرشانی خۆی‌و پابەند دەبێت بەو دەستوورەو یەکێتی ئارەزوومەندانەش مانای

مافی چارەی خۆنووسین نییە. کە ئەو بەڕێزانە باسی لێوە دەکەن. مافی چارەی خۆنووسین پێگەیەکی یاساییە ئایا نەتەوەیەک دەیەوێ لەچوارچێوەی دەوڵەتێکدا بمێنێتەوە یان نا. ئەگەر مایەوە بە چ شێوەیەک ئۆتۆنۆمی دەبێ، فیدرالی یان کۆنفیدرالی.؟

بڕیاری چارەی خۆنووسین بڕیارێکی بێسنوورە ئەوە لە کاتێکدا ئەگەر خەڵك دەنگی بۆ ئەو دەستوورەدا، دەبێ کورد خۆی ببەستێتەوە بە گەلی عێراق‌و پابەندی ئەو دەستوورە بێت‌و یەکێتیی خاکی عێراق بپارێزێت.

ئەی ئەگەر نەیپاراست، ئایا کورد مافی جیابوونەوەی هەیە. ئەوە مانای ئەوە نییە ئەگەر نەتتوانی بیپارێزی داوای جیابوونەوە بکەیت، ئێستاش عەرەبەکان تەنها سێ پارێزگاکە بە کوردستان دەزانن، کەرکووك‌و موسل‌و دیالە بە کوردستان نازانن، ئەز بڕوام بەوە نییە کە ئەو شوێنانە بەو شێوەیە ڕۆژێك بێت بگەڕێنەوە سەر کوردستان، بەڵام خوابکا بە هەڵە داچووبم.

ئەز نازانم د.فوئاد مەعسووم کە عەرەبی زانێکی باشە، چۆن ئەوەی بەسەردا تێپەر بووە. مەسەلەی ئایین کە دەڵێ ئایینی ئیسلام ئایینی ڕەسمییە لە عێراق، تەنها لە کوردستان چەندەها جۆر ئایین هەیە، دوایی خواپەرستی شتێکە لەنێوان خودی مرۆڤ‌و خوادا، چ پێوەندی بەخەڵکی ترەوە هەیە، ئایینی ڕەسمی عێراق لە دەستوورەکەدا ئیسلامەو هیچ قانونێك دەرناچی دژی بنەماکانی ئیسلام، لەخاڵێکی تریشدا هاتووە هیچ قانوونێك دەرناچێ دژی بنەماکانی دیموکراسی، کەواتە ئەمانە دووشتی زۆر جیاوازن‌و خاڵی یەکەمیش بەهێزترە لەخاڵی دووەم. کەواتە ئیسلام سەرچاوەی سەرەکیی یاساکانە.

ئیسلام‌و دیموکراسیەت یەك ناگرن، ئیسلام هەر ئیسلامە، ئایین لەچوارچێوەی خۆیدا فەرمانی خودایەو فەرمانی خوداش ناگۆڕێت‌و هەقی

بە سەر دیموکراسیەتەوە نییە. لەکوێ ئیسلامو دیموکراسیەت بەیەکەوە دەگونجێن!

دوایی لەدەستوورەکەدا هاتووە کە عێراق وڵاتێکی جیهانی ئیسلامییەو ئەندامێکی دامەزرینەرو کارای کۆمکاری وڵاتە عەرەبییەکانەو پابەندی (میپاق)ەکەیەتی، کەواتە کوردستانیش بەشێکە لەجیهانی ئیسلام لێرەدا ئەم دەستوورە حەق بەکابرایەکی موسوڵمانی پاکستانیو ئەندەنووسی دەدات کە بەیانی شەڕی کورد بکەن ئەگەر لاملەیەکی کرد، چونکە جیهانی ئیسلام دەکەوێتە مەترسیەوە.

ئەز دەپرسم چ وڵاتێکی غەیرە عەرەبی ئەندامی ئەو کۆمکارە عەرەبییەیە، کەواتە عێراق دەوڵەتێکی عەرەبیەو ئێمە لەدەرگاوە دەرمان کردن، ئەوان لەپەنجەرەوە هاتنەوە ژوورەوە. لەبەر خاتری چیو کێ، سونییەکانو عەمرو موسا؟

مام جەلال، خوا سەلامەتی کا! هەموو کاتێك دەڵی عێراق دەوڵەتێکی عەرەبیەو بەشیکە لەجیهانی عەرەب. هۆشیار زێباری دەچوو دەپاڕاییەوە کە عێراق وەك ئەندام لەکۆمکاری وڵاتە عەرەبیەکان قبوول بکەنەوە، جا کە ئێمە خۆمان وابڵێینو وابکەین بۆ گلەیی لەخەڵکانیتر بکەین.

مادەی 8 باسی تێرۆر دەکات، بەڵام دیار نەکراوە، تێرۆریزم چییەو تێرۆریستەکان کێن. ئایا بەیانی کوردێك لەدەست رژێمی ترك یان فارس یان عەرەب ڕابکاتە کوردستان بەتیرۆریست دەناسرێتو دەبێت بیدەنەوە بەو وڵاتە؟ ئایا خەباتی ئازادیخوازانە تیرۆریستییە؟ ئایا شەڕ بۆ رزگاریی نەتەوەیەك تیرۆریستییە، ئایا فیداکارێتیی شوانەی سەید قادرو سەرهەڵدانی کوردەکانی رۆژهەلات کارێکی تیرۆریستییە؟ سەرهەڵدانی کوردانی قامیشلۆ کارێکی تیرۆریستییە؟ لەدەستوورەکەشدا باس نەکراوە

ئەو کەسانەی ژیانیان لەمەترسیدایە دەتوانن لەکوردستان ماف پەنابەریان هەبێت یان نا.

ئەوجا مەسەلەی پێشمەرگە کە بووە بەپاسەوانی سنوور. پێشمەرگە، پاسەوانی سنوور نییە، پێشمەرگە کەسانێکن کوردو گەلی کوردستان دەپارێزن.

لەدەستووردا هاتووە، بەپێی یاسا دەتوانرێ ناسنامەی عێراقی لە هاوڵاتیان بسەندرێتەوە، بەڵام دیاری نەکراوە ئەو یاسایە چییەو سنووری چییە. دەکرێ، وەك رژێمی سووریا ناسنامەی لەهەزاران کورد ستاندەوە، ئەوانەش وابکەن، جارێ نازانین ئەو خاڵانە چین، لەوڵاتە دیموکراسیەکاندا، یاسا لەو رۆژەوە کاری پێدەکرێت کە لەرۆژنامەی رەسمیدا بڵاودەکرێتەوە.

لەدەستووردا باسی یاسای موڵکایەتی دەکات و ئێراقییەکان بۆیان هەیە لە هەموو عێراق موڵك بکڕن و نیشتەجێبن. کەواتە، هەزاران عەرەب دەتوانن بێنە کەرکووك و شارەکانی دیکەی کوردستان خانوو بکڕن بەپێی یاساش کەس ناتوانێ رێگریان بکات و دەریان بکات.

لەدەستووری تازەدا واکەوتووەتەوە کە ژنان چوار یەکن واتە ئەگەر جاران 2 ژن بەیەك شاهیددەشیان، ئێستا چوار ژن بەیەك پیاو حسابن، لەمەسەلەی میرات، هەروەها وەکو وتم ئێمە سەرەتاکەمان بەهەڵە دەست پێکردووە، ئەوجا نازانم خەڵکی کوردستان تا چ رادەیەك دەنگ بۆ ئەو دەستوورە دەدەن کە هیواو ئاواتی ئەوان لەچاڵ دەنێت.

سەرانی کورد تازە بە من دەڵێن وەرە لەنووسینەوەی دەستووری هەرێمدا بەشداربە باشە، بۆ لە زووەوە جارێك پرسێکتان بە من نەکرد؟ بۆ پرستان بەکەسانی شارەزا لەو بارەیەوە نەکرد؟ مەحمود عوسمان دەڵێ جەمال نەبەز بۆی نییە قسە بکات. جارێ مەحمود عوسمان بچوکترین پرەنسیبی

دیموکراتیەت نازانێ، چونکە لەسیستەمی دیموکراتیدا هەموو کەس بۆی هەیە قسە بکات، کەسێك لە ئوستڕالیاشەوە بۆی هەیە قسە لەبارەی دەستوورەکەوە بکات. ئەگەرنا کەواتە ئەو کابرایەکی فاشیستە.

مەحمود عوسمان کە لەساڵی 1992 لەکوردستان هەڵبژاردن بوو، لە مەلا عوسمانیش زۆر کەمتر دەنگی هێنا، کە گەڕایەوە بۆ لەندەن بە کاك جەوادی مەلا و شیخ لەتیفی مەریوانیوتبوو کە یەك گونییە دۆکەمینتی پییە کە ئەو هەڵبژاردنە هەمووی ساختە بووە، ئەوانیش وتبوویان باشە بێنە با بڵاوی بکەینەوە، وتبووی ئێستا کاتی نییە ئەوە لەو ساکەوە هەر کاتی نەهات. مەحمود عوسمان لەشۆڕشی کورد دا لەگەڵ بەهەشتی بارزانی بوو، دوای هەرەس هەڵگەڕاییەوەو، هەموو خراپییەکانی دایە پاڵ بارزانی، دوایی کتێبێکی بەعەرەبی بڵاوکردەوە کە بارزانی چووە بۆ ئیسرائیل، زۆر ناشیرنە مرۆڤ کەسایەتی خۆی بەهۆی کەسانی ترەوە دەستکەوێتو هەردووکیان لەسەر یەك ڕێگا بڕۆن، دواتر هەوڵبدات هاوڕێکەی ناشیرین بکاتو ئەو هەمووخراپەکارییەکانی شۆڕشی ئەیلوولی دایە پاڵ مەلا مستەفاوە، کەچی چەند ڕۆژێك لەمەوبەر لەڕۆژنامەی "خەبات"دا مەلا مستەفای بردووتەوە ئاسمان، ئەم شتانە جوان نین.

کاتێکیش ئەو چەپلەی لێدەدا بۆ مۆسکۆ من دەمگوت، ئەوە دەوڵەتیکی دیکتاتۆرەو دژی فەقیرو هەژارانە، دەیانوت ئەوە قسەی ئەمەریکاو ئیسرائیلە، ئەز ئەو کاتە نۆکەری سۆڤیەت نەبووم، ئیستاش نۆکەری ئەمەریکا نیم. مەحمود عوسمان دەیەوێ خۆی خۆشەویست کات، پیرۆزی بێ، بەڵام مافی ئەوەی نییە بڵێت فلان کەس یان جەمال نەبەز بۆی نییە قسە بکات.

دواتر بەپرسیارو وەڵامی ئامادەبووان سەمینارەکە گەرمتربوو.

**میدیا**، ژ / 209، 2005/9/20

## دوكتۆر مەحموود، هەزار خولیداو، لەهەزار ئاشیكرد، هێشتا ڕێگەی قسە كردنیش بە من نادات

لەژمارە (208)ی ڕۆژی 9/13ی ڕۆژنامەی "میدیا"دا وتووێژێك لەگەڵ دوكتۆر مەحموود عەلی عوسمان، بڵاوكراوەتەوە. لەو وتووێژەدا دوكتۆر مەحمود، بێئەوەی هیچ پرسیارێكی لەبارەی منەوە لێكرابێ، باسی منی هێناوەتە پێشەوەو، هێندەك شەكری شكاندووە، كە پڕ بەپێستی ژیننامەی هەڵپەرستانەو هەڵمەتەكاسانەی ئەم سیاسەتبازەیە، كە هەردەمە لەسەر پەتێك هەڵدەپەڕێ‌و، هەردەمە خۆی بەحیزبێك‌و كۆمەڵێك‌و لایەنێكدا هەڵدەپەسێرێ‌و، خۆی بەوە دەژێنێ‌و زلدەكاو، لەو ماوەیەشدا، هیچ جۆرە ڕەخنەیەك ناگرێ‌و قوڕوقەپدەكا لەهەموو ناتەواوی‌و كەموكورتییەك. بەڵام كە لەو حیزبە، یان لەو لایەنە دەقەومێ، ئەوجا دەستبەجێ گێڕ دەگۆڕێ‌و دەكەوێتە ڕەخنەگرتن‌وگەمار كردنی نێوی هاوڕێیەكۆنەكانی‌و، بۆ ئەمەش گەلێك بڕو بیانوو دەهێنێتەوەو، لەهیچ جۆرە بوختانكردنێك ناسڵەمێتەوەو، هەموو گۆتاوڕۆی سەرنەكەوتنی ئەو حیزب‌و لایەنە، دەهێنێ بە ملی ئەوانەدا كە تادوێنێ بوو لەسای سێبەریاندا دەژیاو پارووی دەگرت‌و خۆی دەنواند، بێ هیچ جۆرە ڕەنج‌و زەحمەتكێشانێك، لەقسەی بێ گوومرگ بەولاوە. بەڕاستی نەمدەویست ژیننامەی ڕامیاریی ئەم سیاسەتبازە لەم ڕۆژەدا بخەمەڕوو، بەڵام چ بكەم، كورد دەبێژێ: "شەڕمو یەخەت دەگرێ، ئەگەر نەیكەیت خودێ دەتگرێ".

دوكتۆر مەحموود، پاش ئەوەی خوێندنی بژیشكی (گب)ی لەزانستگەی بەغدا تەواو كرد، ماوەی یەك دوو مانگێك لەسلێمانی، وەك بژیشك، كاریكرد. جا لەبەر ئەوەی كەس نەیدەناسی، هات عەیادەكەی لەخانووەكەی دوكتۆر جەمال ڕەشیددا دانا، كە ئەو دوكتۆرێكی زۆر

شارەزاو ناسراو بوو لەسلێمانیو، لەو کاتەدا، کارەکەی، وەك سەرۆکی فەرمانگەی تەندروستی (رئیس دائرە الصحە) گۆزرابووەوە بۆ هەولێرو، خانووەکەی چۆلکردبوو، لەگەڵ ئەوەشدا، دوکتۆر مەحموود، نەیتوانی جێگەی دوکتۆر جەمال رەشید بگرێتەوەو، بازاڕی کزبوو. لەم ماوەیەدا، پێوەندیی بە پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە بەست، کە پاش کودەتای قاسم، لە 1958/7/14داو، بۆ ماوەی ساڵێك، دەسەلاتێکی بەهێزی پەیدا کردبوو و، پێبەپێی ئەوەش، پارتی دیمۆکراتی کوردستان، بەهۆی گەڕانەوەی رەحمەتی مەلا مستەفای بارزانییەوە لەسۆڤێت، گوڕوتێنی تێکەوتبوو.

دوکتۆر مەحموود ویستی لەهەردوولا بێبەش نەبێ. بۆ ئەوەش، رێیەکی زۆر زانانەی گرتەبەر. هات خۆی لەرەحمەتی هەمزە عەبدوڵڵا، سکرتێری ئەو دەمەی پارتی نێزیککردەوە. بەلاّم ئەم هاوڕێیەتییە درێژەینەکێشا. چۆنکە، رەحمەتی هەمزە عەبدوڵلا، بەتەواوی کەوتبووە ژێر کاریگەریی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوەو، دەیویست هەموو رێکخراوە کوردستانییەکانی سەر بەپارتی، وەك لاوانو قوتابیانو ژنانو مامۆستایان، هەڵبوەشێنێتەوەو بیانخاتە نێو ریزی رێکخراوەکانی پارتی کۆمۆنیستی عێراقەوە. ئەم هەڵوێستەی هەمزە عەبدوڵلا، هەرچەندە، لای کۆمۆنیستەکان بەرز دەنرخێنرا، بەلاّم مەترسییەکی زۆری لای کاربەدەستانی پارتی پەیدا کردو، بۆ چارەسەر کردنی ئەمەش، پەنایانبردە بەر بارزانی، کە سەرۆکی پارتی بوو. بارزانی، لەگەڵ چەند چەکدارێك، ئێوارێی 1959/6/30 چووە بارەگەی سەرەکیی پارتی لەبەغداو، بارەگەکەی خستە ژێر دەستی خۆیەوەو، هەمزەی هەڵپەسارد، تاکۆنگرەی چوارەمی پارتی لە 1959/10/6دا کە لەبەغدا گیرا، هەمزەو لایەنگرانی بە "تاوانی خیانەت لەحیزبو گەل" لەپارتی دەرکران. ئەز خۆم، لەنێزێکەوە، ئاگام لەم رووداوە بوو، چۆنکە لەو سەردەمەدا،

ماموٚستای قوتابخانەی دوانێوەندیی جەعفەرییە بووم (کە قوتابخانەی شیعەکان بوو لەبەغدا).
کۆنگرەی چوارەم، ڕەحمەتی برایم ئەحمەدی، وەك سکرتێری گشتیی پارتی، هەڵبژارد. دوکتۆر مەحموودیش یەکودووی لێنەکردو، هەمزەی بەجێهێشتو، لووس‌و باریك، چووە بنەو پاڵی برایم ئەحمەدەوەو، لەڕێی برایم ئەحمەدەوە، خۆی لە مەلا مستەفاو، دوایی لەشۆڕشی ئەیلوول، نێزیککردەوە. کە لەساڵی 1964دا، ناکۆکی کەوتە نێوان سەرۆکی شۆڕش‌و کۆمیتەی نێوەندیی پارتییەوەو، برایم ئەحمەدو مام جەلال‌و هاوڕێکانیان، لەسەرکردەیەتیی شۆڕشدا نەمان، دوکتۆر مەحموودی برادەریان، مێش میوانی نەبوو، بای بایی لەوانیش کردو، لەگەڵ سەرۆك بارزانی مایەوەو، سووتی لە "قحگ الرجال"ی ئەو سەردەمەی شۆڕش وەرگرتو، خۆی کردە کەسیەتیی دووەمی شۆڕش، پاش سەرۆك بارزانی‌و، لەو ماوەیەشدا، بەیەك و شەش چییە، ڕەخنەی لە هیچ کارو کردارو هەڵسوکەوتێکی کاربەدەستانی شۆڕش، بەتایبەتی سەرۆك بارزانی‌و، ڕەوتی شۆڕش نەگرت. بەڵام بەهەموو توندوتیژییەك دوژمنایەتیی هەموو مرۆڤێکی ئازادیخوازو نەتەوەییی کوردی دەکرد، بەتایبەتی من‌و هاوبیرانی من‌و، بەمەش هاوکارو هاوکرداری ساواکی ڕژێمی شای ئێران بوو، چۆنکە شای ئێران، وەك ڕەحمەتی کامەران بەدرخان گێڕایەوە بۆمو، کەریمی حیسامی لەبیرەوەرییەکانیدا لەزمان شەهید عەبدولرەحمانی قاسملوەوە دەیگێڕێتەوە، منی بەدوژمنێکی سەختی ڕژێمەکەی خۆی دادەنا. بێجگە لەوەش، دوکتۆر مەحموود پێوەندییەکی توندوتۆڵی هەبوو لەگەڵ ئیسرائیل، کەچی بەدەم باسی "مارکسێتی"و "پێشکەوتنخوازی"و "برایەتیی کوردو عەرەب"ی دەکردو، زوڕنای بۆ یەکێتیی سۆڤێتو "شۆڕشی مەزنی ئۆکتۆبەر" لێدەدا، بۆ

شاردنەوەی ئامانجەکانی خۆی‌و، خراپەکاریی بەرامبەر بە من، کە ئەز بەر لەھەموو کوردێکی دیکە، باسی ئەوەم کرد کە سۆڤیت دەوڵەتێکی ئیمپریالیستییەو سۆسیالیستی نییە و دوژمنی ئاشتییە، نەك ئاشتیخوازو، بێجگە لەوەش، داگیرکەری بەشێکی کوردستانە، نەك پشتوپەنای کوردو، ھەرواش دەرچوو.
شایانی باسە، ئێمە چەند ھاوبیرێك لەئەورووپا، پاش ئەوەی بۆماندەرکەوت کە کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لەئەورووپا (KSSE)، پێویستیی سەرشانی خۆی بەرامبەر نەتەوەی کوردو شۆرشی ئەیلوول بەجێناھێنێ‌و، حیزبحزبێنەی کردووە بەسەر مەشقی خۆی، یەکێتیی نەتەوەییی خوێندکارانی کورد لەئەورووپا (نوکسە NUKSE)مان لە 1965/3/21دا لەمیۆنخ دامەزراند، کە لەبەھاری ئەمساڵدا، چل ساڵ تێپەڕی بەسەر ئەو رووداوە مێژووییەدا، ھاوبیری ھێژا ھەندازیار بروسك ئیبراھیم، بوو بە سکرتێری گشتیی نوکسە. ئێمە سەرەتای کارمان ھەر بەرۆشنکردنی بیری کوردەوارییەکەو ئەورووپاو، پەیدا کردنی دۆست بۆ کورد، لەنێو ئەورووپاییەکاندا دەستپێنەکردو بەس، بەڵکو، لەپاڵ ئەوەشدا، کەوتینە کۆکردنەوەی دەرمان‌و ئامێری بژیشکیی زۆر دەگمەن‌و گران، ھێندەکی بە پارەی خۆمان کڕیمان‌و، ھێندەکیشمان لەدۆستە ئەورووپاییەکانمان وەردەگرت. بەکورتی، چەند جارێك، ژمارەیەکی زۆر، دەرمان‌و کەلوپەلی نەخۆشخانە، لەکارتۆن‌و سندوقی گەورە گەورە دا، بە پۆستەی بارھەڵگرو، بەزانیاریی شەھیدی کوردستان، مامۆستا مەلا جەمیلی رۆژبەیانی کە ئەو دەمە لەتاران بوو، رەوانەی تارانمان کردن، تا لەرێی نوێنەری شۆرش، شەمسەدین مفتییەوە، بگاتە پێشمەرگەکان، کە زۆر پێویستیان بەو دەرمان‌و ئامێرانە ھەبوو. وەك لەدواییدا بیستمان، دەرمانەکان، بەفەرمانی دوکتۆر مەحموود، نەدرا بوون بە پێشمەرگە،

بەبیانووی ئەوەوە کە گوایە، جەمال نەبەز دژی شۆڕشەو، دوور نییە ئەو دەمانانە شتێکی خراپیان تێدا بێ. ئەوجا، چارەنووسی ئەو دەرمانانە بەچی گەیشت، ئەوە هەر خودێ‌و دوکتۆر مەحموودو کاربەدەستەکانی دەیزانن.

پاشان، کە وتووێژ لەنێوان سەرکردایەتیی شۆڕش‌و ڕژێمی بەغدا، لەکۆتایی ساڵی 1969دا، هاتە کایە، دوکتۆر مەحموود، سەردەستەی وتووێژکەران بوو لەگەڵ مێشێل عەفلەق‌و ئەحمەد حەسەنولبەکرو سەددام حسەین‌و، ئەوەبوو ئەو ڕێککەوتننامە فشوفۆڵ‌و کونوکەلە بەردارەی بەسەر کوردو بارزانیدا سەپاند، کە چوار ساڵ کاتی دا بەرژێمی بەعس، تاخۆی بەجارێك کۆکردەوەو، ئەو هەرەسەی بە شۆڕشی ئەیلوول هێنا، کە ڕاستییەکەی، ئەوەیە، وەك دەمێکە گوتوومە، هەرەسەکە لەمارتی 1970دا ڕوویدا، نەك لەمارتی 1975دا، جا ئەگەرچی، ڕاستە خەڵکەکەی کوردستان هەستیان بەوە نەکرد، بەڵام ئێمەی هاوبیرانی نوکسە، هەرچەند ڕۆژێك دوای ئیمزاکردنی ڕێککەوتنەکە، لێدوانێکمان لە ڕۆژنامەکەماندا "کوردستان ئینفۆرماسیۆن" -کە بەزمانی ئەڵمانی دەرماندەکرد- بڵاوکردەوەو، گومانی سەختی خۆمان بەرامبەر سەرگرتنی ئەو ڕێککەوتننامەیەی مارت دەربڕی. کەچی دوکتۆر مەحموود، هەر پاش بەیاننامەکە، خۆی نێونا "دوکتۆر مەحموودی سۆرانی"، بەمەشدا وایدەزانی، کە دەتوانێ، خۆی بەرامبەر سەرۆك بارزانی ڕاستبکاتەوە، بەڵام لەوەوە، سەرەتای نیۆچەگەریی سۆرانی‌و بادینانی دا بە بای گوێی مرۆڤی سادەو ساویلکەداو، دڵی دوژمنانی نەتەوەی کوردی خۆشکردو ئەوجا، خولە سۆرانی، لەگەڵ کاربەدەستانی بەعس، ئەم شارو ئەو شار دەگەڕاو، پروپاگەندەی بۆ حیزبی بەعس دەکردو، لەنێو خەڵکی سلێمانیدا دەیقیژاند: "کاژیکمان بەجارێك لەنێو برد، هەریەك کەسیان ماوە، ئەویش

جەمال نەبەزە". ئەم دوژمنایەتییەشی بەرامبەر بە من، گەیشتبووە رادەیەك، كە جارێكیان، گەنجێكی خەڵكی سلێمانی ویستبووی بێتە دەرەوە لەوڵاتو، بێ بۆ ئەورووپا، ناسیاوێكی بردبوویە لای دكتۆر مەحموودو، ئەویش لەڕێی ئێرانەوە راییكردبوو، بەڵام پێیگوتبوو: "تۆ ئەوا دەچیتە ئەورووپا، لەوێ دەبێ ئاگات لەخۆت بێ. كابرایەكی زۆر خراپ هەیە، نێوی جەمال نەبەزە. لەژوورێكدا دانیشتووە، شەوو رۆژ خەریكی نووسینە، هەر كاغەز رەشدەكاتەوەو، بەسەری خۆیدا هەڵیدەداو دەڵێ: هوو... وریابە نەتخڵەتێنێ". ئەو گەنجە هات بۆ لام بۆ بەرلینو، لەژوورەكەمدا بەرامبەرم دانیشتو، قسەكەی دوكتۆر خولەی سۆرانی بە پێكەنینەوە، گێڕایەوە بۆمو، كە خەریك بوو بڕوا، هێندەك لەنووسینەكانی خۆمو نوكسەم دایە دەستو گوتم، ئەمجارە هەڵینادەم بەسەری خۆمداو، ناشڵێم "هوو.." نەوەكو دوكتۆر مەحموودی سۆرانی لەكوردستانەوە چاوی لەكاغەزەكانو گوێی لەدەنگی "هوو..."ەكەم بێ!!

پاش ئەو كوێرەوەرییەی كە بەسەر كورد هات لەئەنجامی هەرەسەكەوە، دوكتۆر مەحموودی سۆرانی، روویكردە سووریاو ئەورووپاو، لەسەرەتای 1977دا نامیلكەیەكی بەعەرەبی دەكرد "تقییم مسیره الپوره الكردیه وانهیارها والدروس والعبر المستخلصه منها"، بەنێوی گوایە "لیژنەی ئامادەكاریی پارتی دێموكراتی كوردستان"ەوە، وەك ئەوەی پارتی كەسی نەمابێو، ئەو سەر لەنوێ دروستیبكاتەوە. لەم ماوەیەدا خۆی لە "یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان" نێزیككردەوە، كە لەو سەردەمەدا، لەدیمەشق دامەزرابوو. نامیلكەكەشی هەر لەدیمەشق بۆ چاپكراو، بەیارمەتیی "ی.ن.ك"، چەند كۆڕو سەمینارێكیشی لە ئەورووپا بۆ بەسترا، كە لەو جڤینو نامیلكەیەدا، خۆی وەك مرۆڤێكی "پێشكەوتنخواز"و "دۆستو لایەنگیری بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی عەرەبو بەتایبەتی

فەلەستینیەکان"و دژ بە "ئیمپریالیزمی ئەمریکاو زایۆنیزم" پێشاندەداو، لەنامیلکەکەیدا بەشێوەیەکی زۆر بێویژدانانەو، لەباتی رەخنەگرتنی بابەتانە، بەتایبەتی لەخۆی، هێرشی زۆری کردبووە سەر بارزانیو بنەماڵەی بارزانیو، هەموو گۆتاوڕۆکەی هۆی هەرەسهێنانی شۆرشی خستە ئەستۆی مەلا مستەفای بارزانیو بنەماڵەی بارزانی. ئەم پەلاماردانەی بۆ سەر بارزانی، تەنانەت سالآنێکیش پاش کۆچیدواییی بارزانی هەر درێژەیکێشا. بۆ وێنە: کاتێك کە رۆژنامە عەرەبییەکان، نهێنیی چوونی دوکتۆر مەحموودیان بۆ ئیسرائیلو پێوەندییەکانی دوکتۆر مەحموودیان بە ئیسرائیلەوە زڕاند، دوکتۆر کێچ کەوتە کەوڵیو زراوی چوو و، هەر رۆژە نا رۆژێك، لەگەڵ رۆژنامەیەکی عەرەبی (بۆ نموونە گۆڤاری "الوسگ")، یان رادیۆو تەلەفیزیۆنێکی عەرەبی، وتووێژیدەکردو، وایدەدایە بەرچاو، کە ئەو پێوەندییە لەگەڵ ئیسرائیل، بەفەرمانی بارزانی بووەو، ئەو لەگەڵ بارزانی چووە بۆ ئیسرائیلو، دەیگوت کە ئەوە کارێکی یەکجار خراپ بووەو، زۆر زیانی هەبووە بۆ کوردو، گوناهی وی تێدا نەبووە. ئەمەش هەڵوێستو وەفای دوکتۆر مەحموودی سۆرانی بوو بۆ سەرۆك بارزانیو بزووتنەوەی کوردایەتی، ئەو کوردایەتییەی کە بەداخەوە، گەلێك کوڕی رۆژی کردە دەسەلآتدارو ملوێنێرو، گەلێکی دیکەشی ماڵوێرانو سەرگەردانو برسیو رەشوڕووتکرد.ئەوە هەڵوێستی ئەو ساکەی مەحموود سۆرانی بوو، بەرامبەر سەرۆك بارزانی، بەڵام ئەوەتە ئەوڕۆ دەفەرموێ کە "ئەو خۆی رێککەوتنی 11ی مارتی کردووەو" بارزانی تەنێ پشتگیریی لەدانوستاندنەکان کردووە بۆ ئەوەی ئاشتی هەبێو شەڕ نەبێ" (تەماشای رۆژنامەی "خەبات"، ژ 1914 دووشەوممە 2005/9/12 ل6 بکە: مەحموود عوسمان: بارزانیی نەمر پشتگیری لەدانووستاندنەکان دەکرد،

بۆ ئەوەی ئاشتی هەبێ و شەڕ نەبێ). گێڕگۆڕین بۆ مەحموود سۆرانی، ڕادیارە، شەرم نییە. بۆچی؟ چۆنکە ئەوڕۆ کاک مەسعوود بارزانی دەسەڵاتدارە، خۆ ئەگەر ڕۆژێك بێ و، ئەو دەسەڵاتەی نەمێنێ، ئەوا نامیلکەیەکیش لەدژی وی دەردەکاو، خۆی وەك بەرزەکی بانان دەپەڕێنێتەوە. ئەمجارە، رەنگە لەباتی "تقييم مسيرە البورە..." نامیلکەکەی نێو بنێ "تقييم مسيرە الفيدراليە ودستور عروبە العراق... الخ". ئەمە لەکاتێکدا کە ئەو خۆی، وەك ئەندامی لیژنەی دەستوور، ئیمزای ئەوەی کردووە، کە عێراق ئەندامی کۆمکاری عەرەبەو پێوەندییداری پەیماننامەکەیتی، پەیماننامیەکی عروبییە "واتا عێراق دەوڵەتێکی عەرەبییە"و هەروەك دوکتۆر خۆی دەڵێ، بەئارەزووی خۆی، ئەوان هەر خۆیان ئەنفال و کیمیابارانیان نەخستە دەستوورەوە، ئەمەش، بەدانپێدانانی خۆی لەوتووێژەکەی "میدیا"دا دەڵێ و، هەر لەوێدا پەلاماری فەلەکەددین کاکەیی دەدا کە گوتووێتی ئەندامانی کوردی لیژنەی دەستوور، داخوازییەکانی کوردیان بەگەرمی نەخستبوەڕوو، تا ئێمە چووین بۆ بەغدا.

پاش هەرەسهێنانی شۆرشی ئەیلوول و، ئەو نامیلکە شەرمەزارییەی کە دوکتۆر مەحموود دەریکرد، دەستی بەوە کرد، کە پێویستە ڕێخۆشبکا بۆ دامەزراندنی حیزبێك، چۆنکە بۆیدەرکەوت، کە ئەو خاوەنی پارتی نەبووە، تا دەستبگرێ بەسەریداو ببێتە سەرکردەی، لەبەر ئەوە، پاکانەی بۆ ئازادیی دەربڕینی بیروڕا دەکردو. تەنانەت لەنامیلکەی "تقييم البورە الكرديە..."دا ڕوودەکاتە بنەماڵەی بارزانی و دەبێژێ: "(عليهم) ان يتصرفوا كمن خسرَ قچيه... وان لايعتبروا انفسهم فقگ مخلصين بل يقبلوا بان لكل كردی حق العمل والنچال اژا استگاع ژلك وكژلك ان يقبلوا تعدد الافكار والتيارات بعد النكسه، باعتباره شيئاً گبيعيا" (ص86). کە

واتاکەی بەکوردی ئەمەیە: پێویستە (لەسەریان)، وەك کەسانێك هەڵسوکەوت بکەن، کە مەسەلەیەکیان دۆڕاندووە.. (راستدەکەیت خولە، تۆ خۆت هیچت نەدوڕاند، چۆنکە هیچت نەبوو بیدۆڕێنیٚ: جەمال نەبەز)و هەر تەنیٚ خۆیان بەدڵسۆژ نەزانن، بەڵکو رازیبن بەوەی، کە هەموو کوردێك مافی کارو تێکۆشانی هەیە، ئەگەر پێیکرا. هەروەها، دەبیٚ رازیبن، بەفرەیەتیی بیرو رێباز، پاش هەرەسەکە، چۆنکە ئەوە شتێکی خۆڕسکییە... هتد".

ئەریٚ، دکتۆر مەحموود، تا دەسەڵاتی هەبوو لەنێو شۆڕشدا، نەدەبوو کەس ببێژیٚ "لەل"و، داوای لەنێوبردنی کاژێكو هەموو مرۆڤێکی دەکرد، کە بیروڕای خۆی دژ بە لایەنە نەرێنییەکانی شۆڕش دەربڕیایە، وەك ئەوڕۆ، کە ئەوەتە رەپوڕاست دژی دەربڕینی بیروڕایە. بەڵام کە دەسەڵاتی نەما، ئەوا لەنامیلکەکەیدا، داوای سەربەستیی بیروڕاو رێباز دەکاو، بەشتێکی ئاسایی دادەنیٚ، کەچی ئەوڕۆ، کە هێناویانەتەوە مەیدانو کردوویانە بەئەندامی پەرلەمانو دەستەی نووسینی دەستوورو، کەسیش نازانی نوێنەری کێیە، مافی قسەکردنو رادەبڕین بەمن نادا، کە ئەمەش رەوشتێکی یەکجار دیکتاتۆرانەو مرۆڤدوژمنانەی ئەوانەیە کە سەر بە بەرەی فاشیستەکانن.

کە دکتۆر مەحموود، دەستی ششت لەدامەزراندنەوەی پارتی بەسەرۆکایەتیی خۆیو بۆیدەرکەوت کە ناتوانیٚ ببێتە میراتخۆری پارتی، خۆی خستە نێو ئەوانەوە کە دەیانویست پارتی سۆسیالیستی کوردستان دروستبکەن. پاش چەند کۆبوونەوەیەك لەگەڵ سەرکردەکانی سۆسیالیستو، خۆ کردن بە نوێنەریان، دیشەکەمی لەوانیش کرد. چۆنکە وەك برای بەڕێز کاکە حەمەی حاجی مەحموود، هەر لەو ژمارەیەی "میدیا"دا دەیگێڕێتەوە بۆمان، کە دوای رووخانی رژێمی سەددام بە

دوکتۆر مەحموودی گوتووە، وەرە ببە بە سکرتێری حیزبێکی کوردستانی، بەڵام دوکتۆر مەحموود رازینەبووەو گوتوویەتی" ئێمە بەتەمای حیزبێکی عێراقین". کەچی ئێستە لە "میدیا"دا دەبێژێ، ئەو بۆ سەربەخۆیی کوردستان تێدەکۆشێ، بەڵام ئیمزای "عروبەی عێراق"یش دەکاو کاتێك ئەندامی مەجلیس حوکم بوو لەدژی ئەو کەرکووکیانەش قسەیکرد کە لە خوپێشانداندا داوای سەربەخۆیی کوردستانیاندەکردو بە "ئاژاوەگێڕ"و "گێرەشێوێن" نێویبردن. پاشان دوکتۆر مەحموود چوو سالانی دووردوێژ لە لەندەن ژیاو، هیچ کارو کاسبیەکیشی نەدەکردو، باشیش بەڕێوەدەچوو.

هەر پاش سەرکەوتنی راپەڕینو کۆڕەوەکەو لەکاتی دەستپێکردنی وتووێژدا لەگەڵ سەددام، دوکتۆر مەحموود لەگەڵ دەستپێکردنی وتوێژ لەگەڵ سەددام، گەڕایەوە کوردستان، وەك یەکێك لە حەوت سەرکردەکەی "بەرە" بەنوێنەرایەتیی حیزبی سۆسیالیست.

پاش دامەزراندنی "هەرێمی نەفرین"و هەڵبژاردن بۆ پەرلەمانی "هەرێمی نەفرین" لەساڵی 1992دا، دوکتۆر مەحموود خۆی پالاوت بۆ پەرلەمان، بەڵام تەنێ چەند سەت دەنگی وەرگرتو، گەڕایەوە لەندەن. لە لەندەن لەکۆبوونەوەیەکدا، کە هێژایان جەواد مەلاو شێخ لەتیف مەریوانیو چەند کەسێکی دیکەش ئامادەیبوون، گوتبووی: فەردەیەك بەڵگەنامەی لەگەڵ خۆی هێناوە، کە هەموو ئیسپاتی ساختەکارێتیی لەهەڵبژاردنەکەدا دەکەن. شێخ لەتیف پێیگوتبوو دەباشە ئەو بەڵگانە بڵاوبکەرەوە. گوتبووی "ئێستە کاتی نییە. ئەوجا پێیانگوتبوو، باشە بیدە بە ئێمە بڵاویبکەینەوە. گوتبووی "کاتی نییە". ئێستەو ئەوسا. ئەمانە دەریدەخەن کە دوکتۆر مەحموود چەند خۆشەویستە لەنێو خەڵکی کوردستانداو قسەکانی چەند راستن.

پاش ئەوەی پی کی کی بیری "پەرلەمانی کوردستان لەدەرەوەی وڵات"ی لە "کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان"ەوە وەرگرت، دوکتۆر مەحموود، خۆی لە پی کی کی نێزیککردەوەو، هەر ساتە ناساتێ، لەتەلەفیزیۆنەکەیانەوە (مێد تی ڤی) قسەی ناشرینی بەپارتیو یەکێتی دەگوت. لەگەڵ ئەوەشدا، پی کی کی هیچ بایەخێکیان پێنەداو، نەیانخستە شوێنەکەی دوکتۆر عیسمەت شەریف وانلی، هەرچەندە بێزووی بەو شوێنەوە دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا، بەدرێژاییی ساڵان لەئەورووپا، لەهەموو ئاشێکدا بەرداشبوو. جارێکیان بەڕێوەبەرێتی شاری فلۆرێنس لەئیتالیا، سەمینارێکی بەست بۆ کولتووری کورد، کە منو بەڕێز فەلەکناز ئوجەو دوکتۆر مەحموودیشیان بانگکردبوو. ئەوانەی کە لەوێ بوون شایەتن، کە لەو سەمینارەدا، من هەرچییەکم دەگوت، دوکتۆر مەحموود پشتگیریی قسەکانی منی دەکرد. ئێستەش مافی قسەکردن ڕەوا نابێنی پێمان. بانێکەو دووهەوا.

کاتێك کە رادیۆی "العراق الحر"، بە پشتگیریی "سی. ئای. ئەی" دامەزرا، دوکتۆر مەحموود، هەر رۆژە نارۆژێك، بەنێوی "سیاسەتمدارێکی سەربەخۆ"وە، هێندەك قسەی زلی بەگوێگران دەفرۆشتو، رەخنەی توندوتیژی لەپارتیو یەکێتی دەگرت، کەچی هەر پاش رووخانی رژێمی بەعس، سەری دوکتۆر لە تەلەفیزیۆنی هەولێردا دەرکەوتو، کەوتە مێچکە مێچکە کردن بۆ پارتیو یەکێتیو، کرا بە ئەندامی "مجلس الحکم الانتقالی"، بێئەوەی کەسێك بزانێ دوکتۆر خولە نوێنەری چ لایەکە. لەبەرئەوە، هێندەك کەس دەیانگوت "ئینگلیزەکان ناردوویانە". ئەز نازانم ئەوە تا چ هەندازەیەك راستە، بەڵام ئەوە هەیە کە دوکتۆر مەحموود بەدرێژایی بوونی "مجلس الحکم الانتقالی" مانگانەی خۆی وەردەگرتو بەرگری لە "قانوونی بەڕێوەبردنی دەوڵەت" دەکردو ئەوانی دژی ئەو

قانوونە بوون بە "نەزان" دەدانە قەڵەم. کەچی یەک بەند لەو قانوونەدا نەبوو کە ئەنفال‌و کیمیاباران بەجینۆساند بداتە قەڵەم. ئێستەش لەبارەی دەستوورەوە دەبێژیٚ دەستوورەکە لە قانوونی بەڕێوەبەریتیی دەوڵەت دواکەوتووترەو گەرەنتی نییە بۆ جێبەجێکردنی بەندەکەی لەسەر کەرکووک. بەڵام ئەوی دەنگی نەدا بۆی هەڵەو نەزانە بەلای ئەوەوە. دەبیٚ ئەوەش بگۆترێ کە دوکتۆر مەحموود پشتگیریی هەڵکردنی ئاڵای بەعسی دەکرد لەتەنیشت ئاڵای کوردستانەوە، ئەو ئاڵایەی کە ئەنفال‌و گەلکوژی لەژێردا کراو، دەیگوت دەبیٚ لە هەولێریش هەڵبکریٚ‌و سیاسەتیی یەکێتی لەو بارەیەوە لە سیاسەتیی پارتی پێڕاستتر بوو.
ئەوجا، بێینە سەر ئەو قسە ناماقووڵەی دوکتۆر مەحموود کە گوایە ئەز چەند ساڵە لەئەورووپام‌و نەگەڕاومەتەوە کوردستان، لەبەر ئەوە مافی قسە کردنم نییە.
ڕاستییەکەی، ئەگەر دوکتۆر مەحموود کەمێك ویژدانی ببوایە، دەبوو ئارەقی شەرمی بڕشتایە کە ئەو قسەیە دەکا. چۆنکە خولە فیڕنەگولە، خۆی زۆر باش دەزانیٚ کە ئەوبوو بەهۆی ڕێگرتن لەگەڕانەوەم. چیرۆکەکەش ئەوەبوو، کە لەپاییزی ساڵی 1969دا، هەستم بەوە کرد، کە گوشارێکی زۆر گەورە لەسەر سەرۆك بارزانی هەیە بۆ ڕێککەوتن لەگەڵ بەعس، کە ئەوەش لە بەرژەوەندیی شۆڕش نەبوو، چۆنکە درێژەدان بە شۆڕش، چەند مانگێکی دیکە، دەبووە هۆی کەوتنی ڕژێمی بەعسی، سەددام خۆشی پاش هەرەسەکە دانی بەوە دانا کە ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ بارزانی لەناچارییەوە بووە. ئەوەی پتر هانی منی دا بۆ ئەو کارە لەو کاتەدا، بوونی گەلێك لەهاوبیرانی کاژێك بوو لەنێو شۆڕشدا، کە دوکتۆر مەحموود، بۆ خۆشخزمەتیی بۆ ڕژێمی شا، تیرو شێری دەسوو لێیان، بەڵام ئەوان لەنێو شۆڕشدا خۆیان ڕاگرتبوو. نامەیەکم نووسی بۆ هاوبیری

کۆچکردووم مامۆستا فەرەیدوون عەلی ئەمین‌و پێمڕاگەیاند کە داوا لە سەرکردایەتیی شۆڕش بکەن، ئاسانکاریی بۆ هاتنەوەم بکات. خۆشم، خۆم ئامادە کرد بۆ گەڕانەوە. هەرچی پەرتۆکم هەبوو، دام بە نامەخانەی دەوڵەتی لەهەمبورگ کە ئێستاش لەوێ پارێزراون‌و، شتە گرنگەکانم لای دۆستێك دانا. جا لەبەر ئەوەی، تەنیٚ ژوورێکم هەبوو، بەکرێم گرتبوو و، وەك کوردەکە دەبێژیٚ: "کەر کوڵ‌و بارسووك" بووم. خوێندنی یەکەمیشم لەزانستگەی هەمبورگ تەواو کردبوو. هێندەك شتیش فێر بوو بووم کە دەمتوانی بیخەمە خزمەت کۆمەڵگەی کوردەوارییەوە.. پاش ماوەیەك، لەسەرەتای ساڵی 1970دا، هاوبیر مامۆستا فەرەیدوون وەرامی گێڕایەوە لێم، کە سەرۆکایەتیی شۆڕش رازینییە بەوەی تۆ (واتە ئەز) بێیتەوە کوردستان‌و، وەك ئاگادار کرام، دوکتۆر مەحموود فەرمووبووی، "ئەو جەمال نەبەزە دوژمنی شۆڕشەو، نابیٚ بێتە ئێرە". ئەوجا دیاریشە کە ئەز نەدەگەڕامەوە نێو ئەو کوردستانەی بەدەست بەعس‌و رژێمی ترك‌و شاوە بوو، ناچار لەئەورووپا مامەوەو، سەر لەنویٚ خوێندنێکی دیکەم دەستپێکردووە. پاش ئەوەی کە بەیانی مارت دەرچوو، ئەوا ئاشکرایە کە بەدڵی من نەبوو. خۆ، ئەگەر بگەڕاشمایەوە، ئەوا، دوکتۆر مەحموود سۆرانی، ئەو حەلە دەیگوت "ها.. هاتووە، دەستکەوت بەشبکا لەگەڵمان". لەکاتێکدا کە دەسکەوتی من‌و دەسکەوتی مەحموود سۆرانی زۆر پێچەوانەی یەکن. رۆژگارو ساڵانیش ئەوەیان ئیسپاتکردووە، کاتێك کە شۆڕشیش لەبەهاری 1974دا تازە بووەوە، دڵنیا بووم کە درێژەناکێشیٚ‌و کورد دەیدۆڕێنیٚ‌و، هەرواش دەرچوو. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر هەوڵم دا بۆ پشتگیریی شۆڕش. یەکێك لەو هەوڵانە ئەوە بوو کە رۆژنامەنووسێکی بەنێوبانگی ئەڵمانی، سەر بە تەلەفیزیۆنی Z.D.Fم والێکرد بچیٚ بۆ نێو شۆڕش‌و چەند دەمژمێرێك فیلمی شۆڕش بگریٚ‌و لەگەڵ سەرۆك بارزانی

وتوویژ بکا. کابرا چوو بۆ تاران‌و چوار هەفتە لەتاران مایەوە، بەڵام نوێنەری شۆڕش ڕێینەدا بچێ بۆ کوردستان. ئەوە لەکاتێکدا بوو کە مەلا مستەفای ڕەحمەتی لەخودێ دەپاڕایەوە، ڕۆژنامەنووسێکی ئەورووپایی ڕێبکەوێتە نێو شۆڕش. ئەوەش هەر لەبەر ئەوەی خولە پێیوابوو، ئەگەر ئەز بگەمە نێو شۆڕش، یان یەکێك لەڕێی منەوە بچێتە نێو شۆڕش، ئەوا جێ بەجەنابی لێژ دەبێ. لەکاتێکدا کە ئەز -وەك ژیننامەی من دەریدەخا- هیچ کاتێك نە بەدوای پلەو پایەدا گەڕاوم‌و، نە بەدوای دەسکەوتی تایبەتیدا. ئەوانە هەمووی پێشکێشبن بە خولە. ئەوجا کە هەرەسەکە بوو و، چەند حیزب‌و دەستەو بەرە پەیدا بوون‌و، هەریەکە تاقمێك چەکداری لەخۆی کۆکردەوە بۆ پەلاماردانی ئەوانی دی‌و، دوای ئەوەش جەنگی ئێران‌و عێراق ڕوویداو هەشت ساڵ درێژەیکێشاو، حیزبە کوردییەکانی ڕۆژهەڵات‌و باشوور، ئەویان لایەنی سەددام‌و، ئەمیان لایەنی خومەینیان گرت، نەمتوانی بێمەوە کوردستان (واتە نەمتوانی بێمە نێو شەڕی خۆکوژییەوە)و پاش ئەوەش ئەوەبوو جەنگی کوێت ڕوویداو "هەرێمی نەفرین" دروستبوو، حیزبحزبێنە لەنێو پارتی‌و یەکێتییدا واخەستبوو، تاگەیشتە شەڕو بەیەکدادان‌و ڕژانی خوێنی هەزاران کەس لەهەردوولا. لەم ماوەیەشدا، چەند ساڵ خەریکی ئاشتکردنەوەو نێزیککردنەوەی پارتی‌و یەکێتی بووم، لەکاتێکدا کە دوکتۆر مەحموود، لەقسەی ناشیرین گوتن بەهەردوولا دریغی نەدەکردو لێدوانە دژ بە یەکەکانی لەسلێمانی‌و پیرمام بەنێوی -گوایە ئاشتکردنەوەوە- بارودۆخەکەیان لەنێوان پارتی‌و یەکێتیدا توندوتیژتر دەکرد. بێجگە لەوەش هاتنەوەی من بۆ کوردستان، وەك هاتنەوەی دوکتۆر مەحموود، یان ئەوانە نییە کە سەر بەحیزبەکان‌و پێوەندییان لەگەڵ دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان هەبووە. ئەز مرۆڤێکم سەربەخۆ، نەچەکدارم هەیەو، نەحیزبێك لەپشتمەوەیەو، نە

بیرۆشم هەیە لە تاران‌و، ئەنقەرەو دیمەشق‌و، نە لەگەڵ ئەو عێراقییانەشدا بووم‌و هەم، کە ئەوڕۆ کاربەدەستن‌و تادوێنێ بوو، لەبەرەی بەرهەڵستکارانی عێراقیدا بوون، خۆشم بەعێراقی نازانم‌و عێراقیش نیم‌و باشووری کوردستانیش بە عێراق نازانم. باشە، کێ گەرەنتی ئەوە دەکا کە ئەگەر لەکوردستاندا بم، رێم پێبدرێ، بەسەربەرستی بیروڕای خۆم دەربڕم‌و بنووسم‌و بڵاوبکەمەوەو رەخنە لەکاربەدەستان بگرم، وەك ئێستە لەدەرەوە دەیکەم‌و ئەوەتە دوکتۆر مەحموود کەوتووەتە لەرزین لەقسەکانم‌و لە ئەورووپای ئازاددا، مافی قسەکردن نادا پێم. ئایا ئەگەر لەکوردستاندا بژیم‌و ئەو دەسەلاتدار بێ سێدارە هەڵناخا بۆم؟ کە لەکوردستانیش نەبووم، مانای ئەوە نییە، کە لەسنووری دەسەلاتی خۆمدا، هیچ کارێکی باشم بۆ خەڵکی کوردستان نەکردووە. باشترین کاریشم ئەوەیە کە خۆم بەهیچ لایەك نەفرۆشتووەو، بە درۆو دەلەسەش کەسم نەخڵەتاندووەو خۆشم نەکردووە بە نوێنەرو دەمڕاستی کەس. بەڵێ. خۆ ئەگەر هەلێکیش هەڵکەوتبێ بۆ خزمەت، کردوومەو بەرامبەر بەوەش هیچ جۆرە چاوڕەوانی‌و داخوازییەکم لەکەس نەبووەو، بەتەمای خەلات‌و بەراتی کەسیش نەبووم‌و نیم، بەپێچەوانەی دکتۆر مەحموودەوە، کە وەك فارسەکان دەبێژن کابرایەکی "معلوم الحال"ە.

دەمێنتەوە سەر ئەوەی کە دوکتۆر مەحموود دەبێژێ: "جەمال نەبەز ئاگای لە هیچ نییە" باشە. ئەگەر ئاگام لە شت نەبووایە، دوو ساڵ لەمەوبەر دەمگوت کە مەلا سیستانی کابرایەکە هەروەك خومەینی، بەڵام جەربەزەیەتیی خومەینی تێدا نیە. ئەوەتا دوو ساڵێك دوای ئەوەو، لەرۆژی 9/14دا خەلیل زەلمای زاد، بالیۆزی ئەمریکا لەعێراق، قسەکەی منی کردەوە. هەروەها کاتی خۆی گوتم، ئەگەر ئەمریکا وریا نەبێ، رژێمێکی وەك رژێمی ئێران لەعێراق دروستدەبێ، بەخوێنی سەربازیی

ئەمریکاو خوێنی کوردو، ئەمانەش هەموو لە "میدیا"دا بڵاوکرانەوە.
ئەوەتە ئەوڕۆ 9/21 کاربەدەستانی عەرەبستانی سعوودی دەبێژن ئەمریکا
عێراقی دایە دەست ئێران. ئایا ئەمانەو، سەتان پێشبینیو شیکردنەوەو
ئەنجامگرتنی راستو دروست لەلایەن منەوە، ئەوە ناگەیەنێ کە ئاگام
لەشتە؟ یا دوکتۆر مەحموود ئەوەش بزانێ کە ئاگام لەهێندەك
پێوەندییەکانی بەڕێزیشیەوە هەیە، چۆنکە کاتی خۆی رەحمەتی میر
کامەران بەدرخان، گەلێك شتی گێڕایەوە بۆم کە ئەز لەبەر راگرتنی
ئاسایشی نەتەوەیی، وەك هۆنەر دەبێژێ: "دەروونم پڕ لە ئەشعارەو
لەترسا دەفتەرم خاڵی". جارێ باسیانناکەم. دوکتۆر مەحموودیش کە
دەبێژێ یا ئەمانەی داوای سەربەخۆیی کوردستان دەکەن بچن حیزبێك
دروستکەن، هەر هێندەی پێدەبێژم، ئەوانەی کە بەڕاستیو لەکانی دڵەوە
بۆ سەربەخۆیی کوردستانو ئازادیی کۆمەڵگەی کوردستانو یەکسانیی
ئەندامەکانی هەوڵدەدەن، حیزب دروستکردن بەئامێری بازرگانیی
رامیاریو دوکانی کاسبیی رەشو تەناقبازی، نازانن و پێشنیانیش
گوتوویانە: "ئەگەر کەسە، ئەلفێك بەسە"!

بەرلین 2005/9/21

**میدیا**، ژ 210، 2005/9/27

# ڕەشنووسی دەستووری عێراق،
# لە دەنگداندا، سەربکەوێ، یان ژێر بکەوێ،
# لەهەردوو بارەکەدا، هەر بەزیانی کورد تەواو دەبێ

چارەنووسی دەستوورەکەی سەرکردە حیزبییەکانی کوردو شیعە، هێشتا دیار نییە کە، ئایا لەدەنگداندا دەیباتەوە، یان دەیدۆڕێنێ. چۆنکە، ئەگەر زۆربەی زۆری سوننەکان، لەسەر ئەوە کۆکبن کە بەشداریی دەنگدانبکەن‌و لەدژی دەنگبدەن‌و، بەشێکی شیعەکانیش، بەتایبەتی لایەنگرانی موقتەدا سەدر، کە خۆی بە "مەرجەعییەتی دەنگدار (ناگق)" دەداتە قەڵەم و، کە دژی سیستەمی فیدراڵی‌و هەموو مافێکی کوردن، ڕێکبکەون لەگەڵ هێندەك شیعەی دیکە، کە پتر ناسیۆنالیستی عەرەبن، لەوەی دوای کەللەرەقیی ئاینزایی (مژهبی)و، فەرمانی مەلا سیستانی فارس بکەون‌و، ئەوانیش هەر لەدژی دەستوورەکە دەنگبدەن، ئەوا، بێگومان، ژمارەیەکی زۆر کوردیش هەن، کە بەپڕۆپاگەندەی حیزبە کوردییەکان هەڵناخلەتێن‌و، لەدژی دەستوورەکە دەوەستن. خۆ ئەگەر ئەوانیش بچن بۆ دەنگدان‌و دەنگ لەدژی بدەن، ئەوە لەوانەیە کە بەهەموویان بتوانن "ڕەوایەتیی" دەستوورەکە لەبارەی وەدەستنەهێنانی زۆرێتیی دەنگەوە، پووچبکەنەوە. خۆ، ئەگەر وانەبێ‌و، زۆربەی دەنگەکان بەلای وەرگرتنی دەستوورەکەوە بێ، ئەوا سەردەکەوێ. بەڵام، ئێستە جارێ، با ئێمە وادابنێین، کە دەستوورەکە لەئەزموونی دەنگداندا دەردەچێ. ئەودەمە، ئەوانەی لەدژی بوون، هەروەك دژبەر دەمێننەوەو، بەدەستووری خۆیانی نازانن‌و ڕێزیناگرن‌و، عەرەبەکانیان، داوای گۆڕین‌و لابردنی ئەو خاڵانە دەکەن، کە سەرکردەکانی پارتی‌و یەکێتی، وەك مافی سەرەکیی کورد، شانازیدەکەن

پێوەی‌و، بە"بەشی شێر"ی دادەنێن. ئەوەتا، هەر لەئێستەوە، سوننییەکان، داوای ئەوە دەکەن، کە زمانی عەرەبی ببێتە زمانی فەرمی لەکوردستانداو، لەدەسەلاتی هەرێمەکان کەمبکرێتەوەو، دەسەلاتی نێوەند بەهێزتر بکرێ‌و، گەرەنتی ئەوەش هەبێ، کە عێراق، وەك دەوڵەتێکی یەکتاو، لەدابەشکردننەهاتوو بمێنێتەوە. بۆ هێنانەدی ئەوەش‌و، سەرەڕای هەموو دوژمنایەتییەکی سوننییەکان بەرامبەر ئەمریکا، لەمەدا، ئەمریکایان کردووە بەدەمڕاستی خۆیان‌و، پەنایانبردووەتە بەری، کە گوشار بخاتە سەر کوردو، ئەوەبوو زەلمای خەلیلزاد، سەفیری ئەمریکا لەبەغدا، بۆ ئەم مەبەستە روویکردە دوکان‌و لەگەڵ مام جەلال‌و کاك مەسعوود کۆبووەوەو، کەسیش نازانێ بڕیار چیبووە، چۆنکە، پارتی‌و یەکێتی، خودێ دەستبداتە باڵیان، دەستێکی بالایان هەیە لەچاوشارکێی رامیاریدا. لەبەرئەوە، نازانرێ چ بەڵێنێکی دیکەی گۆڕینی دەستووریان داوە بە "برا سوننیەکان". خۆ ئەگەر دەستوورەکە، هەرواش بمێنێ، کە هەیە، ئەوا کوردستان، هیچ کاتێك، مافی جیابوونەوەی نابێ‌و، عێراقیش، بەکوردستانەکەیەوە، دەوڵەتێکی عەرەبیی ئیسلامییەو، تەنانەت مام جەلال خۆشی، نکۆلی لەم راستینەیە نەکرد، کاتێك کە لەمانگی ئەیلوولدا کە لەئەمریکا بوو، لەبەردەم تەلەفیزیۆنی CNNدا، لەوەرامی پرسیارێکی رۆژنامەنووس Wolf Blitzerدا، لەبارەی پێوەندیی عێراق بەئیسرائیلەوە، گوتی: "لەکۆنفرانسە رۆژنامەییەکدا، لەلایەن رۆژنامەنووسێکی ئیسرائیلییەوە، (ئەم) پرسیارە کرا لێم، وەرامی من ئەوەبوو (کە) عێراق دەوڵەتێکی عارەبییە. (عێراق) هەر تەنێ دەوڵەتێکی ئیسلامی نییە..." "I was asked by Israeli Journalist in the Press Conference: my answer was: Iraq is an Arabic Country State. It is not Islamic only... ete" . (Kurdistan Obsever. Com 11. Spt. 2005)

لەبەر ئەوە، لێرەدا هیچ گومانێك نامێنێتەوە، كە عێراقی رووخاو و، هەرەسبردوو، بە بەلادا كردنی "چاكی مەردانەی" سەركردەكانی پارتی و یەكێتی، بووەوە بە دەوڵەتێكی عەرەبی. بەڵام ئەمجارە، نەك بەهۆی لەشكری بەریتانیاوە، بەڵكو بەدڵخوازی ئەوانەی رۆژگاری نالەبار كردوونی بە نوێنەری كوردو، بە "شێوەیەكی ئارەزوومەندانە"ش!!! ئەوەش دەبێ بگوترێ، كە لەدەستوورەكەدا، بەهیچ جۆرێك نێوی "گەلی كورد"، یان "نەتەوەی كورد"، وەك نەتەوەیەكی سەرەكی، لەپاڵ نەتەوەی عەرەبدا، نەهاتووە، بەڵكو عێراق، وەك چێشتی مجێور، لەهەموو بابەتێك پێكهاتووە. ئەوجا، عێراق كە بەپێی دەستوورەكە خۆی، ئەندامی دامەزرێنەری كۆمكاری عەرەب بێ‌و، پێگیر (ملتزم) بێ بە پەیماننامەی كۆمكاری عەرەبییەوە، كە پەیماننامەیەكی "عرووبی"یە، ئەوا دیارە، بەپێی ئەو پەیماننامەیە، عێراق دەوڵەتێكی عەرەبییەو، ئیدی كورد، هاوولاتی دەوڵەتێكی عەرەبین، وەك چۆن قیبتیەكانی میسر، هاوولاتی كۆماری عەرەبیی میسرن‌و، كوردستانیش نیشتمانی كوردو كوردستانییەكان نییە، بەڵكو بەشێكە لەخاكی عەرەب. هەر كەسێكیش بێ‌و، دەستبكا بە فەلسەفە لێدان‌و، بێژێ، ئەمە وانییە، ئەوا دیارە، قسەكەی دەوەن بەئاش‌و نێرە بیدۆشەیەو، هیچی دی.

شایانی باسە، كەینوبەین (مؤامرە)و نەخشەكێشان لەدژی ئاواتەكانی خەڵكی كوردستان بۆ ئازادی‌و رزگاربوون لەكۆیلەیەتی، لەگەلێك لاوە بەدیدەكرێ. لەلایەكەوە، بەرەی كۆنەپەرستان‌و شۆڤێنیستانی عەرەب، بەسەرۆكایەتیی شێخەكانی حیجاز، كە بەزۆری شمشێرو خوێنڕێژی، شەریفی مەككەیان دەرپەڕاندو، لەژێر ئالای "وەهابیێتی"ی دژ بە پێشكەوتنخوازی‌و ئازادیی مرۆڤو لەژێر ئالای ژندوژمنیدا، خۆیان كردە شای ئەو ولاتەو، نێوەكەشیان گۆڕی بە "عەرەبستانی سعوودی"، بەنێوی

بنەماڵەکەیانەوە. ئێستەش دەیانەوێ، بەبیانووی ئەوەوە، کە ئەمریکا عێراقی داوەتە دەست ئێران،و، عەرەبایەتیی لەعێراقدا لەمەترسیدایە، دەستبکێشنە کاروباری عێراقەوەو، دەیانەوێ "لەشکرێکی عەرەبی" رەوانەی عێراق بکەن، بۆ ئەوەی ئەنفالێکی دیکە لە کوردو خەڵکی کوردستان بکەنەوە. لەلایەکی دیکەوە، کۆنەدۆستەکەی سەددام، جاك شیراك، کە بە "جاك ئیراك" نێویرۆیوە، لەفەرەنساوە، خەمی پارچە پارچە بوونی عێراقی لێنیشتووەو دەیەوێ، کۆنفرانسێکی نێو نەتەوەییی بگرێ بۆ "رێگرتن لە لەتلەتبوونی عێراق". لەولاشەوە، دیکتاتۆری رووسیا، پووتین، دەفەرمووێ، دەبێ لەشکری ئەمریکاو بەریتانیاو هاوپەیمانەکانیان عێراق بەجێبهێڵن. بێگومان، ئەم کابرایە دەزانێ، ئەگەر هاوپەیمانان عێراق بەجێبهێڵن، کارو کرداری تیرۆریستەکان بەجارێ پەرە دەستێنێ. وادیارە، ئەویش ئەوەی دەوێ. ئاشکرایە، ئەم پووتینە، شەووڕۆژ هاوارێتی لەدەست ئەوانەی کە لە چیچانستان داوای سەربەخۆیی دەکەن،و، ئەو بە "تیرۆریست" نێویاندەبا، باشە، بۆچی دەستوەشێنەکانی چیچانستان تیرۆریستن، بەڵام دەستوەشێنەکانی عێراق، کە هەموو رۆژێك چەند کوردێك "ئەنفال" دەکەن، بەرهەڵستکارو رزگاریخوازن؟ ئەم پرسیارە دەبێ لە خۆشەوی مەلا برایمو کاك شۆرشیش بکرێ، کە ئەویان نوێنەری پارتی،و، ئەمیان نوێنەری یەکێتییە لەرووسیاو، هەردووکیان لە تەلەفیزیۆنەکانی پارتی،و یەکێتیدا، بەئاوو تاوەوە، باسی هەڵوێستی دۆستانەی رووسیایان دەکرد بەرامبەر بە کورد. ئەمە لەکاتێکدا، کە لەسەردەمی قەیسەردا لەشکری رووسیا کوردستانی کاولکردو، لەسەردەمی ستالیندا، رژێمی ستالین ئەنفالی لە کورد کردو کوردستانی سۆری بەخشی بە ئازەربییەکان،و، کۆماری رۆژهەڵاتی کوردستانی فرۆشت بە نەوت،و، پاش ئەوەش،و، هەتا ئەوڕۆش، رژێمی

رووسیا هەر هاوپەیمانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بووەو، چاوی نەك هەر لە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەکوردستاندا پۆشیوە، بەڵکو پاکانەشی بۆ رژێمی سەددام کردووەو، ئێستەش دەیەوێ بازرگانەکانی بنێرێتە هەرێمی باشوور، بۆ مژینی خوێنی کورد. قسەیەك هەیە لەنێو ئەڵمانەکاندا دەبێژێ "جاران رووسەکان کۆمۆنیزم- یان ئێکسپورت دەکرد بۆ جیهان، بەڵام ئێستە کچە سۆزانیو نەخۆشیی ئێدز ئێکسپورت دەکەن".

کورتو کرمانجی، لەگەڵێك لاوە، هەوڵدەدرێ بۆ ئەوەی رێ لە کورد بگیرێ، تاکو نەتوانێ مافی بڕیاری چارەنووسی خۆی بدا. تەنانەت، ئەوەتا ئەمریکاش کە گوایە هەڤاڵبەندی کوردە، گوشاری خستە سەر یەکێتیی ئەورووپا، کە وتووێژ لەگەڵ رژێمی ترك بکەن، بۆ بوونە ئەندام لە یەکێتیی ئەورووپادا، بێ ئەوەی بەیەك وشە باسی کێشەی کورد بکا.

ئێستە، با بێینەوە سەر بەشی دووەمی باسەکەمان، ئەمەش ئەوەیە، ئەگەر هاتوو دەستوورەکە لە دەنگداندا کەوت، چ دەبێ؟ بە بیروڕای منو، بەپێچەوانەی ئەو مەترسییەوە کە سەرکردەکانی پارتیو یەکێتی دەیخەنە دڵی کوردەوەو دەبێژن، "دەرفەتی وا هەڵناکەوێتەوە"، باشترین هەل بۆ کوردستان هەڵدەکەوێ، ئەگەر بێتو سەرکردەکانی ئەم دوو زلحیزبە، نەبنە رێگر لەبەر سوودوەرگرتن لێی. چونکە، ئەوسا، دوو رێ لەبەردەم خەڵکی کوردستاندا دەبێ. یەکەمیان ئەوەیە، خەڵکی کوردستان بەیەك دەنگ بێژن، "عەرەبە بەرێزەکان! ئێمە، بەهەموو شتێك رازیبووینو، دەستوورێکمان دانا لەگەڵ ئێوە، کە وازمان لەمافی چارەنووسی خۆو سەربەخۆیی وڵاتمان، کوردستان، هێناو خۆمان کردەوە بە عێراقیو، دانیشماننا بەوەدا کە عێراق دەوڵەتێکی عەرەبییەو، ژنمان، لەبەرخاتری چاوی رەشی ئێوە، کردە چارەکە پیاوێك، بەڵام ئێوە بۆرە مافێکتان بەئێمە

ڕەوا نەدی.. کەواتە، خودێتان لەگەڵ‌و، ئێوە لەماڵی خۆتان‌و ئێمەش لەماڵی خۆمان". ئەوجا دەستبەجێ لەکۆمەڵی نەتەوە یەکگرتووەکان داوا بکەن، کە باشووری کوردستان، وەك پرۆتێکتۆرات (محمیە)یەك، بگرێتە ژێر باڵی خۆی، کە ئەمە سەربەخۆیی نییە، ئەو سەربەخۆییەی کە سەرکردەکانی کورد بەخەون‌و خەیاڵی شاعیرانەو، گەفی ڕەگەزپەرستانی دەدەنە قەڵەم، بەڵکو بارودۆخێکە لەسەربەخۆییەوە نێزیکە. ئەو دەمە دەبینین، کە گەلێك لایەن هەن، لەمەدا، پشتی کوردستان دەگرن. بەتایبەتی، چۆنکە کێشەی تیرۆر لەعێراقدا زۆر توندوتیژ بووەو، تادێ بەرەو توندتیژتر بوونیش دەچێ، لەبەرئەوە گەلێك لایەن هاتوونەتە سەر ئەو باوەڕەی کە عێراق، هەزار پینەشبکرێ، یەکناگرێتەوەو، لەم ڕووەوە زۆر سەرزەنشتی سیاسەتیی ئەمریکاو بەریتانیا دەکەن بەرامبەر بەوەی کە هەوڵی یەکپارچەییی عێراق دەدەن.. بەڵام، ئەوەی ڕاستی بێ، باوەڕ ناکەم ئەمە ڕووبدا، چۆنکە سەرکردەکانی کورد بەگشتی‌و، سەرکردەکانی پارتی‌و یەکێتی بەتایبەتی، ئەو ورەو دووربینی‌و جەربەزەییەیان تێدا نییە، کە زاتبکەن، ئەو هەنگاوە بنێن. بەڵکو، زۆر ڕێیتێدەچێ، کە هەوڵی ئەوە بدەن، کورتانەکەی جەجاڵ سەرلەنوێ بەرەشوڕووتی خەڵکی کوردستان بدروونەوە، بەڵام ئەمجارەو، لەژێر گوشاری هەلومەرجی سەختی تازەدا، چۆنکە، دەرفەتە گەورەکە بەو شێوە لەبارەی دوو ساڵ لەمەوبەر، نەماوە، ئەمجارە، کورتانێك دەبێ، کە گەلێك تەنگترو ئێسکگرانتربێ لە کورتانەکەی سەردەمی عەللاوی‌و جەعفەری. ئەودەمە، بێزاریی خەڵکی کوردستان، بەتایبەتی، بەهۆی ئەو ڕەوشە خراپەوە کە تێیدا دەژی، هەر لە بێ ئاوی‌و بێ کارەبایی‌و بێکارییەوە بیگرە، هەتا دەگاتە گەندەڵیی بەڕێوەبەرێتی‌و مشەخۆریی کاربەدەستان‌و هەڕەشەو گوڕەشەیان لەدەربڕینی بیروڕا بەسەربەستی، دەگاتە ئاستێکی وا، کە

شەڕو بەیەکدادان‌و پشێوی‌و ئاژاوەی نێوخۆیی هەڵدەگیرسێنی‌و پەرەدەستێنێ. شایانی باسە، ئەوەی شەڕو لێکدانی ئەمجارە، لەشەڕو لێکدانی نەوەتەکان جیا دەکاتەوە، ئەوەیە، کە ئەمجارە شەڕەکە ناکەوێتە نێوان پارتی‌و یەکێتی، چۆنکە، هەردوولایان، زۆر باش دەزانن، کە دەستوەشاندن لەیەکدی، گۆڕی خۆ هەڵکەندنیانە بەدەستی خۆیان. لەبەر ئەوە، پارتی‌و یەکێتی، لەگەڵیەك رێککەوتوون کە هۆی چوون بەگژیەکدا لەخۆیان دووربخەنەوەو، ئەوەش بەوەی هەردوولا رازیبوون‌و گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە ئەم بارەی ئەوڕۆ هەیەو بەخەیاڵی وان، وێستاوە، رایبگرن‌و، بەهیچ جۆرێك بیر لەوە نەکەنەوە حکوومەتێکی یەکگرتوو دروستببێ، بەڵکو لەسەر بنچینەی نیوە نیوە، یان کەمێك لەنیوە نیوە، پلەو پایەکان‌و سەروەت‌و سامانی کوردستان، لەنێو خۆیاندا بەشبکەن، ئەوەتە هەر لەئێستەوەو، بەپێی قسەی محەممەد مەلا قادر، ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی، هەر کاتێك سەرۆکایەتیی حکوومەت بکەوێتە دەست یەکێتی، دەبێ سەرۆك پەرلەمان پارتی بێ ("میدیا" ژ 211، 2005/10/4، ل9). هێژای گۆتنییە، کە کاك محەممەد مەلا قادر، کاتی خۆی لەتەلەفیزیۆنەکەی پارتیدا دەیگوت، "ئەو کەسەی نەچێ بۆ هەڵبژاردن خاینە، یان بێگانە رایسپاردووە کە نەچێ". ئەز یەکێك بووم لەو خاینانەی، نەچوون بۆ هەڵبژاردن، چۆنکە ویژدانم نەیهێنا، بەدەستی خۆم، خۆم بکەمەوە بەئەندامی دەوڵەتێك کە ئەنفالی لەکورد کردو، کوردی دایە بەرچەکی کیمیایی‌و کچی کوردی لەبازاڕە عەرەبییەکاندا فرۆشت. ئێستەش، ئەوەتە جارێکی دیکە، دەستیکردووە بە بەخاین‌و نۆکەر نێوبردنی ئەو کەسانەی کە دەنگ بۆ دەستووورە رەشەکە نادەن‌و، خۆی بەوەوە هەڵدەکێشی کە کاتێ خۆی چووەتە شاخ. بەڵێ. زۆر کەس چوونە شاخ‌و ماڵییان وێرانبوو و، ئەوەتا لەژێر خێوەتدا دەژین، زۆر کەسیش

چوونه سەر شاخو بوونە ملیۆنێرو کەوتنە داگیرکردنی پلەو پایەی حکوومەت، هەر لەبەر ئەوەی "لەسەر شاخ" بوون. دوایش، ئەگەر یەکێك لەسەر بەکارهێنانی مافی خۆی، واتە دەنگدان بە "نا" بە خاینو نوکەر بدرێتە قەڵەم چۆن دەتوانێ لەکوردستاندا بە ئازادی قسە بکاو بنووسێو بیروڕای خۆی دەربڕێ؟؟ لێرەدا، دەبێ بێژم، ئەم رێککەوتنەی پارتیو یەکێتی، بۆ هێشتنەوەو راگرتنی دابەشکردنی باشووری کوردستان، لەوەدا دەردەکەوێ کە لەساڵی 1995وە باسی ئەوە دەکەن، کە "بەو زووانە" یەکدەگرنەوەو، تەنانەت لەرۆژی 9/4دا، بۆ دواجار گوتیان 5-6 رۆژی دیکە جاڕی یەکگرتنەوەی هەردوو بەڕێوەبەریتییەکە دەدەن، بەڵام کۆتاییی مانگی ئەیلوول، بە خەڵکیان راگەیاند، کە کاتێك دەستنیشاننەکراوەو، دانەنراوە بۆ یەکگرتنەوەی هەردوو بەڕێوەبەرێتییەکە.

بەڕاستی، مرۆڤ کە تەماشای بارودۆخی کورد دەکاو، دەبینێ کە کورد لە چ وێستاوێکی مەترسیدار دایە بەدەست حیزبحزبێنەو، بەرچاو تەنگیو، هەڵمەتەکاسەییی خۆپەرستانەو، لەسیاسەتنەزانانەی سیاسەتکارانی کورد، کە ئەو دەرفەتە مێژووییەی بۆ کوردستان هەڵکەوتبوو، بەهەرزان فرۆشتیان، ئەوجا کە مرۆڤ سەرنجێکی ئاستنزمی رۆشنبیریی ئەوانە دەدا، کە خۆیان کردووە بەگەورەو دەمڕاستی کوردو، دەیانهێننە سەر تەلەفیزیۆنو دەکەونە پەسندانی ئەو دەستوورە رەشەو، هێندێکیشیان بەدرۆی بێشەرمانە، مۆرکی خیانەت دەنێن بەوانەوە، کە ئازایانە دێنە پێشەوەو، نایانەوێ مافی دەنگدانی خۆیان بەکاربهێنن بۆ تێپەڕبوونی دەستوورێکی وا، کە جارەکی دیو، پاش هەشتا ساڵ کۆیلەیەتی، زنجیری عێراقیبوون، لەدەستو پێو گەردنی کورد بئاڵێنێتەوە، ناچار دەبێ، بدا لەپرمەی گریانو بکەوێتە قوڕ پێوان.

باوەڕ بکەن خەڵکینە، هەرچەند سەردێنمو سەردەبم، نازانم چۆن مام جەلال، کە خۆی کەرکووکییە، زاتدەکاو دەبێژێ "ئەو کوردەی کەرکووك بەجێبهێڵێ خیانەت دەکا". باشە، بۆچی دەبێ کەرکووکییەك ساڵانی ساڵ لەژێر خێوەتدا بژی، بێ ئاوو بێ کارەباو بێ سەرپەرشتیی بژیشکیو، سەرمای زستانو قرچەی گەرمای هاوین بگرێتە خۆیو، منداڵی بەپێخاوسی بگەڕێنو، هەموو ساتو چرکەیەکیش ترسی ئەوەی هەبێ کە تیرۆر بکرێ، ئەگەر هاتو ئیدی نەیتوانی بەرگەی ئەو ژیانە کولەمەرگییە لە"عێراقی ئاشتیو هیوا"دا بگرێ، بۆچی دەبێ خاین بێ؟ باشە، بۆچی مام جەلالوماڵومنداڵیو سەرکردەکانی پارتیو یەکێتی نەچوون ماوەیەك لە کەرکووك بژین، تا تێبگەن ژیان لەوێ چۆنە! ئایا، ئەو کاربەدەستانەی کە دەتوانن بەسەتان ملوێن دۆلار تەرخان بکەن بۆ کڕینی خانوو لەکەرکووك بۆ کەرکووکییە دەرکراوەکانو بن خێوەتەکان، کە ئەوەتا هەر خانووەو لەسەری نووسراوە "بۆ فرۆشتن"و، دەتوانن نانو کار بدۆزنەوە بۆ ئەو لێقەوماوانە، کەچی ئەو کارە ناکەن، ئایە ئەوە "نیشتمانپەروەری"یە؟ ئەز باسی "خیانەت" ناکەم، چۆنکە ئەگەر بێمە سەر ئەو باسە هەویرەکە زۆر ئاو دەکێشی.

قسەی خۆمان بێ، وەك دەمێکیشە لە "میدیا"دا نووسیومە، کێشەی کەرکووك وەك کێشەی فەلەستینو سەرکردە عەرەبەکانی لێهاتووە. سەرکردە عەرەبەکان، کە تا بینەقاقایان ملیاردە دۆلاری نەوتە، ساڵانی ساڵە، بازرگانی بەکێشەی فەلەستینو خوێنی فەلەستینیەکانەوە دەکەنو، لەژێر خێوەتدا دەیانژێنن‌و، ملی هەزاران کەسیان کرد بە پەتی سێدارەدا، بەناوی خیانەتو سیخوڕێتییەوە بۆ "دوژمنی زایۆنی"و ناپاکیی لە "کێشەی چارەنووسسازی فەلەستین"و "قودسی عەرەب"و، تەنانەت ئەنوەر ساداتیشیان هەر بەو تۆمەتە کوشتو، چەند حیزبو تاقمیان لە

"بەرەی رزگاریخوازیی فەلەستین" جیاکردەوەو، خستنیانە دەستوەشاندنو، تائێستەش هیچیان بۆ فەلەستین نەکردووە. لەبەر ئەوە، کێشەی فەلەستینیش، لەم رووەوە، لەکێشەی کەرکووک دەچیٌو کە، کەرکووك بە "قودسی کوردستان" دەدرێتە قەڵەم، زۆر لەجێی خۆیایەتی. سەرکردە عەرەبە دیکتاتۆرەکان، چەند "قودسی عەرەبیان" گێڕایەوە بۆ فەلەستینییەکان، سەرکردە بەڕێزەکانی کوردیش، هەر هێندە "قودسی کوردستان" دەخەنەوە باوەشی کوردستان. چۆنکە، ئەگەر مەبەستیان چارەسەرکردنی کێشەی کەرکووك بوایە، دەمێك بوو کردبوویان. چەند سەت ملیۆنێك دۆلاریان تەرخاندەکرد بۆ کڕینی خانو و، پەیدا کردنی کارو کاسبی بۆ خەڵکی کەرکووكو، پارەیەکیان دەدا بە عەرەبە هاوردەکان بۆ مسۆگەر کردنی ژیانی خۆیان، لەکاتی گەڕانەوەدا. هەروەها، ئەو نێوچانەی لە کەرکووك دابڕاون، وەك چەمچەماڵو شوێنەکانی دی، بەبڕیارێکی "بەڕێوەبەریتییەکەیان" دەیانخستەوە سەر کەرکووكو، نەدەچوون دەست لە عەللاوی و جەعفەری پانبکەنەوەو، دواییش، هەموو گوتاوڕۆکە بهێنن بەسەر جەعفەریدا، ئەوەیش کە، کاتێك دیان، کەرکووکییەکان، ئیدی بەرگەی چاوەڕوانیی دوو ساڵی دیکە ناگرنو، بەدەستیدەستیپێکردن، چیدی ناخڵەتێن، هاتوون گوناهی جەعفەری دەگرن. باشە، ماوەی چەند مانگێك لەمەوبەر لە "میدیا"دا نەمنووسی کە جەعفەری فارسەو خزمی مەلا سیستانییەو مەلا سیستانی چی پیٌ بێژیٌ، ئاوادەکا؟ بۆچی هەر ئەو دەمە، ماوەیەکتان دانەنا بۆی بۆ جێبەجێکردنو ئاساییکردنەوەی بارودۆخی کەرکووك، کە دەبوو پێش ئەو، حکوومەتی عەللاوی بیکردایەو، نەیکردو، ئێوەش لێی بێدەنگ بوون؟ دوایی باشە، ئایا پارتیو یەکێتی، هەردووکیان لە حکومەتی عەللاوی و جەعفەریدا بەشدار نەبوونو نین، بۆچی خۆیان دەستپێشکەری ناکەن؟ ئەگەر عەللاوی

ڕێگر بوو، بۆچی لەحکوومەتەکەیدا مانەوە؟ ئەگەر جەعفەری ڕێگرە، بۆچی لەحکوومەتەکەیدا ماون؟ نەخێر وانییە قوربان، ئێوە ناتانەوێ کێشەی کەرکووک چارەسەر بکەن. ئەوەی ئێوە دەتانەوێ، ئەوەیە، دوو میرنشینەکە، وەك خۆیان بەشێوەی فیفتی فیفتی بمێننەوە، بەڵام دڵنیابن کە نامێننەوە. لەبەر ئەوە، خەریککردنی خەڵك بە هەیتوهووتی دەنگدانەوە بۆ دەستوور، هیچ خێرێك چاوەڕواننا کرێ لێی.
دەنگدان بۆ دەستوور بە ئا، یان نا، سەرکەوتنی دەستوور، یان ژێرکەوتنی لەدەنگداندا، هەردووکی بەزیانی خەڵکی کوردستان تەواو دەبێ، چۆنکە، حیزبحزبێنەو فیفتی فیفتی، کارەکەی هەر لەسەرەتاوە بەهەڵە دەستپێکردو، هەر خانوویەکیش لەسەر بناخەی ڕفۆك‌و قرچۆك دابمەزرێ، هەزار جۆرە بۆیاخی جوانیش بکرێ، ئەنجامەکەی هەر ڕمانە بەسەر ئەوانەدا کە تێیدا دەژین.

بەرلین 2005/10/7

**میدیا**، ژ 212، 2005/10/11

# یـادێکی نــەورۆز

هەمووی چەند ڕۆژێکی ماوە بۆ یادی نەورۆز.. دەبێژم، یادی نەورۆز، نەك جێژنی نەورۆز. چۆنکە، لەوەتەی کورد بۆ یەکەمینجار جێژنی نەورۆزی، بەهەڵکردنی ئاگری نەورۆز پیرۆزکردووە، خۆشییەکی وای بەخۆیەوە نەدیوە کەنێوی بنێی "جێژن". لەبەر ئەوە، دەبێ جارێ هەر بەیادی کۆنە نەورۆزەوە خەو ببینین و شتی لێوە فێربین و، تێبگەین کەجێژن بۆنەیەکە بۆ چێژوەرگرتن لەژیان و، دەربڕینی هەستی شادی، ئەمەش تایبەتکارێکی مرۆڤی ئازادە، نەك مرۆڤی بندەست.
ئێستە، با جارێ بگەڕێینەوە بۆ یەکەمین جێژنی نەورۆز، کەئەوەش هەر لەسایەی شوومی داگیرکەراندا بووەو کوێرەوەریی هەزاران ساڵەشی بەدوادا هات، چیرۆکە ڕاستییەکەش ئەوەیە، کاتێك کەکوردی ئەو سەردەمەی وڵاتی ماد، دژی ملهۆڕێتیی ئەژدەهاك (کەفارس و عەرەبەکان کردوویانە بەچحاك)، ڕاپەڕین و دەرەقەتی نەهاتن، پەنایان بردە بەر فارسەکانی دراوسێیان بۆ یارمەتیدانیان و، بەو هۆیەوە توانییان ئەژدەهاکی زۆردار لەنێو ببەن، کەئەو ناڕەسەنەش، هەر کوردێك بوو لەخۆیان، بەڵام لەشکری شای ملهۆڕو زۆرزانی هۆزی فارس، بەرە بەرە شوێنی خۆی لەوڵاتی مادا کردەوەو، جێی ئەژدەهاکی ملهۆڕی گرتەوەو، هەر لەو دەمەشەوە کورد سەربەخۆیی خۆی لەدەستداو، ماڵی چووە سەر بەشی ماڵان و، ئیدی نەورۆز لەکورد بوو بەشین و شەپۆڕ. جاهەر چەندە نەورۆز، یادی جێژنی ڕزگاربوونە لەزۆردارێکی خۆیی، بەڵام بۆنەیەکیشە بۆ هێنانەوە بیری چارەنووسی ڕەش و، بندەستیی زۆردارانی بێگانەی داگیرکەر.

نەورۆز، لەم رووەوە، وانەیەکی زۆر گرنگە بۆ کورد، ئەویش ئەوەیە، کەنابێ پەنا ببرێتە بەر ملهۆڕێکی بیانی، بۆ خستنە خوارەوەی ملهۆڕێکی خۆیی. ئەوجا ئەگەر ئەو ملهۆڕە بیانییە، داگیرکەری پارچەیەکی دیکەی نیشتمانەکەت بوو، ئەوا بەهیچ جۆرێك نابێ پشتببەسترێت پێی. زۆردارو ملهۆڕی کورد، دەبێ بەدەست و مێشکی خەڵکی کوردستان لەسەرکار لاببرێت، نەبەدەستی داگیرکەرانی کوردستان، یان بێگانەی چاو لەدوو. زاڵبوونی بەرەیەکی رامیاری، بەسەر دژبەرەکەیدا، دەبێ بەبڕیاری ئاشتییانەو ئازادانەی خەڵکی کوردستان بێ، نەك بەزۆری زۆردارەکیو چاوڕاوو پارەو چەکی داگیرکەرانی کوردستان.

زۆر بەداخەوە، هێندەك لەمیرە کوردەکان، لەسەردەمی خۆیانداو، لەپاش ئەوانیش، گەلێك لەحیزبە کوردستانییەکانیش، لەسەتەی رابردوودا، ئەم رێسا نگریسە (ملعون)ەیان چەند جارو چەند جار تاقیکردووەتەوەو لەئەنجامی ئەوەوە، دەست و دەم و لینگیان بەئاگری ناهومێدیدا چزاوە، کاتێك لەشکری داگیرکەرانیان هێناوەتە ولاتەکەیانەوە بۆ سەرشۆڕکردنی هاوولاتەکەیان، کەهۆڤێتیکردووە بەسەریانەوە، یان ناحەزو رکەبەریان بووە لەرامیارییدا، کەئەوەش هەمووی بەپەژیوانی و ماڵوێرانیی گشت لایەکی خەڵکی کوردستان تەواو بووە.

ئەوەی کەکورد، کەم پەندی لەبەسەرهاتی دڵوەستێنی خۆیو کارەساتەکانی رابوردووی وەرگرتووە، شتێکی بەڵگەنەویستە. هۆی ئەوەش یەکلایەنە نییە، بەڵکو گەلێك کارکردی مێژوویيو جۆگرافیاییو جڤاکيو ئاینی کەوتوونەتە یەك و، بەتێپەڕبوونی زەمان، ئەم بارە نالەبارەیان سازداوەو گرێکوێرەیەکی دەروونییان لەناخی کورددا دروستکردووە، کەخۆی، لەنێوخۆدا، بەزل و ئاشوەستاو فرەزان و، بەرامبەر دەرەوەش، بچووك و بەردەست و نەزان، رادەگرێ. ئەگەنا، ئەگەر

وانەبووایە، بۆچی دەبوو کوردێك کە 13 ساڵ، دوو دەوڵەتۆچکەی لەسێ ستانی بەرفراواندا هەبوو، پێوەندیی دیپلۆماسییانەی بەگەلێك دەوڵەتی گەورەو بچووکەوە هەبوو، بودجەی خۆی هەبوو، پۆلیس و دەزگەی ئاسایشی سەربەخۆی هەبوو، دەزگەی راگەیاندنی گشتیی مۆدێرنی هەبوو، چوار زانستگەی هەبوو، پاش ئەوەش، بەرێکەوت، بوو بوو بەهاوپەیمانی ئەمریکاو بەریتانیا لەجەنگی خستنی سەددامدا، ئا ئەو کوردە، پێویستی بەوە هەبێ، لەباتی ئەوەی دەستبەجێ خۆی کۆبکاتەوەو خۆی یەکبخاو هەموو بەرژەوەندییەکی لاوەکی بخاتە لاوەو، سووت لەو دەرفەتە مەزنە وەربگرێ کەرەخساوە بۆی، یەکودووی لێنەکا، رابکاتە بەغداو، بەکراسی بەری خۆیەوە، خۆی بکاتەوە هاوولاتی دەوڵەتێکی رووخاو، کەهەشتا ساڵ لەوەبەر، بۆ نەمانی تێکۆشا بێ، ئەوجا خۆی بگەیەنێتە رەوشێکی وا چرووك و پەرپووت و تەپیو، کەوەك حەمەی حاجی مەحموو گوتەنی "دەستی لەبن هەمانەکە هاتبێتە دەرەوە"؟!

ئەم قسانەم قسەی ئەمڕۆم نیین، ساڵانێکە ئەم قسانە دەکەم و هاوار دەکەم و، لەهەموو لایەکیشەوە دەبیسترێن، بەڵام ناکەونە گۆڕەپانی کارەوە، ئەگەنا، هەر پاش رووخانی سەددام، لەرۆژنامەی "میدیا" و "کۆنگرە" و گەلێك دەزگەی راگەیاندنی گشتیدا، باسی ئەوەمکرد کەجەعفەری کابرایەکی سەر بەرژێمی ئێرانەو دژ بەکوردەو ژنبرای مەلا سیستانیی فارسەو، مەلا سیستانیش کابرایەکە وەك خومەینی. ئەو چەندی پێبوو بۆ کوردی رۆژهەلات، ئەمیش هەر هێندەی پێیە بۆ کوردی باشوور، راستی و دروستی ئەم وتانەش، هەموو لەگەڵ رۆژگاردا کەوتنەڕوو، بەڵام کاربەدەستانی کورد، کەوتنە پەسندان و هەڵدانی سیستانی، تەنانەت مام جەلال دەیگوت: "سیستانی نیعمەتێکە خوا ناردوویەتی بۆ عێراق" و هەموویان، دەستیاندایە دەست جەعفەری، کە ئەو دەمە کابرایەکی

نەناسراوو، پێش ئەوەش، پەنابەرێك بوو لەلەندەن، عەیادەیەكی بچووكی كەم بایەخی هەبوو، لەپاڵ ئەوەشدا، بازرگانیی بەفرۆشتنی گون و گورچیلەی مەڕەوە دەكرد. كەچی ئەو جەعفەرییە بێدەسەلاتە، كەكرا بە "سەرۆكوەزیران"، بەیارمەتیی كورد، نەچوو بۆ پیرۆزبایی كۆبوونەوەی پەرلەمانی كوردستان و، نەچوو بۆ پیرۆزبایی دەستنیشانكردنی سەرۆكی هەرێمی كوردستان، كەئەمەش بەڵگەیەك بوو بۆ دوژمنایەتیی كوردو، دەبوو كورد هەر زوو دوور بكەونەوە لێی. ئەوجا، كە بەرۆژی نیوەڕۆ، فێڵی لەدەقی سوێندخواردنی كابینەی وەزیران كردو، هەموو وەزیرە كوردەكانیش، بێجگە لە دوكتۆر بەرهەم ساڵح، نەچوون خۆیان جیابكەنەوە لێی، بەڵكو ئەو سوێندە درۆیەیان خوارد بۆی و، مێش میوانیان نەبوو، ئێستە، پاش ئەم هەموو تاقیكردنەوە تفت و تاڵەو، پاش ئەوەی ژمارەی پارلەمانتارە شیعەكان گەیشتووەتە 127 و كوردیش بووە بە 53 و بیست و چواری كەمكردەوە، تازە بەخێریێ، بیر لەلابردنی جەعفەری دەكەنەوە، ئەمە لەكاتێكدا، كە مەلا سیستانیو فەقیێ موقتەدا سەدر، پشتگیریلێدەكەن. لەگەڵ ئەوەشدا، خوا بكا ئەم داخوازییە، كەنێویاننا وە "هێڵی سوور"، هەتا سەربیێو، وڕككگرتنی زارۆكانە، نەبیێو، وەك "هێڵە سوورەكان"ی لەمەوبەری بەسەر نەیێت.

كوردستان، بەسەردەمێكی یەكجار ترسناكدا تێدەپەڕیێ، كەمان و نەمانی كوردی پێوەیە، گەلێك دوژمن، دانیان تیژ كردووە لەكوردو، چاوەڕوانی كشانەوەی لەشكری ئەمریكاو هاوپەیمانەكانی دەكەن، كەرەنگە ئەوەش زووتر رووبدا لەوەی باسدەكریێ. عێراقچێتیی لەتامبەدەری كاربەدەستانی كورد، كەئەوەتە بەڕێزێكی وەك كۆسرەت رەسووڵ، كەئەندامێكی باڵای سەركردەیەتیی ی.ن.ك.ە، بێپەروا دەفەرمویێ "ئێمە (حیزبەكەی: ج.ن) بەرژەوەندیی گەلی عێراق لەسەروو بەرژەوەندیی گەلی كوردەوە دادەنێین" (

ڕۆژنامەی "الاتحاد"ی ئیماراتی 2006/2/9 ). پێشموایە قسەکەی زۆر ڕاستەو، ئەم عێراقچێتییە، نەیهێشت هێزێکی نێونەتەوەیی، بۆ ڕۆژی "نەوەك" لەباشووری کوردستاندا بمێنێتەوە. دەسەڵاتدارانی کورد، لەباتی ئەوەی، بیر لەو دوارۆژە ڕەشە بکەنەوە، خەریکی ئاشتکردنەوەی شیعەو سوننەو، هێنانەوە پێشی جەنابی عەللاوین. کەئەوەش نەکاری ئەوڕۆی کوردەو، نەکارێکی هەروا سادەو سووکە، کەبەزمانی شیرین و دەستەملانێی یەکدی بێتەدی‌و، عەللاویش هەر جەعفەرییە، بەڵام لەبەرگێکی دیکەداو، ئەویشمان تاقیکردەوە.

وادیارە، ئەو هەڵەی کە کێشەی مافی خاوەنداریێتیی هێزی ئەتۆمی، کەئێران بەخۆی ڕەوادەبینی‌و تیرۆرکردنی ڕەفیق حەریری لوبنانی، کەرژێمی سووریای پێ تۆمەتبار دەکری‌و، هەروەها ترسی ڕۆژئاڤاو ئیسرائیل لەهاتنە سەرکاری "حەماس" لەفەلەستین، ماڵی حیزب و حیزبۆڵکەکانی کورد ئاوابیّ، کەهەر یەکەیان لەئاوازێك دەخوێنی‌و، زۆر بەشیان لەفارس ئێرانیترو، لەعەرەبی سووریا سوورییاییترو، لەعەرەبی عێراقی عێراقیترن، هیچ خێرێکی بۆ کورد تێدا نابی‌و، لەئەنجامدا، چەند ڕژێمێك دێنە سەرکار، کە فشە دۆستایەتییەك لەگەڵ ئەمریکاو ئەورووپاو ڕووسیاو چین دەبەستن و، کوردیش لەولاوە دادەمێنن و، دەست لەگۆنان درێژتر.

ئەوڕۆ، لەنێو کورددا، باسباسی "گەندەڵیی بەڕێوەبەرێتیی"یە. ڕاستە، بەڕێوەبەرێتیی گەندەڵە، بەڵام گەندەڵیی بەڕێوەبەرێتی، لەگەندەڵیی جەماوەرەوە هاتووە. هەر چەندە لەنێو خەڵکدا واباوە کەماسی لەسەرەوە بۆگەن دەکا، بەداخەوە، ماسییەکەی کورد لەبنەوە بۆگەنی کردووەو، بۆگەنی خوارەوەیە، داویەتە سەرەوە. جەماوەرێکی دەستپاك و هۆشیارو

بەتەنگەوە هاتوو، کاربەدەستانیشی هەر لەو جۆرە دەبن، پێچەوانەش، بەپێچەوانە.
کورد دەبێژن، خواردنێك بۆ ئەوەی بۆگەن نەکا، خوێی دەکەن، ئەی ئەگەر خوێیەکە بۆگەنی کرد، چی لێدەکەن؟.
بەڵێ...... جەماوەر گەندەڵە، ئەوجا بانەترسین لەتانووتی کەس و قسەیەکیش بۆ شەیتان بکەین.

بەرلین 2006/3/3

**میدیا**، ژ 232، 2006/3/14

* ئەم وتارە هاوکات لەژمارە (37)ی (کۆنگرە)ی ئۆرگانی کۆنگرەی نیشتمانی کوردســـتان KNC بڵاودەکرێتەوە.

# راپەڕینی هەڵەبجە، ئەڵقەیەکی دی لەراپەڕینی نەوەی نوێیی کوردستان

پاش قەومانی کارەساتی هەڵەبجە، کە کوشتنی کوردێکو بریندار بوونی چەند کوردێکی دیکەی بە دواوە بوو، گەلێك زمانو قەڵەم کەوتنە کار، هێندێکیان بابەتانە لەکارەساتەکە دوانو، بەرپێچیان هێنایەوە بۆ خۆپێشاندەرانو، کەوتنە رەخنەگرتنو گلەیی لە کاربەدەستانی دوو حیزبە دەسەڵاتدارەکەو، پێشکێشکردنی هێندەك ئامۆژگاریی خێرخوازانەو، هێندێکیش لەوانەی کە هەلێکی وایان بە ئاوات دەخواست، ئەم رووداوەیان کردە بیانوو، بۆ ئەوەی کەمتەرخەمیو گوناهباریی کاربەدەستانی دوو حیزبەکە بخەنە ئەستۆی، گوایە هیچ لەباردا نەبوویی و ئاژاوەگێڕیی و هۆز هۆزێنەی خەڵکی کوردستانو، گوتیان، کورد شایستەی ئەوە نین، رێبەریَ پێیان، خۆیان خۆیان ببەنبەڕێوەو، هەر چییەك دەگوترێ لەبارەی ئارامیی کوردستانەوە، هەموو سرۆو چاو بەستەو، بە زۆری چەكو تۆقاندنو زیندانیو نانبڕین، خەڵکەکە بێدەنگ کراون، واتە، نالەباریو گەندەلییو ملهوڕی کاربەدەستانی حیزبەکانیان خستە مل خەڵکی بەشخوراوی کوردستان.

ئەوەی راستی بێ، دەمێکە خەڵکی هەڵەبجە خۆیان دەخۆنەوەو، لەژێر باری هەژاریو بێکاریو بێخزمەتیو پشتگوێخستنو بازرگانی بەسەرەوە کردندا، دەناڵێنن. ئەوە تا هەژدە ساڵە خۆڕاگرو بێدەنگن. ئەرێ... هەژدە ساڵ. هەژدە ساڵی رەبەق، نەك هەژدە رۆژو هەژدە هەفتەو هەژدە مانگ. بەتایبەتی پاش ئەوەی خەڵکی قوربانیدەری هەڵەبجە، هەژدە ساڵ لە چاوەڕوانییەکی بێئەنجامی گفتو بەڵێنی زلو پفهەڵدراودا، ژیانیان بە کولەمەرگی بردە سەرو، لە بچووکترین لالێکردنەوەو خزمەتی سادەی، وەك

ئاوو كارەباو شەقامو نەخۆشخانەو پاركو پۆستەو قوتابخانەو، خوانەكا بێژین زانستگە، بێبەشبوون، كە ئەمانە هەمووی بە ئەلفوبێی شارستانێتی دەدرێنە قەڵەم. ئەمە لەكاتێكدا كە خەڵكی هەڵەبجەو هەموو خەڵكی كوردستان، بە تەمای ئەوە بوون، كە كارەساتی 16ی مارتی 1988 بكرێتە بەڵگەنامەیەكی نێودەوڵەتی، لەپاڵ گەلكوژیی ئەنفالدا، بۆ داخوازییكردنی قەوارەیەكی رامیاری بۆ كوردستان، بەڵام كاربەدەستانی دوو حیزبەكە، نەك هەر ئەوەیان بەجێنەهێنا، بەڵكو چوون دەوڵەتی رووخاوو، لەشكرو پۆلیس نەماوو، لەگرێژەنە دەرچووی دەوڵەتی داگیركەری عێراقیان، جارەكی دی دروستكردەوە. ئەوەتا، حكوومەتەكەی بەغداش، جێژنی نەورۆز، لەگەلی عێراق پیرۆز دەكا، وەك "جێژنی بەهارو دارو درەخت"، نەك وەك جێژنێكی كورد. كە نەورۆز، نە پێوەندیی بە بەهارەوە هەیەو، نە پێوەندیشی بە دارو درەختەوە هەیە. ئەمەی حكوومەتی بەغداش، كە بە بێدەنگیی كاربەدەستانی دوو حیزبەكە دەیكا، كولتووركوژییەكە ولە كورد دەكرێ.

ئەوەی لە هەڵەبجە قەوماو، بەرەورووی كاربەدەستانی دوو حیزبەكە بووەوە، نە كارەساتێكی خۆ جۆشو كوتوپڕ بوو،و نە بە چاوەڕاوی بێگانە هاتە كایەوە، وەك دوو حیزبەكە بەو جۆرە پاساوی دەدەنەوە، بەڵكو بەتەواوی چاوەڕوانكراو بوو، بەتایبەتی پاش ئەوەی خەڵكەكەی هەڵەبجە، سەر بەهەموو حیزبو كۆمەڵەكان، ماوەیەك لەوەبەر بڕیاریاندا بوو، كە ئەمساڵ رێنەدەن بەوەی كاربەدەستانی دوو حیزبەكە روو لە هەڵەبجە بكەن. لەبەر ئەوە، دەیانتوانی، پیچێك لەفیزو لووتبەرزیی خۆیان كەمبكەنەوەو، لەباتی ناردنی هێزی ئاسایش بۆ ئەوێو، خۆ ئامادەكردن بۆ بەربەرەكانێ، بە داخۆیانییەكی نەرمونیانو خۆ بە بچووكی خەڵك نیشاندان، ئەو كارەساتە لەسنووری خۆپێشاندانێكدا بهێڵنەوە. واتە،

تەنێ بەسبوو، ڕۆنکردنەوەیەك دەربکەن‌و بێژن، کە ئەوان هەست بە دڵشکاویی‌و مافپێشێلکراوی خەڵکی هەڵەبجە دەکەن‌و، لە تووڕە بوون‌و هەڵچوونی خەڵکی هەڵەبجە، باش تێدەگەن‌و بە هەقی دەزانن‌و، لەبەرامبەر بڕیاری خەڵکی هەڵەبجەدا، سەری ڕێزلێنان شۆڕ دەکەن‌و، ئەمساڵ نایەنە ئەوێ، با خەڵکی هەڵەبجە خۆیان لیژنەیەك دەستنیشانبکەن بۆ بەپیرەوە چوونی میوانە بێگانەکان. ئەودەمە، نە ژمارەی شەهیدانی هەڵەبجە، یەکێکی دیکەی دەچووە سەرو، نە کەسیش بریندار دەبوو. کڵپەی دەروونی خەڵکە لیقەوماوەکەشی نەدەگەیشتە ئەوەی ڕێبدا بەوەی مۆنومێنتیەکەی گەلکوژیی لە کورد بەو شێوەیە بێڕێز بکرێ‌و گەلێك بەڵگەنامەی بە نرخ‌و ئارشیف، کە جارەکی دی دەستناکەونەوە، لەنێوبچێ‌و، توانج‌و تانووتی دوژمنانی کوردو کوردستانیش سەربکەوێ. ئەودەمە، کاربەدەستانی دوو حیزبەکەش، نەدەبوونە تیزەجاڕی ڕۆژنامە هەرە بەنێوبانگەکانی جیهان، وەك نێویۆرك تایمزو تایمس ماگەزین‌و، کاتێك هەوڵی ئەوەیاندا، بەدرۆ ئۆباڵی ئەو ڕووداوە بخەنە گەردنی ئیسلامییەکان، کەس باوەڕینەکرد پێیان‌و، ئەوەشیان هەر لە کۆڵەواریی رامیاری‌و سەر دەرنەچوونیان لە بارودۆخی زەمانەوە بوو. چۆنکە، ئەگەر ئیسلامییەکانی هەڵەبجە بتوانن خۆپێشاندانێکی واچەند هەزار کەسی بخەنە سەر شەقامەکانی شارەکە، ئیدی، دوو حیزبەکە، ئەگەر باوەڕیان بە دیمۆکراسی هەبێ، مافی ئەوەیان نابێ باسی هەڵەبجە بکەن‌و، دەبێ لەوێ باربکەن بۆ لایەکی دی. دەبێ ئەوەش بزانن کە بەهێز بوونی ئیسلامییەکانی کوردستان، لەئەنجامی شەڕەقۆچی ئەم دوانەوە بوو. بێجگە لەوەش، گەلێك بەڵگەو شایەت هەن بۆ ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی یەکێتی‌و پارتی‌و حیزبەکانی دی‌و کەسانی ناحیزبی، لە خۆپیشاندانەکەدا بەشدار بوون.

کاربەدەستانی دوو حیزبەکە، پێویستە لەسەریان، چیدی سەری خۆیان نەکەن بەژێر خۆڵەوەو، هەوڵی تەفرەدانی ئەم‌و ئەو نەدەن، چۆنکە ئەو سەردەمە رۆیی کە خۆڵ بکەنە چاوی خەڵکەوەو، ئەوەش نەما لرفی لێدەن.
ئەوەی لە هەڵەبجە قەوما، گرێیەکە لە زنجیرەی سەرهەڵدانی بیری ئازادی‌و یەکسانیی لە کوردستاندا، پاش ئەوەی خەڵکی کوردستان، نیو سەتە پتر، بە گوێڕایەڵیی لەم حیزبانە، فریوی بەڵێنی رزگاریی کوردستان‌و دواڕۆژێکی بەختیاری خواردو، لە کوێرەوەری‌و بەشمەینەتی‌و ئەنفال‌و گەلکوژی‌و شەڕی نێوخۆیی‌و چەکی کیمیایی‌و دەربەدەری‌و ماڵوێرانی‌و ئاوارەیی‌و ژنکوژی بەولاوە، هیچی دیکەی پێنەبڕا، بەتایبەتی پاش راپەڕینی مەزنی بەهاری 1991و گەلڕەوی ملیۆنیی خەڵکی کوردستان، کە جارەکی دی رێیدا بەم حیزبانە، لەودیوسنوورەوە بێنەوەو، دەستبەسەر دەسکەوتەکانی راپەڕین‌و گەلڕەودا بگرن‌و، مایەی گەل، بوو بە مایەی پیازفرۆش، ئێستە خەڵکەکە دەیەوێ راپەڕینی بەهاری 1991 تازە بکاتەوە، ئەوسا دژی ملهوڕیی بێگانە بوو، ئەوڕۆیش دژی ملهوڕیی خۆیی.
راپەڕینی هەڵەبجە، سەرەڕای هێندەك زێدەڕۆیی‌و چەند ئەنجامێکی ناپەسند، ئەڵقەیەکە لە زنجیرەی هاتنەوە سەرخۆی نەتەوەیی بۆ رووخاندنی دەسەڵاتی زۆرداری‌و نانەتەوەیی‌و، بەهیچ جۆرەك لە راپەڕینی خەڵکی کۆیەو خەڵکی کەلارو خەڵکی جلەولا، جیاناکرێتەوە، گەلێك راپەڕینی گەورەتریشی بەدوادا دێ. لاوانی کوردستان، کچان‌و کوڕانی ئازادیخوازو بەتەنگەوە هاتوو، بە ئامانجی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆو، گەلێکی ئازادو یەکسان‌و تێروتەسەل، کەوتوونەتە سەر پێیان‌و تەکان بەخۆدان. بەڕاستی جێی شادی‌و خۆشبەختییە کە گەنجان بوونەتە زەنگی پێشەنگی کاروان. خۆ ئەگەر هەر لەسەرەتاوە، خۆیان لە

زۆرەو بۆرەو، پشتبەستن بە جەماوەری گەندەڵ و، کەسانی هەڵپەرست و کوڕی ڕۆژو حیزبحزبێنەکەر، دوورەپەرێز بگرن، بەدڵنیاییەوە، دەبنە تیشکێکی ڕۆشنکەرەوەی ڕێی ئازادی و یەکسانیی گەل و ڕزگاری و سەربەخۆییی کوردستان.

ئەوجا، بۆ ئەوەی کوردستان نەبێتە گۆڕەپانی شەڕو پێکدادان و دوژمن سووت لەوە وەرنەگری و، سەرهەڵدانی گەلیش ڕی و شوێنێکی هێمنانەو شارستانیانەو، ئاشتیخوازانە وەربگرێ، پێویستە کاربەدەستانی دوو حیزبەکە زۆر هوردبیانەو هۆشیارانە بجووڵێنەوەو، دڵنیابن لەوەی کە ئەو هەلومەرجەی ڕابوردوو ناگەڕێتەوە. دەبێ بزانن کە نە کوردستان ملکی ئەم حیزب و ئەو حیزبەو نە خەڵکی کوردستانیش نۆکەری ئەڵقەگوێی ئەم و ئەون. بەر لە هەموو شتێك پێویستە حیزبەکان ملبدەن بۆ جێگۆڕکێی دەسەلات. با پیرەکان و ئەوانەی کە پەنجا ساڵە مەکینەی دەسەلاتیان گرتووەتە دەست و، هەزاران هەڵەو گوناهیان کردووەو نەچوونەتە بەردەم هیچ جۆرە لێپرسینەوەیەکەوە، ڕێزی خۆیان بگرن و، شوێنی خۆیان چۆڵبکەن بۆ لاوانی ژێهاتی و دڵسۆژو، بۆ دڵنیاییش، دەبێ حیزبەکان، هەموویان، چەکدارەکانیان لابدەن و، لە لێوەشاوەکانیان لەشکرێکی بەهێزی کوردستانی دروستبکەن کە کارو فرمانی پاراستنی کوردستان بێ لە دەستدرێژیی بێگانە، نەك پەلاماردانی خەڵکی ڕەشوڕووتی کوردستان، بەفەرمانی ئەم حیزب و ئەو حیزب. بێجگە لەوەش، ڕێبدەن کە کۆمیتەیەکی بێلایەن پێکبێ بۆ لێکۆڵینەوە لە گەندەڵی و بەناڕەوا دەوڵەمەند بوونی ئەوانەی سەر بەحیزبەکان و ئەو سامانەی کە بە ناقانوونی و ناڕەوا دەستیانکەوتووە، لێیانبسەندرێتەوەو بخرێتەوە سەر داراییی گشتی. هەر لەوکاتەشدا، کۆمیتەیەکی بێلایەنی دیکە، لەبارودۆخ و گونجان و دەستدانی کەسوکاری کاربەدەستانی حیزبەکان

بکۆڵیتەوە کە پلەو پایەی حکوومەتیو دەستکەوتی گەورە دابینکراوە بۆیان، بۆ ئەوەی بزانریٚ، تا چ هەندازەیەك ئەو پلەو پایەو دەستکەوتانە لە جێی خۆیاندا بوون. ئەگەر وانەبوو، ئەوا، دەستبەجیٚ ئەو پلەو پایەو دەسکەوتانە بستێندرێتەوە لێیانو بدرێن بە مرۆڤی شایستە. هەروەها لەو خەڵاتو بەراتانەش بکۆلرێتەوە کە سالآنی ساڵە دەدرێن بە هێندەك کوردو بێگانەی وا کە ماستاو سارد دەکەنەوە بۆ ئەم حیزبانە. لەپالٚ ئەمانەشدا، لەکێشەی ژنکوژیو ژندوژمنی بکۆلرێتەوەو، سنوورێك دابنریٚ بۆ خراپەکاری بەرامبەر ژنانو، سزادانی سەختی ئەوانەی کە ئەم سنوورە دەبەزێننو، گۆڕینی قانوونەکانی پێوەندار بەمەوە، بەجۆرێك ژن بتوانیٚ هەر کاتێك هەستی بە زۆرداریی مێردەکەی کرد، مێردەکەی تەلاق بدا، واتە وشەی "تەلاق سەندن" نەمینیٚو بکریٚ بە "تەلاقدان" لە هەردوو لاوەو، وەك یەك. شان بەشانی ئەمەش قانوونێکی مۆدێرن بۆ رۆژنامەگەری دەربکریٚ کە ئازادی دەربڕینی بیروڕا بپارێزیٚ.

ئەگەر ئەم دوو حیزبە دەسەلآتدارە دەیانەویٚ ئاشتیی راستەقینە لە کوردستاندا جێی خۆی بگریٚ، دەبیٚ رێبدەن کە بە زووترین کات گشتپرسییەك بکریٚ لە هەموو باشووری کوردستانو لەنێو کوردی بەغداو عێراقدا، بۆ ئەوەی بزانریٚ خەڵکی کوردستانو کورد چییان دەویٚ. ئەوجا، ئەگەر خەڵکی کوردستانو کوردی عێراق، دەنگیان بۆ سەربەخۆیی دا، ئەوا دەبیٚ هەڵبژاردنێکی نویٚ بکریٚو پەرلەمانێکی نویٚ بێتە کایەو، دەستبەجیٚ خەڵکە دەرکراوەکەی کەرکووكو مووسڵو شوێنە داگیرکراوەکانی دیکەی باشوور بگێڕدرێنەوە شوێنی خۆیانو خانوو و کارو ئاسایشیان بۆ دەستەبەر بکریٚ. ئەوجا، کاربەدەستانی ئەمریکاو بەریتانیاو شیعەو سوننە رازیین یان نا، دەبیٚ ئەو شوێنانە بەڕەسمی بە باشووری کوردستان بدرێنە قەڵەمو دەستووری باشووری کوردستانیش

هەر بەو شێوەیە سنووری باشووری کوردستان دەستنیشانبکا. بەرلینی ڕۆژاوا لە پاش جەنگی جیهانیی دووەمەوە تا سەردەمی هەشتاکان، لەلایەن سوێندخۆرانەوە بە هەرێمێکی سەربەخۆ دادەنرا، جیا لە ئەڵمانیای ڕۆژاواو ڕۆژهەڵات. بەڵام حکوومەتی ئەڵمانیای ڕۆژاوا BRD، بەرلینی ڕۆژاوای بە پارچەیەك لە BRD دەدایە قەڵەمو مانگانەی مووچەخۆرو فەرمانبەرەکانی بەرلینی ڕۆژاوای دەداو، گەلێك ئاسانکاری بۆ خەڵکی بەرلینی ڕۆژاوا دەکرد. ئێستە، با ئەمانیش، لەخەڵکەوە پەندێك وەربگرن.

بەرلین 2006/3/29

**میدیا**، ژ 234، 2006/4/4

## زیندوو كوژی مردوو پەرست

لەژمارەی هەفتەی پێشووی "میدیا"دا، ریپۆرتاژێكی كورتی ئەو سەردانە بڵاوكرایەوە، كە ئێمە، سێ كەس پێكەوە، شێخ ئەحمەد نەقیبو خودێلێخۆشبوو مامۆستا عەزیز محەممەدو ئەز، پەنجا ساڵ لەمەوبەر، لە پاشنیوەڕۆیەكی هاوینی 1956دا، كردمانو، چووینە خزمەت كۆنەشای كوردستان، شێخ مەحموودی بەرزنجی (حەفید). ئەم ریپۆرتاژە، كاتی خۆی لە مانگنامەی "سەكۆ"و گۆڤاری "كۆنگرە"دا بڵاوكرایەوە.
"كۆنگرە" دەنگی كۆنگرەی نیشتمانیی كوردستانە، لە ئەرویێژ دەردەچێ. "سەكۆ"ش مانگنامەیەك بوو، لە بەرلین لە نیوەی دووەمی نەوەتەكاندا، لەلایەن بەرێزان، پێشڕەو سەید برایمی بەرزنجیو عەبدولمومین دەشتییەوە دەردەهێنرا.

وەك لەوتارەكەدا پەنجەم راكێشابوو بۆی، شێخ مەحموود لەداریكەلی، كە گوندێكی سەر بە ستانی سلێمانی بوو، وەك دەستبەسەر دەژیاو، مافی ئەوەی نەبوو ئەو گوندە بەجێبهێڵێ. حكوومەتی عێراقی ئەو سەردەمە، كە پێوەندداڕو هەڤاڵبەندی بەریتانیا بوو، شێخ مەحموودی بەچاوی دوژمن تەماشا دەكرد، شێخ مەحموودیش هەتا ئەو رۆژەی كۆچیدواییكرد، دانی بە بوونی دەوڵەتی عێراقدا نەنا.

سەیر ئەوەیە، ئەو كوردانەی كە لەو سەردەمەدا خۆیان بە چەپیو دژ بە ئیمپریالیزمی بەریتانیا دادەناو، حكوومەتی عێراقیان بەدەستنێژی بەریتانیا دەدایە قەڵەم، شێخ مەحموودیان بە دەرەبەگو داردەستی ئینگلیزەكان دادەنا. جا لەبەر ئەوەی سەرم لەو بەزمە دەرنەدەكرد، گەلێك جار ئەو پرسیارەم لەو چەپاژۆیانە دەكرد، كە بۆچی دەبێ شێخ مەحموودێك كە خۆی دەرەبەگو دەستكەلای دەستی ئیمپریالیستەكانی بەریتانیا بێ، هەر لەلایەن ئەم ئیمپریالیستەو نۆكەرە عێراقییەكانییەوە،

ئاوا چەوساوەو دەستبەسەر بکریٚو، سەربەستیی جوولاٰن و سەفەری، بە جۆرەکی وا سنووردار بکریٚ کە نەتوانیٚ لە کوێرە لادیٚی داریکەلی بەولاوە، پێهەڵبنیٚ؟ لەوەرامدا ئەو بەرێزانە دەیانفەرموو، "ئەوە بۆ سیاسەتە". ئەوەی راستی بیٚ، ئەز لەو سیاسەتە ژیرانەیەی بەریتانیاو رژێمی ئەڵقە لەگوێی عێراق نەدەگەیشتم. بەلاّم وادیادە، ئەو چەپاژۆ مووهەڵکزێنە بەرێزانە، باش لێیدەگەیشتن.

لەئەنجامی ئەو بارودۆخە سەپێندراوەوە، واتە، لەلایەکەوە، ترس لەرژێمی عێراق و، لەلایەکی دیکەشەوە، ترس لەزمانی بەدی ئەم چەپاژۆ بەرێزانە، خەڵکەکە واچاوترسێن کرابوون، کە بەدەگمەن کەسێك هەبوو، بوێریٚ سەرێك لە شێخ مەحموود بدا. ئەوجا، تۆ وەرە لەباشووری کوردستانی ئەو سەردەمەدا، هەشت- نۆ- دە خوێندەوار، نابێژم رۆشنبیر، هەڵنەکەویٚ، کە هێندە چاوقایم بن، سەرێکی ئەو شێخ مەحموودە بدەن، کە ساڵانێکی دوورودرێژ، بە چەند سەت پێشمەرگەیەکی رووت و برسی و چەکێکی سادەوە، بەربەرەکانیی زلهێزێکی وەك "بەریتانیای مەزن" و هەموو داگیرکەرانی کوردستانی دەکردو، هەوڵی دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆی دەدا، تا بزانن، ئەو پیاوە کێیەو، بیروڕای چۆنە بەرامبەر بەسەرهاتەکانی خۆی و کوردستان و جیهان.

ئەز کە ئەودەمە، تەمەنم هێشتا 23 ساڵی تێنەپەڕاند بوو، بەختم یاربوو، کە چوومە سەردانی شێخی کوردو، لەو سەردانەدا، گەلێك شت رۆنبوونەوە بۆم. ئەوەش بەهۆی هاوڕێی منداڵی و قوتابخانەم، شێخ ئەحمەد نەقیبەوە بوو، کە ئەو هەلەی بۆ من رەخساندو، ئەو بە یەکگەیشتنەی هێنایەدی. کە لێرەشدا جارەکی دی سوپاسبژێریی خۆم جەختدەکەمەوە بۆی.

دەمێکە ئەوەم گوتووە کە کورد لەنێوخۆیدا گەلێکی زیندووکوژی مردووپەرستە. مخابن، ئەو کەسەی لەنێو کورددا هەڵدەکەوێ‌و هەست بە بەرپرسیاریدەکاو چاکی لێدەکا بەلاداو، بێ هیچ چاوەڕوانی‌و پاداشتێك‌و بەپێی وزەی خۆی‌و بگرە پتریش لەوە، دەکەوێتە خزمەتکردنی خەڵك‌و، لەو ڕێیەشدا تووشی برسێتی‌و دیلێتی‌و شەڕو کوێرەوەری دەبێ، ئەوا، ئەو کەسە، هەتا لەژیاندایە، نەك هەر یارمەتینادرێ‌و بەس، ئەوەیان هەر هیچ، بەڵکو بەهەموو شێوەیەك پاشقولدەگیرێ لێی‌و خراپە دەکرێ لەدژی‌و، بە گەلێك بوختان‌و درۆو دەلەسە، هەوڵی ریسوا کردنی دەدرێ‌و دەربەدەر دەکرێ، تا بەهەژاری‌و دەستکورتی‌و هەناسە ساردی‌و داخ‌و خەفەتەوە سەردەنێتەوە. ئەوجا کە مرد، پرسەی ماتەمینیی گەورە دەگیرێ بۆی‌و، لەرۆژی لەدایکبوون‌و مردنیدا، یادی دەکرێتەوە، تەنانەت فیستیڤاڵی قەڵەبالغیشی بۆ ساز دەکرێ‌و، بەجۆرێك پەسندەدرێ، دەبرێتە ئاسمان. ئەمە لەکاتێکدا، کە ئەو مردووە بەستەزمانە، ناتوانێ سەر لەگۆڕ دەربهێنێ‌و بێژێ: "بەسە، بەسە! هەی ڕووی درۆزن ڕەش بێ...".
لێرەدا دەتوانم ژمارەیەکی یەکجار زۆر کەسانی بلیمەت‌و تێکۆشەر لەنێو کورددا بەنموونە بهێنمەوە کە چارەنووسیان وارەشبووە، بەڵام تەنێ بەیەك میناك (مپال) بەسدەکەم. ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە هەمووی چەند هەفتەیەکە ئەوە روویداوە لە هەولێر. ئەو هەولێرەی کە ڕۆژێك بوو، قەڵای کوردستان‌و هۆلاکۆ بەزێن‌و، ئەوڕۆش هەولێری حیزبحزبێنەیەو، هەر لەسایەی سەری حیزبحزبێنەوە، هەزاران کەس لەملاولەولا کۆکرانەوەو خرانە سەرشەقام، نەك لە دژی گەندەڵیی بەڕێوەبەرێتی‌و برسێتی‌و بێکاری‌و، دژی مافخوراویی ژن‌و، بۆ ئازادی‌و یەکسانی‌و سەربەخۆیی کوردستان، بەڵکو لەدژی زانایەکی گەورەی وەك دوکتۆر جەمال ڕەشید، کە بەرهەمە بەنرخەکانی مایەی شانازیی زانستکارانی راستینەن. بەڵێ، لەو

خۆپێشاندانەدا، کە هیچ داخوازییەکی کوردیو کوردستانی تێدا نەبوو، و وەك لەلایەن پاسدارانی ئێرانو حەماسی فەلەستینی لەتارانو بێرووت کرابێ وابوو، ژمارەیەك ژنان دەیانقیژاند: "ئێمەی خوشکی موسڵمان، نامانەوێ رۆشنبیری حەیوان". ئەمن، بۆ خۆم هیچ قسەیەکم نییە لەگەڵ ئەوانەی ئاوا دەچرێننو، ئەو کەللەشەکرانە دەشکێنن. ئەوانە مرۆڤی ساویلکەو نەزانو هەڵخەڵەتاون. بەڵام بۆچی دەبێ کاربەدەستانی هەولێرو ئەوانەی بەنانی خەڵکی کوردستان دەژین، رێ بەو جۆرە سووکایەتیکردنە بدەن، بە پیاوێکی زانای سەربەرزی وەك دوکتۆر جەمال رەشید کە هیچ پێویستیەکی بە کورد نییەو، هیچ چاوەڕوانییەکیشی لە کورد نەبووەو نییە. ئەم قسەیەش لەخۆمەوە ناکەم. ئەمن ئەو پیاوە لە پەنجا ساڵ لەمەوبەرەوە دەناسم، کاتێك کە قوتابییەکی زیرەكو ئازاو رەوشتجوانی من بوو لە قوتابخانەی دوانێوەندیی موسەللا لە کەرکووك. بنەماڵەی دوکتۆر جەمال لەسەر لایەنگیریی بۆ شۆرشی ئەیلوولو رەحمەتی مەلا مستەفای بارزانی، چەند جارو چەند جار،ماڵیان تاڵانکراو، تووشی زیندانیو کوێرەوەریو بێنانیو دەربەدەری بوون. ئایا، ئەمەیە پاداشتی مرۆڤی خزمەتگوزار، کاربەدەستانی هەولێر؟ ئەوانەی لە پشت ئەم کارەوەن، ئەگەر شتێکیان لەباردایە، فەرموون شەرمنەکەنو، دەست بە نووسین بکەن. دوکتۆر جەمال، نەچووەتە سەرجادە جنێو بە کەس بدا، ئەو شتی نووسیوە، فەرموون، ئێوەش بچن، چی بەڕاست نازانن لە بەرهەمەکانیدا باسبکەنو بیروڕای خۆتان بێژەن، تا ئەوانەی لەو بابەتە دەزانن، راستیو ناڕاستی بۆچوونەکانی هەردوولاتان هەڵبسەنگێنن. تیشکی بیری زانستانەش بە فتوای مێژەربەسەری نەزانو لەچکبەسەری فریودراو بەری ناگیرێ.

سەیرە! هەموو ڕۆژێك چەند کوردێك ئەنفال دەکرێن‌و، ژمارەیەکی دیکەش لە کوردستان دەربەدەر دەکرێن، بەڵام یەك فتوا نادرێ لەدژی کوردکوژی‌و، یەك فتوا نادرێ لەدژی داگیرکەرانی کوردستان‌و باسی ئەوە ناکرێ، کە کوردیش وەك عەرەب‌و ترك‌و فارس بەندەی خوان‌و، مافی سەربەخۆییان هەیە وەك ئەوان‌و، هەر کەسێکیش لەدژی ئەو مافە بوەستی داگیرکەرو تاوانبارە. داواکردنی ئەم هەقە کە خودا داوێتیی بە کورد، ناکرێ بەفتوایەك، بەڵام ڕۆژ لەدوای ڕۆژو، هەر ڕۆژە بە بیانوویەکی بێسەروبەرو بێوەجانە، پەلاماری پیرۆزمەندییەك لە پیرۆزمەندییەکانی نەتەوەی کورد دەدرێ. بۆ وێنە، ماوەیەکە گیرپیان ئاڵاندووەتە سروودی نەتەوەیی کورد (ئەی رەقیب) کە مارشی کۆماری کوردستان بوو و، لەو کاتەوەو تا ئەمڕۆ، لە هەموو لایەکی کوردستاندا بە پیرۆز دادەنرێ. ئەوانەی دژی مارشی کوردستانن، هەر یەك تاقم نین، بەڵام یەك ئامانج کۆیاندەکاتەوە. چەندساڵێك لەمەوبەر، کۆنە زورناژەنی رژێمی سۆڤێت، ئەمیری حەسەن پوور "ئەی رەقیب"ی بەرەگەزپەرستی دادەنا. ئەوجا کەسانێك کەوتنە دژایەتیی "ئەی رەقیب" بەبیانووی ئەوەی کە گوایە، وتەی "دینمانە، ئاینمانە، نیشتمان" دژی باوەڕی وانە. ئەمەیان لە نەزانینەوە دێ. چۆنکە ئەو "دین"و "ئاینە"ی کە لە "ئەی رەقیب"دا هاتووە، پێوەندیی بەو "دین"و "ئاین"ەوە نییە کە ئەوان باوەڕیان پێیەتی. رەگی وشەی "دین" لە زمانە ئارییەکان‌و زمانە سامییەکانیشدا هەیە. رەگی وشەی "دین"ی زمانی کوردی وشەی ئاڤێستایی دەئێنا deênaیە کە مانای "ویژدان"و "رامان"و "ئەڤین"ە. "دین dîn" بەم پێیە، وشەیەکی کوردیی زۆر کۆنەو، لە پێش ئیسلامەتیدا هەبووەو، هەر لە پێش ئیسلامەتیشدا، بەهێندەك مانا چووەتە زاری عەرەبییەوە.

"دین" گەلێك مانای هەیە، لەوانە دادگە، فەرمانگە، شوێنی لێپرسینەوە. بۆ وێنە: ئەوەی لە قورئاندا هاتووە: "مالك يوم الدين" مانای "خاوەنی ڕۆژی دادگەیی"یە کە مەبەست لەوە، ڕۆژی پەسلان (قیامەت)و لێپرسینەوەیە.

"دین" بەم مانایە لەوشەی کوردیی کۆن dîpîpane (دیپی پانە)وە هاتووە کە بۆ نێونانی ئەو شوێنە بەکارهێنراوە کە کاروباری حکوومەتی تێدا بەڕێوەچووە و، تۆمارخانە لەوێدا بووە. ئەم وشەیە دوایی بووە بەدیڤان dîvan و لەسەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا، عەرەبەکان ئەم وشەیەیان وەرگرتو کردیان بە "دیوان dîwan"و هەتا ئەوڕۆش بەکاری دەبەن. فارسەکانیش لەرەگی dîp ەوە کە بەمانای نووسین بووە، وشەی دەفتەر defter یان وەرگرتووە کە بەمانای "نووسینگە" (بیرۆ) بەکاریدەبەن. هەر لەو وشەیەوە، وشەی دەبیر (debîr) یان چێکردووە، کە بۆ سکرتێر، یان مامۆستای قوتابخانەی دوانێوەندیی، بەکاریدەبەن. وشەی "دیوەخان"ی کوردیش هەر لەوەوە هاتووە. وشەی "دین" لە فۆلکلۆری کوردیشدا هاتووە. باش لەبیرمە کە لەپۆلی دووەمی قوتابخانەی نێوەندیی سلێمانی بووم. هاوقوتابییەك، کە پێموایە تووشی دڵداری بووبوو، ماوەیەك هەر ڕۆژ شمشاڵێکی لەگەڵ خۆی دەهێنا بۆ قوتابخانەو لەپشووەکاندا گۆرانییەکی فۆلکلۆری بەو دەمو شمشاڵە دەگوتو دەگوتەوە: "خانمی، خانمی، خانمی خانمانمی. خانمی، خانمی، تۆی دینو گیانمی. ئەو دەردەی وامن گرتم، هەر تۆیی دەرمانمی، هەر تۆیی دەرمانمی" کەسیش بە خەیاڵیدا نەهات کە مەبەستی لە "دین" دینێکی ئاسمانییەو هیچ مەلایەکیش فتوای کوشتنی دەرنەدەکرد.

هەروەها وشەی "ئاین Ayin"یش، گەلێك مانای هەیە، لەوانە ڕێبازو ڕەوشتو جۆری ژیانو جێژنو هەلسوکەوتو کردارو قانوونو بەرنامەو...

هتد. وشەی "ئاین" لەپەهلەوی ئایین Ayinو ئەدڤێن Edvênە. تەنانەت فارسەکان ئەم وشەیە لەجیاتی "بەرنامە" بەکار دەبەنو دەبێژن "ئاییننامە"ی حیزب.

کەسانێکی دیکەش هەن، لەبەر خاتری خاترانو راگرتنی دڵی دراوسێکان، بڕوبیانووی نەشارەزایانەیان ئەوەیە کە "کەیخسرەو" کە نێوی لە مارشی کوردستان دا هاتووە، کورد نەبووە. وەك ئەوەی ئەمانە تەنیٚ ساڵێك بیٚ هەستیان بەوە کردبیٚ کە کەیخسرەو کورد نەبووە، بۆیە هەر ساڵێکە باسیدەکەن. بەمانە دەبیٚ بڵێم: لە بیٚ خەبەران کەشکەك سڵاوات. کەیخسرەو، هەر نێوی زەلامێك نەبووە، بەڵکو کەیخسرەو کەسایەتییەکی میتۆلۆژیایی بووە، وەك رۆستەمو زۆرابو گیو. نێوی کەیخسرەو لە ئاڤێستادا هەیەو، بەپێی چیرۆکێك 160 سەتو شەست ساڵ فەرمانڕەواییکردووە. داخەکەم، نەزانی وایکردووە، داگیرکەرانی کوردستان، بەیارمەتیی کوتە خوێندەواری کورد، خۆیان بکەنە خاوەن کولتووری کورد.

نموونەیەکی دیکە، بە سووك تەماشا کردنی جلوبەرگی کوردییە، کە یەکێکە لە نیشانەکانی پێوەندارێتی بە نەتەوەی کوردەوە. ئەوە بوو، ماوەیەك لەمەوبەر کە ژنانی سەرفرازی کورد لە بادینان، هەستیان بەوە کرد کە عەبای ژنانی عەرەبی نێوچەی کەنداو (خليج)، خەریکە تەنگ بە جلوبەرگی جوانی ژنانی کورد هەڵدەچنیٚ، هەزاران ژنی کورد هاتنە سەر شەقامو کەوتنە خۆپیشاندان، بۆ رێگەگرتن لە فرۆشتنی ئەو جۆرە جلکانە لەکوردستانداو بەنیازی برەو پەیداکردن بۆ کنجی ژنانەی کورد. چۆنکە لە عەبای کەنداودا، نیشانەی بە عەرەبکردن دەبینریٚ. کەچی مەلایەکی کورد، کە بەنانو ئاوی کوردستان دەژی، بیٚ سڵکردنەوە، دەستیکرد بە پەلاماردانی ئەو ژنە سەربەرزانەو، پشتگیریکردنی عەبای بەعەرەبکردنی

کوردو، ئەو ژنە نیشتمانپەروەرانەی بە "بێڕەوشت" (بێ ئەخلاق) لەقەڵەمدا، بێ ئەوەی کاربەدەستانی بادینان، یان هەولێر، مێش میوانیان بێ. ئەمە لەکاتێکدا، کە هەموو کەسێك دەزانێ، وشەی "بێ ئەخلاق" لەنێو کوردەواریدا، چ مانایەك دەگەیەنێ، بەتایبەتی ئەگەر ئەو تۆمەتە قورسە بخرێتە پاڵ ژنان. ئەوجا ئەگەر ئەو کەسەی کە ئەو تۆمەتە ناڕەوایە دەخاتە مل هەزار ژنی کورد، خۆی مەلا بێ‌و لە مانای "الزین یرمون المحصَّنات الغافلات... الخ" تێبگا، ئەوا، دەبێ بزانێ، چ تاوانێکی گەورەی کردووەو سزاکەشی چەندە. ئەوە، بێجگە لە بەسووك تەماشاکرانی جلوبەرگی کوردی کە یەکێکە لە پیرۆزمەندییەکانی نەتەوەی کوردو، بێڕێزکردنی پۆشاکی کوردی، تاوانێکی یەکجار گرانە. جا لەبەر ئەوەی کاربەدەستانی کوردستان، لەبەریان مرم، لەم پێخوستکردنە قێزەوەنەی پیرۆزمەندییەکانی کورد بێدەنگن، هیچ بەدووری نازانم، سبەینێ هی واپەیدا بن، ئەمجارە دژی ئاڵای کوردستان قسە بکەن‌و، بیانوویەکیش بۆ ئەوە بدۆزنەوە، بۆ وێنە، بێژن: ئەو خۆرەی کە لەنێوەڕاستی ئاڵاکەدایە، نیشانەی "خۆرپەرستی"یە. ئەو دەمە، کەسانی وا پەیدا بن، دەستبدەن بە سنگدا بۆیان‌و بڵێن "ئەشەدوبیلا، کەرەنێڵ (کۆلۆنێڵ) تۆفیق وەهبی، یان مەلا پچکۆلی چەلەبی، بیست ساڵێك لەمەوبەر، ئەوەیانگوت‌و ئەوەیانگوت". بەلام عەمرو مووسایەك، لەبەردەم پەرلەمانی کوردستاندا، ئەتکی کورد بکاو بێژێ "کوردستان بەشێکە لە جیهانی عەرەبی"، قوڕوقەپ بکرێ لێی‌و، ئاوڕووی تکێنراوی کچە کوردەکان لەیانەی شەوانەی قاهیرە، ئەوە، پێشکێشی پێلاوەکانی جەنابی عەمرو بەگ بێ، چۆنکە ئەوە "حەلالە"و "بێ ئەخلاقی" نییە، بەلام پێداگرتنی ژنانی کورد لەسەر لەبەرکردنی جلوبەرگی ژنانەی کوردی،

لەجیاتی عەبای رەشی کەنداو، کە نیشانەی بەعەرەبکردنی کوردە "بێ ئەخلاقی"یە!!!
بۆ دوا هەرەسهێنانیش بە کۆشکی رووخاوی زمانی کوردی، کە بەڕێکەوت چەند کۆڵەکەو نیرگەیەکی لەجێی خۆیدا ماون، بۆ ئەوەش "خواکەریمە، "فتوا"یەکی رێکوپێك بدرێ بۆ بەکارنەهێنانی زمانی کوردی بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەم زمانە، زمانی زەردەشتی "ئاگرپەرست" بووەو، لەبنەڕەتیشدا زمانی جنۆکان بوو. ئەی چەند سەت ساڵێك لەمەوبەر، مفتی عوسمانی لە "تاج التواريخ"دا نەیفەرموو "عولەمای گەورە" گوتوویانە "پەیامبەری موسڵمانان نزایکردووە کە خوا نەهێڵێ کورد یەکبگرن، ئەگەرنا دەبنە هۆی رووخاندنی جیهان"و لەمەشەوە ئەو ئەنجامەی بەدەستەوە نەدا، کە کورد لەبەر ئەوەیە نەیانتوانیوە، دەوڵەتی گەورەیان هەبێ؟ ئەی ئەوەشی بڵاو نەکردەوە کە گوایە گوتراوە "کورد تاقمێك جنۆکەن، خوا پەردەی لەسەر روویان لابردووە". (الاكراد گائفه من الجن كَشَفَ الله عنهم الغگاو)؟ وادیارە، ئەو مەلا بەرێزەی بادینان، کە هەزار کچی کوردی بە "بێ ئەخلاق" داوەتە قەڵەم، بەپێی قانوونی هەولێرو دهۆك، هیچ لێپرسینەوەیەك نەکراوە لەگەڵی، لەبەر ئەوەبووە، کە ئەو وشەیە، "هەق" بووە، چۆنکە "جلکی کوردی جلکی جنۆکانە"و، جلکی ژنە عەرەبەکانی کەنداویش جلکی حۆرییەکانی بەهەشت.
بەداخەوەو، زۆر بەداخەوە... لەچرە دووکەڵی نارەواییی کۆمەڵایەتیو فرکانفرکانی حیزبحزبێنەو خزمخزمێنەو گەندەڵیی بەڕێوەبەرێتیی کۆمەڵگەی باشووری کوردستان، کە نێویاناوە "ئەزموونی دیمۆکراسی"، رۆژ بووە بەرۆژی مرۆڤی لرفلێدەرو خۆ بەرەپێشەوەو خۆبژێنو چەندڕوو، ئەوەی نوێی کوردستانیش، واخەریکە چاوهەڵدێنێو کەوتووەتە تەکانو، داخوازیی مافی رەوای خۆیو خەڵکی مافپێشێلکراوی کوردستان دەکاو،

دەیەویْ پشوویەكی ئازادانە بدا. بەڵام كاربەدەستانی حیزبەكان، سا، لە دەسەڵاتدا بن، یان لەدەرەوەی "بازنە"، ترسی نەمانو كاتبەسەرچوون نیشتووە لێیانو، لەباتی ئەوەی گویْ بۆ رازی دڵی بەشخوراوان شلكەنو، بەخۆیاندا بێنەوە، كەوتوونەتە هەڕەشەو بەربەرەكانیو، هیچ رێیەكیان بۆ چاكسازی (ریفۆرم) نەهێشتووەتەوە. لەبەر ئەوە، كە گوێم لەوتارەكەی بەڕێز كاك مەسعوود بارزانی بوو كە لە فیستیڤاڵی شێخ مەحمووددا خوێندییەوە، ئەو فێستیڤاڵەی كە پەنجا ساڵ پاش كۆچیدواییی شێخ سازكرا، دیتم كاك مەسعوود، رووی گلەییو گازندە دەكاتە خوێندەوارانی كوردو دەفەرمویْ كە ئەوانە "لەجیاتی ئەوەی راستییەكان بخەنە بەرچاوی خۆیانو خەڵك، دەچن رەخنە دەگرن" و هەر لەو كاتەشدا دەفەرمویْ "باشە داوایان لێدەكەم با بێن ئەوەی ئێستا باشتر بكەنو یارمەتی خۆیانو ئێمەش بدەنو باشتری بكەینو زیاتری بكەین. بەڵام نەیەن مێژووی پڕ سەروەری خۆیان سووكو بێقیمەت بكەن...".

ئەز پێموایە مەبەستی كاك مەسعوود لەمێژووی پڕ سەروەری، ئەو خەباتە قورسە درێژخایەنەو، ئەو قوربانییە زۆرەیە كە خەڵكی كوردستان لەپێناوی ئازادیدا داویانە. ئەگەر مەبەستەكە ئەمە بیْ، ئەوا هیچ باوەڕ ناكەم كەسێك پیچێك ویژدانی هەبیْ، ئەوجا ئەو كەسە كوردستانی بیْ یان نەبیْ، ئەو قوربانییە مەزنە بە كەم بگریْ. دیارە، ئەوانەی رەخنە لە كاربەدەستانی كورد دەگرن، هەموویان یەكجۆر نین. ئەز، وەك رەخنەگرێك، رەخنەكەم لەوەیە كە خەڵكی كوردستان، بەرامبەر بەو هەموو قوربانیوماڵوێرانییە، بەشی "زەكاتو سەرفترەیەك"یشیان بەرنەكەوتووە. كە بەریشیان نەكەوتووە، ئۆباڵی هەرە گەورەی بەئەستۆی حیزبحزبێنەو خزمخزمێنەو نادادپەروەریی بەڕێوەبەرێتییەو، گەندەڵیش گەیشتووەتە رادەیەك، كە شێوای چاكسازی (ریفۆرم) نییە. لەبەر ئەوە، هەزاران

خوێندەواری دڵسۆزیش بێن، ناتوانن ئەو سیستێمە نەخۆشە بەرەو چاکبوونەوە ببەن، بەڵکو خۆشیان دەکەونە چڵپاوی ئەو سیستێمەوە. ئەرێ، سیستێمەکە، لەهەموو لایەکیەوە، ئابووری، کۆمەڵایەتی، رامیاری، خوێندەواری... هتد تووشی گۆلی بووەو، دەبێ لەبنەڕەتەوە بگۆڕدرێ. خۆ، ئەگەر ئەمە وانییە، بۆچی پارتیو یەکێتی لەساڵی 1996ەوە، واتە لەو دەمەوە کە نوێنەری هەردوولا چوونە تارانو نوێنەری پارتی رەحمەتی سامی عەبدولڕەحمان بوو، و هەتا ئەوڕۆ دەبێژن "یەکدەگرینەوە بەم زووانە"، بەڵام ئەوەتا هەتا ئەوڕۆ کە ئەوڕۆیە، تازە، باس هەر باسی ئەمەیە کێ ببێتە وەزیرو کێش ببێتە گزیر. ئەز خۆم، 6-7 ساڵ، زۆر دڵپاکانە خەریکی ئەوەبووم پارتیو یەکێتی لەگەڵ یەک رێکبخەمەوە بەجۆرێك نیشتمانپەروەری ببێتە بناخەی حیزبایەتی، نەك بەپێچەوانەوە، بەڵام سوودی نەبوو. کاك مەسعوودی بەڕێز، هەتا حکوومەتێکی نەتەوەییو لەشکرێکی نەتەوەییو سیاسەتێکی نەتەوەییو پەروەردەیەکی نەتەوەییو پۆلیسو ئاسایشێکی نەتەوەییو دادگەیەکی نەتەوەییو سەندیکا گەلی نەتەوەیی دروست نەبن، کە فەرمان لەدەستوورێکی نەتەوەییو ویژدانێکی نەتەوەییی ئازادەوە وەربگرنو، هەتا حیزب پارە بدا بە حکومەتو، هەتا حیزب چەکداری هەبێو، هەتا کاربەدەستانی حیزب، وەك فارسەکان دەبێژن "مادام العمر" لەسەر کار بمێننەوەو، کە مردیشن کوڕەکانیان جێیانبگرنەوەو، هەتا ژن کەنەفتو ژێر دەستە بێو لەسەر هیچە بکوژرێو کەسێك نەبێ تۆڵە لە تاوانباران بسێنێ، ئەوا برای خۆت دڵنیات دەکا، کە کورد، نەك هەر بەشێکی کەمی نرخی قوربانییەکانی وەرناگرێو بەس، بەڵکو ئەو فشە مافەش کە هەلومەرجی رۆژگار خستوویەتە دەستی، ئەوەشی لەدەست دەچێ. بەڵام

خوایە، ئەگەر ئەو رۆژە رەشە لەچارەی کورد نووسراوە، ئەوا بەر لەوە بمبەرەوە بۆ خۆت، با ئەو رۆژە رەشە نەبینم.

بەرلین 2006/4/24

**میدیا**، ژ 238، 2006/5/2

# کـوردو کێشـەی زمـان

ئەوەی راستی بێ، زۆرم پێناخۆشە کە لەم کاتەدا ئەم وتارە بە ناچاری دەنووسم، چۆنکە خەریك بوونم بەم باسەوە، دوورم دەخاتەوە لە بەرنامەی کاری ئێستام، کە پێوەندیی بە زمانەوانییەوە نییە. هۆی ئەم نا بەدڵییەش ئەوەیە، دەمێکە گەیشتوومەتە ئەو باوەڕەی کە زمان، ژێرخانی نەتەوە نییە، وەك زۆر کەس پێیانوایە،کە ئەگەر هاتو نەتەوەیەکی ژێر دەست، زمانەکەی لە دەستنەدا، ئەوا ئەو نەتەوەیە هەر دەمێنیّو، دەتوانیّ لە ڕێی زمانەکەیەوە، خۆشی رزگار بکا... با، زۆر دوور نەڕۆین، ئەوەتە، قیبتییەکانی میسر، کە مێژوویەکی چەند هەزار ساڵەیان هەیەو، زمانەکەشیان ماوە، لەگەڵ ئەوەشدا، بندەستی عەرەبن‌و، ئەگەر لەسەر ئاینی دیانی نەبوونایەو، وەك عەرەبەکانی میسر موسڵمان بوونایە، ئەوا دەمێك بوو لەنێو چووبوون. سوببەکانی عیراقیش، کە بە ماندایی ناسراون، نەتەوەیەکی یەکجار کۆنن‌و، زمانەکەشیان هێشتا ماوە، لەگەڵ ئەوەشدا، ژێر دەستەی عەرەبن‌و، ئەوەی تا ئەمڕۆ پاراستوونی، زمانەکەیان نییە، بەڵکو ئەوەیە کە ئاینێکی جیاوازیان هەیە لە ئاینی عەرەبەکانی عێراق... بەپێچەوانەی ئەوانەوە، جوولەکەکان، سەتان ساڵ بوو، دەربەدەری وڵاتان بوون‌و، لە هەر وڵاتێك بە زمانی خەڵکی ئەو وڵاتە قسەیان دەکرد، کەچی، توانیان ببنە خاوەن دەوڵەت‌و، زمانی ئاینیی کۆنی لە دەستچوویان، سەر لەنویّ بژیێننەوە.

ئەریّ، زمان ژێرخانی تایبەتکارەکانی نەتەوە نییە، بەڵکو سەرخانی ئەو تایبەتکارانەیە. پاراستنی ئەو سەرخانە، پێویستیی بەژێرخانێك هەیە کە لەسەر بنچینەیەکی پتەو راگیرکرابیّ. ئەو ژێرخانە، لە رۆژی ئەوڕۆدا، سا، یان سامان* (دەوڵەت)ێکی سەربەخۆیە، یان قەوارەیەکی وایە، کە لە سنووری جوگرافیایی ئەو زمانەدا، دەسەڵاتێکی ئەوتۆی هەبیّ، کە

زمانەکە بپارێزێ و گەشە بدا پێی. کورد، ئەوڕۆ، ئەو سامانە سەربەخۆیەی نییە. ئەوەی هەیەتی لە بەشێکی باشووری کوردستاندا، بریتییە لە بەلەمێکی سووکەڵەی بێ بایەوان (شراع)و، کەسیش نازانێ کەینێ تەوژمی شەپۆلی هەڵکردووی ئاو، بەهۆی کەشتییە زەبەللاحەکانی دەوروپشتییەوە، نوقمی زەریای دەکا. ئەو دەسەڵاتە کوردییەی هەشە، هیچ خزمەتێکی لەم رووەوە نەکردووە.

جا، دروستکردنی سامانێك، یان قەوارەیەکی لە سامان چوو، کە زمان لە لەنێوچوون بپارێزێ، بەر لە هەموو شتێك، پێویستی بە بوونی گیانێکی نەتەوەیی هۆشیارانە هەیە، کە پێوەندیدارانی ئەو نەتەوەیە وا لێبکا، هەست بە بەرژەوەندییەکی هاوبەش و چارەنووسێکی هاوبەش بکەن و، لەو رێیەوە، بوونی ناسنامەیەکی هاوبەش، بە پێویست و مافی خۆ بزانن و، ئەوجا، بە شێوەیەکی هەرەوەزی و تێکۆشینێکی نێوکۆیی، هەوڵبدەن بۆی.

دیارە، ئەو هەستەش بەبێ رۆشنکاری (توعیە)یەکی زانستانەی شێلگیر نایەتە کایە. هەر لەبەر ئەمەشە کە ئەز دەمێکە خەریکی بابەتی رۆشنکاریم، سەرەڕای هەموو بەرهەڵست و تەگەرەو چاڵ بۆ هەڵکەندنێك لەلایەن حیزبحزبێنیکەرانەوە، کە بوونەتە بەڵای سەری کوردو، هەر یەکەیان بە تەپڵ و زوڕنای زۆردارێك هەڵدەپەڕێ و، بە دەمێك و هەزار دەم، باسی ئازادی و دیمۆکراسی دەکاو، بە کردەوەی رۆژانەش دژی سادەترین تێگە (مفهوم)ی دیمۆکراسی و ئازادییە، ئا، لەم چرە دووکەڵی بازاڕی گەوجێتی فرۆشی بە نرخی نیشتمانپەروەریدا، دەمەوێ دەردو کوێرەرییەکانی کۆمەڵگەی کوردەواری و، کارەساتەکانی دەوروبەری و جیهان، بەڕاستی و بێ کەموکورتی و پێوەنان و، بێ گوێدانە راگرتنی دڵی کەس، بخەمە بەردەم راستەخەڵکەکە، بۆ ئەوەی هیچ نەبێ، ئەگەر بتوانم، ژمارەیەك لە نەوەی نوێ، وا لێبکەم کە ئازادانە، بە مێشکی خۆی بیر

بکاتەوەو، بابەتانە پەنجە بخاتە سەر نەخۆشییەکانی کۆمەڵگەکەی و، ئیدی، بە درۆو دەلەسەو فیشاڵی ئەوانە باوەڕ نەکا، کە بە ساختەکاریێتی و بۆ خۆ بڕێنی، هەوڵی گۆڕینی مێژووی کورد دەدەن و، تەنانەت دیرۆکی دوێنێ و پێرێش، کە بەبەرچاوی هەموومانەوە تێپەڕ بووە، دەیشێوێنن و، دەیانەوێ، ئەوەی کە کورد دەستیکەوتووەو، سەتییەکی ئەو قوربانییە گەورەیە نییە کە کورد داویێتی، بکەنە بەروبوومی "خەبات"ی خۆیان و، ئەو راستییە لە خەڵك بشارنەوە، کە ئەوەی ئێستە هەیە، کەسیش نازانێ، کەینێ ئەنفالێکی دی لە کورد دەکرێتەوە، ئەنجامی هەلومەرجێکی تاکهەڵکەوتووی نێو نەتەوەیی بووە، نەك "خەبات"ی وان. خۆ ئەگەر سەدام، لە لوتبەرزی خۆیەوە، پەلاماری کوێتی نەدایەو، پاشان گەوجێتیی رامیاری، نەیگەیاندبایە ئەوەی ئەمریکا پەلاماری بدا، ئەوا سەدام هەتا مردن سەرۆکی عێراق دەبوو و، پاش خۆشی، کوڕەکانی جێیاندەگرتەوە و، ئەو حەلە، هەر لەسەرخۆو، بەسایی چاوچنۆکی بازرگانانەی دەوڵەتە پیشەسازەکانەوە، چەکی ئەتۆمیشی بە دروستکردن دەداو، باشووری کوردستانیشی، تەنانەت بە پێنجوینیشەوە دەکردە عەرەبنشین و، هەزاران ماچوموورچکردنی سەدامیش، پوولێکی قەڵپی نەدەهێنا. ئەز، راست دەمەوێ، ئەو سیاسەتە چەواشەکارانەیە بە پەند بکەم، کە هەزاران کرێکاری کورد، بێکارو برسی بە کۆڵاناندا دەسووڕێنەوە، کەچی رێدەدرێ بە هەزاران عەرەب، بە نێوی کرێکارییەوە، لە کوردستاندا خۆیان نیشتەجێ بکەن و، جێ بە کرێکارە هەژارەکانی کوردستان لێژ بکەن. مانەوەی درێژخایەنیشیان دەبێتە هۆی گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستان. ئەز، دەمەوێ ئەو سیاسەتە بە پەند بکەم کە حیزبەکان ، بە بۆنەو بێ بۆنە، باسی مافی ژنان دەکەن، کەچی هەر رۆژە نا رۆژێك کچێك، یان چەند کچێکی کورد، بە ئاگری پرێمز دەسووتێن، یان خۆیان دەکوژن، یان لەسەر

ئەوەی کە نێویان ناوە "ناموس"و "کڕینەوەی ئاوڕوو" خوێنیان دەڕژێنریٚو، کاربەدەستانی حیزبەکان قوڕوقەپ دەکەن لێی، بکوژەکانیش وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن. ئەز، دەمەوێ ئەو سیاسەتە بە پەند بکەم، کە بە ملوێن پارەی کوردستان، بێ لێپرسینەوەو، بە فەرمانی تاکە کەس، بەملاو بەولادا تەخشوپەخش دەکریٚ، مرۆڤی گەجەرو گوجەرو لرفلێدەر، لە ولاتانی دەرەوە، بەنێوی "دۆستی کورد"ەوە، بانگێشتدەکرێن بۆ هەولێرو سلێمانی‌و، بەتایبەتی بۆ هەولێر. ئەوانیش، پاش چەند پەسندانێکی درۆیینەی خۆیان‌و، سەرکردەکانی حیزبە دەسەلاتدارەکان، میوانداریيەکی پاشایانە دەکرێن‌و، بە گیرفانی پڕەوە دەگەڕێنەوە، بێ ئەوەی هیچ سوودێکیان بۆ دۆزی کورد هەبووبێ، لە قسەی زل‌و خراپەکاری بەرامبەر کوردی سەربەخۆو خەباتکار بەولاوەو، تەنانەت هێندێکیشیان زیانیان هەبووە بۆ دۆزی کورد لە دەرەوەی کوردستان. هەر بۆ نموونە، هی وا هەیەکۆمەلێکی چەند کەسی پێکهێناوە، کە هیچ دەسەلاتێکی لە ئەورووپا نەبووەو نییەو، لە بلاو کردنەوەی چەند بلافۆکێك پتر، یان چوونە خۆپیشاندانێکەوە لەگەلٚ حیزبێك یان کۆمەلێکی کوردی، لەبەر کەمیی ئەندامەکانی کە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، کەچی سالانی سالٚ خەریکی ئەوە بووە، کوردە ئێزیدییەکان، کە رەسەنترین کوردن، بە گەلێکی "جیاواز لە کورد" بداتە قەلەم، یان نەخشەیەك بۆ ئەرمەنستان بلاوبکاتەوە، کە هەموو باکووری کوردستانی تێبخا. بەلام کە دەچێتە کوردستان، وەك پارێزەری کورد، بەرەو پیری دەچن‌و سوپاسیدەکەن. ئەمە لەکاتێکدا کە هونەرمەندێکی کورد، یان زانایەکی کورد، یان کەسێتیيەکی خزمەتگوزاری کورد، کە ڕێزی خۆی دەگریٚو، ماستاو بۆ دەسەلاتداران ناکا، ئەگەر ڕێی بکەوێتە کوردستان، نەك هەر گوێی نادرێتیٚو بەس، بەلکو خراپەکاریش دەکریٚ لە

دژی. خۆ ئەگەر هاتو رەخنەیەکی رەوای گرت، ئەوا وەك دوژمن تەماشایدەکرێت.

کابرایەکی قیبتی میسری، کە نێوی سەعدەدین ئیبراهیمەو، گوایە یەکێکە لەو کەسایەتییە ناسراوانەی میسر، کە لە بەرهەڵستکارانی رژێمی حوسنی موبارەكو لایەنگرانی سیستەمی دیمۆکراسیو،گوایە بە "دۆستی کورد" دەدرێتە قەڵەم، لە ئێوارەی رۆژی 2005/6/24 و، لە تەلەفزیۆنی"المستقلە"دا کە بە ملیۆنان عەرەب تەماشایدەکەن وتووێژی لەگەڵ سەروەر جەواد مەلا دەکرد. کە هێژا جەواد، باسی گەلکوژی لە کورد کرد لە عێراقدا، ئەو یەکسەر بە تورەییەوە هەڵیدایەوەو گوتی: "ئەوە گەلکوژی نەبووە". ئەمە لەکاتێکدا کە تەنانەت یەکێك لە نوێنەرانی "بەرەی ترکمانی" کە ئەویش لەو وتووێژەدا بەشدار بوو، گوتی "ئەز پشتگیریی بەرێز جەواد مەلا ناکەم، بەڵام لەم شتەدا هاودەنگم لەگەڵیو گەلکوژی بووەو بە قسە ناشاردرێتەوە".

ئەوجا، ئێستە وەرن تەماشاکەن، ئەگەر یەکێکی وەك سەعدەدین ئیبراهیم "دۆستی کورد" بێ، ئایا کورد پێویستی بە دوژمن هەیە، کاربەدەستانی کورد؟

ئەز دەمەوێ ئەو پرسیارە بکەم، بزانم چۆن هێندەك لە کاربەدەستانی ئەم دوو حیزبە، کە تا چەند ساڵێك لەمەوبەر، وەك کورد دەبێژێ "شێوی شەویان نەبوو" وا لە پڕ، بوونە خاوەن زەویو دوکانو کۆشكو ئۆتۆمبێلی گرانو پارەی زۆر؟ خۆ، ئەمەش هەر پرسیاری من نییە، ئەوەتا کاربەدەستێکی گەورەی "یەکێتی"ش کە کاك نەوشیروان مستەفایە، ئەویش هەر باسی دەکاو دژی گەندەڵی قسە دەکا. باشە کاك نەوشیروان، تۆیەك کە ئەوە دەزانیتو، خواش هەڵناگرێ، هەر گوناهێك بخرێتە ئەستۆی تۆ، کەس ناتوانێ تاوانی دزێتی بخاتە ئەستۆتو، لەم رووەوە

داوێنت پاکەو، خۆشم ئەمەم بەخۆت گوت، تۆ بۆچی لەم کارە ناکۆڵیتەوە؟ فەرموو، کە تۆ ئەوە دەڵێیت، ئازاگۆو ئازا مەیدان، وەرە ئەمە بخەرە دادگە، بۆچی نایخەیتە دادگە؟ بەربەرەکانیی گەندەڵیی بەڕێوبەرێتی، هەر بە قسە نابێ، بەڵکو بە کردەوە دەبێ. کەسێك بیەوێ لە دژی نارەوایی کار بکات، دەبێ دڵی هێندەك کەسیش لە خۆی بێشێنێ. ئەوەتا، ئەز، کە ئەم قسانە دەنووسم، دڵنیام هێندەك کەس دڵیان دێشێ لێم‌و، هێندەکیش ئافەرینم دەکەن، تۆش گوێمەدەرە ئەمانەی لە دژت دەوەستن، هەستە بچۆ وێژەی قەفەیان‌و، وەك "ئوستاد" بەشیر موشیر دەیگوت "قەفەیان...".

ئەز دەمەوێ ئەو سیاسەتە بە پەند بکەم کە بە درۆ باسی "یەکگرتنەوە"و پتر لە "یەکگرتنەوەی پارتی‌و یەکێتی" دەکرێ، وەك ئەوەی لەوە پێش ئەم دووانە یەکبووبن‌و، ئەوجا لەیەکترازابن‌و، ئێستا "یەکیانگرتبێتەوە"، نەك ئەوەی "رێککەوتبن" لەسەر دابەشکردنی دەسەڵات، تا شەڕ لەنێوانیان تازە نەبێتەوە، چونکە دەزانن تازەبوونەوەی شەڕ مردنی هەردوو لایانە. باشە، ئێستە، کە ئەمان باسی "یەکگرتنەوە" دەکەن، بۆچی وەزارەتەکانی دارایی‌و پێشمەرگەو دادو نێوخۆ، وا بە "دوو فلیچقانەیی" ماونەتەوەو، کەینێ دەبنە یەك‌و، کەینێ کوردستان لەشکرێکی نەتەوەییی یەکگرتوو و، دەزگەی ئاسایشێکی دیمۆکراتانەی یەکگرتوو و، دادگەیەکی سەربەخۆو، داراییەکی رۆناك‌و بێ دزی‌و گەندەڵی دەبێ؟ کەینێ گشتپرسییەك دەکرێ لە گشت نێوچەکانی باشووری کوردستاندا، تا بزانرێ خەڵکی باشوور چ بڕیارێك دەدا بۆ چارەنووسی خۆی، ئەوا ئەو عێراقەی دەتانەوێ دروست بێت، لە گیانەڵا دایە.خۆ، ئەگەر باشوور بەو گشتپرسییە، سەربەخۆیشی دەستنەکەوێ، ئەوا بەڵگەنامەیەکی دەکەوێتە دەست، کەوا دوا رۆژ بۆ داخوازیی مافی خۆی پشت ببەستێ پێی.

ئەز دەمەوێ، ئەو سیاسەتە بە پەند بکەم، کە ئەم دوو حیزبە دەسەڵاتدارە، بە هەزار چاو بۆ کەرکووك دەگرینو دەبارێننو، بە "دڵی کوردستان" و "قودسی کوردستان" دەیدەنە قەڵەمو، کەچی لە باتی نەخشەیەکی یەکگرتوو، بۆ ئاوەدانکردنەوەی کەرکووکو، دابینکردنی خانوو و کار بۆ لێقەوماوانی کەرکووکو، ئەوانەی لە ژێر خێوەتدا دەژینو، خزمەتێکی فراوان بە کەرکووکییەکان، بە کوردو ترکمانو هەموو رەگەزەکانی دیکەیەوە، لەوێش هەر خەریکی حیزبحیزبێنەن. تەنانەت دوو جۆرە پرۆگرامی خوێندنو دوو جۆرە رێنووسو دوو جۆرە پەروەردەی جیاواز دەبەن بەرێوە لە قوتابخانە کوردییەکاندا. بە قسەی زلیش، هیچیان نەمێشتووەتەوەو باسی "زمانی یەکگرتووی کوردی" دەکەن...

ئەوجا کە ئێستا هاتینە سەر بابەتی زمان، دەمەوێ بێژم، ئەوەی وای لەمن کرد ئەم وتارە بنووسم، ئەوە بوو هەر لەم رۆژنامەیەدا (میدیا) یەکێك لەوانەی بووە بە ئەندامی "کۆڕی زانیاری کوردستان"، لەبارەی زمانی یەکگرتووی کوردییەوە گوتبووی ، نە کۆڕی زانیاری کوردستان، کە ئێستە هەیەو، نە"کۆڕی زانیاری کورد" (کە لە بەغدا هەبوو)، هیچ بەرنامەیەکیان بۆ ئەم بابەتە (زمانی یەکگرتووی کوردی) نەبووەو نییە، ئەوانەی لەم بوارەدا کار دەکەن، هەندێکیان جێی بەزەیی پێ هاتنن، لە یەك شێوە ئاخاوتنی کوردیی شارەکەیان، یان گەڕەکەکەیان بەو لاوە، شتێکی تر لە کوردی نازانن". تا ئێرە، کاری من نییە لەسەری بڕۆم، دەبێ ئەندامانی "کۆڕی بێبەرنامە" کە خۆی یەکێکە لە ئەندامەکانی، وەرامی ئەم رەخنەیە بدەنەوە، چۆنکە بەزمێکی خۆشە مرۆڤ کاربەدەستیش بێو بەرهەڵستکاریش بێ!! بەڵام پاش ئەمە هاتووە، بێ ئەوەی نێوی من ببا، کەوتووەتە پەلاماردانی منو گوتوویێتی "پسپۆڕی زمانەوانی هەیە، لەبەر شەڕ، فریای پسپۆڕییەکەی ناکەوێ، هەر خەریکی تۆپبارانی خەستو

خۆڵی حزبو سەرکردەی کوردییە". ئەم پەلامار دەرە، هەر لەو وتارەیدا، باسی "خێروبێر"ی دوو حیزبە گەورەکە لە بارەی زمانەوە دەگێڕێتەوە بۆمان، کە لەوبەرو لەمبەری شەقامی رەحیماوای کەرکووک، پارتیو یەکێتی دوو جۆر پرۆگرام، هەولێریو سلێمانییان بەسەر کەرکووکییەکاندا سەپاندووە، کەچی رەخنەی رەوای من لە سیاسەتکارانی دوو زلحیزبەکە بە "شەڕە گەڕەك"و "تۆپبارانی حزبو سەرکردە کوردییەکان" دەداتە قەڵەم. ئەز نامەوێ زۆر لەسەر ئەم باسە بڕۆم، با ئەوانەی دەیانەوێ ئەو کەسانە بناسن کە کردەوەی ناهەق بە پەتووی شڕ دادەپۆشن، ماڵپەڕی کوردبوون www.kurdbun.de بکەنەوەو سەیرێکی ئەو "پاشگۆتن"ە بکەن کە بۆ " کوردستانو شۆرشەکەی"م نووسیوە، ئەوسا تێدەگەن کێ لەسەر هەقەو کێ لەسەر نا هەقە.

ئێستە ئەگەر مەبەست لە زمانی یەکگرتووی کوردی، ئەوەبێ کە هەموو کورد بەیەك شێوەزار قسە بکەن، ئەوە، نەك هەر بۆ کورد، بەڵکو بۆ هیچ گەلێکی ئەم جیهانە نەچووتە سەرو ناشچێتە سەر. بۆ بوونی زمانێکی یەکگرتوو، دەبێ رێزمانێکی یەکگرتوو ببێ، بۆ شێوەزارەکانی زمانی کوردی، یەك رێزمانمان نییە، تاکو هەموویان بخاتە چوارچێوەی دەستوورێکی یەکگرتووەوە. ئەمەش لە کردن نایەت، بەڵام دەکرێ زمانێکی یەکگرتوو، بۆ نووسینو قسەکردنی فەرمی، دروستبکرێ، کە وەك زمانی دیوانی (رسمی، حکومی) لە پاڵ شێوەزارەکاندا بەکاربهێنرێ و شێوای گەشەپێکردن بێ، ئەم زمانە دیوانییەش، دەبێ لەسەر بنچینەی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەکی کوور (قووڵ)ی زمانەوانانەی هەموو شێوە زارەکانی کوردیو زمانە خزمەکان بێتە بەرهەم. لە پەرتووکی "زمانی یەکگرتووی کوردی" کە چاپی یەکەمی لە ساڵی 1976 دا بڵاوکرایەوەو، جارەکی دی لە مەهاباد لە 1979دا چاپکرایەوەو، لەو وتارەمدا کە

بەزمانی ئەڵمانی، لە ژێر نێوی " زمانی نووسینی کوردی" لە ئینیسکلۆپیدیای ئیرانیکا (ئەکتا ئیرانیکا) لە ساڵی 1975 دا کە لەلایەن (هۆڵەندە) بلاّو کراوەتەوە، گەلێك پێشنیازم خستووەتە بەرچاو، کە هێندێکی لەلایەن خەڵکەوە پێڕەوی دەکرێن. بەداخەوە پاش ئەو بەرهەمە، هیچ کەسێك تا ئێستە، هیچ بابەتێکی نوێی نەخستە سەر ئەو باسە، هەرچەندە (30) ساڵ بەسەر ئەو کارانەدا تێپەڕیون.
هێنانە کایەی زمانێکی یەکگرتووی فەرمی، بۆ کاروباری دیوانی (رسمی)، دەبێ لەلایەن دەسەڵاتێکی فەرمانڕەواوە پشتگیرییەکی تەواوی لێبکرێ، تاکو گشت لایەك بەکاریبهێنن، ئەگەرنا بەختی سەرکەوتنی نابێ. ئێستە ئەگەر بێژم، ئەم دوو دەسەڵاتە کوردییەی کە 15 ساڵە هەن، هیچ هەنگاوێکیان نەهاویشتووە لەم بارەیەوەو، بگرە قڵیشیان بە درەختی زمانەکە بردووە، ئەمە نە شەڕە گەڕەکە، نە تۆپبارانی سەرکردەکانی کورد. ئێوە وەرن گوێ لە قسەو دەربڕینەکانی هێندێك لەو کاربەدەستە گەورانە بگرن کە لە تەلەفیزیۆنەکاندا دەیفەرموون، ئەو دەمە دەبینن، ئەگەر، عەرەبێکی کوردی نەزان گوێبگرێ لێیان، زۆربەی زۆری قسەکانیان تێدەگا: "گبعا، مع الاسف، علی اساس، اهتمام، وەحدەی وەگهنی، عچوی قیادی، محاسبە، اجهزەی گبی، مُسایرەی عصر، تگعیم، مصرف زراعی، بێ کەفائەتی، بێ اگلاعی‌و..... سەتان وشەی لەم بابەتەو...... ئیلا ئاخیریهی.. کە بەرامبەرە کوردییەکانیان، قوتابییەکی قوتابخانەی سەرەتایی دەیانزانێ. ئێدی زمانی یەکگرتووی کوردی، ئەگەر دروستیشبێ، چۆن بچێتە نێو "اموری رەسمییەوە"، لەبەرتان مرم؟. ئا لێرەدا دەمەوێ بەسەرهاتێك بگێڕمەوە کە لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول روویدابوو، کاتێك بەڕێز عیسمەت شەریف وانلی، وەك نوێنەری شۆڕش لە دەرەوەی وڵات، لەگەڵ رۆژنامەنووسێکی ئەوروپایی دەچێ بۆ کوردستان.

ئەمە لەو کاتەدا دەبێ کە لە نێو ریزەکانی پارتیدا ناکۆکی هەبوو، رەوانشاد، مەلا مستەفای بارزانی، وەرامی پرسیارێکی رۆژنامەنووسەکەی دابووەوە، کە عیسمەت شەریف نەیویستبوو بەو شێوە رەپوراستە بۆ رۆژنامەنووسەکەی بکا بە فەرەنسی، لەبەر ئەوە، کابرا پرسیارەکەی دووپاتکردبووەو، ئەمجارەش عیسمەت بە تەواوی تێینەگەیاندبوو. سەرۆك بارزانی، هەستی بەوە کردبوو کە شتێك هەیە، بە عیسمەتی گوتبوو، وا دیارە ئەو میوانە باش تێناگا. عیسمەتیش گوتبووی: "ناتوانم تێی بگەیێنم". لەوەدا بارزانی بە عەرەبی بە عیسمەت دەڵێ (چۆنکە عیسمەت ئەو سەردەمە هیچ کوردی نەدەزانی): لڈا انتم لیس باستگاعتکم ان تُفهموا چیفنا هڈا الشیو البسیگ، فلماڈا لا تدخلون المدرسە الابتدائیە؟".

ئەز، لێرەدا ناچار دەمێنم، ئەم قسەیەی بارزانی رەحمەتی دووبارە بکەمەوەو بێژم: باشە، جەنابی کاربەدەست، کە بەرێزت کراویت بە کاربەدەستو نانی کورد دەخۆیت، بۆچی جارێ ناچیتە قوتابخانەی سەرەتایی، تا کوردییەکی رەوان فێر ببیت؟

ئەوجا ئەگەر کورد بیانەوێ زمانێکی یەکگرتوویان هەبێ بۆ نووسینو کاروباری دیوانی، دەبێ بەر لە هەموو شتێك، ئەکادێمیایەکی راستینە بهێننە کایە، کە ئەندامەکانی بە ناسنامەی حیزبایەتی، یان "بەڵێ قوربان" نەبووبنە ئەندام، بەڵکو بە ناسنامەی زانستکاریو هونەروەری. پێویستیی بوونی ئەکادێمیایەکی لەو جۆرە، بۆ هێنانەدی زمانێکی یەکگرتوو، وەك پێویستی بوونی تێپی شانۆییە بۆ بنیاتنانی سینەما. ئەو ئەکادێمیایەش، دەبێ لەلایەن دەسەڵاتێکی دەوڵەتییەوە پشتگیری بکرێ، ئەگەر نا بەرهەمەکانی هەر لە سنووری خزمەتی زانستدا دەمێننەوە. ئەوەش لە تاقیکردنەوەوە دەبێژم. چۆنکە ئێمە، چەند مرۆڤێکی زانستکاری دەرەوەی

وڵات، لەوانە: دکتۆر بارام رەسوڵ کە نێوبانگێکی جیهانی هەیە لە زانستی دەرمانسازیداو پرۆفیسۆری زانستگەی ئۆپسالایە لە سوێد، لەگەڵ فەیلەسووفو فیزیکزانی گەورەی کورد، رەوانشاد محەممەد لەیلا، خاوەنی تیۆری "ماسیزم" لە فیزیکداو، مێژووزانی کورد دکتۆر کەمال عەلیو، بژیشکی نژدار (جراح) رەوانشاد دوکتۆر حەسەنی حیسامی و ئەندازیار و سیاسەتکار بەڕێز بروسك ئیبراهیم و، لێکۆڵەرەوە و وەرگێڕی بەڕێز فەخری سەلاحشۆرو، ئابووریزان دوکتۆر عیسام عەزیز شەریف (کوڕی سیاسەتکارو دۆستی بەنێوبانگی کورد رەوانشاد عەزیز شەریف)و چەند هاوکارێکی دیکە، لەمانگی ئابی 1985دا لە سوێد، ئەکادێمیایەکمان دامەزراند بە نێوی "ئەکادێمیای کوردی بۆ زانستو هونەر"و، لەگەڵ تێپەڕ بوونی کاتدا چەند بەرهەمێکی خۆشمان بڵاو کردەوە. بەڵام، هەر ئەوەندە هەواڵی دامەزراندنی ئەکادێمیا بڵاو بووەوە، ژمارەیەك بازرگانی سیاسەت، کە ساڵانی ساڵ بوو لە ئەورووپا بوونو لە هیچ کونێکەوە دیار نەبوون، بە فیتی (ی.ن.ك) کەوتنە سازدانی شتێك کە پێیاندەگوت "ئەکادێمیای کوردی". ئەمان کەوتنە خراپەکاری بەرامبەر بە ئێمەو، داوا کردنی ئەوەی "با ئەکادێمیاکانی کورد یەکبگرن"، ئەمەش بە نیازی ئەوەی ئێمە، ئەو بازرگانانە، کە هیچ پێوەندێکیان بە زانستەوە نەبوو، رابردووشیان گەلێك پەڵەی رەشی پێوەبوو بیانخەینە نێو خۆمانەوە، تا بکەونە ئاژاوە گێڕان، بەڵام ئێمە لەسەر کاری خۆمان رۆیشتین. ئەوان، لەپێشەوە پێیانوابوو، ئەم کارەی ئێمە پارەی تێدایە، دوایی کە دەرکەوت بۆیان، نەك پارەی تێدانییە، بەڵکو ئێمە دەبێ خۆمان پارە بدەینو پارەمان دەدا، هەر زوو توانەوەو گۆڕیان ون بوو. ئەوجا، کە کۆڕی زانیاری کوردستان لە هەولێر دامەزرایەوەو، سەردەمێك دوکتۆر شەفیق قەزار بوو بە سەرۆکی ئەو کۆڕە، داوای کرد کە هاوکاریی "کۆڕ"

بکەم. گوتم کاکی برا، خۆت دەزانیت کە ئێمە چەند ساڵە ئەو ئەکادێمیایەمان دامەزراندووەو باوەڕیش ناکەم، هیچ هاوکارێکی ئەکادێمیا دژی هاوکاری بێ لەگەڵ داوو دەزگەی زانستانە، بەڵام کۆڕ، ئەکادێمیا نییەو ئەکادێمیاش، هەر چەندە دەبێ دەسەڵاتێکی دەوڵەتی پشتگیری بکات لێی، بەڵام دەبێ سەربەخۆ بێ. سەربەخۆیی بۆ زانست وەك سەربەخۆیی بۆ دادگە، بنەڕەتی سیستەمی دێموکراتییە. کۆڕ لە هەولێر دەزگەیەکی حیزبییە. کاك شەفیق گوتی: "کەس دەست ناخاتە کاروباری کۆڕەوە"، گوتم: هیوام وایە وابێ. گوتم: دەبێ کۆڕ ببێتە ئەکادێمیا یەکی رێزدارو سەربەخۆو دوایی لەسەر ئەوە رێککەوتین، کە ئەز بەرنامەو کارنامەی ئەکادێمیای کوردی بۆ زانست‌و هونەر بنێرم بۆی، ئەویش بەپێی ئەو بەرنامەو کارنامەیە، کۆڕ بکاتە ئەکادێمیاو هەر بەو نێوەوە زانستکارو هونەروەری کوردو بیانی کە لە سنووری بەرنامەو ئامانجی ئەکادێمیادا بتوانن کار بکەن وەربگیرێن‌و سەربەخۆیی ئەکادێمیا مسۆگەر بکرێ‌و ئەو دەمە،ئەم ئەکادێمیایەی لە ئەورووپا هەیە،دەتوانێ ببێتە لکی دەرەوەی ئەکادێمیای کوردستان. کاك شەفیق گوتی: بەسەرچاو. بەرنامەو کارنامەم نارد بۆی، چوار ساڵ کاك شەفیق سەرۆکی ئەکادێمیا بوو، ئێستەش‌و ئەوساش دەنگی نەبوو.

وەك گوتمان، هێنانە کایەی زمانێکی یەکگرتووی کوردی بۆ کاروباری فەرمی‌و نووسین‌و بڵاوکردنەوە، دەبێ لەلایەن ئەکادێمیایەکی زانستانەی سەربەخۆوە بێ کە دەسەڵاتێکی دەوڵەتی پشتیبگرێ، بەڵام دەستنەخاتە بڕیارەکانییەوە بەهەواو هەوەسی سیاسەتبازی.

یەکەمین مەرجیش بۆ سەرگرتنی نەخشەی زمانی یەکگرتووی کوردی ئەوەیە، رێنووسی زمانی کوردی لەئارامییەوە بگۆڕین بەلاتینی. ئەمە مەرجێکی بنچینەییە، نەك هەر لەبەر ئەوەی تیپی لاتینی باشتر دەگونجێ

لەگەڵ زمانی کوردی، بەڵکو بۆ ئەوەشە کە، خەڵکی باکووری کوردستان بتوانن ئەو رۆژنامەو پەرتۆکانەی لەباشوورو رۆژهەڵات دەردەچن بخوێننەوە. یا هەمووشی تێنەگەن، بەڵام ، هێدی هێدی و، تا هەندازەیەك سووت وەردەگرن لێی. ئێستە، کە دەبێژم بەلاتینی، مەبەستم ئەوە نییە، ئەو لاتینیەی کە ئەوڕۆ باوە، هەروەك خۆی وەربگیرێ‌و بەکار ببرێ. نەخێر . دەبێ دەستکاری بکرێ‌و بیراز بکرێ. بەبیروڕای من پێویستە تیپی ş و ç بگۆڕین بە shو ch و لەجیاتی ê دوو e بنووسین واتا: ee و، لەجیاتی î ، ie بنووسین. ئەمە رزگارمان دەکا لەو چوکلانەی ژێر ş و ç و لەو کلاوەی بەسەر e وەیە، کەدیارە ئەمە سووککردنی رێنووس‌و کەمکردنەوەی تیپەکانی زمانەکەیە. بێجگە لەمەش زۆر بەپێویستی دەزانم، واز لەبزرۆکە (الکسره المختلسه) بهێنین، واتە کردن وا: kirdin نەنووسین، بەڵکو، هەر بەم شێوەیە krdn بنوسین. ئەو دەمە کە هیچ بزوێنیك لەنێوان kو rو dو n دانەبوو، هەموو کەس بەبزرۆکەی دەربڕێ. ئەوەتا ئەوڕۆ "کردن" بەم شێوەیە"کردین" نانوسین‌و، هەمووشمان هەر بە"کردن" دەیخوێنینەوە. بۆ ر r ی قەڵەو ڕ rr و م l ی قەڵەو î، ه h یەك بخەینە دوای تیپەکە بەم شێوەیە rhو lh. ئەمە رزگارمان دەکا لەو کلاوەی بەسەر rو lەوەیە. بەکورتی: دەبێ خۆمان لەچوکڵەو کلاو دووربخەینەوە. بێگومان گەلێك پێشنیازی دیکەش هەن کە دەتوانرێ بخرێنە مەیدانی وتووێژەوە. بەلام بەبێ بەکار هێنانی ئەلفوبێی لاتینی، هەموو باسێکی زمانی یەکگرتوو، هەر دەوەن بەئاشە.

گیرو گرۆیەکی گەورەی دیکە لەرێی زمانی یەکگرتووی کوردیدا نیشانەی نێرومێیە. نێرو مێ، لەهەموو شێوەزارەکانی کوردیدا هەیە، هەر یەکە بەرێژەیەکی تایبەتی، بەڵام لەشێوەزاری کوردیی باکووردا، یەکجار زۆرەو، گەلێکیشی هیچ پێویست نییە، چونکە لەباری رێزمانەوە نرخێکی نییە. بۆ

وێنە: کوڕێ من kurê min. ژنا من jina min، نیشانەی خستنە پاڵ بۆ نێرینە (ê)و بۆ مێینە (a). باشە، یەکێ هەیە نەزانێ کوڕ نێرەو ژن مێیە؟ ئەمە لەلایەك لەلایەکی دیکەوە، هەزاران وشەی کوردیی باکوور هەن کە بەنێر، یان بەمێ، دەدرێنە قەڵەم. بۆ وێنە: دەستێ خوە destê xwe، چاڤێ وی çavê wî . سەرێ تە serê te بەڵام بازارا هەولێرێ bazara hewlerêو مالامە mala me. باشە، بۆچی دەبێ چاڤ و دەست و سەر نێر بن، بەڵام بازارو ماڵ مێ بن؟ بەرای من باشتروایە، ئەو وشانەی کەلەم بابەتەن، بەنیشانەی خستنە پاڵی بێلایەن ی , دەستنیشانبکرێن، ئەمە تێگەیشتنی شێوەزاری باکوور، یەکجار هاسان دەکات. ئەوجا نیشانەی نێرومێ بەکار بهێنرێ لەشوێنی پێویستدا. بۆ وێنە دەبێژێت: هاوڕیێ منhawrêy min ئەوجا ئەگەر هاوڕێیەکەت پیاو بوو، ئەوا ، بابگوترێ هاوڕیێ من hawrê yê min خۆ ئەگەر ژن بوو ئەوا هاورێیا من hawrê ya min ، ئەوەش لەکاتێکدا دەرخستنی رەگەزی نێر یان مێ پێویست بوو، ئەگەر نا هەر بە ی î بمێنێتەوە.

لە کاتی جێنێو (چمیر)ەکەی سێیەمدا، هەر "ئەو ew "بۆ هەردوو (نێرو مێ) بەکاردەهێنرێ، بەڵام ئەگەر کەوتینە دۆخێکەوە کە پێویستیکرد رەگەزی ئەو کەسە پێشانبدرێ ئەوا، "وی wî" بۆ نێرو "وێ wê" بۆ ژن بەکارببرێ وی گوت wî gut، وێ گوت wê gut، لەکاتی خستە پاڵیشدا هەر بەو جۆرە بکەین. بۆ وێنە شتێك (تشتەك) بەسەر(ی ) ئەو هات. ئەگەر پێویستی کرد بزانین ئەو ew نێرە یان مێیە، ئەو کاتە دەتوانین بێژین شتێك ( تشتەك) بەسەر (ی) وی/ وێ هات.

سووککردنێکی دیکەی شێوەزاری باکوور و ناڤین لابردنی پاشگرەکانە، ئەو پاشگرانەی کە بەهۆی ئامرازی پێشگرەوە دێنە کایەو ئەگەر لابرێن، هیچ جۆرە سەر تێکدانێك پەیدا ناکەن. بۆ وێنە: لە هێندەك شێوەزاردا

دەگوترێ: کە گەڕامەوە هەولێر، بەڵام لە شێوەزاری دیکەدا دەگوترێ کە گەڕامەوە هەولێر (ێ). ئەو (ê ێ) یە، ئەگەر لە نووسیندا لا ببرێ لە نرخی ڕێزمان کەمناکاتەوە، بەڵام زمانەکە سووك‌و هاسانتر دەکا. ئەم پاشگرە نا پێویستانە لە شێوەزاری باکووردا یەکجار زۆرن.

زمانی یەکگرتووی کوردی، دەبێ دەمکاتی دوارۆژ (مستقبل) وەربگرێ، وەك لە شێوەزاری باکووردا هەیە. ئەمە بە هیچ جۆرێك نابێ بخرێتە پشتگوێ. زمانێك کە ئەو دەمکاتەی تێدا نەبێ، ناتەواوە، کە گوترا: "دەچم بۆ کەرکووك"، ئەمە دەمکاتی ئێستا دەگەیەنێ، نەك دوایی. بەڵام کە گوتت: (ئەز) دێ بچم بۆ کەرکووك، ئەوە دەمکاتی دوا ڕۆژە. دێ dê خۆی لە دڤێ divê وە هاتووە، کە دڤێ divê دەوێ dewê یە. واتە ئەز دە(مە)و/ڤ ێ بچم بۆ کەرکووك، واتا ئێستە بەڕێوەنیم، بەڵام دەمەوێ (دوایی) بچم بۆ کەرکووك. جاری وا هەیە ئەو دێ d ê یە کورت دەبێتەوە دەبێ بە ێ ê و، بەمە ئاسانتر دەبێ: (ئەز) ێ بچم بۆ کەرکووك.

دەبێ زمانی یەکگرتووی کوردی، لە تێکەڵو پێکەڵیی جێنێوی لکاو، پاکبکرێتەوە کە بە لاتینی agglutination ەو ئەمەشم بۆ یەکەمجار لە "زمانی یەکگرتووی کوردی"دا ڕۆنکردووەتەوە. کە کوردی باکـــــوور دەبێـــــژن: ئەز گرتم ez girtim مانای وایە "ئەز شتێك (یان یەکێکم) گرتووە"، بەڵام لەو شێوەزارەدا بۆ ئەوە بەکاردەبرێ کە "ئەز گیراوم". ئەمەش سەر لێتێکدانی ڕێزمانییە، وەك ئەوەی خەڵکی باشوور دەبێژن "سەری ئێشاندم"، کە ئەمە مانای وایە "ئەز سەری یەکێکم ئێشاندووە"، بەڵام لەو شێوەزارەدا بۆ ئەوە بەکاردەبرێ کە یەکێکی دی سەری منی ئێشاندووە. شێوەزاری گەرمیانی (کەرکووکی)و فەیلی بە ڕاستی بەکاریدەبەن: لەبەر ئەوە ئەگەر یەکێك، تۆی لە شارەکەت دەرکردبوو، مەیەژە "دەریکردم"، بەڵکو بێژە "دەرمی کرد" یان "منی دەرکرد". ئا

لەبەر ئەمەیە کە بایەخدانێکی زانستانە بە هەموو شێوەزارەکان زۆر پێویستە.
کورت و کرمانجی، زمانێکی یەکگرتوو بۆ نووسین و کاری فەرمی شتێک نییە نەکرێ، بەڵام بە مەرجێک: 1-ئەکادیمیاییەکی راستینە بۆ زانست و هونەر لە کوردستاندا دابمەزرێ کە لە سنووری پشتگیریی دەسەڵاتی حکومەتیدا، رێز لە سەربەخۆیی بگیرێ. 2- زمانی کوردی بە هەموو شێوەزارەکانییەوە، لەگەڵ زمانە خزمەکان، بخرێتە ژێر وردەبینی لێکۆڵینەوە، ئەنجامەکانی ئەو لێکۆڵینەوانە بخرێنە بەردەم زانستکارو راستە خەڵکەکەی کوردستان و کوردی دەرەوە. 3- بەکارهێنانی ئەلفوبێی لاتینی بیراز کراو، بێگوێدانە دڵی ئەمو ئەو، لەوانەی پێیانوایە ئەلفوبێی عەرەبی لە ئاسمانەوە هاتووەتە خوارێ، نەک شێوەیەکی دەستکاریکراوی ئەلفوبێی ئارامییە، کە زمانی ئاینیی کۆنی جوولەکەکان بوو. 4- خوێندنی کوردۆلۆژی (نەک تەنێ زمان و ئەدەبیاتی کوردی) کە زمانە کۆنەکانی وەک ئاڤێستا و پەهلەوی و پازەندو پارتی و زانستی زمانەوانی بگرێتەوە، لە زانستەگەکانی کوردستاندا، کە ئێستە ئەوە نییە. 5- دانانی فەرهەنگێکی زمانەوانی کوردی (زمانەوانیی- جوگرافیایی) کە لە پاڵ مانای وشە، یان زاراوەکەدا، شوێنی بەکارهێنانی لە کوردستان، یان دەرەوەی کوردستاندا دەستنیشان بکا. یان ئەگەر دروستکراوە کەینێ و لەلایەن کێوە داهێنراوە، بەکاردەبرێ یان نا. هەروەها وشە بیانییەکان و چاوگەکانیشیان بخاتە بەرچاو.
دیارە، ئەمە کارێکی هاسان نییە، بەڵام دەسەڵاتێکی کوردستانی، کە بتوانێ چەند ملیاردێک دەسکەوت بە سەتان کۆمپانیای ترک بگەیەنێ، لە کاتێکدا کە ئەو رژێمە چاوی بەرایی نەدا، پەساپۆرتێکی عێراقی ببینێ، دوو وشەی کوردی لەسەر بێ، بێگومان دەتوانێ چەند سەت ملیۆنێک

بخاته خزمەتی داهێنانی کوردییەکی فەرمیو دیوانییەوە، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە، ئایا دەیکا؟. ئەز ڕەشبینم، نە گەشبینم. لێ ئاواتی من ئەڤە، کە بە هەڵە چووبم. ئەز، لەلایەن خۆمەوە، بێ هیچ جۆرە چاوەڕوانیو دەسکەوتێکی تایبەتی، ئامادەی بەشداریکردنم لەو کارە خێرەدا، بەڵام تا ماوم هەروەك تا ئێستا، نە تەشی دەڕێسم بۆ کەس و، نە دەبمە داردەستی هیچ دەسەڵاتدارێك.

* وشەی "سامان"م لە جیاتی "دەوڵەت" داناوە. کورد دەبێژین "سەروەت و سامان". "سەروەت" لە "پروە"ی عەرەبییەوە هاتووە. سەروەت لەبنەڕتدا "سەر- وەند" ە. "سەر" کورتەی "سەرمایە"یەو "وەند"یش وێنەیەکی دیکەی خاوەند (خاوەن)ە. کەواتە سەروەند مانای خاوەن سەرمایە. "سامان"یش هەر مانای دەوڵەمەندیو ئەو شتەیە کە مرۆڤ هەیەتی. وشەی ئینگلیزی wealth (سەرنجی وشە کۆمۆن وێلز Common wealth بدە) ئەمەش هەرمانای دەوڵەمەندییە،بەڵام بۆ دەوڵەت State بەکاردەبرێ. هەروەها وشەی (رایش Reich)ی ئەڵمانی هەرمانای دەوڵەت (دەوڵەمەندی)یەو هەر لە هەمان کاتیشدا وەك دەوڵەت بە مانای Stateی ئینگلیزی بەکار دەبرێ.

بەرلین 2006/6/6

**میدیا**، ژ 244، 2006/6/13

# کۆڕی زانیاریو ئەکادیمیای کوردی

مارە (244)ی رۆژی 2006/6/13ی "میدیا"دا، وتارێکم لەژێر نێوی "کوردو
ی زمان"دا بڵاوکردەوەو، زۆر بەکورتی" هێندەك پێشنیازم خستە بەرچاو بۆ
ردنو پێشخستنی زمانی کوردیو، رێخۆشکردن بۆ هاسانکردنو هێنانە
اری ئەوەی ببێتە زمانی زانستو هونەرو، ئاماژەشم بۆ ئەوە کرد، کە دەبێ ئەو
کردنو، وەبەرهێنانە، لەلایەن ئەکادیمیایەکەوە بکرێ کە ئەندامەکانی
ـامەی لێزانی، نەك بە ناسنامەی حیزبایەتیو خزمایەتیو دۆستایەتی، یان
اوکردن بۆ دەسەڵاتداران، بووبنەتە ئەندام.

یانی باسە، "کۆڕی زانیاری کورد"، وەك دەزگەیەکی فەرمی (رەسمی)ی
ـمەتی عێراق، پاش رێککەوتنی 11ی مارتی 1970، لەنێوان رژێمی بەعسو
ردەیەتیی شۆرشی ئەیلوولدا، کە بە "بەیاننامەی ئازار" نێوی ڕۆیوە،
ایەو، مامۆستا ئیحسان شێرزاد کرا بە سەرکردەی "کۆڕ"و، دوای ئەویش،
ەتی مامۆستا مەسعوود محەممەد. پاش هەرەسهێنانی شۆرش بەماوەیەك،
' کرا بە بەشێك لە "المجمع العلمي العراقي"و، هەر بەو شێوەیەش مایەوە، تا
، بەعس لە 2003/4/9دا لەگرێژەنە دەرچوو، لێرەدا، دەبێ بگوترێ، زۆربەی
ی کرابوون بە هاوکارو مووچەخۆری "کۆڕ"، کەسانێك بوون کە بەپێی
لاتی زانستانەیان نەخرابوونە ئەو شوێنە. پاش ئەوەش کە "کۆڕ" بوو بە کلکی
ع العلمي العراقي"، ئەوان هەر لەنێو "کۆڕ"دا مانەوە. بەڵام پاش رووخانی رژێمی
ئێران لەساڵی 1979دا، هەژارو هێمن، کە ئەندامی "کۆڕ" بوون، چوونەوە
و، ئەوەبوو" هەژار، لەئێرانو لەپڕ، فەرهەنگێکی بەنێوی "هەنبانە بۆرینە"وە،
ی خۆیەوە چاپکرد، کە لێرەدا دەبێ بێژم، کە زەحمەتکێشی خودێلێخۆشبوو،
ـتا گیوی موکریانی، کە پەنجا ساڵ پتر خەریکی بەرهەمهێنانی فەرهەنگی
ستان" بوو، ئەو فەرهەنگەی لەسالۆنیوێك زێتر لەلای "کۆڕ" دانابوو، بەهیوای
، چاپیبکەن بۆی، بەڵام نەچاپیانکرد بۆیو، نەداشیانەوە دەستی. خۆ ئەگەر
ای "فەرهەنگەکەی هەژار" بکەینو، نێوی ئەو گوندانە دەرهێنین لێی، کە
ییەکان کاولیانکردووە، هەروەها، وشە فارسییەکانیشی لێجیابکەینەوە،

جیاوازییەکی ئەوتۆی نامێنێ لەگەڵ فەرهەنگی "کوردستان" کە گیوی قوڕبەسەر
پەنجا ساڵ ژیانی خۆی لەگەڵ بردەسەر، ئەز خۆم، بەچاوی خۆم، ئەو فەرهەنگە
لەماڵی مامۆستا گیو لەهەولێر لە پەنجاکاندا دیوە، فەرهەنگێکی گەورەو چڕو پڕبوو
خۆشم هەژارم زۆر لەنێزیکەوە دەناسی و ئاگاشم لەوە نەبووە، کە هەژار خەریکم
فەرهەنگنووسین بووبێ.

ئەمەیان واو، دوای دامەزراندنی "هەرێمی ئاسایش"یش بە چەند ساڵێك، "کۆڕ
زانیاری کوردستان"، لەلایەن سەرکردەکانی پارتییەوە، لەهەولێر هێنرایە کایە. بەڵا
ئەوانەی کە لە بەغدا، ئەندامی "کۆڕی زانیاری"ی پاشکۆی "المجمع العلمي العراقي
بوون، ئامادەنەبوون لەهەولێر هاوکاریی ئەو کۆڕە نوێیە بکەن، تەنانەت مامۆس
مەسعوود محەممەد، کە داواکرا لێی؛ سەرکردەیەتیی کۆڕی نوێ بگرێتە دەست
رازینەبوو، هەر بە پلەو پایەی جارانی بەغدای، بەڵام ئەمجارە، لەژێ
سەرکردەیەتییەکی کوردیدا، ببێتە "سەرکردەی کۆڕ" بەڵکو، دەیویست لەپا
ئەوەدا، پلەی سەرۆکوەزیران بەخۆی و، پلەی وەزیری، بەهاوکارەکانی بدرێ، ئەوە
کە پێنەدرا؛ نەیکرد، بەڵام هاوکارەکانی هەر لەبەغدا مانەوە، تەنێ رەحمەتی مە
شوکر مستەفا نەبێ، ئەویش لەکۆتایی نەوەتەکاندا، واتە، ماوەیەك پێش
کۆچیدوایی، روویکردە هەولێرو خرایە کۆڕی هەولێرەوە، ئەویش، بەداخەوە، کەو
تێچێنیکردن بۆ زانای گەورەی کورد، مامۆستا مەلا جەمیلی رۆژبەیانی کە دەیویس
بکەرێتەوە کوردستان. لەئەنجامی ئەم خراپەکارییەی مەلا شوکردا، پارتی و یەکێت
ئامادە نەبوون بیهێننەوە کوردستان، تا نۆکەرەکانی رژێمی بەعس لەبەغدا؛ بەتەو
لەتوپەتیانکرد.

هەر لەنێو ئەوانەی سەر بە "کۆڕ"ی بەغدا بوون، هی واهەبوو کە بووبو
بەراوێژکاری باوەڕپێکراوی سەددام و، سەددام لەسەردەمی جەنگی هەشت ساڵەی
دژ بە ئێران، پرسیدەکرد پێی و، ئەویش سەددامی، تەنانەت پاش رووخان
سەددامیش، لەوتووێژی تەلەفزیۆنیدا، بە "پیاوێکی ئازاو مەردی مەیدان" دەدا
قەڵەم، هێندێکیشیان بەدانپێدانانی خۆیان لەلای من، وەرگێڕی وتارەکانی سەدد
بوون. شایەتیشم هەیە بۆ ئەمە. هێندەکی دیکەشیان، هەرچەندە لەبەغ

تەجێبوونو، لەوێ دوو مووچەی "کۆڕ"و "وانە گوتنەوە"یان وەردەگرت، کەچی
وون، لەسلێمانی و هەولێریش، بەنێوی "وانەگوتنەوە"وە لەزانستگەی هەولێرو
مانی، پارەی باشیان وەردەگرت و، لەم هاتوچووەشیاندا لەنێوان بەغداو
،ستاندا، ڕژێمی بەعس هیچ "دڵی پیس" نەدەکرد لێیان. ئەوەش دەبێ بخەینە
، ئەم قسانە، کە هێندێکیان، کۆنە زوڕناژەنی ڕژێمی تیرۆریستی سۆڤێت بوون،
ڕژێمە نامرۆڤانەیەی کە دوو جار ئەنفالی لە کوردی سۆڤێت کردو، یارمەتیدەری
وو داگیرکەرانی کوردستان بوو، بەدرێژایی هەشتا ساڵ تەمەنی ڕەشی، هەروەها
نەکەر بوو بۆ ڕژێمی سەددامو، دەیگوت "درۆیە، سەددام چەکی کیمیایی دژی
د بەکار نەهێناوە". بەلام سەیری خۆش ئەوەیە، کە مەسعوود محەممەدێکی
منی کۆمۆنیستی و ئەم مۆسکۆفیچانە، وا یەکیانگرتبوو، موو بەنێوانیاندا
ڕۆی.

ێژای گۆتنە، کاتی خۆی زۆر ڕەخنەم لەکارو کردەوەکانی "کۆڕ" گرت و، تەنانەت
مەکانیشیم خستە ژێر هوردەبینی لێکۆڵینەوەوە. ئەوەشم لە چاکەخوازی و
ۆژییەوە بوو، نەك دژایەتیی ئەمو ئەو، چۆنکە هاتنە کایەی "کۆڕی زانیاریی
ەوانی"، زادەی بیری پەنجا ساڵی پێش ئێستەی خۆم بوو، کە لەپەرتۆکی
ێندەواری بەزمانی کوردی" (بەغدا 1957)و پەرتۆکی "نووسینی کوردی بە
نی" (بەغدا 1957)دا، باسی کۆڕو ئەکادیمیام بەئاشکرا خستووەتە بەرچاو. بەلام
دەستەی کۆڕ، هەر ساتە ناساتێك، شتێکیان لەدژی من، لە گۆڤارەکانی دەزگەی
سدا بلاو دەکردەوە بۆ خۆ بردنەپێشەوە لەرژێمی تیرۆریست و کوردکوژی بەعس.
ڕژێمی بەعس رووخا، لەنێو نامە نهێنییەکانی دەزگەی ئاسایشی بەعسدا، کە
تنە دەست خەڵك، بە ڕۆنی دەرکەوت، کە بەعس منی چەند بەدوژمنی خۆی
ایە قەڵەم. بەلام ئەوڕۆ کە ئەوان، باریان کەوتووە، پێویست ناکا خۆم ماندوو بکەم
نەوە، با هەر خۆیان بەخۆیان بن. لەگەڵ ئەوەشدا، نابێ ڕێبدرێ پێیان، جارەکی
و، ئەمجارە، بەمێچکە مێچکە کردن بۆ دەسەلاتدارانی پارتی و یەکێتی و،
نیەستن بەو کۆنە زوڕناژەنانەی سۆڤێت، کە ئێستە لەنێو ئەم حیزب، یان ئەو

حیزبدا، دەستڕۆیشتوون، جارەکی دی، لرفیلێبدەن و، گاڵتە بەمێشکی جەماوەری کوردستان بکەن.

ئێستە، با بەشێك لەو چەند دێڕەی کە لەبارەی "کۆڕی زانیاریی زمانەوانی"یەوە لە 1957دا، لە نامیلکەی "خوێندەواری بەزمانی کوردی"دا بلأوکراوەتەوە، هەر وەك خۆی بگوێزمەوە ئێرە (ل31-34):

ب-دامەزراندنی کۆڕێکی زانیاریی زمانەوانی:

"..ئێمە، نەك، تەنها پێویستیمان بەدەستەیەك نووسەری بەکارو لێهاتوو هەیە، کە ئەدەبیات و مێژووی نەتەوەکەمان بۆ زیندوو بکەنەوەو بەس، بەڵکو هەر لەو کاتەدا، پێویستیمان بەچەند دڵسۆزێکی تریش هەیە کە هەر یەکەیان لەلقێکی زانیاریدا پسپۆڕێکی شارەزاو، لەزمانی کوردیشدا دەستێکی باڵایان هەبێ، تاکو ئەوانیش، کۆمەڵێك بەناوی (کۆڕی زانیاری- زمانەوانی)یەوە پێکبهێنن. ئەم کۆمەڵە دەبێ ئامانجی ئەوەبێ، ئەو (مصطلحات)ە زانیاری و هونەرییانەی کە لەزمانی کوردیدا نین، وەریانبگێڕێتە سەر کوردی و پەیتا پەیتا هەوڵبدەن بۆ نووسین و وەرگێڕانی کتێبی زانیاری و هونەری، وەك فیزیاو کیمیاو جەبرو ئەندازەو وێنەگەریو.. هتدو، واچاکترە ئەو کۆمەڵە گۆڤارێکی زانیاری بەناوی خۆیانەوە دەربکەن..هتد".

ئەمە، بەڵگەیەکی بنجبڕو مستەکۆڵەیەکی ددانشکێنە بۆ ئەوانەی پێیانوایە کەبیرۆکەی کۆڕ لەوانەوە داهاتووە. ئەو رۆژانەی کەئەز خەریکی دامەزراندنی بنچینەیەکی زانستانەی پتەوو فراوان بووم بۆ خزمەتکردنی زمان و کولتووری کورد، ئەوانە گاڵتەیان بەزمانی کوردی دەکرد، بەڵام چیبکەین لەگەڵ ئەوانەی، کەنەك هەر بیرۆکەی "کۆڕ" بەتەنێ، بەڵکو هەموو خاکی کوردستان و هەر چییەکی لەسەرەو، هەرچییەکی لەژێردایەو، هەرچییەك بەئاسمانەکەیدا دەفڕێ و، بەنێو رۆبارەکانیدا دەگەڕێ، بەهی خۆیانی دەزانن، دەیبەن و دەیخۆن و دەیفرۆشن و دەیبەخشن.

دیارە، ئەم بیرۆکەیەی سەرەوە، هی تەمەنی 22 ساڵیەو، بەپێی زانیاری (معرفة) و سنووری تێگەیشتنی ئەو سەردەمەم نووسیومە، کاتێك وشەی "زانیاری"م، کە "معرفة" دەگرێتەوە، لەجیاتی زانست (علم) داناوە، راستییەکەی "زانست" وێنەیەکی دیکەی "زانشت"ە، وەك سروشت و رەوشت و خۆرشت و بڕشت. دەنگی س و ش،

جار، جێیەك دەگرنەوە، هەر بۆ وێنە سەرنجی وشەی "سووتاندن" و
موتاندن"بدە. "زانست" لەباتی "زانشت" بۆ یەکەمجار، لەلایەن خودێلێخۆشبوو،
ممەد باشەگەوە (کە لەبەغدا عەرەبەکان کردبوویان بە محەممەد باشقە) داهێنراوە.
ە باشەگە، کوردێکی فەیلی رۆشنبیرو نیشتمانپەروەر بوو، لەکۆتایی جەنگی
ەمدا لەگەڵ مێجەرسۆن، هاوکاریکردبوو بۆ نووسینەوەی پەرتۆکی خوێندنەوەی
دی و، لەپەنجاکاندا لەبەغدا، لەوەزارەتی نێوخۆ کاریدەکرد، وەك شارەزا بۆ
اردان لەبارەی پەرتۆکی کوردییەوە، کەئایا رێبدرێ بە چاپکردنی یان نا. جاروبار
اتە دوکانی ئوستاد (بەشیر موشیر). رەوانی شادبێ. پێویستە ئەوەش بێژم کە
ێلکەی "خوێندەواری بەزمانی کوردی"، 30 ساڵ دوای بڵاوبوونەوەی چاپی
ەمی، جارەکی دی لەسوێد لەساڵی 1986دا چاپکرایەوە، بەپێشەکییەکی نوێوەو،
ەمام، ئەگەر مام، جارەکی دیش چاپبکرێتەوە، لەتوێی زنجیرەی "کۆبەرهەم"دا.
ومان، مەبەستی من لە "کۆڕی زانیاری"، ئەکادیمیایەك بوو بۆ "زانست و هونەر".
ر ئەوە، لەسەفەرەکانمدا بۆ سووریاو لوبنان (1956) و ئێران (1957)، چاوم
ەند کوردیزانێکی ئەو شوێنانەو ئەو سەردەمە کەوت، لەوانە، ئایەتوللا محەممەد
دۆخی کوردستانی لەسنەو، فاتحەلی حەیدەری زێوا جۆیی لەکرماشان و رەوشەن
رخان و قەدریجان و ئەحمەد نامی و عوسمان سەبری لەدیمەشق و، لەهەموویان
لەگەڵ رەحمەتی عوسمان سەبری، باسی ئەکادیمیامکردو بەهەردووکمان، لەم
یەوە، هێندەك پێشنیازمان کرد کە لە "نووسینی کوردی بەلاتینی" (بەغدا
19)دا (ل.ە-و) بڵاوکراوەتەوە. لەوێدا هاتووە: "... بۆ ئەم ئامانجە، هاوینی
دوو کە بەشاما تێپەڕ بووم بۆ لوبنان، بەخزمەت زاناو شاعیری نیشتمانپەروەری
ەوەی کورد، جەنابی عوسمان سەبری گەیشتم و، بەدوورو درێژی ئەم باسەم
ەڵ کردەوە. مامۆستای ناوبراو، بەر لەهەموو شتێك هەستێکی پیرۆزی نیشان دا
امبەر زمانی کوردی و فەرمووی: "ئێمە زۆر پێویستیمان بەئەکادیمیایەك (کۆڕی
یاری) هەیە بۆ پاراستن و پێشخستنی زمانەکەمان و... هتد". چەند لاپەڕەیەکیش
ی ئەوە، قسەکانی عوسمان سەبریم بەدەستنووسی خۆیو بەزینکۆگراف
کردووەتەوە، کە لەپاڵ ئیمزاکەیەوە، رۆژی 1956/8/20ی تۆمارکردووە، واتا،

پەنجا ساڵ لەمەوبەرو، ئەوڕۆ کە 2006/8/20ەو، ئەم نووسینە دەنووسم، پێشکێشدەکەم بەرەوانی شادی عوسمان سەبری، ئەو مرۆڤە مەردە سەربەرزە خۆ نەفرۆشە خەباتکارە، کەئازایانە، بەرامبەر کۆلۆنیالیزمی فەرەنساو کۆلۆنیالیزمی عەرەب و هەلپەرستو چڵکاو خۆرە کوردەکانیان راستبووەوەو، لەش و پێنووسی خۆی خستە خزمەتی خەڵکەوە.

عوسمان سەبری، لەوێدا، بەئەلفوبێی کوردیی لاتینی، ئەمەی خوارەوەی نووسیوە: "ژ بەر کو، ئەم کورد، حۆجەی ئەلفبایەکە یەکتانەو، ژمەرا ئەکادێمییەك نینە، کو ڤێ کێمیاهان، راکە، دەما، مامۆستا جەمال نەبەز، ژ من خوەست کو ئەم بهەڤ رابنگەهێ ئەلفبایەکە یەکتا دانین، تەڤی بەرپرسیارییا زانستی، من خوە ژێ نەدا پاش.. هتد".

هەر لەو ساڵەشەوە، هەوڵمدا، نووسینی کوردی بەئەلفوبێی لاتینی، لەباشووری کوردستاندا بخەمە برەو. لەسلێمانی، بەهاوینان، وانەی تایبەتیم بەخەڵك دەگوتەوەو، لەکەرکووك و هەولێریش قوتابییەکانم فێری ئەو ئەلفوبێیە دەکرد. لەبیرمە، خودێلێخۆشبوان، عەلی عەسکەری و جەبار جەباری لەکەرکووك (1956-1957) دوو قوتابی زۆر چالاك و بەپەرۆشبوون لەم رووەوە. لەهەولێریش، پاش ئەوەی لەگەڵ مامۆستا مەلا عەبدولحەمید ئیسماعیل، یادی بەخێر بێ، لیژنەی پێشخستن و خزمەتی زمان و وێژەی کوردییمان لەقوتابخانەی دوانێوەندیی هەولێر دامەزراند (1960-1961)، مومتاز حەیدەری، یەکێك بوو لەو قوتابیانەی کەزۆر هەوڵیدەدا زانیاریی خۆی لەبارەی زمان و وێژەی کوردییەوە بەهێز بکا. مامۆستایان مەجید ئاسنگەرو بورهان بەرزنجی و عومەر ساقی و حسەین رەشوانیش، یادیان بەخێر بێ، پشتیوانیاندەکرد.

وەك لەمەوبەر، لەوتاری نێوبراوی "کوردو کێشەی زمان"دا باسمکردووە، لەنێوەراستی ساڵی 1985دا، واتە بیستویەك ساڵ لەمەوبەر، ئێمە، چەند زانستەکارێك لەئەورووپا، بنیاتی ئەکادیمیایەکمان دانا بەنێوی "ئەکادیمیای کوردی بۆ زانست و هونەر"، بەڵام نەك هەر بۆ زمان، بەڵکو بۆ هەموو بەشەکانی زانست و هونەر. چۆنکە ئەکادیمیا هەیە، تەنێ سەر بەیەك بابەتە، ئێمە ویستمان گشتی بێ، وەك ئەکادیمیا بەنێوبانگەکانی جیهان (بۆ شارەزایی خوێنەرەوە، دەقی بەرنامەو

مەی "ئەکادیمیای کوردی بۆ زانست و هۆنەر" بەزمانی کوردی لەژمارەی
ووی "میدیا" بلاْودەکرێتەوە)، ئەوەبوو، هەر لەو وتارەدا، باسی ئەوەشم کرد،
ن حیزبحزێنە کەرەکان و دوکاندارانی رامیاری (سیاسەت) کەوتنە دژمان،
ە پێیانوابوو، ئەمە بازرگانییەکی مشەیە، بەلاْم کە بۆیان دەرکەوت، نەخێر،
و بوون و بەختکردنی پارەو کات و وزەیەو، ئەوەش نە ئامانجی وانەو، نەکەری
بارەشن، ئەوجا، وەك بەفرەکەی پار توانەوەو، ئەوەبوو پاش ئەوەی دوکتۆر
ق قەزاز، بۆ ماوەی چوار ساڵ کرا بەسەرکردەی "کۆڕ" لەهەولێر، ئەویش
ی بەڵێنێکی داپێم لەبارەی چاکسازیی کۆڕەوە، نەیبردەسەر. ئێستەش،
نێك هەن، کەهێندێکیان، لەکۆنە یاساوڵەکانی کۆڕی بەغدان، کەهەتا ئەوڕۆش
ەوێن، مەگەر لەترسی کوشتن و بڕین لەوێ نەمابن، ئەمانە دەیانەوێ رێککەوتنی
و یەکێتی بکەنە بیانوو و، دەڵێن، کۆڕی هەولێر "یەکێتی" تێدا نییە، وەك
ی کۆڕی زانیاری "بەرەی نیشتمانی"، یان، پەرلەمانێك بێ و، دەبێ نوێنەری
و حیزبەکانی تێدابێ، کەدیارە، زانست لەسەر ئەو بنچینەیە دانامەزرێ و، بێجگە
ش، لەکۆڕی زانیاری هەولێریشدا ئەندامی سەر بەیەکێتی تێدا هەیەو، ئەو
ی هەولێر، بەقانوون دامەزراووە، لەلایەن پەرلەمانی هەردوو حیزبەکەوە، کەئەوە،
اری حکوومەت، یان هەر دەسەلاْتدارێك هەڵناوەشێتەوە، ئەگەنا، قانوون دەبێتە
تە قولێی مندالاْن. بەلاْم دەکرێ و دەبێ کۆڕ فراوان بکرێ و، نێوی کۆڕی زانیاریی
ستان" بگۆڕدرێ "بەئەکادیمیای کوردی بۆ زانست و هونەر"، ئەوەش بەبڕیاری
کەسانەی کە ئەندامی کۆڕن و، ئەوجا سووت لەبەرنامەو کارنامەی "ئەکادێمیای
ی بۆ زانست و هونەر" کە لەسوێد دامەزراوە وەربگرن و، هەوڵبدەن زانایانی
ی پارچەکانی دیکەی کوردستان و ئەورووپاو ئەمریکا، وەك ئەندامی پەیامنێر
گیرێن و، بەهیچ جۆرێ نابێ رێبدرێ بەوانەی هاوکاری رژێمی بەعسی بوون،
نە نێو ئەکادێمیاوە. خۆزگە، کاربەدەستانی کورد، چارەنووسی ئەم "کۆڕ"ەشیان
کرد بەچارەنووسی "قوربانییانی ئەنفال" و "گەلکوژی لەکورد". ئەوەتا سبەینێ
21ی ئابەو یەکەمین رۆژی "دادگاییکردنی کێشەی ئەنفال"ە، لەباتی ئەوەی
ەتی عێراق، بدەنە دەست دادگەیەکی نێونەتەوەیی، دەچن نوێنەرەکانی ئەو

دەوڵەتە، کە سەددام یەکێکە لەهەزارانیان، دەخەنە بەر دادگەیەکی دەوڵەتی عێرا
خۆی، ئەو دەوڵەتەی کە لەڕێی نوێنەرەکانییەوە گەلکوژی لەکورد کردووە، ئەگەر
سەددام، بەهێزی خۆی و خزمەکانی و حیزبەکەی، ئەوەی لەکورد نەکردووە، بەڵ
بەهێزی دەوڵەتی عێراق و لەشکری عێراق و پۆلیسی عێراق و ئاسایشی عێراق
دیپلۆماسیێتیی عێراق و دارایی عێراق، ئەوەی لەکورد کردووە. جا ئەگەر، سەددام
شەشمەکەی دی، ملیان بکرێ بەپەتدا، ئەوە تۆڵەو نرخی ئەو گەلکوژییە نییە
لەکورد کراوە. هەر گەلێکی بێ دەوڵەتی دیکە، ئەوەی لێبقەومایە، ئەوڕۆ لەجیات
ئەوە، دەوڵەتێکی بۆ خۆی بنیاتدەنا.

بەرلین 2006/8/20

**میدیا**، ژ 255، 2006/8/29

# اریکی نەرویج (خەڵاتی یەکسانی) بەکچێکی کورد دەبەخشێ

"شیلان شۆرش، وەك شمشێرێکی هەڵکێشراو،

بەرووی چەوساندنەوەی ژناندا"

ئەگەر سەرنجێکی ژیانی ژنانی ئەم جیهانە بدەین، دەبینین ژن لەنێو هەموو نەتەوەو
ەل و ولاتێکدا، بەشێوەیەك لەشێوەکان، بەشخوراوە، بەلام رادەو جۆری ئەم
شخوراوییە، بەپێی بارودۆخی ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و ئاینی و، چەشنی
رکردنەوەی خەڵکەکەی و، نەریت و قانوونی ئەو شوێن و سەردەمە دەگۆڕێ، کەژن
ێدا ژیاوەو دەژی. بۆ وێنە "ئەگەر لەکوردستان، لەم سالانەی دواییدا، لەساڵێکدا
50 ژن لەلایەن کەسوکاریانەوە کوژرابن، یان بەئاگری پرێمز خۆکوژییان کردبێ، یان
ووتێندرابن، سایان لەسەر خۆشەویستیی "رێبەندکراو" (ممنوع)، یان کردەوەی
ێکسی نائاینی، یان دژایەتیکردنی بەشوودانی بەزۆر، ئەوا، لەولاتێکی وەك
ڵمانیادا، لەساڵێکدا، سەتان ژن، لەلایەن پیاوانەوە، سا، یان لەبەر دڵپیسیی پیاوان،
لامار دەدرێن، یان دەستدرێژیی سێکسی دەکرێتە سەریان و، هێندەك لەو ژنانەش،
و بوارانەدا، لەلایەن دەستدرێژکەرانەوە دەکوژرێن. رۆژنامەکانی ئەورووپاش پڕن لەو
ەنگوباسانە. بەلام ئەوە هەیە، ئەمان ئەو کردەوانەی خەڵکەکەی خۆیان، ناکەن
هەرا، وەك ئەوەی کە پیاوێکی کورد، ژنەکەی، یان خوشکەکەی خۆی لەئەورووپا
ەکوژێ. هۆی ئەمەش، بەزۆری، لەبەر ئەوەیە، کەژن لەئەورووپا، لەسەر کاری
ێکسیی ئازادانە، ناکوژرێ، چۆنکە سێکس لەولاتە ئەورووپاییەکاندا ئازادەو، بەپێی
نوون و نەریتی کۆمەڵگە، سزای لەسەر نییە. ئەمە لەکاتێکدا، کە پەلاماردانی ژنان،
ن زۆرکردن لێیان بۆ کاری سێکسی، یان کچ بەشوودان بەنابەدڵیی خۆی، سزای
ەختی لەسەرە. لێرە، کە ژنێك، یان کچێك، دەستدرێژیی سێکسی دەکرێتە سەری،
وا، لەلایەن کەسوکاریەوە، ناکوژرێ، لەبەرئەوەی گوایە"ئاوڕووی تکاوە"،
ن"بێبنکراوە"، بەڵکو لەلایەن کەسوکارو کۆمەڵگەوە، بە زۆرلێکراو دەدرێتە قەڵەم و،
ەبرێتە لای دوکتۆری رەوانناسی و، خزمەتی دەکرێ و، هەوڵدەدرێ کارکردو تەزووی
و تاوانە سووکبکرێ لەسەر گیانی. لەگەڵ ئەمەشدا، ژن، لەکۆمەڵگەی رۆژئاواییدا،
گەلێك رووەوە، بەشخوراوە، بەتایبەتی، لەباری ئابوورییەوە (بۆ وێنە، ئەو پارەیەی

کەژن بۆ ڕاپەڕاندنی هێندەك کار وەریدەگرێ، کەمترە لەو پارەیەی کەپیاو وەریدەگرێ، هەر بۆ ئەو کارە) هەروەها، لەبارەی دەسەلاتەوە (بۆ وێنە: ژمارەی ئەو پیاوانەی پلەو پایەی دەسەلاتیان پێدەدرێ، بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی ژنان بۆ ئەو پلەو پایانە، یەکجار کەمە). بێجگە لەوەش، ژن لەئەوروپا، کە بەتەنێ دەمێنێ، ڕەوشی ژیانی یەکجار خراپ دەبێ و، هەست بەبێکەسی دەکا، چۆنکە شێرازەی پێوەندارێتیی بنەماڵەیی و خزمایەتی، هێندە بەهێز نییە وەك لەڕۆژهەلات.

ئێستە، ئەگەر سەرنجێکی مێژوویی، تەنانەت سەرپێییش، بگرینە شوێنی ژن لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا، دەبینین ژن هەر زۆرلێکراو و چەوساوە بووە، بۆ وێنە: کەهۆزێك لەشەڕدا بەسەر هۆزێکی دیکەدا زاڵبووبێ، هۆزی زاڵبوو، یەکسەر پەلاماری ژنانی هۆزی ژێرکەوتوویان داوە، ئەگەرچی، ئەو ژنانە لەشەڕیشدا بەشدار نەبوون. کە دەولەتێکی ملهوڕیش، نیشتمانی دەولەتێکی بێهێزی داگیر کردبێ، یەکسەر، سەربازەکانیان، پەلاماری ژنانی ولاتی داگیرکراویان داوە. با، دوور نەڕۆین، دەستدرێژیکردنە سەر ژنانی کورد، لەلایەن ڕژێمی عەرەبیی عێراقەوە، لەکاتی ئەنفالداو، فرۆشتنیان بەڕژێمی عەرەبی میسرو عەرەبی کەنداو، نموونەیەکی گچکەی ئەوەیە.

نموونەیەکی دیکەی سادەو زیندووی ڕۆژانەش ئەوەیە، کاتێك کە پیاوانی گەلانی ڕۆژهەلات، با، سالانی سالێش لەئەوروپا ژیابن، کە لەیەکێك تووڕەبن، دەستبەجێ دەستدەکەن بەباسی ئامرازی سێکسی خوشك، یان ژنی ئەو کەسە، ئەگەرچی، ئەو ژن و خوشکە، نەلەوێ ئامادەن و، نەئاگاشیان لەناکۆکیی ئەوانە هەیە. ئەمە، ئەوە دەگەیێنێ، کە سووکایەتیکردن بەژن، بەشێکە لەڕەوشت و خوو و جۆری بیرکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لەگەلانی جیهان، کەئادەمیزاد، هەروا بەهاسانی ڕزگارینابێ لێی. ئەم سووکایەتیکردنەش، لەپاڵ ڕشتنی خوێنی ژناندا، بەتایبەتی، لەکوردستان، لەم سالانەی دواییدا، یەکجار پەرەی سەندووە، کەدیارە، کارکردی ڕژێمی شیعەگەرێتیی ئێران، کەچوارچێوەیەکە بۆ شۆڤێنیزمی [illegible]ایەتیی فارس، دژ بەکوردو گەلانی ژێر دەستی ئێران، ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبووەو هەیە لەم تاوانانەدا. ئەوجا، وەنەبێ هەر ئاین بکرێ بە بەڵگە بۆ کەنەفتکردنی ژن، بەڵکو شان بەشانی

ئەوەش، بەڵگەی واسەیر سەیر دەمێنرێتەوە، کەمرۆڤ سەری سووڕ دەمێنێ. بۆ وێنە: جارێکیان لەکۆبوونەوەیەکی فارسەکاندا ئامادە بووم، کە لەبارەی مافی ژنەوە قسە دەکرا، فارسێکی ریشنی ڕەزاگران، بەسمێڵێکەوە کە لەپەتی شەڕەسەگ دەچوو، ڕوویکردە من و گوتی: ژن و پیاو چۆن جیاوازییان نییە؟ گوتم: نابێژم جیاوازییان نییە. دیارە، لەبارەی نێرێتی و مێیێتییەوە هەیانە، بەڵام دەبێژم لەئازادیدا دەبێ یەکسان بن. گوتی: جیاوازیی نێوانیان ڕێ بەو یەکسانییە نادا". گوتم کام جیاوازی؟، گوتی"زۆر شت". گوتم: وەك چی؟ گوتی: "باشە، ژن دەتوانێ بەپێوە میزبکا"؟ گوتم:" ڕاستدەکەیت. شانازییە بۆ سەگ و کەر کەبەراوەستانەوە میز دەکەن، نەك بەچیچکانەوە".

شایانی باسە، لەم 20-30 ساڵەی دواییدا، سا یان لەئەنجامی زۆرداریی داگیرکەرانی کوردستان، یان، لەئەنجامی هەژاری‌و بێکاری، یان لەئەنجامی نەبوونی هیچ جۆرە ئازادییەك، یان لەئەنجامی چاولێکەرییەوە، جەماوەرێکی فرە، لەژن و پیاوی کورد، ڕەڤیانە دەرەوەی وڵات و، بەتایبەتی ئەورووپا. پرانیی ژنان و کچان، لەگەڵ خێزانەکانیان هاتن و، کەمەیەکی کەمیش بەتەنێ. هەر لەئەورووپاش، گەلێك کچ لەدایکبوون و، چوونە بەر خوێندن و کارکردن و، تێکەڵبوونیان لەگەڵ کۆمەڵگەو کولتووری ڕۆژاوایی، گەلێك کێشەی لەنێوان هێندەك لەو ژن و کچانە، لەگەڵ مێردو کەسوکارەکانیان، هێنایە کایە، هەتا وایلێهات، هێندەك لەو کچانە، بەدەستی باوك و براکانیان کوژران و، ئەم تاوانانەش بوونە بابەتی باسی ڕۆژانەی دەزگەکانی ڕاگەیاندنی گشتی بۆ پەلاماردانی کورد،تاکار گەیشتە ئەوەی کەکێشەی کوشتنی ژن "لەسەر شەرەف"، بکرێتە کوتەکێك بەدەست دوژمنانی کوردەوەو "ژنکوژی" بکەنە "بەشێك لەکولتووری کورد". ئەمە لەکاتێکدا کەرۆژنامەکانی ئەورووپا پڕن لەباسی دەستدرێژیکردنە سەر ژنان و، ئەوەتا، ژن لەئێران و عەرەبستانی سعوودی، بەرد باران دەکرێن، یان، ملیان دەکرێ بەپەتدا لەسەر سووکە پێوەندییەکی سێکسی. لێرەدا، ئەو پرسیارە دێتە گۆڕێ. باشە، ئەگەر، لەباکوورو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای کوردستان، کورد هیچ دەزگەیەکی خۆیی نییەو گیان و سەرو ماڵی بەدەست ترك و فارس و عەرەبەوەیە، ئەی خۆ ئەمە پانزدە ساڵە لەبەشێکی باشووری کوردستاندا،

حکوومەتێکی کوردستانیی خۆیی هەیە، بۆچی نەماندی ڕێ‌و شوێنێك دابنێ بۆ بەربەرەکانێی ژنکوژی‌و سزادانی ئەوانەی کەکچ بەزۆر بەشوو دەدەن و دەستدرێژی دەکەنە سەر ژیان و لەش و گیانی ژنان، یان، هیچ نەبێ، سنوورێك بۆ ئەوانە دابنێن کەپیاوان لەدژی ژنان هاندەدەن، بە بەڵگەی کۆنە پەرستانەی بێوەجانە؟

لە هەمووش ناخۆشتر ئەوەیە، کەژمارەی ئەو ژنە کوردە هۆشیارە ڕۆشنبیرانەی کە لەئەوروپا دەژین و هەست بەکەنەفتیی ژنان دەکەن و بەر بەرەکانێی ئەو ڕەوشە ناهەموارە دەکەن، یەکجار کەمە. چۆنکە زۆربەی زۆری ژنان، یان هەر خەریکی کاروباری ماڵەوەن، یان لەگەڵ ئەو حیزبانە هاودەنگن کەمێردەکانیان نێزیکن لێیانەوە، یان، هێندە بەرچاو تەنگن بەرامبەر بە یەك، هیچ هاوکارییەك لەنێوانیاندا دروست نابێ. بەداخەوە، بەدەگمەن هەڵدەکەوێ، کچێك یان ژنێك، بەشێوەیەکی سەربەخۆ، چاکی کردبێ بەلاداو کەوتبێتە خزمەتی کێشەی ژنان، کە بەر لەهەمووشتێك کێشەی ئازادی‌و یەکسانییە.

یەکێك لەو کچە ئازاو بەجەرگ و تاکهەڵکەوتووانەی، سەرەرای هەموو کۆسپ و بەرهەڵست و هەڕەشەو گوڕەشەیەکی مێشکپووتان، گۆی هونەری لەم مەیدانەدا بردووەتەوە، شیلان شۆرشە کە ئەمساڵ لەرۆژی جیهانیی ژناندا بەرزترین خەلاّتی نەرویّجی وەرگرت، وەك پاداشتێکی ئەو خزمەتە گەورانەی کەبۆ ژنی کوردو ژنی بیانی کردووە، ئەوەش "خەلاّتی یەکسانییە" کەیەکێکە لەو خەلاّتە بەرزانەی لەنەرویّج دەدرێ بەکەسانی هەڵکەوتوو.

بەپێی رۆژنامەکانی نەرویّج(*)، لەو رۆژەدا لەشاری بێرگن Bergen، سەتان کەس کۆبووبوونەوە. جێگری پارێزگاری بێرگن، خانمی مۆنیکا مێلان، "خەلاّتی مافی یەکسانی"ی پێشکێشی شیلان شۆرش کرد. هەر بەپێی هەواڵی رۆژنامەکان، شیلان لەو کاتەدا بەدەم فرمێسکی خۆشییەوە گوتی: "هیوام وایە گەلێك ژنی دیکەی کورد بێنە مەیدان و، هەر لەماڵ نەمێننەوەو کاری دەرەوە بکەن و، لەباری ئابوورییەوە خۆیان سەربەخۆکەن". رۆژنامەی BT لە 2006/3/8دا دەنووسێ ..شیلان، بەدەم چەپڵەی خەڵکەوە دەبێژێ "ژیان لەنەرویّج بۆ ژنی بێگانە زەحمەتە، بەلاّم هیوا هەیە.. شایانی باسە، ئەم خەلاّتە دەدرێ یان بەتاکەکەس، یان بەرێکخراوو کۆمەڵە. شیلان

ئەمساڵ ئەو خەڵاتەی وەرگرت بەرامبەر ئەو هەموو خزمەتەی کەبۆ ژن کردوویەتی.
کریستینە رۆوە Kjerstine Roe سەرۆکی هەڵبژێردراوی دەزگەی مافی یەکسانی
دەبێژێ: گەلێك پێشنیازمان بۆ هات کەخەڵاتەکە بدەین بەکەسی دیکە، کەکاری
چاکیان کردووە. بەڵام شیلان کاری بەنرخی کردووە، بۆیە خەڵاتەکەمان داپێی".
چەند رۆژنامەیەکی نەرویجی ئەم هەواڵەیان بلاو کردووەتەوە. (سەرنجی رۆژنامەی
BT رۆژی 2006/3/8 بدە). شیلان رەشید ئەحمەد، کە لەدەزگەی راگەیاندنی
گشتیی نەرویجدا، بەشیلان شۆرش ناسراوە، لەسلێمانی لەگەڕەکی شێخ محێدین
لەدایکبووە. هەر لەچوار ساڵییەوە چووەتە قوتابخانە. لەقوتابخانەی سەرەتایی
"رازاوەی تێکەلاو" و نێوەندیی "ڤیانی کچان" لەگەڕەکی مەجیدبەگ خوێندوویەتی.
لەبەر کێشەی رامیاری نەیتوانیوە قوتابخانەی دوانێوەندی لەکوردستان تەواو بکا.
لەساڵی 1993دا بووە بەئەندامی پارتی کۆمۆنیستی کوردستان هەتا مانگی 10ی
1995، ئەوجا وازی لەم حیزبە هێناوەو، وەك خۆی دەبێژێ، لەبەر ئەوەی بیروڕای
جیاوازی هەبووە لەگەڵ رێبازی ئەم حیزبە. بەڵام لەو ماوەیەدا کەئەندام بووە، شەست
ئەندامی بۆ ئەو حیزبە پەیدا کردووە. لەساڵی 1998دا بۆ ماوەیەك لەگەڵ کوردانی
باکوور هاوکاریکردووە، بەڵام وازی لەوانیش هێناوە، لەبەر جیاوازی بیروبۆچوون.
لەمانگی تەمووزی 1998دا لەکوردستان هەڵهاتووە بۆ نەرویج و، لەوێ قوتابخانەی
دوانێوەندی تەواو کردووەو لەزانستگە دەستیکردووە بەخوێندن. زمانی نەرویجی
زۆر بەباشی فێربووەو، تێکەڵ بەسیاسەتی وڵاتی نەرویج بووەو، لەساڵی 2002دا
چووەتە بەرەی یەککگرتووی سۆری نەرویج"ەوە، کەحیزبێکی سۆسیالیستی
نەرویجییەو، لەو حیزبەدا دوو ساڵ بەرپرسیاری کاروباری ژنان بووە لەشاری بێرگن.
هەر لەساڵی 2002دا بووە بەئەندام لەرێکخراوی "یارمەتیی خەڵکی نەرویج NPA"
کەئەمە کۆمەڵەیەکی خێرخوازییە. بێجگە لەوەش ئەندامی ئەمنستی ئینتەرناشنال و
رێکخراوی ژنانی نەرویجە.

شیلان لەنەرویج بەشێوەیەکی شێلگیر خەریکی خزمەتکردنی ژنی کوردو ژنانی
بێگانە بووە. لەبارەی زمانەوە، وەك وەرگێڕ لەخزمەتیاندا بووەو لە 2001دا، لەدژی
"کوشتنی ژن بۆ کرینەوەی ئاوڕوو" وتاری لەرۆژنامەکانی نەرویج دا

بلاوکردووەتەوە. چەند جار پارەی بۆ ڕێکخراوی NPA کۆکردووەتەوە کەئەم ڕێکخراوە لەکوردستانیش لقی هەیەو کار دەکاو، پارەکەی ناردووە بۆیان. هەروەها یارمەتی بۆ ڕێکخراوی "ئاسوودە"ش ناردووە کە لەسلێمانی بۆ پارێزگاریی لەژنان تێدەکۆشێ. لەگەلێك ڕێپێواندا، لەدژی پەلاماری ڕژێمی ترك بۆ سەر کوردستان و بۆ مافی پەنابەران لەنەرویج و بۆ پاراستنی زمانی دایك و دژ بەپێشێلکردنی مافی ژن و دژ بە داخستنی کەمپی پەنابەران و، لەساڵیادی کیمیابارانی هەڵەبجەو، گەلێك بۆنەی دیکەدا چالاکی نواندووە. چەندان سەمیناری ڕێکخستووە لەبارەی مافی ژنان و دژ بەزۆر بەشوودانی کچان و بۆ بڕینەوەی مافی خانەنشینی بۆ ژنان و، هەوڵدان بۆ گۆڕینی قانوونی نەرویج لەم بارەیەوەو، گەلێك وتاریشی لەبارەی مافی ژنانەوە لەرۆژنامەکانی نەرویجدا نووسیوە. هەر لەم بوارەشدا، یارمەتیی ژنانی تەنیا و بێکەسی داوە، لەوانەی کە لەبەر زۆرداریی مێردەکانیان لێیان جیابوونەتەوەو، بێ پەنا ماونەتەوە، شیلان ئەمانەی بردووە بۆ سەنتەری پاراستنی ژنان کە بە "کریسیە سەنتەر"Bergen krisesenter بەنێوبانگە. هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەکچانی کوردی پاراستووە کە تەمەنیان لەنێوان 15-20 ساڵیدا بووەو، کەسوکاریان ویستوویانە بەزۆر بیاندەن بەشوو. بێجگە لەمەش، لەکێشەی دادگەیی 70 پەنابەردا کەمافی مانەوە (إقامة)یان نەبووە، کاریکردووەو بردوونی بۆ لای رۆژنامەوانان، بۆئەوەی لەسەر باسەکەیان بنووسن و، پارەی بۆ پارێزەرەکان (محامی) کۆکردووەتەوە، تا بەرگریبکەن بۆ ئەو پەنابەرانە. یەکێك لەو کێشانەی کەنێزیکەی 20 جار لەرۆژنامەدا باسکراوە، مانگرتنی ژن و پیاوێکی ئێرانی بوو، کەدوو مانگ مانیان لەنانخواردن گرت. شیلان ئەو دوو مانگە رۆژی 8 دەمژمێر بەخۆڕایی کاریدەکرد بۆیان. هەر لەئەنجامی ئەم هەوڵ و تەقەلایەوە، 3 ژن کە دەبوو ڕەوانەی وڵاتی خۆیان بکرێنەوەو ژیانیان لەمەترسیدا بوو، مافی مانەوە دراپێیان و، ئێستەش شیلان کار دەکا بۆ گەیشتن بەمافی ئەوانی دیکە. لەبارەی منداڵیشەوە، شیلان خزمەتی هەیە، خانووی بۆ گەلێك منداڵ گرتووە کە لەزەورو زۆنگی باوك و دایکیان ڕایانکردووەو، هەوڵیشی داوە بیانخاتە قوتابخانەو پارێزەری گرتووە بۆیان. کۆرسی

ێزش و مەلەی خۆڕایی بۆ ژنان وەدەستهێناوە. شیلان، لەپاڵ ئەم هەموو کارە
ڕخانەشدا، ئەندامێکی چالاکی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستانە.
ەم چالاکیانەی شیلان، سەرەنجی دەزگەی ڕاگەیاندنی گشتی لەنەرویج بۆ خۆی
ێشاوە. هەتا ئێستە پتر لە 155 جار لە وتووێژی ڕادیۆیی و تەلەفیزیۆنی و
ژنامەییدا بەشداریکردووە. وەك ڕۆژنامەی ڕۆژاوای شاری بیرگن Bergen BY
A لە وتووێژیکدا لەگەڵ شیلان دەبێژێ "شیلان وەرگێڕو سەرۆکی ڕێکخراوی
ۆکرات و سەربەخۆی ژنانی کوردە لەهۆرەلاند لەنەرویج". بەبۆنەی وەرگرتنی
ڵاتی مافی یەکسانییەوە کە لەلایەن کۆمۆنی بیرگنەوە دراوە پێی، ڕۆژنامەی
Bergen BY A نەرویجی لە 2006/4/30دا وتوێژێکی لەگەڵ شیلان کردووەو
ووسی" شیلان شۆڕشگێڕانە لەدایکبووەو لەوڵاتی خۆی خەباتیکردووە دژی ئەو
، نالەبارەی کە لەوێ بووەو، ئێستەش لەنەرویج شەڕو تێکۆشانی لەپێناوی مافی
ی بێگانەدا خستووەتە سەرشانی خۆی". کەرۆژنامەوان لێیدەپرسێ: "ئەم خەڵاتە
، دەگەیێنێ لای تۆ؟ شیلان دەبێژێ: "ئەمە هیواو هاندانێك و بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی
وانیومە بیروڕای خۆم بگەیێنم بەخەڵك". لێرەدا شیلان یارمەتی باوکی لەبیر ناکا،
لەخەباتکردنیدا بۆ مافی ژنان زۆر پشتگیریکردووە. لەبەر ئەوەی حەزی بەسەر
ۆشین و خۆ بەکەمگرتن نەکردووە، لەکاتی چوونە قوتابخانەیدا لەسلێمانی، گەلێك
ەی ناشرینیان داوە بەگوێدا. شیلان گەلێك شتی خوێندووەتەوە، هەر لە قورئانەوە
ا پەرتۆکە مارکسییەکان. بەکورتی، شۆڕشگێڕێك بووەو ویستوویەتی
ۆمەڵگەدا) گۆڕانێك بهێنێتە کایە. لەبەر ئەوە دژایەتیکراوەو، چاو خراوەتە
ی‌و، هەوڵی فڕاندنی دراوە. ئەوجا ماوەیەك چووەتە شاخ بۆ بەرگری لە
ەکەی، هەر چەندە دایك و باوکی بەوە ڕازینەبوون. پاش ماوەیەك هەوڵی ڕاکردنی
،، بەڵام گیراوەو خراوەتە گرتووخانە. کە لەوڵات ڕایکردووە، نەیویستووە بچێتە
گن (نەرویج)، کەچی تووشی بووە بەتووشی ئەوێوە". کەرۆژنامە نووسەکە
ڕسی لێی، بۆچی حەزی لەنەرویج نەکردووە، لەوەرامدا دەبێژێ: "خەڵکی نەرویج
ڕاستگۆ نەبوون. ئەوە منی دوچاری ناهومێدیکرد، چۆنکە هیچ چاوەڕێی ئەوە
ووم" بەڵام شیلان وەك ڕۆژنامەکە دەبێژێ "هەر زوو هەست بەوە دەکا کە ئەو

ئازادییەی لەنەرویج هەیە، یەگجار بەنرخە. ئەو دەتوانێ لێرە بیروڕای خۆی بێپێچو پەنا دەربڕێ. کەبچێتە دەرەوە، کەس چاو ناخاتە سەری و، دەرفەتی ئەوەشی هەیە بخوێنێ و کاریش بکا". ڕۆژنامەوان دەنووسێ "شیلان کچێکە حەزی لەفێربوونەو بەقسەی خۆی، بەسێ مانگ پلەی Eی تەواو کردووەو بەپێنج مانگ زمانی نەرویجی فێربووە. ڕاستییەکەی، نەرویجییەکەی شیلان بێ کەموکوڕییە". لەوەرامی پرسیارێکی ڕۆژنامەکەدا، بۆچی شیلان بەکێشەی مافی ژنانەوە خەریکە" شیلان دەبێژێ: "کە دەمدی ژنی کورد، بۆ مافی خۆیان کار ناکەن، ئەوە زۆر کاریدەکردە سەرم". شیلان باسی بارودۆخی خراپی ژیانی ژنی کورد دەکا کە دەکوژرێن و دەسووتێندرێن و کەسیش لەسەریان هەڵناداتێ و دەبێژێ ژنی کورد پێویستی بەپشتگیرییە". ڕۆژنامەکە لەسەر باسەکە دەڕواو دەنووسێ: "کە ڕێکخراوی ژنان دروستکرا، شیلان هەڵبژێردرا بەسەرۆك". ڕۆژنامەکە درێژە بەقسەکانی دەداو دەنووسێ "شیلان هێندە خەریکی رامیاریە هەموو کاتێك هەر باسی رامیاری دەکا، بۆ هەموو کەسێك کەبیەوێ گوێبگرێ لێی. تەنانەت، ئەگەر پیاوێك بیەوێ باسی خۆشەویستی بکا لەگەڵی، ئەو شانێك هەڵدەتەکێنێ بۆی و، باسی سیاسەت دەکا. چونکە سیاسەت لێیەوە نێزیکترەو، گرنگترین شت لەلای لە ژیانیدا ئازادییەو، لەیلازانا کە 15 ساڵ لەزینداندا بوو، بەنموونەیەك دادەنێ بۆ خۆی. شیلان بەڕۆژنامە نووسەکە بەڵێن دەدا، کە بەر لەوەی بمرێ شوێنەوارێك بۆ خۆی بەجێبهێڵێ"".

ئەزژی لەکۆتایی ئەم وتارەدا هیوام وایە شیلان تەندروست و تەمەندرێژ بێ و نموونەی لەنێو ژنانی کورددا فرەبێ لەپێناوی گەیشتن بەکۆمەڵگەی ئازادو یەکساندا.

* ئەم ڕۆژنامانە باسیانکردووە: Bergen Avis (BA) (ڕۆژنامەی بێرگن) (BT) Bergen Tidende کاتی بێرگن (ڕۆژنامەیەکی سەرتاسەرییە)، Bergen BY Avis (ڕۆژنامەی شاری بێرگن) Bergen Kommune (وێب سایدی کۆمۆنی بێرگن) Norsk Riks Kring Kasting NRK (میدیای وڵاتی نەرویج 2006/3/8) TVN (تەلەفیزیۆنی نەرویج 2006/3/8).

بەرلین 2006/9/18

**میدیا**، ژ 259، 2006/9/26

# کۆڕی زانیاری کوردستان (*)
# لەژێر مەترسی کودەتای تەوافوقی حیزبیدایە

سالح قادر- هەولێر/ دوای دوولەتبوونی ئیدارەی کوردستان، سەرجەم وەزارەت و
ەزگاکانی لای هەردوو ئیدارەی هەولێر، هاوتاکانیان لە سلێمانی دامەزرێندران و
پێچەوانەشەوە، تەنانەت سەندیکاکانیش بوون بە دوو بەشەوە، تاکە دەزگا کە
اوتاکەی لەسلێمانی نەبێت کۆڕی زانیاری کوردستان بوو.
ماوەیەك بەر لەئێستا دەنگۆی هەڵوەشاندنەوەو سەر لەنوێ دامەزراندنەوەی کۆڕی
نیاری کوردستان یەکێك بوو لە بابەتە گەرموگوڕەکان، بەو پێیەی ئەو کۆڕە لەلایەن
یدارەی پێشووی هەولێر دامەزراوەو دەبێت ئەندامانی ئیدارەی پێشووی
لێمانیشی تێدا بێت، واتە کۆڕی زانیاری ئەندامەکانی بە تەوافوق لەنێوان پارتی و
ەکێتی دابنرێن، بەڵام ئەندامانی ئێستای کۆڕی زانیاری ئەو گۆڕانکارییە بە ترسناك
دەنێن، ترسی ئەوەیان هەیە دەزگاکە، بەو شێوەیە لە دەزگایەکی ئەکادیمیی
حیزبییەوە ببێتە دەزگایەکی حیزبی بەهۆی سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی لەسەر
چینەی تەوافوقی حیزبییەوە. جگە لەمەش هەوڵی دانانەوەی کۆڕی زانیاری کورد
بەغدا هەیەو هەوڵدەرەکان کە ئێستا دەستەیەکیان بەسەرۆکایەتی عەرەبێك
امەزراندووە دەیانەوێ کۆڕ ببنەوە بەغدا. پرۆفیسۆر د.جەمال نەبەز لەوتارێکی دا
بارەی کۆڕی زانیاری کوردستان کە لەژمارە (255)ی 2006/8/29ی (میدیا)
ڵوکرایەوە رەخنەی لەو کەسانە گرت کە هەوڵدەدەن کۆڕ ببەنەوە بەغدا.
ئەو دەزگا کوردییە دوای رێککەوتننامەی ئاداری 1970ی نێوان حکومەتی بەغداو
ۆرشی کوردستان دامەزرا، بەڵام دوای نوشستی شۆرشی ئەیلول، حکومەتی بەعس
م دەزگایەی کردە بەشێك لە مەجمەعی عیلمی عێراق بەناوی دەستەی کوردییەوە.
وای راپەڕینی 1991 دەزگاکە بەبڕیاری ژمارە 37ی پەرلەمانی کوردستان لە رۆژی
1997/12/2 بڕیاری دووبارە دامەزراندنەوەی دراو یاسای بۆ دەرچوو.
ساڵی2000دا خولی یەکەمی کۆڕ لە خانوویەکدا لەگەڕەکی راپەڕین دەست بەکار
و، ئێستا دەزگاکە لەنێو تەلارێکی قەشەنگی سێ نهۆمی تایبەتی خۆیدایە لەسەر
ەقامی هەڵەبجە لەشاری هەولێر.

ژمارەی ئەندامانی کۆڕی زانیاری 13 کەسن، بەپێی ئەو یاسایەی لە پەرلەمانی کوردستاندا بۆ کۆڕی زانیاری دانراوە، دەکرێ ژمارەی ئەندامانی بۆ 21 کەس زیاد بکرێ، هەر کەسێکیش ببێتە ئەندام لەو دەزگایە بە ئەندامی هەمیشەیی دادەنرێت، تەنیا لە حاڵەتێکدا نەبێت کە خۆی واز لە ئەندامێتی کۆڕ بهێنێت، جگە لەمەش دەزگاکە چەند ئەندامێکی شەرەفی هەن وەك "د.ئیسماعیل بێشکچی، ئەحمەد هەردی، د.جەمال نەبەز، ئۆردیخانی جەلیلو د.کەمال مەزهەر"، هەروەها کۆمەڵێك ئەندامی یاریدەدەریشی هەیە، جگە لەمەش چەندین کەسی دیکە لەنێو لێژنەکانی کۆڕی زانیاریدا هەن، کە لێژنەکانیش بریتین لە "لێژنەی گۆڤار، لێژنەی فەرهەنگ، لێژنەی زمانو زانستەکانی، لێژنەی رێزمان، لێژنەی ئەدەب، لێژنەی زاراوە، لێژنەی دەستنووس، لێژنەی پێداچوونەوە بەتابلۆکانی پایتەخت، لێژنەی چاپو بڵاوکردنەوەو لێژنەی مێژوو".

ئەندامانی کۆڕی زانیاری لەئاخاوتنەکانیاندا بۆ (میدیا) جەختیان لەسەر ئەوە کردەوە، کە سەرەڕای گرفتی دارایی، توانیویانە لەماوەی ئەو 6 ساڵەدا کاری باش ئەنجامبدەنو، نزیکەی 26 کتێبیان بە چاپ گەیاندووەو 4 ژمارەشیان لەگۆڤاری "ئەکادیمی" دەرکردووەو 8000 کتێبیان کڕیوە، سەرەڕای بەستنی چەند سیمینارو کۆنفرانسێك. ئەوان لەکاتێکدا ئەو قسەیە دەکەن، کە دەزگاکە رووبەڕووی رەخنەی زۆری نووسەرانو رۆشنبیرانو تەنانەت خەڵکی ئاساییش دەبێتەوەو رەخنەی ناچالاکیو بێ بەرهەمی لێدەگیرێ.

د.کوردستان موکریانی سەرۆکی کۆڕی زانیاری کوردستان، لەبارەی ئەو رەخنانەی لە گۆڤارو رۆژنامەکاندا ئاراستەی کۆڕ دەکرێن دەڵێت ئێمە پێمانخۆشە رەخنە بگیرێت، بەڵام رەخنەکان بابەتانەو زانستانە بن. سەرۆکی کۆڕ گوتی "ئەو رەخنانەی لە کۆڕی زانیاری دەگیرێن، زیاتر لەلایەن کەسانێکە کە نازانن ئەرکی کۆڕی زانیاری کوردستان چییە، هەروەها هەندێك کەس لەوانە بابەتیان هێناوە بۆ کۆڕی زانیاریو بابەتەکەیان بۆ چاپ نەکراوە، دواتر هێرشی توندیان کردۆتە سەر کۆڕی زانیاری، هۆی لەچاپنەدانی بابەتەکانیشیان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لێکۆڵینەوە نەبووە، چونکە

بابەتانەی لێرە چاپو بڵاودەکرێنەوە دەبێت لێکۆڵینەوە بن، یان لەبواری
نگەو ئینسکلۆپیدیا بن".
کریانی لەخولی دووەمی کۆڕی زانیاری لەرۆژی 2004/12/25 بە زۆرینەی دەنگ
سەرۆکی کۆڕ. کوردستان بڕوانامەی دکتۆرای لەساڵی 1977 لەئەنستیتۆی
ەڵاتناسی سەر بەئەکادیمیای سۆڤێتی، لەبواری سینتاکس (رستەسازی)
رتووە. ئەو پێیوابوو هەڵوەشاندنەوەی کۆڕی زانیاری کارێکی سەختە "کۆڕی
ی بەبڕیارێکی یاسایی لەلایەن پەرلەمانی کوردستانەوە دامەزراوە،
شاندنەوەشی هەر دەبێت بەبڕیارێکی یاسایی بێت، جا بۆیە هەڵوەشاندنەوەی
کی سەختە، لەرووی یاساییەوە ناکرێ کۆڕی زانیاری هەڵبوەشێتەوە". ئەو
ەی ئەو دەنگۆیانەی لە ئارادان وەکو دامەزراندنەوەی کۆڕی زانیاری لەبەغداو
وەی د.شەفیق قەزازی سەرۆکی پێشووی کۆڕو کردنەوەی بە سەرۆك و دانانی
مەکانی کۆڕ بەڕێککەوتنی پارتی و یەکێتی، گوتی "ئێمە تائێستا بەفەرمی هیچ
کمان بۆ نەهاتووە، ئەو دەنگۆیانەشمان هەر لەدەرەوە بیستووە".
رەڕای بوونی چەند کەسانێکی ئەکادیمی لەناو کۆڕی زانیاری کوردستان، بەڵام
اش ژمارەیەك خەڵك هەن لەدەرەوەی کۆڕن و کەسانی زۆر ئەکادیمیش بوون، کە
ێکیان لەژیاندا نەماون، لەکاتی دامەزراندنەوەی کۆڕی زانیاری کوردستان
ان کردبوو بێنە ناو کۆڕەوە، لەوانەش مامۆستا مەسعود محەممەد، هەروەها مەلا
ل رۆژبەیانی کە بەر لەپرۆسەی ئازادی عێراق لەلایەن بەعسەوە تیرۆر کرا.
ستان موکریانی لەبارەی ئەو دوو کەسەوە گوتی "مامۆستا مەسعود محەممەد
ی هەبوو بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆکی کۆڕ، مەرجەکەشی ئەوە بوو کە ئەو وەکو
ۆکی کۆڕ دەسەڵاتی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی هەبێت و ئەندامانی کۆڕیش
ەڵاتی وەزیریان هەبێت، ئەوەش لەیاسای کۆڕی زانیاریدا نییە، هەرچی مەلا
ل رۆژبەیانییە، کاتی دامەزراندنەوەی کۆڕی زانیاری، چەند نامەیەکی بۆ مەلا
ر مستەفا ناردبوو، بەڵام مەلا شوکر هانی نەدابوو بێت بۆ ناو کۆڕی زانیاری
ستان".

"نووسینگەی فیل بۆ فرۆشتنی جامو بۆیاخ. داماك عەقارییەكان یەكەم شێوازی ژیانی گەورە بەبڵندی لە ئوردون. خواردنگەو كەسی پورتوقالە،.... هتد" ئەمە حالی زمانی كوردییە لەسەر چەند تابلۆیەكی دوكانو نووسینگەكانی هەولێر، سەرەڕای بوونی چەندین تابلۆی دیكە بە زمانی عەرەبی. كۆڕی زانیاری كوردستان لیژنەیەكی تەرخانكردووە بۆ پێداچوونەوە بەو تابلۆیانە، سەرۆكی كۆڕ لەبارەی كاری لیژنەكە گوتی "ئێمە چەند بنەمایەكمان داناوە كە ئەو تابلۆیانە یەكەم شت دەبێت بەزمانی كوردی بن، ئەگەر خاوەنەكەی ئارەزوو بكات بە ڕێنووسی لاتینی بینووسێت، ئەو ڕێسایانەمان داوەتە ئەو شوێنانەی ناو دەبەخشن وەكو وەزارەتی رۆشنبیریو شارەوانیو قایمقامیەت، بەڵام بەداخەوە رۆژ بەرۆژ ناوی زۆر سەیر دەبینین لەناو شاری هەولێر". ئەو گلەیی لەلایەنە پێوەندیدارەكان كرد كە رەچاوی ئەو ڕێسایانەی كۆڕی زانیاری ناكەن لەكاتی ناو بەخشیندا "هەرچەندە هەموو لایەنەكان نوێنەریان لەناو لیژنەكەی ئێمەدا هەیە، بەڵام هیچیان پەیوەست نین بە بڕیاری لیژنەكە، تەنیا وەزارەتی رۆشنبیری نەبێت، ئەو وەزارەتە كاتێك ناوێك دەدات نامەیەكمان بۆ دەنێری".

یەكێك لە گرفتە دیارەكانی كۆڕی زانیاری كوردستان لەمساڵدا نەبوونی بودجە بوو، هەرچەندە كۆڕی زانیاری بۆ بودجەی 2006 سەرەتا داوای 400 ملیۆن دیناری كردبوو، بەڵام بڕە پارەكە كەمكرایەوە بۆ 200 ئینجا بۆ 100و دواجاریش بۆ 50 ملیۆن دینار. ئەندامانی كۆڕ پێیانوایە نەبوونی بودجەیەكی تەواوو پێویست گرفتی زۆری بۆ دروست كردوون بەتایبەتی بۆ چاپكردنی بەرهەمو سازدانی فیستیڤاڵو سیمینارو كۆنفرانس، موكریانی سەبارەت بەمە گوتی "ئێمە داوامان كرد، بەڵام نازانین بۆچی بۆمان سەرف ناكەن، هۆكارەكە لەلای ئەوانە".

گرفتی ڕێنووسی كوردی، یەكێكە لە گرفتەكان كە تائێستا یەكلایی نەبۆتەوە، كۆڕی زانیاریش نامیلكەیەكی بۆ ڕێنووسی یەكگرتووی كوردی چاپ كردووە، كە كاتی خۆی لەلایەن حكومەتەوە بۆ دەزگاو فەرمانگەكان لەكۆر كرایەوە. د.كوردستانی سەرۆكی كۆڕی زانیاری كوردستان پێیوابوو ڕێنووس كێشەی هەرە گەورەیە لەلای كورد "هەر كەس بەئارەزووی خۆی بەجۆرە ڕێنووسێك دەنووسێت،

ـچی ئێمە ڕێسایەکمان بۆ ڕێنووسی کوردی داناوە، بەڵام زۆر زەحمەتە لەلایەن
ـانەوە پەیڕەوبکرێت، پێویستە ئەو ڕێنووسە لە قوتابخانەکانەوە دەست
ـت".

ـێی یاسای کۆڕ دەستەی سەرۆکایەتی کۆڕ لە سەرۆک‌و جێگرو سکرتێر
ـێت، بەڵام ماوەیەکە کۆڕی زانیاری بێ سکرتێرە، کوردستان موکریانی لەبارەی
ـنی سکرتێرەوە گوتی "ئەو ئەندامانەی کە ئێستا لە کۆڕی زانیاری کوردستانن
ـ ئەوەیان هەیە ببنە سکرتێری کۆڕ، داواشیان لێکراوە، بەڵام کەسیان ئامادە
ـبێتە سکرتێر، من وای دەبینم لەبەر مووچەو شوێن گۆڕینە".

ـەبدوڵڵا یاسین ئامێدی، لەساڵی 2000دا بڕوانامەی دکتۆرای لەبارەی ئەدەبی
ـی کوردی وەرگرتووەو لەخولی دووەمی کۆڕی زانیاری لەساڵی 2004دا
ـری سەرۆکی کۆڕی زانیاری کوردستان هەڵبژێردراوە. د.عەبدوڵڵا هەمان
ـنی سەرۆکی کۆڕی هەبوو، کە هەندێک کەس لەبەر ئەوەی بەرهەمیان لە کۆڕی
ـی چاپ نەکراوە بۆیە ڕەخنە لە کۆڕی زانیاری دەگرن‌و ئەوەشیگوت "هەندێک
ـ هەیە دەیەوێت بێت پێگەی خۆی لەکۆڕی زانیاری قایم بکات، بەڵام بەپێی
ـ کۆڕ ئەو کەسانە مافی ئەندامبوونیان نابێت لە کۆڕ، بۆیە دێن ڕەخنە لە کۆڕی
ـی دەگرن". ئامێدی باسی لەوە کرد کە کۆڕی زانیاری تائێستا چەندین کاری
ـە لەبواری زاراوەو فەرهەنگ‌و لێکۆڵینەوەی مێژوویی، بەڵام کەس ئاماژەی بەو
ـە نەداوەو ڕەخنەی لێ نەگرتوون "داوامان لە ڕۆشنبیران کردووە هەر
ـیەکیان هەیە لەسەر بەرهەمەکانی کۆڕی زانیاری بۆمانی ڕەوانە بکەن، بەڵام
ـسێک تائێستا ڕەخنەی لەو بەرهەمانە نەگرتووە".

ـ ڕووخانی بەعس هەوڵێک هەبوو بۆ دامەزراندنەوەی کۆڕی زانیاری کورد لە
ـبێ ئەوەی ئەوە لە بەرچاو بگرن کە کۆڕ لەپایتەختی کوردستان هەیە وەک
ـنێک بە کۆڕی زانیاری کوردستان لە هەولێر. هەوڵەکەش بەتایبەتی لەلایەن
ـل مەزهەرو محەممەدی مەلا کەریم‌و چەند کەسێکی دیکەوە بوو لەبەغدا.
ـل مەزهەر خۆی لە هەڤپەیڤینێکی تەلەڤزیۆنیدا باس لەو هەوڵە دەکات‌و دەڵێ
ـلە د.بەرهەم ساڵح کرد بۆ ئەوەی هاوکاریان بکات لە دامەزراندنەوەی کۆڕی

زانیاری کورد لەبەغدا، بەلام دواتر وەك خۆی دەلێ لەسەر راسپاردەی نێچیرڤ
بارزانی داوای لێکراوە کە واز لەو هەوڵە بهێنێت‌و بێت خزمەتی کۆڕی زانیار
کوردستان بکات لە هەولێر، بۆیە د.کەمال دەستبەرداری هەوڵەکانی بووە. هەر لە
هەڤپەیڤینەدا باسی لەوەش کردووە، کە کەس داوای لێنەکردووە بێتە کۆڕی زانیار
کوردستان. د.عەبدوڵلا بێئاگایی خۆی لەو مەسەلەیە نیشانداو گوتی "من ئاگادار
ئەو مەسەلەیە نیم، بەلام بەپێی زانیاری خۆم لەکاتی دامەزراندنەوەی کۆڕی زانیار
پەیوەندی بەو زاتە بەڕێزانە کراوە بەتایبەتی ئەوانەی ئیشیان لە بەغدا بوو، کە بێ
بەشداری لە دامەزراندنەوەی کۆڕی زانیاریدا بکەن، بەلام ئەوانە لەبەر ئەوەی پێگ
پایەی تایبەتی خۆیان هەبوو لە بەغدا تاڕادەیەکیش لایەنگری بەعس بوون، ئیشر
کاریان زۆر بە باشی بەڕێوە دەچوو، رژێمی بەعسیان بە باشتر دەزانی، چونکە ئ
کات چارەنووسی کوردستان دیار نەبوو، بۆیە نەهاتنە کوردستان، دوای رووخا
بەعس، کە هیچ بەرژەوەندییەکیان نەما، ئێستا بە پەرۆشن ببنە ئەندامی کۆڕ".

د.کەمال مەزهەرو محەممەدی مەلا کەریم سالی رابردوو جارێکی دیکە دەستیـ
کردەوە بە هەوڵەکەیان. دکتۆر عەبدوڵلا داخباری خۆی دەربڕی لەو کارەی ئەوان
ئێستا لە بەغدا ئەنجامیانداوە، کە ئەویش دامەزراندنی دەستەیەکی کوردیی سەر
مەجمەعی عیلمی عێراق لە بەغداو گوتی "لە هەموو ولاتێکدا تەنیا یەك کۆڕ هەیا
لقیشی نییە، بەلام جێگەی داخە ئەو برادەرانەی بەغدا دەستەیەکی کوردییان
کۆڕی زانیاری بەغدا دامەزراندۆتەوەو ئەوەی سەرپەرشتی دەستەکەش دەکا
کەسێکی عەرەبە بەناوی (محمد العبیدی) کە یەك وشەی کوردی نازانێت، کۆمەلێك
ئەکادیمیان‌و رۆشنبیرانی کورد چوونەتە ناو ئەو دەستەیە، ئەوەش سەرپێچیـ
لەیاساکانی کۆڕی زانیاری".

ئامێدی پەسنی هەلوێستی د.جەمال نەبەزی دا لەبارەی کۆڕی زانیاری کوردستا
گوتی "بۆچوونەکانی مامۆستا جەمال نەبەز راستگۆییان پێوە دیارەو لۆجیکیانە
مەسەلەکە چووەو پێویستە لایەنی پەیوەندیدار بابەتەکەی بە هەند وەربگرن، چو
کەسێکی زۆر بە ئەزموونە".

یەکێك لەو دەنگۆیانەی کە باسدەکرێت هێنانەوەی دکتۆر شەفیق قەزازە بۆ
ڕدنەوەی بە سەرۆکی کۆڕ، قەزاز لە خولی یەکەم بە سەرۆکی کۆڕ هەڵبژێردرا، بەڵام
خولی دووەمی کۆڕ نەیتوانی دەنگ بە دەستبهێنێت، ئامێدی لەبارەی دەنگۆی
ێنانەوەی قەزاز بۆ کوڕی زانیاری کوردستان گوتی "ڕێزمان هەیە بۆ د.شەفیق کە 4
الٚ سەرۆکی کۆڕ بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی شارەزایی لە تایبەتمەندێتی کۆڕدا نەبوو،
یە نەیتوانی بەپێی پێویست کۆڕ بەگەڕ بخات، دوای ئەوەی لە هەڵبژاردنی خولی
ۆەم دەرنەچوو، کۆڕی بەجێهێشت، لەو ماوەیەشدا ئێمە بەردەوام یاداشتەکانمان
ڕەوانە دەکرد وەکو ئەندامێك لەئەندامانی کۆڕی زانیاری، بەڵام لەڕۆژی 2006/1/9
ڕایەکی ئاراستەی سەرۆکی کۆڕ کرد کە واز لە ئەندامێتی کۆڕی زانیاری دەهێنێت،
ۆژی 2006/2/1 بەزۆرینەی دەنگی ئەندامان داواکەی پەسەند کراو پەیوەندی بە
ڕی زانیاری کوردستانەوە نەما". بەپێی یاساکانی کۆڕ هەر ئەندامێك لە سێ
بوونەوەی ئەنجوومەنی کۆڕ بەبێ هۆ ئامادە نەبێت ئەوا مافی ئەندامێتی کۆڕی
ەسەندرێتەوە، د.عەبدوڵلا لەبارەی ئامادەبوونی د.شەفیق قەزاز لە کۆبوونەوەکانی
ڵی دووەمی کۆڕی زانیاری گوتی "لەکۆبوونەوەکان ئامادە نەدەبوو، بۆ یەك دوو
بونەوە نامەی ئاراستە کردین، کە کاری هەیە یان سەفەری کردووە، بەڵام لەدوای
ە بەبێ پیشاندانی هیچ هۆیەك ئامادەی کۆبوونەوەکان نەدەبوو". بەپێی یاسای
ـ بێت هەر کەسێك واز لە کۆڕی زانیاری بهێنێت مافی گەڕانەوەی نییە، ئامێدی
ی "لەناو یاسای کۆڕی زانیاری ئاماژە بەوە نەدراوە کەسێك واز لە کۆڕی زانیاری
نێت بگەڕێتەوە، بەڵام کەسێك بە ئارەزووی خۆی بە داوایەکی ڕەسمی واز لە
ـامێتی کۆڕ بهێنێت مافی گەڕانەوەی نییە".

ەرچەندە کۆڕ پێشترو ئێستاش چۆڵ نەبووە لە ئەکادیمیانی سلێمانی، بەڵام
ێی قسەی جێگری سەرۆکی کۆڕ، لەکاتی دامەزراندنەوەی کۆڕی زانیاری داوا لە
کانی سەر بەئیدارەی سلێمانی کراوە کە بەشدار بن لە دامەزراندنەوەی کۆڕ، بەڵام
ن مەسەلەکەیان دواخست بۆ دوای یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەکە، ئامێدی
ی "ئێمە لەلایەن خۆمانەوە بەڕێز د.شەفیق قەزازمان ڕاسپاردبوو بۆ ئەوەی
ەندی بە جەماعەتی سلێمانی بکات، ئەویش بەکاری خۆی هەڵسا تەنانەت لەگەڵ

خودی مام جەلالیش دانیشت، بەلام ئەوان مەسەلەکەیان بۆ یەکگرتنەوەی دوو ئیدارەکە دواخست، ئێستاش ئێمە لەگەڵ فراوانکردنی کۆڕی زانیاریداین، بەلام نەك بەناوی حیزبایەتی، چونکە مخابنە دەزگایەکی ئەکادیمی وەکو کۆڕی زانیاری ململانێی حیزبایەتی تێدا بکرێت".

زۆرجار گلەیی ئەوە لە کۆڕی زانیاری دەکرێت کە خەڵکی پارچەکانی دیکەی کوردستانی تێدا نییە لەکاتێکدا ئەوە لە حەفتاکاندا هەبوو، لەو بارەوە د.عەبدوڵلا گوتی "ئەگەر بمانەوێت خەڵکێك لە باکووری کوردستان یان لە ڕۆژهەلات یان کوردێکی ئێریڤان بکەینە ئەندامی کۆڕ، دەبێت ماڵی لە کوردستان بێت، چونکە دەبێ پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کۆڕی زانیارییەوە هەبێت، ئەمەش ناکرێت، بەلام وەکو ئەندامی یاریدەدەرو ئەندامی شەرەف چەند کەسێکی پارچەکانی دیکەی کوردستانمان وەرگرتووە".

بەدران ئەحمەد حەبیب، ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کوردستان باسی لەوە کرد، کە ئەویش ئەو دەنگۆیانەی بیستووە کە لەبارەی هەڵوەشاندنەوەی کۆڕی زانیاری بلاوبوونەتەوەو گوتی "ئەو دەنگۆیانەی لەبارەی گۆڕانکارییەکان بیستوومانە هەڵوەشاندنەوەی کۆڕی زانیارییە، بەلام ئەگەر گۆڕانکارییەکان بەگوێرەی ئەو دەنگۆیانە بێت کە هەیە، پێموانییە گۆرانکاری باش بێت، چونکە ئەوەی ئێستا لە حکومەت هەیە بریتییە لە یەکگرتنەوەی داوو دەزگاکان، شتێك نییە ناوی هەڵوەشاندنەوە بێت، بۆچوونی ئێمە لەگەڵ فراوانکردنی کۆڕی زانیاریدایە نەك هەڵوەشاندنەوەی"، بەپێی قسەکانی ئەو ئەندامەی کۆڕ بواری فراوانکردنی کۆڕی زانیاری هەیە ئەویش بەپێی یاسای کۆڕ "بەپێی یاسای کۆڕ ئەنجوومەنی کۆڕ لە 15 ئەندام پێکدێت، بەلام ئێستا 13 ئەندامە، ئێمە داوامان کرد کە پێداچوونەوە بە یاساکەدا بکرێت و ئەو 15 کەسە بکرێتە 21 کەس و کرا، بۆیە ئێستا کۆڕ دەتوانێت 8 ئەندامی دیکە وەربگرێت، ئەو خەڵکانەی ئێستا لە کۆڕی زانیارین زۆر بە دامەزراندنی کۆڕەوە ماندوو بوونە، ئەز بەڕاستی نازانم ئەو خەڵکە بەڕێ بکرێت، یاسای کۆڕیش ڕێگە نادات، چونکە ئەندامێتی کۆڕ هەمیشەییە، یەکێك ببێتە ئەندامی کۆڕ ئەندامێتی لێناسێندرێتەوە".

لەبارەی ئەو کەسانەی کە دەنگۆی ئەوە هەیە کە بهێنرێنە ناو کۆڕی زانیاریەو، ئایا لەکاتی دامەزراندنی کۆڕی زانیاری داوایان لێکراوە بێنە ناو کۆڕی زانیاری، بەدران گوتی "زۆربەی ئەو کەسانەی وەکو دەنگۆ ناوەکانمان بیستوون بێنە ناو کۆڕی زانیاری کوردستان پێش رووخانی بەعس بەشێکی زۆریان داوایان لێکراوە، کە بێن بینە ئەندامی کۆڕ، بەڵام خۆیان نەهاتن، سەیرو سەمەرەکە لەوەدایە هەتا سەددام مابوو ئامادە نەبوون بێن ئێستا دەیانەوێ بێن".

بەدران ئەحمەد وتارەکەی د.جەمال نەبەزی لەبارەی کۆڕی زانیارییەوە بە باشی نرخاندو گوتی "من زۆر پشتیوانی لەو بۆچوونەی مامۆستای رێزدارو پایەبەرز د.جەمال نەبەز دەکەم، راستە ئیدارەی هەولێر کۆڕی زانیاری دامەزراند، بەڵام ئەندامەکانی لەسەر لیستی حیزبی نین، تەنیا من پارتیم لە کۆڕی زانیاری دا، رەنگە خەڵکانی سەر بە حیزبەکانی دیکەی تێدابێت"، هەروەها لەدرێژەی قسەکانیدا گوتی "دەزگایەکی ئەکادیمی بە خەڵکی سەربەخۆ هیچی پێنەکری بە خەڵکی حیزبی چی پێدەکری".

بەدران ئەحمەد، کۆڕی زانیاری کوردستان بە "پەرلەمانی زمانی کوردی" ناو دەبات، بۆیە پێیوایە دەبێت یەك دەزگا هەبێت بڕیار لەسەر زمانی کوردیی بدات "ئەگەر چەند دەزگایەك هەبێت یەك لە هەولێرو یەك لە سلێمانی و یەکێکی دیکە لە دیاربەکرو یەکێکیش لە بەغداو یەکیش لە ئەورووپا، مەسەلەکە نابێتە یەکگرتنی زمانی کوردی، دەبێتە پارچە پارچە کردنی زمانی کوردی". ئەو بەگومانەوە دەڕوانێتە ئەو دەستە کوردییەی لە بەغدا دامەزراوەو دەڵێت "هەولێر پایتەختی کوردستانە چ عەجەب کۆڕی زانیاری لە بەغدا بێت، لەکاتێکدا هەموو توانا رۆشنبیرییەکان لە کوردستانن، هەمووشیان تواناکارییەکانی زمانی کوردی لە هەولێرە بۆیە دەبێت کۆڕی زانیاری کوردستان لە هەولێر بێت، ئەو دەستەیەی لە پشت دروستکردنی کۆڕی زانیارییە لە بەغدا بەرای من دەستێکی ئەمین نییە لە مەسەلەی زمانی کوردی، دەستێکی گومانلێکراوە".

بەدران ئەحمەد کە خاوەنی نامیلکەی رێنووسی یەکگرتووی زمانی کوردییەو، نامیلکەکە لەلایەن کۆڕی زانیاری چاپکراوەو دەزگای ئاراسیش چاپی کردۆتەوە، لەو

بارەوە گوتی "راستە من ئەو نامیلەکەیەم داناوە، بەڵام کەس کاری پێنەکرد، هەرچەندە پێویستە بڕیارەکانی کۆڕی زانیاری بێ چەندو چوون بن، بەڵام کەس رەچاوی ناکات، تەنانەت ئەندامانی کۆڕیش پابەند نین بە رێنووسی نووسینی کۆڕ".

لەبارەی ئەو رەخنانەی لە کۆڕی زانیاری دەگیرێن، بەدران وەڵامێکی جیاواز لە سەرۆک‌و جێگری سەرۆکی کۆڕی هەبوو و گوتی "بەشێکیان راستن، بەشێکیان راست نین. بەشێکیان راستن کە دەبێت کۆڕ دەزگایەکی کاراتر بێت، دیارە ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کۆڕ ئیمکانیاتی ماددی لەبەردەست نییە، لەهەمانکاتدا کۆڕ هیچ دەسەڵاتێکی نییە، ناتوانێ شت بسەپێنێ، بۆ نمونە لەبارەی زمانی راگەیاندن‌و پرۆگرامەکانی خوێندن هەتا ئێوارە قسە بکەیت کەس بە گوێت ناکات، لەبەر ئەوەی ئەوانەی گلەیی لە کۆڕ دەکەن، با گلەیی لە خۆیان بکەن، کە هیچ شتێك بە قسەی کۆڕ ناکەن". ئەو ئەندامە کارایەی کۆڕ ئەو پرسیارە دەوروژێنێ‌و دەپرسێ "باشە دەزگایەك کەس بەقسەی نەکات گلەیی چی لێدەکرێت؟".

ئەو، کەموکوڕییەکانی کۆڕی زانیاری‌و نزمی ئاستی گۆڤارەکەی بەستەوە بەئاستی رۆشنبیری‌و لێکۆڵینەوە لە کوردستانداو گوتی "زۆرجار باس لەوە دەکرێت کە کۆواری ئەکادیمی ئاستی بەرز نییە، ئەزیش لەگەڵ ئەوەدام، کۆواری ئەکادیمی کە بابەتی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی‌و مێژوویی‌و زانستی بڵاودەکاتەوە، بەڵام کە کۆوارەکە ئاستی بەرز نییە مانای وایە لێکۆڵینەوە لە کوردستاندا لەو ئاستەدایە، ئەگەر نا بابەتێکم پێ بڵێ لە کۆوارێکی دیکە بڵاو کرابێتەوە، خۆزگەی بۆ بخوزای لە کۆواری ئەکادیمی کۆڕی زانیاری هەبووایە".

**میدیا**، ژ 262، 2006/10/17

(*)- ئەم وتارە، هەر چەندە وتاری من نییە وەی "میدیا" خۆیەتی، بەڵام لە بەر ئەوەی پێوەندییەکی راستەوخۆی بە وتارەکەی منەوە هەیە لە بارەی "کۆڕی زانیاریی"یەوە، وامبە باش زانی لێرەدا چاپیبکرێتەوە (جەمال ... ەن)

# کوردستانێکی تەقولەق و جیهانێکی شڵەقاو

سەتەی بیستەم؛ سەتەیەك بوو کە دوو جەنگی گشتی (کە بەجەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی بەنێوبانگن)و، چەند جەنگێکی هەرێمی (لەوانە: جەنگی یەکەم و دووەم و سێیەمی "کەنداو")ی بەخۆیەوە دی. هەرچەندە لەماوەی سەت ساڵی رابوردوودا، جوگرافیای گەلێك وڵات و دەوڵەت و ئیمپراتۆرێتی، هاتنە گۆڕان، بەڵام مۆرکی دیاری ئەو سەتەیە ئەوەبوو، کە دوو کامپی دژ بەیەك؛ هاتنە کایە، هەر یەکەیان بەسەرۆکایەتیی زلهێزێك و، هەر زلهێزێکیش، چۆکی لەسەر چارەنووسی بەشێك لە گەلانی سەر زەوی دادابوو. کامپی یەکەمیان؛ کامپی سەرمایەدارێتیی دەوڵەتی بوو، بەنێوی کۆمۆنیستیی یەوە، بەسەرۆکایەتیی یەکێتیی سۆڤێت و، کامپی دووەمیشیان؛ کامپی سەرمایەدارێتیی تایبەتی بوو، بەنێوی جیهانی ئازادەوە، بەسەرۆکایەتیی ئەمریکا. کامپی یەکەمیان کەپێیدەگوترا؛ کامپی رۆژهەڵات، سیستەمێکی دیکتاتۆرانەی تۆتالیتێرانەی هەبوو، کامپی دووەمیشیان کە پێیدەگوترا؛ کامپی رۆژاوا، سیستەمێکی لیبرالانەی دیمۆکراتانەی هەبوو. جا؛ لەبەر ئەوەی هەردوولا؛ خاوەنی چەکی قرکەری ئەتۆم و تەکنۆلۆژیایەکی پێشکەوتوو بوون، هیچ کامێکیان زاتی ئەوەی نەدەکرد، پەلاماری ئەوی دی بدات، بەڵام "جەنگی سارد" لەنێوانیاندا، بەنهێنیی و، بەشێوەی چاوورپاو کردن لە یەك و، دزانە لەپشتەوە لەیەك سرەواندن و، ئاژاوە نانەوە بۆ یەکدی، کردەوەیەکی باوبوو. هەر لەئەنجامی هەوڵدانی هەردوولا، بۆ زۆر کردنی "هەڤاڵبەند"؛ گەلێك دەوڵەت و رێکخراوی تیرۆریست هاتنەکایە، کە هێندێکیان سەر بەملاو هێندێکیشیان سەر بەولا بوون. ئەوجا؛ بۆ راگرتنی ئەم دەستوپێوەندانە، هەر یەکێك لە دوو کامپە نێوبراوەکە، ناچار بوو، بە چەك و پارەو دیبلۆماسێتی؛ پشتگیریی لایەنگرانی خۆی بکات و، چاو لە تاوانەکانی بپۆشێ. بەڵام بەم جۆرە؛ بەشێك لە زانستی تێکنۆلۆژیای چەك، کە جاران، لەلایەن ئەم دوو کامپەوە دەستبەسەریدا گیرابوو، کەوتە دەست ئەم "هەڤاڵبەند"ە زۆردارانە، کە هێندێکیان دوایی بوونە فەرمانڕەوا، وەك "تالیبان"ی ئەفغانستان، کە بە یارمەتیی ئەمریکا هاتە سەرکار. هی واشیان تێدا هەبوو، سەرچاوەیەکی نەوتی فراوانی

لەبەردەستدا بوو و، لەو ڕێیەوە بازرگانییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ هەردوو کامپەکە بەستبوو و، خەڵکەکەی ژێر دەستی خۆشی، بەوپەڕی دڕەندەیەتییەوە دەچەوساندەوە. هەردوو کامپەکەش، مێش میوانیان نەبوو.

شایانی باسە، لەپاڵ ئەم دوو کامپەدا، کامپی دیکەش هەبوون. بۆ وێنە: سەردەمێک بەرەی لانەگرەکان (عدم الانحیاز) هەبوو، کە یۆگۆسلاڤیای تیتۆ و میسری ناسرو هیندستانی نەهرۆ، بەڕێوەیاندەبرد، کە هیندستان خۆی خاوەنی چەکی ئەتۆم بوو. هەرچەندە، چەند وڵاتێکی سەر بە بەرەی ڕۆژاوا هەبوون، ئەمریکایان بەسەرکردەی خۆیان نەدەناسی و، چەند وڵاتێکی "کۆمۆنیستی"ش، وەک چینی ماوتسی تۆنگ و ئەلبانیای ئەنوەری خواجا، سۆڤێتیان بەسەرکردەی خۆیان دانەدەنا، لەگەڵ ئەوەشدا، جیهانی ئەوسا؛ دوو کامپی بوو، دژ بەرێتیی نێوانیشیان درێژەیکێشا؛ تاوایلێهات، کامپی ڕۆژهەڵات، لەئەنجامی نەبوونی ئازادی و گیروگرۆی ئابووری و، بوونی ژمارەیەکی زۆر لەگەلانی جیاواز، لەنێو سنووری ئیمپراتۆرێتییەکەیدا، هەرەسی هێناو ماڵی چووە سەر بەشی ماڵان و لەمەشەوە، گەلێک گەل و نەتەوەی بێدەوڵەت، بێجگە لە کورد، بوونە خاوەن دەوڵەت و، تەنانەت؛ میراتبەری هێزی ئەتۆم، بۆ وێنە: کازاخستان.

بەکورتی؛ لەنێوان کامپی ڕۆژهەڵات و کامپی ڕۆژاوادا، جۆرە هاوسەنگییەک ڕاگیرابوو. سنووری دەسەڵاتی هەردوولا؛ بەشێوەی دیفاکتۆ defacto دانی پێدا نرابوو. ئەمریکاش و سۆڤێتیش، دەیانتوانی؛ ڕاستەوخۆ فەرمان بدەنە "هەڤاڵبەندەکانیان". بۆ وێنە: کە سەرۆکی میسر، خودێ لێخۆشبوو جەمال عەبدولناسر، لە پایزیساڵی 1956دا، واتە، پەنجا ساڵ لەمەوبەر، کە ئەز ئەوکاتە مامۆستا بووم لە کەرکووک و، ئەو ڕۆژانەشم باش لەبیرە، کەناڵی سوێسی کردە ملکی دەوڵەتی میسر، ئەوەبوو فەرەنساو بەریتانیاو ئیسرائیل، هەرسێکیان پێکەوە، پەلاماری میسریان داو، ئاگری جەنگ هەڵگیرسا. سەرۆککۆماری ئەو دەمەی ئەمریکا ئایزنهاوەر، لەبەر هێندەک هۆ، کە ئێرە جێی باسکردنیان نییە، داوای لە هەر سێ دەوڵەتەکە کرد کە زوو لەشکرەکانیان بکێشنەوەو، ئەوانیش پاش چەندان نامەو تەلەفۆن و پاڕانەوە؛ کە هیچ سوودتیان نەبوو، ناچارمان لەشکرەکانیان بکێشنەوەو، بچنە ژێر باری بێناوڕووی خۆیان و، دڵی ئەمریکا نەیەشێنن. هەروەها هەر لە پایزی ئەو ساڵەدا (1956) تۆپ و

تانکی یەکێتیی سۆڤێت، بەسەرۆکایەتیی نیکیتا خەرەشۆف، گەلی راپەریوی هەنگاریای لەخوێندا خنکاندو، هێزی ناتۆش فزەی لێوەی نەهات. ئاشکرایە، کە هەر لەشکری سۆڤێت بوو، لەساڵی 1968دا شۆرشی گەلی ئازاو بوێری چیکۆسلۆڤاکیای بەشێوەیەکی درندانە کوژاندەوەو، بەرەی رۆژاواش لە چەند وتارێکی رۆژنامەو رادیۆو Tv بەولاوە، هیچ هەڵوێستێکی دیکەی نەنواند. ئەوەش دەزانین، کە قڕکردنی کورد لەلایەن دەوڵەتە دەستکردەکانی عەرەب‌و تورک‌و فارسەوە، پاش جەنگی یەکەمی جیهانی، واتە، لەکاتی دامەزراندنی سۆڤێتەوە، هەتا رمانی سۆڤێت، لەکۆتایی هەشتاکاندا، بە بێدەنگی هەردوو کامپ بەرێوەچوو؛ ئەمەش، بۆ راگرتنی هاوسەنگێتیی نێوانیان بوو.

هەر لەبەر ئەو هاوسەنگییەش بوو، کە بزووتنەوەی رزگاریخوازانەی گەلانی بندەست‌و نیشتمان داگیراکراو، زۆر بە زەحمەت سەردەکەوتن. چۆنکە بەرژەوەندیی هیچ لایەك لەم دووانە، رێیی بەوە نەدەدا، باری وێستاو بێتە لەقاندن‌و هەژاندن‌و، کامپی بەرامبەر لە خۆی بهرووژێنێ. شۆرشی ئەو سەردەمەی گەلە بندەستەکان، یان لەشێوەی خۆپیشاندانی جەماوەرانەی سەرشەقامەکان بوو، وەك شۆرشی هەنگاریا و چیکۆسلۆڤاکیا، کە بەهاسانی، بە تۆپ‌و تانك، دەکوژێندرایەوە، یان لەشێوەی شەڕی پێشمەرگەیەتیدابوو، بەپێی تاکتیکی "لێدەو راکە"، وەك شۆرشی کوردستان‌و شۆرشەکانی ئەمریکای لاتین، کە ئەمەش کاتێك دەیتوانی خۆی رابگرێ، کە خەڵکی ئەو نێوچەیەی شۆرشەکەی لێهەڵدەگیرسا، لەباری لۆژستیکییەوە؛ پشتگیریی ئەو شۆرشەی بکردایەو بیتوانیایە پشتگیریی بکا. هەر کاتێك ئەم یارمەتییە لۆژستیکییە نەبوایە، یان بڕایەوە، ئەوا شۆرشەکە، یان لە هێڵی خۆی دەردەچوو و، دەبووە دەسکەلای ئەمو ئەو، یان کۆتایی دەهات. چارەنووسی شۆرشگێری بەنێوبانگ چێ گیڤارا، کە لەو یارمەتییە لۆژستییە بێبەش ما، نموونەیەکە بۆ ئەمە. هەر لەبەر ئەوەشە، کە داگیرکەرانی کوردستان، بەر لە هەموو شتێك، گوندەکانی کوردستان کاولدەکەن، چۆنکە ئەو گوندانە، سەرچاوەی بژێوو کانیاوی لۆژستیی شۆرشەکانی کوردبوون. بەلام ئەوەتە بەداخەوە، کە 15 ساڵە لەبەشێکی باشووری کوردستاندا، حکومەتی پارتی‌و یەکێتی دامەزراوە، کەچی لەباتی دروستکردنەوەی گوندەکان‌و، یارمەتیی

جۆتکاران و ژیاندنەوەی سامانی کشتوکاڵیی کوردستان، سەوزەو ماست و شیرو رۆن و دۆشاوی تەماتەو تەنانەت ئاویش، لە دەرەوەی کوردستانەوە دەهێنرێن، وەک ئەوەی هەولێر هیچ کاتێک ماستی نەبووبێ و، لەکوردستانیشدا، یەک کانیاو نەبێ.

مێژای گۆتنە،کە لەسەردەمی بوونی دوو کامپەکەدا، واتە، لەزەمانی جەنگی سارددا، کارێکی یەکجار سەخت بوو، کەسێک، یان کۆمەڵێک، یان حیزبێک، خۆی بەسەربەخۆ زانیباو بیتوانیبا، لەنێوان ئەو دوو کامپەدا هەڵکا. چۆنکە لەلای ئەوانەی سەر بە کامپی رۆژهەلات بوون، ئەوی رەخنەی بگرتایە لە کابە(کعبە)کەیان، ئەوا، گومانی ئەوەیان دەکرد لێی کە سەر بە کامپی رۆژاوا بێ، پێچەوانەکەشی هەروا بوو. ئەمە بەتایبەتی لەکوردستاندا رێسایەکی بەرچاوو لەکاردا بوو، کە بەداخەوە، زۆربەی هەرە زۆری رامیارو خوێندەوارو بگرە نەخوێندەوارەکانیشی، دەروێشانەو، بەڕاستی بێوەجانە، سەر بە بەرەی رۆژهەلات بوون و، ئەوی رەخنەیەکی سووکەڵەی لەرژێمی سۆڤێت بگرتایە، ئەوا، یەکسەر بە نۆکەری ئەمریکاو بەریتانیاو ئیسرائیل دەدرایە قەڵەم و، ئەمەشم بە تاقیکردنەوەی تاڵ و تفتی خۆم زۆر بە قووڵی چێشتووە. هەرچەندە، بەرەی رۆژهەلات، نەک هیچ خزمەتێکی بەکێشەی کورد نەکرد، بەڵکو لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان، یەک بە یەک و، بەئاشکرا هاوکاریی دەکرد. پشتگیریی سۆڤێت، بۆ ئەتاترک و شای ئێران و خومەینی و سەددام و حافز ئەسەد، بەشێکە لەمێژووی رەشی سۆڤێت. ئەمە بێجگە لەوەی کە سۆڤێت، دوو جار ئەنفالی لە کوردی کوردستانی سۆر کردو، وڵاتەکەیانی بەخشی بە ترکە ئازەرییەکانی سۆڤێت، کەچی؛ حیزبە کوردییەکان و دارو دەستەکانیان، ئەمەیان دەشاردەوە، یان پاساویان دەهێنایەوە بۆی و، رۆژنامەکان و نووسینەکانیان، پڕ بوون لە زورناژەنی و پەسندانی رژێمی سۆڤێت و کلکەکانی لەئەورووپای رۆژهەلات و، رژێمی تیرۆریستی سۆڤێتیان، وەک "رزگارکەری گەلان"و "دۆستی کورد"و "قەڵای ئاشتی" دەدایە قەڵەم. ئەمەش کارێکی وایکرد؛ کە داگیرکەرانی کوردستان، بەڵگەی بەهێز بکەوێتە دەستیان بۆ چەوساندنەوەی کوردو، توانیان لەبەرەی رۆژاوای بکەمێنن، کە کورد دەسکەلای دەستی رژێمی سۆڤێتن و، پێویستە سەرکوت بکرێن. هەر لەئەنجامی ئەم رەوشە زیانبارەوە، نەتەوەی کورد، پەنجا ساڵ لەوە بێبەریبوو کە دۆزی خۆی بخاتە بەردەم کاربەدەستانی کامپی رۆژاواو،

ەوەش خیانەتێکە لەمێژوو، ئەگەر باسنەکرێ‌و، هەر لەبەر ئەوەش بوو، ئەز، وەك ەکەمین کورد، پەردەم لەسەر ئەم راستییە لابردو، ئێستەش، پاش ئەوەی ئارشیفە هێنییەکانی رژێمی سۆڤێت بەرەلا کران، رۆنبووەوە کە هەموو ئەو بۆچوونانەی کە چل سالٚ‌و پەنجا سالٚ لەمەوبەر، لەبارەی کوردو سۆڤێتەوە بلاومکردوونەتەوە، بەتایبەتی ۆڵی سۆڤێت لە هەرەسهێنانی کۆماری کوردستان‌و ئازربایجانداو، کردنی کوردو ترکە ئازەرییەکانی ئێران بە قوربانی نەوت؛ لەلایەن ستالینەوە، راستی راست بوون. (سەرنجی نامیلکەی: کوردایەتی: بزووتنەوەو برواو رژێم" کە بە نێوی خواستەمەنی "زەردەشت"ەوە لە 1960دا، واتە 45 سالٚ لەمەوبەر بلاومکردووەتەوە. هەروەها کۆمەڵە وتاری "الابجدیة الکردیة اللاتینیة بین دعاتها ومعارضیها" رد علی اضالیل وأباطیل جریدة "اتحاد الشعب" (ئۆرگانی پارتی کۆمونیستی عێراق) کە لەرۆژنامەی "صوت الاکراد" بەغدا 1960-1961 بلاو کراوەتەوە بدە).

لە بیست سالٚی کۆتاییی سەتەی رابوردوودا، دوو بوومەلەرزەی رامیاری‌و کۆمەلایەتی، لەجیهاندا روویاندا.

بوومەلەرزەی یەکەم، لەکۆتاییی حەفتاکاندا بوو کە خەڵکی ئێران بەرووی رژێمی دیکتاتۆرانەی شادا راپەرین‌و، ئەوەبوو رژێمی شا رووخاو، کۆماری ئیسلامیی ئێرانی لێدەرچوو، لەمەشەوە ئیدیۆلۆژیی ئیسلامی، لەقاڵبی ئاینزای شیعەیەتیداو، وەك پەیامێکی ئاسمانیی نێو نەتەوەیی، بەرەو دەرەوەی ئێران کەوتە جووڵەو، هێندەك دەسکەوتیشی لە گەلێك وڵاتدا بۆ خۆی بەدیهێنا.بوومەلەرزەی دووەمیش، دە ساڵێك دوای ئەوەو، لەکۆتاییی هەشتاکاندا بوو، کە رژێمی سۆڤێت بەجارێك هەرەسیهێناو، بوو بە هۆی گۆڕینی هاوسەنگێتی لەجیهانداو، لەئەنجامدا ئەمریکا بوو بەگەورەترین زلهێزی جیهان، نەك تاکە زلهێزی جیهان.

بە رووخانی رژێمی سۆڤێت، گەلێك گەل‌و وڵات، لەکۆت‌و زنجیری کۆیلەیەتی رزگاریان بوو، بەتایبەتی ئەورووپای رۆژهەلات‌و، تەنانەت دامەزراندنی "هەرێمی نەفرین" بەروبووی رووخانی کامپی رۆژهەلات بوو. ئەوجا بە یەککگرتنی هەردوو ئەڵمانیاکەو، یەککگرتنی رۆژهەلات‌و رۆژاوای ئەوروپا، واتە، دروستبوونی بلۆکێکی گەورە بەنێوی یەکێتیی ئەوروپاوە، هێزێك دروستبوو کە بتوانیٚ خۆی بەرامبەر ئەمریکا

راستبکاتەوە، ئەمەش بە دەستپێشکەریی فەرەنساو ئەڵمانیا هاتەدی، ئەو دوو دەوڵەتەی کە جاران پشتو پەنایان ئەمریکا بوو، بۆ پاراستنیان لە دەستدرێژیی سۆڤێتو، لە هیچ شتێکدا نەیاندەوێرا؛ دڵی ئەمریکا کرمێ بکەن، بەڵام ئەوەبوو لە جەنگی ئەمریکادا بەرامبەر رژێمی عێراق، دیشکەمیان لە هەڤاڵبەندێتیی ئەمریکا کردو، دەزگەی راگەیاندنی گشتیی هەردوو دەوڵەتەکەو فەرمانڕەواکانیان بووبوونە سەرچاوەی پروپاگەندەی دژ بە ئەمریکاو، بەتایبەتیی دژ بە سەرکۆماری ئەمریکا جۆرج دەبلیو بوش. ئەم هەڵوێستەی ئەڵمانیاو فەرەنسا، بوو بەهۆی هاندانی رژێمی دیکتاتۆری روسیاو چین کە بکەونە بەربەرەکانێی ئەمریکا، نەک هەر لەبارەی کێشەی عێراقەوە، بەڵکو بلۆکێکی دژ بە ئەمریکاش دروستبکەن، بۆ ئەوەی رێنەدەن؛ ئەمریکاو هەڤاڵبەندەکانی کە بەژمارە کەمن، بتوانن رێ لە ئێرانو کۆریای باکوور بگرن کە نەبنە خاوەن چەکی ئەتۆمو، لەهەمان کاتدا گرێبەندی بازرگانی، بە نرخی چەند ملیاردێك، لەگەڵ ئێران ببەستن، کە بەشێکی بۆ تەواو کردنی پرۆژەی ئەتۆمیی بووشەهرە.

ئەم هەڵوێستەی هێندەك لەوڵاتانی ئەورووپا دژ بە ئەمریکا، لەپاڵ هەڵوێستی چینو روسیادا، بوونەتە هۆی کەمکردنەوەی هێزی ئەمریکا. بەڵام بەشێکی گوناهەکەش لەوەدا، دەوکەوێتە ملی ئەمریکا خۆی. بەر لە هەموو شتێك ناشێتیی ئەمریکا لەچارەسەر کردنی کێشەی عێراق، بەتایبەتی؛ رۆیشتن لەسەر نەخشەی کۆلۆنیالیستانەی بەریتانیا کە لەپاش جەنگی جیهانیی یەکەم، سێ نیشتمانی جیاوازی، پێکەوە دروو، بەنێوی دەوڵەتی عێراقەوە. ئەوجا نەزانیو ژێنەهاتیی هێندەك لە کاربەدەستانی ئەمریکا لە عێراق، بەتایبەتیی پۆل برێمەر. دوایی، لاقلێدانی ئەمریکا، کە دژی تێرۆر دەجەنگێو، بۆ چەسپاندنی ئازادیو دێموکراسی تێدەکۆشێ، کەچی، هەروەك رژێمی ترکیای دژ بەکورد، سەیری کێشەی باکووری کوردستان دەکاو، گوێ لە راوێژی فەرمانڕەوایانی رژێمە تۆتالیتێرەکان دەگرێ، بە تایبەتی، میرەکانی سعودیەو کەنداو،و بەمە، رێبازی "بانێكو دوو هەوا" دەبا بەڕێوە.

لێرەدا پێویستە جەخت لەوە بکەم، کە هەڵەو گوناهی ئەمریکا هەرچییەك بێ، دەبێ ئەو راستییەش بخەمە بەرچاو کە ئەم هەوڵدانە دژێوەی فەرەنساو ئەڵمانیا، شان بەشانی هێندەك لەسیاسەتکارە کۆنە چەپاژووەکانی ئیتالیاو ئیسپانیا وەك رۆمانۆ

ـدی‌و زەباتیرۆ، بەنیازی ئەوەی هاوسەنگێتییەك لەنێوان ئەمریكاو ئەوروپادا ـستبكەن‌و، خۆیان، گوایە لە خواردەستێتی ئەمریكا رزگار بكەن، نەك هەر ئەو ـسەنگێتیە دروستنەكرا پێیان‌و بەس، بەڵكو بەم كردەوەیەیان جیهانیان كردە ـانێكی شڵەقاو. ئەوەتا، دەستوەشاندن لە بەرژەوەندییەكانی ئەوروپا، لەنێو ـروپا خۆیدا، باسی رۆژانەی دەزگەكانی راگەیاندنی گشتییە. هەر بۆ نموونە: ـرێی رۆژی هەینی 2006/10/27 چەند كەسێكی دەموچاو داپۆشراو، ـەرەكێكی كەناری شاری پاریس، ئاگریان لە دوو پاسی گەورە بەردا و، ـوتیژیی بۆ رۆژانی دواییش هەر بەردەوام بوو. ئەم كردەوەیەش بۆ ساڵیادی ـڕینی خەڵكی گەڕەكە هەژارەكانی پاریس بوو كە پار لەم رۆژانەداو بۆ ماوەی 3 ـتە خۆپێشاندان درێژەیكێشاو پتر لە دە هەزار ئۆتۆمبێل‌و 300 قوتابخانەو ـانگەی حكوومەتی سووتێنران (رۆژنامەی بەرلینەر مۆرگن پۆست، ـ2006/10). سەرەتای مانگی ئۆكتۆبەریش، لەیەكێك لە وێستگەی ـەندەفەرەكانی رۆژاوای ئەڵمانیا، جانتایەك دۆزرایەوە كە بۆمبایەكی تێدا ـرابوو، كە بەڕێكەوت نەتەقی، خۆ ئەگەر بتەقیایە، گۆلاوێكی خوێنی لەدوای ـیەوە بەجێدەهێشت.

ورت‌و كرمانجی، دژایەتیكردنی هەڵوێستی ئەمریكا لە پەلاماردانی رژێمی ـدامدا، لەلایەن فەرەنساو ئەڵمانیاو هێندەك لایەنی دیكەی ئەوروپاییەوە، ئەمانی ـراست‌و ناپارێزێ. بێجگە لەوەش خراپەكاری‌و دەستدرێژیی چەند سەربازێكی ـریكایی بۆ سەر هێندەك لە گرتووەكانی ئەبو خرێب، كە بووبوو بە بابەتی رۆژانەی ـیاكانی ئەڵمانیا بۆ زڕاندنی نێوی ئەمریكا، زۆر درێژەی نەخایاند كە، دەستدرێژیی ـیازانی ئەڵمانی لە ئەفغانستان، لەم رۆژانەدا لە هەموو جیهاندا بڵاو ـەتەوە.رۆژنامەی بیلد Bildی ئەڵمانی باس لە هێندەك وێنە دەكا، كە ـركایەتیكردنی سەربازی ئەڵمانیا بە هێسك‌و كەللەسەری مردوو پێشاندەدەن‌و، ئەوە ـاتەڕوو كە سەربازانی ئەڵمان، كە گوایە چوونەتە ئەفغانستان بۆ پاراستنی خەڵكی ـیێ، كەچی؛ بە هێسكی مردوو تیپ دەچنن بەشێوەی دێڕی نووسراو (رۆژنامەی ـینەر مۆرگن پۆست، 2006/10/28، ل1). ئەوجا شەڕی ئیسرائیل‌و حیزبوڵڵاو

شەڕی دارفورو شەڕی تامیلەکان لە سریلانکا، بەشێکن لە لیستەی درێژی ئاژاوەی نێو جیهان.

شڵەقاندنی جیهان، بوو بەهۆی ئەوەی پووتینی رووسیا، سووت لە بێزار بوونی خەڵکەکە وەربگرێ کە لە دیموکراسیێتیی و سەربەستیی سەردەمی یەلتسین دا، لووتیان لە دزێتی و جەردەیەتی و بەرتیل خۆری و بۆگەنی گەندەڵیی کاربەدەستانی هەلپەرست پڕ بووبوو و، توانی، خۆی بکاتە کەڵەگای رووسیاو، هەستی شۆڤێنزمی رووس بهرووژێنێ و هەمووجۆرە ئازادییەك نەهێڵێ و، خەڵکەکەشی چەپڵە لێبدەن بۆی و ئافەرینی بکەن. راستییەکەی پووتین تاکە دیکتاتۆر نییە کە جەماوەری برسیکراو و ساویلکەو لەخشتە براو، چەپڵەلێبدا بۆی و، ئەویش بکەوێتە قەلاچۆ کردنی هەموو رەخنەگرێك. هەر لەسەردەمی پووتیندا، 12 رۆژنامەوان تێرۆر کران کە ئانا پۆلێکوڤسکایا دوایزاەهەمینیانە. لاشەی ئانا لەرۆژی 10/8دا لە ئەپارتمانەکەیدا دۆزرایەوە. ئانا، ژ نە رۆژنامەنووسێکی ئازاو بەجەرگ بوو کە رەخنەی لە سیاسەتی پووتین دەگرت لەبارەی چەچەنستانەوە. ئانا، لە یەکێك لەوتووێژەکانیدا، باسی ئەوەی کردبوو، جارێك سەربازی رووس چەچەنییەکی موسڵمان دەکوژن، لاشەکەی بەپارەیەکی زۆر دەفرۆشنەوە بە کەسوکاری، تاکو بەپێی ئاینی ئیسلام بینێژن، بەمەش خراپەکاری و نامرۆڤدۆستیی لەشکری رووسی لە چەچەنستاندا خستبووەڕوو. کەواتە ئێستە نابێ سەیر بێ لامان کاتێك کە بزانین، هەڵسوکەوتی سەربازانی رووس لە چەچەنستان ئاوابێ، وەزیری دەرەوەی رووسیا "خەم بنیشێ لێی" بۆ "ئەگەری پارچە پارچە بوونی عێراق" ولەوە نارازیبێ...!! وەك چەند رۆژێك لەمەوبەر رۆژنامەکان باسیانکرد.

ئا لەم جیهانە شڵەقاوەدا، کورد دەرفەتێکی باش هەڵکەوت بۆی، کە ئەگەر سەربەخۆییشی، بەجارێك دەستنەکەوتایە، ئەوا هیچ نەبێ هێندەك لە مافە بنەڕەتییەکانی بۆ دەهاتە دی. بەڵام سەرکردەکانی حیزبەکان، کە پەنجا ساڵ بوو فێری ئەوە بوون، هەرچییەك لەسۆڤێتەوە دەربچێ، بە "پیرۆز" و "نەتەکێن" (مصون)ی بزانن، کە ئەو رژێمە هەرەسیهێنا، بەجارێك ئەترەشیان چوو و، ئەمجارە هانایان بۆ ئەمریکا بردو، لەو کاتەوەو تائێستە بەموو لەسیاسەتی ئەمریک

ەچوون. لێرەدا، مەبەستم ئەوە نییە کە کورد دژایەتیی ئەمریکا بکەن، نەخێرو
ر... دژایەتیکردنی ئەمریکا، کارێکی زۆر چەوت و چەویلەو، بەدڵی داگیرکەرانی
ستانە. بەڵام، ئەگەر کورد لەسنووری رێزگرتن لە بیروڕای ئەمریکا، بۆ خۆشی
ە پلان و نەخشەیەکی خۆی هەبێ، ئەمە بەهیچ جۆرێك دژایەتیکردنی ئەمریکا
بێنێ. کەسانێك کە وتارەکانی منیان لە "میدیا"دا خوێندووەتەوە، لەبارەی
ندیی کوردو ئەمریکاوە، کە پێش و پاش رووخانی سەددام نووسیومن، دەزانن
یشە گوتوومە کە "ئەمریکا برای باوکی کەس نییە"، زلهێزێکە کە بەرژەوەندیی
تیژی و ئابووری و... هتدی خۆی هەیەو بیر لەوە دەکاتەوە،مافی خۆیەتی
بکا. دەبا کوردیش، وەك مافی خۆی، بیر لەبەرژەوەندیی خۆی بکاتەوەو کەلکێك
جیهانە شڵەقاوە وەربگرێ و، ئەوەش بخاتە بەرچاو، کە هەموو بەرژەوەندییەك،
ێ لە دەرفەتی لەبارو گونجاودا سەردەگرێ. هەر بۆ وێنە: کە سەرکردەکانی
تی و پارتی رازیبوون بە چوونە هەڵبژاردن و دەنگدان بۆ دەستوورو، ئێستەش هی
ەیە، وەك بەڕێز فەلەکەدین کاکەیی کە دەبێژێ "پەشیمانم"،ئەوا ئەز هەر لەسەرەتاوە
چوونە هەڵبژاردن و دەستوور بووم، چۆنکە هیچ گەرەنتییەکی لەگەڵ نەبوو. دوایی
ئەو سەرکردانە، گوتیان، ناچنە هەڵبژاردن و دەنگدان، تا کێشەی کەرکووك چارەسەر
ێ، کەمێك دڵم خۆش بوو، بەڵام هەر دوای ئەوە گوتیان "ئەمریکاو بەریتانیا بەڵێنیان
، هەر پاش هەڵبژاردن کێشەی کەرکووك بڕیننەوە". پاشان، چوونە هەڵبژاردن و،
ێن"ەکەش خۆیان خۆش! ئەوجا کێشەی کەرکووك کەوتە کۆتایی 2007، کە ئێستە
لەوەی دەکرێ، ئەمریکا بۆ رازیکردنی دڵی رژێمی ترك، دە ساڵ دوای بخا. باشە،
هی ئەمە بە ئەستۆی کێیە؟

دڵنیاییەوە، ئەگەر پارتی و یەکێتی ئەو رۆژە پێیان دابگرتایەو نەچوونایە
ژاردن، هەڵبژاردن سەرینەدەگرت، چۆنکە سوننەکان بۆیکۆتیان کردبوو. ئەودەمە
یکاش و بەریتانیاش ناچار دەمان، کێشەی کەرکووك بەلایەکدا بخەن، کوردیش
، بێڕێز نەدەبوون، بەڵکو رێزیشیان پتر دەبوو. ئەمەتا، یەکێکی وەك نووری مالیکی
گەڕەکێکی بەغدای پێ دانامرکێ، دەچێ لەڕووی جۆرج بوشدا وەردەگەڕێتەوەو
ەڵێ "کەس مافی ئەوەی نییە خشتەی کار بۆ حکوومەتی عێراق دەستنیشان

بكات"و جۆرج بوشيش، پاش ئەوەی كە هەڕەشەی كردبوو و گوتبووی "ئارامگرتنیش سنووری هەیە"، پاشگەز دەبێتەوەو دەبێژێ "هیچ گوشارێكم نەخستووەتە سەر مالیكی، مالیكی پیاوی ئەمریكا نییە، دۆستی ئەمریكایە"، دەبا سەركردەكانی كوردیش، پەڕۆیەك لە مالیكی دادڕن. یان، ئەوەتا دەبینین، حسەینی شەهرستانی كە بە بنەچەو رەچەلەك فارسێكی ئێرانییە، دەیەوێ ئەو گرێبەندانەی كە حكومەتی هەرێم لەگەڵ كۆمپانییەكانی گەڕان بەدوای نەوتدا بەستوویەتی، فتی بكات، كەچی حكوومەتی كوردستانیش دەفەرمووێ: "ئێمە بەپێی دەستوور كارمان كردووە". شەهرستانییەك كە ئەوڕۆ دەسەڵاتی ئەوەی نییە، كێشەی سووتەمەنیی رۆژانە لە وڵاتە پڕ نەوتەكەیدا بۆ خەڵكی بەغدا دابین بكات، یان لە پاراستنی بۆڕیە نەوتەكانی دڵنیا بێ، ئەوە قسەیەتی. خۆشم چەند جار باسی ئەوەم كردووە كە دەستوور، وەك پەرژینی باخەو، پەرژینیش بۆ مرۆڤی بە ناموسە. دەستووریش بۆ كۆمەڵگەیەكە كە رێزی دەستوور بگرێ. ئەوجا شەهرستانی و دەستوور؟ هەر بە زمانە فارسییەكەی خۆی دەبێژم "كجا مرحبا!" شەهرستانی، ساڵانی ساڵ لەبەر دەستی سەددام دا خەریكی لێكۆڵینەوەی ئەتۆم بوو. لەوتووێژەكانیشیدا لەگەڵ رادیۆی "العراق الحر" كە بەپارەی "سیا" دەچوو بەڕێوە، هەمیشە لەدژی فیدرالی قسەیدەكرد. باشە، بۆچی حیزبە كوردییەكان، لەباتی وەزارەتی دەرەوە، كە هیچ سووتێكی بۆ كورد تێدا نەبوو، با عەرەبكردنەوەی عێراق نەبێ بەدەستی كورد، پێیان لەسەر وەزارەتی نەوت دانەگرت؛ لەكاتێكدا كە بەشێكی گەورەی كێشەی كوردستان، كێشەی نەوتە.

بەڕاستی، زۆر نەنگە، كە حیزبە دەسەڵاتدارەكانی كورد، هێندە دڵی داگیركەرانی كوردستان رادەگرن و، هێندەش بەرامبەر چارەنووسی كوردستان كەمتەرخەمن. ئەگەرنا، بۆچی دەبێ هەزاران و هەزاران خێزانی عەرەب بتوانن رووبكەنە كوردستان و نرخی ژیانی رۆژانە واگران بكەن كە كوردستانییەكی سادە، زۆر بەزەحمەت بتوانێ نانەرەقێك بۆ دەمی ببات، بەڵام كوردێكی لێقەوماوی وەك شێخ مورشیدی خەزنەوی كوڕی فرە زاناو شەهیدی كوردستان، شێخ ماشووقی خەزنەوی، كە ژیانی لەمەترسیدایەو دوو مانگە چاوەڕوان دەكا، رێنەدرێ پێی، بێتە هەرێمی كوردستان؟ تكایە كاربەدەستان وەرامی ئەم پرسیارە بدەنەوە.

ربەدەستانی کورد، هیچ گەرەنتییەکیان بۆ دواڕۆژی خەڵکی کوردستان نەکردووە. کوردستان کوردستانێکی تەقولەقە، کە لەنێو جیهانێکی شلەقاودا ە لەرزێتی، بۆ ڕۆنەچوونی، پێویستی بەدەستی بەهێزو بیری تیژە کە یبکات. بەدڵنیاییەوە دەبێژم کە ئەوەش بە حیزبحزبێنە ناکرێ، بەڵکو بە گەلە ەیەکی کوردستانێتی دێتەدی.

رلین 2006/10/29

**یدیا**، ژ 264، 2006/11/7

# سەرنجێك لەبارەی دیرۆكی ئاڵای كوردستانەوە

یەكێك لەو ناتەواوییە بەرچاوانەی كە لەمێژووی كورددا، بەدیدەكرێ و، كەلەبەرێك
زەقی خستووەتە بەردەم ئەوانەی لەرابوردووی ئەم نەتەوە كولۆڵە دەكۆڵنەوە، ئەوەی
كاتێك شتێك لەكوردستاندا روویداوە، پێنووسبەدەستانی كورد، دەمودەست
تۆماریان نەكردووەو، ئەم كەموكورتییەش، نەك هەر دیرۆكی كۆن، بەڵكو سەردەم
نوێش دەگرێتەوە. با زۆر دوور نەڕۆین، و بپرسین: چەند پەرتۆك، تائێستە، لەبارە
شۆرشی ئەیلوولەوە، كە 14 ساڵ درێژەیكێشا، نووسراوەتەوە، بەمەرجێك، ر
بەرۆژ، هەرچییەك قەومابێ، تۆمار كرابێ تێیدا؟ من لەساڵی 1971دا، زنجیرەیە
وتاری سەمیناریم لەبەرلین، بەزمانی ئەڵمانی، لەبەردەم كوردو دۆستانی كورد
لەبارەی شۆرشی ئەیلوولەوە، پێشكێشكرد، كەدوایی بوو بەپەرتووكێكی چەند سە
لاپەرەیی و، بەنێوی "كوردستان و شۆرشەكەی"یەوە، لەساڵی 1972دا، لەلایە
"یەكێتیی نەتەوەییی خوێندكارانی كورد لە ئەوروپا" (نوكسە NUKSE)ەو
چاپكراو، لەساڵی 1985دا كرا بەكوردی و، هەر ئەوساڵەش لەسوێد چاپكرا. بەڵا
ئەمەش هەموو بەسەرهاتێكی رۆژانەی شۆرشی نەگرتووەتە خۆی.

ئۆباڵی ئەمەش، بەئەستۆی ئەو خوێندەوارانەیە كەنانخۆرو كاربەدەستی شۆر
بوون و، هیچ بەرهەمێكیان لەم بارەیەوە نەخستە بەردەم خەڵك و هێندێكیشیان
لەدەركەوتنی پاشەڵی خۆیان دەترسان، بەهەموو شێوەیەك دژی ئەو پەرتۆكەی ە
وەستان.(1)

ئەمەش، هەر نموونەیەك بوو، ئەگەرنا نموونەی لەم بابەتە زۆرن و، ئەنجاه
بێسەروبەرەكەشی، ئەورۆ دەبینین. ئەوەتە، لەم رۆژانەدا، لەلایەن گەلێك كەسەو
باسی ئاڵای كوردستان دەكرێ، هێندەك دەنگی گێرەشێوێنانەو ناسازیش، لەم
لەو لاوە، بەرزبوونەتەوە، داوای گۆرینی ئاڵای كوردستان دەكەن، وەك ئەوەی گۆری
ئاڵا، لیستكی زارۆكان بێ. بەڵگەشیان بۆ ئەم خۆ دەرخستنە، بەپێی نەری
"پێچەوانە بوەستە، تا بناسرێیت"، ئەوەیە، كە ئاڵای كوردستان "درۆشمی گە
ناكوردەكانی كوردستانی تێدا نییە"، وەك ئەوەی ئەم ئاڵایە، ئاڵای كورد بێ
ئاڵایەكی نیشتمانیی كوردستانی نەبێ. ئەوانە، ئەوەیان لەبیركردووە، یان لەبی

يان بردووتەوە کە ئاڵای کوردستان سیمبولی وڵاتی کوردستانە. ئەو نەتەوانەش لە تەك کورد دا لە کوردستان دەژین و خۆیان بەکوردستانی دەزانن، ئەوە ەگەن. چۆنکە ئەگەر ئاڵای وڵاتانی فرە نەتەوە لە سیمبۆلی نەتەوەکان پێکبێ ئەوا کانیان وەك شەڕە پشیلەیان لێدیٚ.

ئەم بەڕێزانە، چاوەڕوانی ئەوە ناکەن، تابزانن چارەنووسی کوردو کوردستان، بەچ کدا دەکەوێ، ئەوسا خەمی ئاڵاکە بخۆن و، شمشێرێکی سۆری سعوودیانەی ڕەبە ڕەسەنەکان"ی کوردستان بخەنە نێو ئاڵای تیشك هاوێژوکەسك و سۆری تیخوازانەی کوردستانەوەو، شمشێرەکە بکەنە دروشمی ئەو عەرەبانەی کە ڕژێمی اق لەماوەی هەشتا ساڵدا، بەچەند گوژمێك هێنانیە کەرکووك و مووسڵ و دیالەو وت و، ئەوڕۆ ئەوانە، بوونەتە "عەرەبی ڕەسەن"و، ئەو عەرەبە دەوڵەمەندانەی ئەوڕۆش، پارتی و یەکێتی، نابەرپرسیارانە،دەیانهێننە هەولێرو سلێمانی و دهۆك دەبنە خاوەنی خانوو و زەوی و زارو دوکان و قوتابخانەی عەرەبی دەکرێتەوە بان، دوارۆژ، ئەوانیش دەبنە "عەرەبی ڕەسەن". ئەی کاتی خۆشی مەلیك فەیسەلی ستنێژی بەریتانیا، عەرەبی نەهێنایە حەویجەو دەشتی شارەزوور، کە ئەمانەی ایی، بە "جيب الگوريس" بەنێو بانگبوون! بەڵام هاوار بۆ کێ بەرین وبلوێر بۆ کێ دەین؟!

ئەمەیان واو، لەلایەکی دیکەشەوە، گەلێك نووسین و بیروڕا، لەبارەی بنجوبناوانی یدابوونی ئاڵای کوردستانەوە، بڵاوبوونەتەوە، کە بەلێوردبوونەوەیەکی ژیربێژانە، ست دەرناچن، لەبەر ئەوە، وامبە باش زانی، ئەوەی ئەز لەم ڕووەوە بیستوومە، ەمە سەر کاغەز، بەشکم ببێتە هۆی پڕکردنەوەی ئەم کەلێنە.

سەرەتای پەنجاکانی سەتەی رابردوو بوو، کەئەو دەمە خوێندکاربووم لەزانستگەی غدا، جارێکیان، بەبۆنەی ڕۆژی نەورۆزەوە، لەدوکانی (ئوستاد) بەشیر موشیر یشتبووم، ژمارەیەکی زۆر کوردی بەتەمەن هاتنە ئەوێ، کەمەر ئەز بەتەنێ نێوانیاندا گەنج بووم، ئەوەشم بۆیە واباش لەبیرە، چۆنکە جێژنی نەورۆز بوو، ێژنی نەورۆز، ئەو سەردەمە، هێشتا نەکرابوو بەپشووی فەرمی (ڕەسمی) لەعێراقدا، گەڵ ئەمەشدا، ئەو ڕۆژە نەچوومە زانستگەو لەخزمەت "ئوستاد"دا بووم. چەند

کوردێك لەدوكانی "ئوستاد" کۆبووینەوە، بۆ ئەوەی پێکەوە بچینە ماڵی رەحمەتی مارف جیاووك بۆ پیرۆزباییکردن. ئەوانەی لەوێ بوون، هێندەی لەبیرم مابێ، ئەم بەڕێزانە بوون: مامە شاكیر مەجرووم، مامۆستا رەفیق حیلمی، عەقید ئەمین رەواندزی، عەقید عارفە سوور(2)، رەفیق چالاك، عەقید جەمال عارف کەرکووکی، عەبدولقادر قەزاز، مەلا واحیدی هەولێری و چەند کەسێکی دیکە. لێرەدا دەبێ بێژم کە "مارووف جیاووك"(3) خۆی دامەزرێنەری "یانەی سەرکەوتن" بوو، بەڵام لەبەرئەوەی کوردە دەستڕۆیشتووەکانی بەغدا، نێوانیان لەگەڵ مارف جیاووك خۆشنەبوو، کرێی خانووەکەی "یانە"یان نەدابوو، لەمەوە چالاکیی "یانە" چەند ساڵێك بوو راوەستابوو، رەحمەتی، مارف جیاووك، ناچار بوو بوو، هەر بۆ مانی نێوی "یانە"، ماڵەکەی خۆی بکاتە "یانە". بۆ ئەمەش تابلۆیەکی بەکوردی و عەرەبی بەسەر دەرگەی ماڵەکەیدا کە لەنزیك "باب المعظم"ەوە بوو، هەڵواسیبوو، لەسەری نووسرابوو "یانەی سەرکەوتنی کورد/ نادی الارتقاء الكردي". کورت و کرمانجی، کە لە سەردانی ماڵی مارف جیاووك، گەڕاینەوە، لەنێوان قسەکانماندا، باس هاتە سەر ئەوەی کە بۆچی مارف جیاووك، ئاڵای کوردستان، بەسەر تابلۆکەوە هەڵناواسێ و، ئەگەر ئەمەیکرد، هەڵوێستی حکوومەتی عێراق، چ دەبێ. لەمەشەوە، قسە هاتە سەر سەرچاوەی هاتنەکایەی ئاڵاکەو،هەر یەکەش لەئاوازێکی دەخوێند.

مامە شاكیر مەجرووم، رەوانی شاد بێ، منی وەك برازای خۆی تەماشا دەکردو، کەدەیدی لەنێو گەنجەکانی ئەو زەمانەدا، کەم هەن وەك من، ئارەزووی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئەو پیرانەدا هەبێ و، بەدوای دەنگوباسی کۆن و بەسەرهاتی ئەوانەدا بگەڕێن، زۆر پێیخۆشبوو و دەیگوت "ئومێدم بەتۆ زۆرە بۆ دواڕۆژ" و، منیش، هەر بەمامە شاكیر قسەمدەکرد لەگەڵی. مامە شاكیر، ماڵی لە رواندز بوو، بەڵام زوو زوو دەهاتە بەغدا. بەڕاستی رۆشنبیرێکی گەورەی کورد بوو و، لەپێناوی نیشتمانپەروەریدا گەلێك دەربەدەری و برسێتی و سەختیی ژیانی چێشتبوو. هاوکارو هاودەنگی راستینەی شێخ مەحموود بوو. گەلێك هۆنراوەی رۆژانی شانشینێتی خوارووی کوردستانی لەبەر بوو. رکێکی ئەستووری لەمێجەرسۆن بوو، دەیگوت میجەرسۆن کوردیزانێکی بە بەهرە بوو، دژی کوردیش نەبوو، زۆر حەزی بەوە دەکرد

کەکوردستان ببێتە دەوڵەت، بەڵام دەیویست خۆی بکەنە شای کوردستان، نەك شێخ مەحموود. دەیزانی کەئینگلیزەکان، عەرەبێکی دەرەوەی عێراقیان هێناوەو، تانجیان کردووەتە سەر، بیری لەوە دەکردەوە، بۆچی ئەو لەمەلیك فەیسەل کەمتربێ. لەبەر ئەوە، دوژمنایەتیی شێخ مەحموودی دەکرد. مامە شاکیر دەیگوت، مێجەرسۆن زۆر "تڕزل"و یەکجار "بەفیز"و "قسەتڕن" بوو، بەپێچەوانەی مێجەر نۆئێل، کە زۆر هێمن و لەسەرخۆو روو خۆشبوو. مامە شاکیر لەسەردەمی شانشینێتیی باشووری کوردستاندا، بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود، وەزیری پۆستەو تەلەگرافی حکومەتی کوردستان بوو. ئەم شاخو ئەو شاخ دەزگەی تەلوگرافناردنەکەی لەگەڵ خۆی دەگواستەوە. ئەو لەبارەی ئاڵای کوردستانەوە ئەمەی خوارەوەی فەرموو:

ئاڵای کوردستان لەسەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، لەلایەن هۆنەری نیشتمانپەروەری کورد، ئەحمەد موختار جافەوە(4) لەمەڵبجە نەخشەیکێشراوەو، دوایی پاش تەواوبوونی جەنگ، لەلایەن مێجەر نۆئێلەوە براوە بۆ سەرکردە کوردەکانی باکووری کوردستان، لەکاتێکدا کە مێجەر نۆئێل بەدزییەوە گەشتێکی بەوێدا کردووە.

لەبارەی رەنگەکانیشەوە گوتی: رەنگەکان لەرەنگەکانی سروشتی جوانو رەنگاورەنگی کوردستانەوە وەرگیراوە(5)، بۆ خۆرەکەش گوتی ئەوە بەرامبەر مانگی عوسمانییەکان دانراوە، چونکە بیروڕای ئەحمەد موختار وابوو، بووە (وجود) یەك رێزی هەیەکە ببەخشێ، نەك دەستندەخۆر بێ. خۆر رۆناکیو گەرما دەبەخشێو، مانگیش وەریدەگرێ. ئەگەرنا مانگ لەخۆیدا ساردو تاریکە. لەگەڵ ئەمەشدا، بابەتی "خۆر"، کە بەشێکە لە میتۆلۆژیای کوردو میزوپۆتامیا، قسەی زۆر هەڵدەگرێ، کە جێی ئێرە نییە.

هەر لەم بارەیەوە جارێکیان پرسیارم لە کاك رەشید شەوقی (برای مامۆستا عەلی ئاگا) کرد، کاکە رەشید شەوقی، ئەو پیاوە بوو کە لەگەڵ ساڵح زەکی ساحێبقڕان، پێکەوە لەبەغدا گۆڤاری "دیاریی کوردستان"یان دەردەکرد. کاکە رەشید مرۆڤێکی زۆر نیشتمانپەروەر بوو. لەسەردەمی عوسمانییەکانداو،لەکاتی جەنگی یەکەمدا، ئەفسەری عوسمانی بوو لەنێوچەی هەورامانو، پێوەندییەکی باشی بە سانەکانی هەورامانو کوردە گۆرانییەکانەوە بەستبوو. گەلێك زانیاری لا هەبوو. لەبەر ئەوەی

دراوسێی ماڵمان بوو لەسلێمانی، زوو زوو چاومان بەیەك دەكەوت. ئەو دەیگوت؛ ئاڵای كوردستان لەسەردەمی جەنگی یەكەمیی جیهانییەوە هەیە.

ئێستە دەبێ بێژم، ئەوەی كە دەگوترێ، ئەو ئاڵایە لەلایەن گۆتفرید یۆهانس مویلەری(6) ئەڵمانەوە، یان رەمزی نافیع رەشیدەوە دروستكراوە، بەدڵنیاییەوە راست نییە. چۆنكە ئەز خۆم لە شەستەكاندا كە چاوم بە مویلەر كەوت و، قسەمكرد لەگەڵی و چەند جاریش لە شەستەكان و حەفتاكاندا، چاوم بە رەحمەتی میر كامەران بەدرخان كەوت، میر كامەران دەیگوت، ئەو ئاڵایە لەسەروبەندی هاتنەكایەی پەیمانی سێڤردا (كە لەساڵی 1920دا بەسترا) لەلای جەنەراڵ شەریف پاشا بووە. ئەوەش دەزانین، كە شەریف پاشا خەڵكی سلێمانی بوو، كە لە ئەستەمبول و سوێد دەژیاو، پێوەندییەكی توندوتۆڵی بەسەركردە كوردەكانی باكوورەوە هەبوو. هەر لەو كاتەشدا، لە ئەستەمبولْ، ژمارەیەك كوردی خەڵكی سلێمانی دەستڕۆیشتوو، دەژیان وەك؛ جەنەراڵ حاجی مستەفا پاشای یاموڵكی، جەنەراڵ ئەمین زەكی بەگ، عەقید تۆفیق وەهبی، هۆنەر پیرەمێرد و قانووناس جەمال بابان و كیّ و كیّ.

زانای گەورەی كورد مامۆستا مەلا محەممەدی قزڵجی (توورجانی)، هاوكاری سمایل ئاغای سمكۆ، دەرهێنەری رۆژنامەی "رۆژی كورد- شەوی عەجەم"(7) لەورمیّ و، پەنابەر لەعێراق و، مامۆستای كۆلێجی (شەریعەت) لەئەعزەمیەی بەغدا، كە زوو زوو سەردانی دوكانی (ئوستاد)ی دەكرد، خۆشم جاروبار گوێم لەوانەكانی دەگرت، ئەگەر بە ئێواران بوایە، جارێكیان فەرمووی: كە ئەو ئاڵایە لە رۆژهەڵاتی كوردستان، لەسەردەمی سمكۆدا هەبووە، پاشان كەوتووەتە لای دوكتۆر عەزیز زەندی (8)، كە لەكۆتایی ساڵی 1937دا كۆمەڵەی "ئازادیخوازی كوردستان"ی دامەزراندو، بەتێكچوونی حیزبەكەی و هاتنەكایەی كۆمەڵەی ژێكاف، كەوتە لای دامەزرێنەرانی ژێكاف. بەڵام كۆمەڵەی ژێكاف، لەبەر ئەوەی دڵنیا نەبوو، لەوەی هەل بۆ كورد هەڵدەكەویّ، "قەوارە"یەك بۆ خۆیان ساز بكەن، جاریّ ئاڵاكەیان لەگۆڤارەكەیاندا "نیشتمان" چاپنەكرد، بەڵكو تەنیّ "خۆر"ەكەیان چاپكرد لەنێو بازنەیەكدا. دوایی، كە كۆماری كوردستان داخۆیانیكرا، ئەوجا، پێشەوای شەهید، قازی محەممەد، ئەو ئاڵایەی كرد بە ئاڵای كۆماری كوردستان. شایانی باسە لەو

ێکۆڵینەوەیەدا کە لەبارەی گۆڤاری "نیشتمان"ەوە، کە ساڵی 1983 دا بەکوردیو
ەڵمانی نووسیومەو، لە 1985 لەسوید چاپکراوە، بۆ یەکەمجار رۆژو مانگو ساڵی
امەزراندنی ژێکاقم، لەبەر رۆشناییی لێوردبوونەوە لە "نیشتمان" ئیسپاتکردووە کە
16 ئەیلوولی 1942 بووە، بەڵام رێککەوتنی رەمزیو مویلەر بۆ هاوکاریکردن لەگەڵ
ەك، لەساڵی 1943دا بووە. راستە مویلەر لەسییەکاندا، ئەفسەری دەزگەی ئاسایشی
سوپایی ئەڵمانیا بووە، وەك لەنامیلکەیەکەیدا کە لەساڵی 1937دا بەنێوی
'خۆخزاندنە کوردستانی داخراوەوە" بڵاویکردووەتەوە، بەڵام بەڕاستی باوەڕ ناکەم،
ە چیرۆکەکە هەمووی بەو شێوەیە بووبێ کە بۆمان دەگێڕێتەوەو، ئەم وتارەش جێی
ەوە نییە کە لەسەر ئەم بابەتە پتر بڕۆم.

بەرلین 2006/11/11

ژێدەرەکان:

1- بۆ خوێندنەوەی "کوردستانو شۆرشەکەی" سەرنجی ماڵپەڕی "کورد بوون"
دریٚ:

www.kurdbun.net، www.kurdbun.com، www.kurdbun.de.

2- موقەددەم عارفە سوور، کۆنە ئەفسەری سوپای عێراق بوو و، لەپەنجاکاندا
خانەنشین بوو. زۆر قەڵەو بوو، بەگران بەڕێدا دەڕۆیشت، بەڵام مرۆڤێکی زۆر سەرو
زمان شیرینو نیشتمانپەروەر بوو. محەممەد بریفکانی هەبوو، کە لە بەغدا رۆژنامەی
'الجبل (چیا)"و دوایی "پێشکەوتن"ی دەردەکرد. بریفکانی زمانی جۆرێك بوو کە،
ر"ی وەك "ظ" دەردەچواند، دەیگوت "عاظفە/ سووظ/ کوظد/ نییە" (عارفە سوور
کورد نییە) دەمگوت بۆ چی، دەیگوت "کوظە/ بابە/ پیظە/، ئێظە/ و/ ئەو/ بن
یواظە/ ناتوانێ ظاکا: (کوڕە بابە پیرە، ئێرەو ئەو بندیوارە ناتوانێ راکا). واتە، لای
حەمە بریفکانی، ئەوی نەیتوانیایە رابکا، کورد نەبوو. کە ئەمەم بۆ موقەددەم عارف
گێڕاوەو، گوتم ئەرێ دەزانیت تۆ کورد نیت؟ گوتی: چۆن؟ ئەو قسەیە چییە؟ گوتم؛
حەمە بریفکانی دەبێژی "عارفە سوور کورد نییە، پیرە، ئێرەو ئەو بندیوارە ناتوانێ
راکا". گوتی "یەك مەتریش ناتوانم راکەمو کوردیشم". ئەوەشمان کردبوو بە گاڵتە
ەنێوخۆماندا، تەنانەت هەژاری موکریانی، کاتی نەخۆشییەکەی کە چووم لەگەڵی بۆ

وێستگەی شەمەندەفەر لە بەغدا بۆ بەڕێکردنی بەرەو هەولێرو شەقلاوە تا لەوێ بحەسێتەوە، لەوێوە هۆنراوەیەکی نارد بۆم کە باسی چاویلکەی سەرچاوی من و دوکانی ئوستادو گەلێ شتی کردبوو (کە لەدیوانەکەیدا چاپینەکردووە، بەلام دۆکتۆر عێزەدین مستەفا، لەو پەرتۆکەدا، کە بەنێوی "ئوستاد"ەوە بلاویکردووەتەوە ،هۆنراوەکەی چاپکردووەو لەوێدا هاتووە:

سوێندم بەو یانەی، هیچ بۆ کورد ناکا

بەو عارفە سوورەی، ناتوانێ راکا

سوێندم بە بەشیر، بە شیعرو "ئیمضا"ی

بە کیژی رەشید، بە بەژن و بالای

سەرنج: ئوستاد، شتێکی بە هی خۆی دەزانی کە ئیمزای کردبێ، بە ئیمزاشی دەگوت "ئیمضا".

3- نووسیومە "ماڕووف جیاووك" چۆنکە "ئوستاد" وشەی "مەعرووف"ی دەگرد بە "ماڕووف" (بەڕێی قەلەو) بۆ وێنە بە مامۆستا مەعرووف خەزنەداری دەگوت؛ "ماڕووف خەزنەدار"و ئەمەش دەستوورێکی زمانەوانیی کوردیی زۆر راستە، بۆ وێنە "کەعبە"، دەبێتە "کابە" واتە، دەنگی ئاa جێی ئەع،e دەگرێتەوە، پێچەوانەکەشی راستە، هێندەك جار "کانی" دەبێتی "کەعنی".

4- ئەحمەد موختار جاف، رۆشنبیرو هۆنەری نیشتمانپەروەری کوردبوو، کوڕی ئەحمەد بەگی وەسمان پاشای جاف بوو. هۆنراوەی زۆر بەسۆزی هەیە، بەداخەوە تەنێ 38 سالێ ژیا (1897-1935). مامۆستا گیوی موکریانی، دوو جار دیوانەکەی لە چاپخانەی کوردستان لەچاپداوە (1960و 1969) ئەحمەد موختار جاف، خاوەنی چیرۆکی "مەسەلەی ویژدان- چۆن بووم بە خانەدان"ە، کە دوکتۆر ئیحسان فوئاد، پێشەکییەك و لێکۆلینەوەیەکی بۆ نووسیووەو، لە بەغدا لەچاپخانەی "ئیرشاد" لە 1970دا چاپکراوە.

5- هەژاری موکریانی لەیەکێك لە هۆنراوەکانیدا ئەم تایبەتکارەی ئالای کوردستان دەخاتەڕوو:

کوردستانم رەنگینە

بەهەشتی سەر زەوینە

خاکم وەکو ئالاکەم

ڕەنگ سووروو سپی و شینە

(کە مەبەست لە "شین" سەوز (کەسک)ە، سەرنجی وشەی "شینایی" بدە).

6- لەو وتارە دووروودرێژەمدا کە لەگۆڤاری کۆڕی زانیاریی کورد (بەشی یەکەم، ـەرگی یەکەم، بەغدا 1974) بلاومکردەوە، لەژێر نێوی "کورتە مێژوویەکی وردناسی لەئەڵمانیادا"، بۆ یەکەمجار پەنجەم بۆ ئەو نامیلکەیەی گوتفرید یۆهانس ویلەر راکێشا، کە بەنێوی "لەرۆژهەلاتی گرتێبەربوودا" کە لە 1959دا لاویکردووەتەوە و، لەزمانی ئەو کابرایەوە، ئامارژەم بۆ چیرۆکی رەمزی نافیع کردووە ل454-453).

لەو پەرتۆکەدا گەلێك پێوەنان (مبالغە)ی تێدایەو، ئەوەش تێنەگەیشتم، بۆچی ویلەرێك، خۆی سەرکردەی بەزمەکە بووبێ، سپ و زیندوو لە گرتووخانە رزگاری ووبێ و، سالانی سالیش دوایی ئەوە ژیابێ، کەچی رەمزی قوربەسەر، هەرکە بەرەڵلا را، پاش ماوەیەك مرد بێ.

7- مەبەست لە "عەجەم" تورکە ئازەرییەکانە، نەك فارس.

8- دوکتۆر عەزیز زەندی، خوێندنی خۆی لە ئەڵمانیا تەواو کردبوو و، وەرگێڕی ینجیل بوو بۆ سەر زمانی کوردی و، باوکی میدیای زەندی بووە کە وێژەری بەشی کوردیی رادیۆی تاران و، ماوەیەکێش خێزانی گۆرانیبێژی کورد حەسەن زیرەك بوو.

بەرلین 2006/11/10

**میدیا**، ژ 265، 2006/11/14

## کێشەکە، دەستکردی بێکەرو مێکەر نییە
## کۆمەڵگەی کوردەکە، خۆی نەخۆش و سەقەتە

سەردەستەی تایبەتکارەکانی مرۆڤی باوەڕ بەخۆ نەبوو، ئەوەیە، ئەگەر کەسێك، هەرچییەکی پێگوت، ئەوا، ئەو، بێ سێودوو، باوەڕ بە قسەکەی دەکات. واتە: مرۆڤێکی خۆشباوەڕە. مرۆڤی خۆشباوەڕیش، مندال‌‌ ـ ڕەوشتە، زوو هەڵدەخلەتی و لەخشتە دەبرێ. ئەوجا، لەبەرئەوەی باوەڕی بە خۆی نییە، خۆی، بەرامبەر بێگانە؛ بە کەم و بێنرخ و، بێگانەش؛ بە گەورەو گران دێتە بەرچاوی. هەر لەبەر ئەمەشە، بەزۆری، چاوەڕوانی کرداری خەڵك و، لاساییکەرەوەیە، نەك دەستپێشکەرو رچەشکێن وپێشبین. کە، مرۆڤیش لاساییکەرەوە بوو، کاری خۆی و، بەرهەمی رەنجی خۆی و، دەسەلاتی خۆی؛ لەچاو، کاری خەڵك و، بەرهەمی رەنجی خەڵك و، دەسەلاتی خەڵکدا، زۆر بە نزم و بێهەند، دەبینێ و، لەئەنجامی ئەمەشەوە، لەفرۆشتنی کالاّی هزری و ماکیی خۆیدا، هەرزانفرۆش و، لەکڕینی کالاّی بێگانەشدا، گرانکڕە. دیارە، لەم رووەشەوە، خۆنەویست و بێگانەپەرستە.

مرۆڤی باوەڕ بە خۆ نەبوو، لە تاقیکردنەوەکانی خۆی و بەسەرهاتی ژیانی، هیچ پەندێك وەرناگرێ و، لەتاقیکردنەوەی خەڵکیشەوە، هیچ فێر نابێ. ئەزموونی بێسوود و بێبەر، چەند جارو چەند جار، تاقیدەکاتەوە؛ چونکە زاتی ئەوەی تێدا نییە، رێیەکی نوێ بۆ خۆی دەستنیشانبکاو تاقیبکاتەوە.

باوەڕ بەخۆ نەکردن، نەخۆشییەکی دەروونیی یەکجار ترسناکەو، بگرە، وەك رەگی گولی وایە، زۆر بەزەحمەت لەکۆڵ نەخۆشەکە دەبێتەوە.

کورد، بەداخەوە،نموونەیەکی دیاری تووشبووی ئەم جۆرە نەخۆشییەیە. کە ئەم نەخۆشییەش، سەرچاوەی هەموو ئەو ماڵوێرانییانەیە، کە بەسەر کۆمەڵگەی کورددا، هاتوون و دێن.

مێژووی کورد، هەر لەکۆنەوەو تائێستە، پڕە لە بەڵگە بۆ ئەم راستییە زەقە. چونکە؛ ئەگەر باوەڕ بەخۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ؛ کوردی سەردەمی ئیمپراتۆرێتیی ماد، پەنا ببەنە بەر هۆزێکی بچووکی فارس و، بیهێننە ولاّتی خۆیان، بۆ بەربەرەکانێی ئیمپراتۆرێکی کورد، واتە: ئەژدەهاك و، پاش لابردنی ئەژدەهاکیش، فارسەکان

ەرنەکــەن و، یــەکێك لــەخۆیان نەکەنــە جێنیــشینی، بــەڵکو؛ گــەل و نیــشتمانیان، پێشکێشی بێگانەیەکی سپڵەو پێنەزان بکەن؟ ئەگەر باوەڕ بەخۆ نەکردن نـەبێ، بۆچی ەبـێ؛ سـەلاحەدینێك، کـە بەپـشتیوانیی کـوردە هەکارییـەکان، هاتبێتـە سـەرکارو، بەیارمـەتیی لەشـکری کـورد تـوانیبێتی؛ بەهێزترین لەشـکری ئـەوروپاییی سـەردەمی خـۆی، ببـەزێنێ، کەچـی؛ نەچـێ، یەکـسەر، ئیمپراتۆریێتییـەکی کـوردی دابمـەزرێنێ، بــەڵکو خــۆی بخاتــە خزمــەتی ئەوانــەوە، کــە پــاش مردنــی وی، دەســتیانکرد بەچەوساندنەوەی نەتەوەکەی و، هەتا ئەوڕۆش بەچەوساندنەوە دەبێژن: "إستکراد" (بـەدەردی کـورد بـردن)؟ ئـەرێ، بەڕاسـتی، ئـا، ئـەو سـەلاحەدینە کـوردە نـەبوو، کـە لەمیسرەوە فەرمانیدەرکرد، بـۆ کوشـتنی فەیلەسووفی بـەنێوبانگی کـوردو جیهـان، سووروەبەردی (سوهرەوەردی) خاوەنی فەلسەفەی تیشکهاویشتن (**الفلسفة اشراقیة**) کە بە "الشیخ المقتول" نێویڕۆیوە، ئەویش، لەبەر خاتری راگرتنـی دڵـی چەند مەلایـەکی عەرەبی بەغدا، کە لەدەمەتەقەدا، سوهرەوەردی بەزاندبوونی.

ئەگــەر بــاوەڕ بــە خــۆ نــەکردن نــەبێ، بۆچــی دەبــێ؛ زانایــەکی بــەنێوبانگ و دەستڕۆیــشتووی وەك؛ ئیدریـسی بیتلیـسی، بەچـەند وشـەیەکی پەسـندان و، چـەند دیارییـەکی سەرۆکهۆزی عوسـمانی، بکەوێتـە جـۆش و، ژمارەیـەکی زۆر لـەمیرەکانی میرنــشینە ســەربەخۆکانی کوردســتان، لــەژێر ئــاڵای ســەرۆکهۆزێکی عوسمانیــدا کۆبکاتەوەو، شەڕی چالدێرانیان پێبکاو، شای سەفەوی، بۆ سـەرۆکهۆزی عوسـمانی، دەمکوتبکا؛ بەڵام نەچێ؛ ئەو میرە کوردانە، بەسەرکردەیەتیی خۆی، یەکبخاو، خۆشی بکا، بە شای کوردستان و هەموو نێوچەکە؟

ئەگەر باوەڕ بەخۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ؛ هەزاران نووسەرو زاناو هەڵبەستڤانی گـەورەی کـورد، بەدرێـژاییی مێـژووی هـەزارو چوارسـەت سـاڵەی ئیـسلامەتی، بـێ گوشارو زۆری هیچ لایەنێك، بچن بەزمانی عەرەبی و فارسی و ترکی، هەزاران پەرتۆکی بەنرخ بنووسن، کەچی؛ پشتبکەنە زمانە شیرینە، رەسەنە، دەوڵەمەندەکەی خۆیـان و، وابێنـازی بکـەن، کـە ئەوەتـە ئـەوڕۆ، نـە شـێوەیەکی سـتانداردو، نـە ئەلفوبێیـەکی یەکگرتووی هەیە؟

ئەگەر باوەڕ بە خۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ ژمارەیەکی زۆر گۆرانیبێژو موزیکژەن و نیگارکێشی نێودار؛ خزمەتی کولتووری خەڵکی بکەن و، ئاوازە رەسەنەکانی کورد، بە وشەی بێگانە بچڕێنن و، فەرهەنگی کورد بکەن بەهی بێگانە؟و بەمەش کورد هەر خۆی؛ "ئەنفال" لەخۆی بکات.

ئەگەر باوەڕ بەخۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ؛ لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا، کە دەوڵەتی عوسمانی، تەخت و بەختی هەڵگیرابوو، دەوڵەتانی عەرەب و فارس، هێشتا لەئارادا نەبوون و، لەشکری بەریتانیا و فەرەنسا؛ کوردستانیان داگیرنەکردبوو، کەچی؛ کورد هێندێکیان ببنە "جلخوار"و هێندەکی دیکەشیان بچن، بەپێی خۆیان، دەسەڵاتی ئینگلیزەکان بهێننە کوردستانەوە، چاوەڕوانیی خێری دەستی "بەریتانیای مەزن"و فەرەنسای "بێشکەی ئازادی و دیموکراتی" بکەن و، بێدەنگ دابنیشن، تا ئەوانیش، لەسەر خۆ و، لەپەنای ئارامیدا، کوردستان پارچە پارچە دەکەن و، هەر پارچەیەی دەدەنە دەست دوژمنێك؟

ئەگەر باوەڕ بە خۆنەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ خوێندەوارانی کورد، پەنجا ساڵی رەبەق، دەوڵەتێکی سۆڤێتی تۆتالیتێری، تێرۆریستی، کوردکوژ، دوژمنی ئازادیی مرۆڤ بە رزگارکەری گەلان و قەڵای ئاشتی و یەکسانی بدەنە قەڵەم و، ئەو دەوڵەتەش، نەك هەر هیچ لایەك لە کورد نەکاتەوە و بەس، بەڵکو کوردی ژێر دەستی خۆی قڕ بکاو، لەگەڵ هەموو داگیرکەرانی کوردستانیشدا، هاوکارو هاوپەیمان بێ، بۆ لەنێوبرانی کوردو ،تەنانەت نکوول لەوەش بکات، کە سەددام چەکی کیمیایی دژی کورد بەکارهێنا بێ؟

ئەگەر باوەڕ بە خۆنەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ، خوێندەوارانی کورد، لەباتی پشت بەستن بە بیرو بۆچوونێکی ئازادیخوازانەی نیشتمانیی زانستانەو بابەتانە، شەست ساڵی تەواو، قسەکانی مارکس و لینین و ستالین و پلێخانۆف و ئیلین بیلین، وێردی زمانیان بێ و، لەباتی سازدانی یەکێتیی نەتەوەیی و، پاراستنی ئاشتیی نەتەوەیی، بەخەیاڵی بەنککێشانەی "پێشڕەوێتیی چینایەتی"و "دیکتاتۆرێتیی پرۆلیتاریا" بکەونە گیانی یەکدی و، هەزاران کورد، لەهیچە، ببنە قوربانی ئەو بیرۆکە زرکانەی، کە ئێستە بوونەتە بابەتی نێو مۆزەخانەکان؟

ەر باوەڕ بە خۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ؛ کورد پەنجا ساڵ، بکەونە چەپلە
، بۆ برایەتیی درۆزنەی کوردو داگیرکەرانی کوردستان و، ئەوی بەسووسەیەك
، سەربەخۆیی کوردستانی کردبێ و، دژی "برایەتیی"ی ئاغاو مسکێنانەی
کەرانی کوردستان و کورد قسەی کردبێ، بە نۆکەری "ئیمپریالیزم"و "زیۆنیزم"و
. چی، درابێتە قەڵەم؟
ەر باوەڕ بەخۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ؛ خوێندەوارانی کورد، ساڵانی ساڵ و
. کارکردنی بیرۆکەی فاشستانەی ستالینیزمدا، دوژمنایەتیی بیرو ڕێبازی کاژێك
، کە بۆ یەکەمجار لەمێژووی کورددا، ئازادی و یەکسانی؛ وەك دوو دیوی
ك و تەواوکەری یەك، خستە بەرچاو، لەسەر بنچینەی پلە پلە نەکردنی ئازادی و،
یەکسانی لەدەسەلاتدا، وەك مافێکی خۆڕسکی هەموو نەتەوەیەکی ئەم جیهانە؟
ەر باوەڕ بە خۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ؛ شۆڕشێکی مەزنی، وەك شۆڕشی
وول، کە چواردە ساڵ ململانێی ڕژێمی ملهۆڕی عێراقی کردبێ و، پارچە
ەکی پان و فراوانی ڕزگار کردبێ و، دەوڵەتۆچکەیەکی کوردستانی دامەزراند
، خاوەنی سەتو بیست هەزار پێشمەرگەو بودجەی تایبەتی خۆی و دەزگەی
و ڕۆژنامەگەری بوو بێ و، سەرکردەیەکی، لەجیهاندا بەنێوبانگی، وەك ڕەحمەتی
ستەفای بارزانی هەبووبێ، کەچی، بەگۆڕینی هەڵوێستی ئەمریکایەکی، پێش
لە ڤیتنام و، ئێستەش، لەعێراقدا بەزیو و، شایەکی تریاکخۆری ترکەن؛ هەرەس
و، نەتەوەیەك ڕەشپۆش بکات؟
ەر باوەڕ بەخۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ؛ هەزاران کورد ببنە جاش و
پارێزو پاسداری داگیرکەرانی کوردستان و، بەشداریکەری کەلکوژیی "ئەنفال"و
ەجر"و "توکلنا علی الله"و چی و چی؟
ەر باوەڕ بەخۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ؛ حیزبێکی کوردی، کە چەند ملیۆنێك
و بیانی، بەدڵ و بەگیان و زێڕو دراو؛ پشتگیریی کردبێ و، بەدرێژایی بیست ساڵ؛
ەڵەکی "سەربەخۆیی کوردستان"ی لێدابێ و،لەو پێناوەشدا؛ چلهەزار کورد
ابن و، بە ملوێن کورد؛ دەربەدەربووبن، کەچی، لە پڕو، بەقسەی زەلامێکی
راوی، دەست و پێ بەستراو؛ واز لەئامانجی سەربەخۆیی بهێنێ و، بابداتە سەر

باسی خەیاڵ پلاّوانەی بەدیموکراسیکردنی دەوڵەتی داگیرکەرو، هەر ساتەو ناساتێکیش، شەڕ بوەستێنیّ و ،دیسانەوە شەڕ تازە بکاتەوەو، دەوڵەتی داگیرکەریش مێش میوانی نەبیّ؟

ئەگەر باوەڕ بەخۆ نەکردن نەبیّ، بۆچی دەبیّ؛ دوو حیزبی کوردستانی، ساڵانی ساڵ بکەونە خۆکوژیو، چەندین کوردی دڵسۆزو نیاز خاوێنیش بکەونە نێوبژیو: کە یەکێکیان خۆم بووم، بەلاّم بەقسەیان نەکەن، کەچی؛ بۆ رێککەوتن لەگەڵ یەك، رووبکەنە تارانو ئەنقەرەو، دوایی ئەمریکا بۆ بەرژەوەندیی خۆی، بیانهێنێتە واشەنتنو، لەویّ لەگەڵ یەك رێکیانبخاتەوەو، ئەمانیش هێندەی ئەرزو ئاسماز سوپاسی بکەن، ئەمە لەباتی ئەوەی، لەگوندێکی کوردستانو، لەسەردەستی چەند هاووڵاتێکداو، بیّ هەڵگرتنی منەتی کەس، لە کەڵی شەیتان بێنەخوارەوە؟

ئەگەر باوەڕ بە خۆ نەکردن نەبیّ، بۆچی دەبیّ؛ کورد، پاش ئەو تاقیکردنەوە تاڵانەی کە هەر لەسەردەمی جەنگی یەکەمو دووەمی جیهانییەوە، تا کاتی پەلاماردانی سەددام، لەگەڵ ئەمریکا هەیانبوو، هەر پاش ئەوەی رژێمی ترك، بەدەمی ئەمریکایدا دایەوەو، ئەمریکاش لەناچاریو داماویی خۆیو، بە نابەدڵییەوە، رووی کردە کورد، بۆچی دەبیّ؛ کورد بەکراسی بەری خۆیانەوەو، بیّ هیچ رێککەوتنێکی گرێبەندانە (تعاقد)ی قانوونیو بیّ مەرج، بکەونە پێش مارینزەکانی ئەمریکاو، بچنە کەرکووكو مووسڵەوەو، شێتگیرانەو، بیّ ئەوەی چەند سەت هەزار کەرکووکیو موسڵاوی دەرکراو، لەگەڵ خۆیاندا ببەنەوە شوێنی خۆیانو، عەرەبە هاوردەکان پاڵپێوە بنێن، کەچی ئەمریکاش بۆ راگرتنی دڵی رژێمی ترك، هەر رۆژێك دوای گرتنی کەرکووك،ئەمانی لە کەرکووكو مووسڵ دەرکردو، ئەمانیش یەکسەر بەقسەیان کرد؟

ئەگەرنا، ئەز، هەر ئەو رۆژانە زانیم، کە نیازی ئەمریکا چییەو، تاکەی پێویستیی بەکوردەو، هەر ئەوڕۆژەش، بەڕێز کاك مەسعوود بارزانیم ئاگادار کرد لەوەی، کە چوونە دەرەوە لەکەرکووك؛ هەڵەیەکی گەورەیە، وەك هەڵەی چوونە نێو کەرکووك، بیّ مەرجو پەیمان. چۆنکە باش دەمزانیو، هەزار جاریشو لەکۆنەوەو، ئێستەش، ئەوەم بە سەرکردەکان راگەیاندبوو کە "ئەمریکا برای باوکی کەس نییە".

گەر باوەڕ بە خۆ نەکردن نەبێ، بۆچی دەبێ؛ کوردێك، کە لە سێ ستانی
ووردا، 12 ساڵ بەسەربەخۆیی، فەرمانڕەوایی کردبێ و، سا؛ باش، یان خراپ،
ی خۆی بەڕێوەبردبێ، سەربازو پۆلیس و دادگەو زانستگەو چەندین دەزگەی
ەفیزیۆن و رادیۆو رۆژنامەگەریی خۆی هەبێ و، بودجەی خۆی و، پێوەندیی
ۆماسیانەی، بەگەلێك دەوڵەتانی ئەم جیهانەوە هەبێ؛ کەچی بچێ، بێ هیچ
ج و پەیمانێکی نێو نەتەوەیی و، بێ راپرسی گشتی لەکوردستان و، بێ ئەوەی
ی زۆریکردبێ لێی، خۆی بکاتەوە، بە بەشێك لەو دەوڵەتە رووخاوەی کە هەشتا
بوو، بەهەموو شێوەیەك بۆ لەنێوبردنی هەوڵیدەداو، بچێ ئەو دەوڵەتە سەرلەنوێ
ستبکاتەوەو بەتکاو پاڕانەوە، بیکاتەوە بە ئەندامی "کۆمکاری عەرەب"و، ئەوجا
ێ دەست لەو حکوومەتە پانبکاتەوە، ئەو حکوومەتەی کە گەڕەکێکی بەغدای
ستەوە نییەو، تەنانەت سووتەمەنیی خەڵکی پێ دابیننناکرێ، لەولاتی نەوتداو
حکومەتەش سێ ساڵ و نیو، پاش رووخانی سەددام، هەر دەستی دەستی بە
بکاو، ئەمیش هەر تەپڵی "یەکێتیی خاك و سەروەریێتیی" عێراق لێبداو پشت بە
ستوور" ببەستێ، کە رێزی دەستوور لەکۆمەڵگەی رۆژهەلاتیدا، وەك رێزی مەڕ
لای قەساب.
ڕاستی، با درۆ لەگەڵ خۆمان نەکەین، کێشەکە کێشەیەك نییە، کە بێکەرو مێکەر،
ستیانکردبێ. کێشەکە لەکورد خۆیەوە دەستپێکردووە. کە کورد خۆیان،
ڕیان بەخۆیان نەبێ و، سیاسەتکاریان، بەژمارە هەزاران و، بە شارەزایی و
انیش، تاکو تووك بێ و، کردەوەکانیان لەئاستی رووداوەکاندا نەبن و، هۆز
ینەی سەتەکانی رابردوویان، گۆڕبیبێتەوە بە حیزبحیزبێنەو خزمخزمێنەو، بۆگەنی
دەڵی و بەرتیلخۆریی بەڕێوەبەریێتی، سەری نەتەوەیەکی کاس کردبێ و،
ماوەریش، فێرە دۆلارپەرستی و ئۆتۆمبێلی لۆکس کرابێ، لەباتی راهێنانی
ەباتی شارستانییانەو کۆمەلایەتیانەو، قۆزتنەوەی دەرفەتی هەرێمی و نێو
وەییی لەبار، بەر لەوەی تێپەڕ بکا،ئەمە گوناهی بێکەرو هاملتۆن نییە، ئەوانە،
ڕیکایین و بیر لە بەرژەوەندیی نەتەوەکەیان دەکەنەوە. بەلام، با ئێمە فێری ئەوە

بین، رەخنە لەخۆمان بگرین و، پاساو بۆ کەمتەرخەمی و ژێنەهاتێتیی خۆمان نەهێنینەوە و بەسەئێدی.

هەرچی پلانی بێکەرو هاملتۆنە، ئەوا؛ بە لەبارچوویی لەدایکبووەو، بەڵگەیەکی رۆشنە بۆ ئەوەی کە ئەم دوو گامەسلەکە، نەك دوو "دیپلۆماتی مەزن" نین، بەڵکو، سەریشیان لەرامیاریی و مێژووی رۆژهەلاتی ناڤین دەرناچێ. ئەگەرنا؛ ئەگەر یەکێك تۆزقالێك تێگەیشتنی هەبێ، دەبێژێ: "با ئەمریکا بچێ لەگەڵ ئێران و سووریا بکەوێتە وتووێژ، بۆ نەهێشتنی ئاژاوەو تێرۆر لەعێراقدا"؟.

بەڕاستی، دەبێ بێژین "هەمزە لە هەباسی چی و، ترە لە تەورداسی چی؟". بۆچی دەبێ ئێران و سووریا لەمەدا یارمەتیی ئەمریکا بدەن؟ چمائێران و سووریا، بەدەردی ئوستاد (بەشیر موشیر) دەیگوت "ناقص العقل"ن؟ ئەوان، دوو دوژمنی سەرسەختی ئەمریکان و، ئەمریکاش دوژمنێکی سەرسەختی هەردووکیانە. بابێژین؛ گریمان، ئێران و سووریا؛ ئامادەی ئەو کارەبن، ئەوا، دەبێ ئەمریکا، لەپاداشی ئەوەدا، چاو لەئێران بپۆشێ، سا، یان بە ئاشکرا؛ یان بە دزییەوە، چەکی ئەتۆم بەرهەمبهێنێ و هەڕەشە لە ئیسرائیل بکا، بەتایبەتی، پاش ئەوەی سەرۆك وەزیرانی ئیسرائیل، ئێهوت ئۆلمەرت، بە ئاشکرا لەبەرلین گوتی ،کە ئیسرائیل خاوەنی چەکی ئەتۆمە. هەروەها دەبێ ئەمریکا، چاو لە سووریاش بپۆشێ کە بەهۆی تاوانی کوشتنی حەریری و جومەیلەوە، بدرێتە دادگەیەکی نێو نەتەوەیی و، خۆشی بکاتەوە بە کەلەگای لوبنان. ئەوەش دەبێ بزانین،کە ئەم بێکەرە، ئەو پیاوەیە کە نەخشەی کۆنفرانسی (طائف) ی کێشا بۆ وەستاندنی شەڕی نێوخۆیی لوبنان، کە لە ئەنجامی ئەوەوە،سووریا 30 ساڵ بوو بە داگیرکەری لوبنان.بەڵام، ئایا ئەمریکا دەیەوێ، یان دەتوانێ، ئەوە بکا، مەگەر، بەتەنگ بەرژەوەندی و، ئاڕووی نێو نەتەوەیی خۆیەوە نەبێ. پاشان گریمان، ئەوەشی کرد، گەرەنتی چییە بۆ دامرکانی داوی عێراق؟ عێراق بەرەو لێواری هەرەسهێنان و نەمان دەچێ. شەڕی نێوخۆ، کە بەسەر زاری، بەشەڕی شیعەو سوننی، دەدرێتە قەڵەم، لەڕاستیدا شەڕی فارس و عەرەب و ترکە، لەسەر دەسەلاتی هەرێمی و، لە دەمێکەوە، دەستپێکردووە.راستە، ئەم شەڕە، سوننەکان و شیعەکانی عێراق دەیکەن، بەڵام دوو زلهێزی هەرێمی، ئێران لەلایەك و، عەرەبەستانی

ووودی لەلایەکی دیکەوە دەیگێڕن‌و تورکیش دەستیتێدایە. ئەمیان دەیەوێ
ڕاتۆریتییەکی فارس، بەنێوی شیعەیەتیەوەو، ئەوی دیکەشیان،
ڕۆاتۆریتییەکی عەرەب، بەنێوی سوننەیەتیەوە دابمەزرێنێ. لێرەدا سووریای
ەوییەکانیش، لەبەر هێندەك هۆ، لایەنی ئێران دەگرێ. دیارە ئەمەش، دەرفەتێکی
ە دەدا بە کورد بۆ رزگاربوون، کە ئەگەر، باوەڕ بەخۆ بهێنن‌و، بتوانن هەلەکە بەکار
نن، رژێمی کارتۆنیی تورکیش کە لەبەر گەلێ هۆی دەرەکی‌و نێوەکی، بەرەو
ڕوتی دەڕوا، کەوتووەتە لۆقەو، کۆنفرانس دەبەستی لە ئەستەمبوڵ‌و، بەئاشکرا،
، عەرەبستانی سعوودی، باسی پشتگیریی سوننە دەستوەشێنەکان دەکات، بەڵام
یان لەدژی کورد، نەك لەبەر خاتری سوننە، یان دژی شیعە، چۆنکە کاتی خۆی
ویست لەگەڵ شیعەکان ڕێکبکەوی دژی کورد، بەڵام سەرینەگرت بۆی. کە بۆ
ەش دیارە، نە ئەمریکاو نە ئەورووپا ناتوانن لەگەڵی بن.
ورد، نابێ واتێبگەن، کە ئەم پلانەی بێکەر- هاملتۆن، هەر تاکە پلانێکە دژی
اری‌و سەربەخۆییی کوردستان، نەخێرا ئەوەتە، وەزیری دەرەوەی سوێد، کارل
ت Carl Bildt، کە گوایە؛ سوێد دۆستی کوردە، لەکۆنفرانسی ئینستیتووتی
ڵینەوە ستراتیژەکاندا لە بەحرەین، (بەپێی هەواڵێك کە ئەسۆشێتد پریس، لە
/2006/12دا، بڵاویکردەوە) گوتی: "هەموو دابەشکردنێکی عێراق بە خوێن
سراوە. ئەم لافاوە خوێنەی کە ئەوڕۆ دەیبینین، تەنێ، دەستپێکی ئەو
ێنرێژییەیە کە دێ ببینین، ئەگەر دابەشکردنی (عێراق) رووبدات".
روپاییەکان، کە دێنە باشووری کوردستان‌و، پەسنی "پێشکەوتن"ی دەدەن‌و،
دێکیان، کۆنسلخانەو مەڵبەندی بازرگانی لەهەولێر دەکەنەوە، لەبەر ئەوەیە، کە
ڕۆ ناتوانن لەبەغدا نیشتەجێ بن، ئەگەرنا، ڕێیان نەدەکەوتە هەولێر. ئەوەتا،
انیا، کە دەڵێن لەهەولێر "کۆنسلخانەی فەخری" دەکاتەوە، ئێستەش بەڕەسمی،
باسی "باکووری عێراق" دەکات، نەك کوردستان. بەڵام ئەمانە هەمووی بەلایەك‌و،
ارە، هەر دەوڵەتە،بەرژەوەندیی خۆی هەیەو، دوای دەکەوێ. باکوردیش بیر
رژەوەندیی خۆی بکاتەوەو، دوای بکەوی‌و، بۆ ئەمەش دەبێ جاری‌و، بەزووترین
ت، حیزبەکان واز لەچەکداریتی‌و چەکدارەکانیان بهێنن‌و، بکەونە چالاکیی

رامیاری‌و بەس. چەکدارەکانی هەموو حیزبەکانی هەموو پارچەکانی کوردستان، لە لەشکرێکی کوردستانیی پیشەییدا کۆببنەوە، بە سەرکردەیەتی ئەفسەرانی سەربەخۆی نیشتمانپەروەرو کارزان و، فەرمانی سەرشانی، لەشکری کوردستانیش تەنێ پاراستنی سنوورەکانی کوردستان‌و، ئاسایشی خەڵکی کوردستان بێ، نەك دەستتێوەردان لەکاروباری نێوخۆدا. بەلەشکرێکی وا بەهێز، دەتوانرێ دەسەڵات لە بەغداو، لە هەموو عێراقدا، بەتایبەتی لەم رۆژەدا بگیرێتە دەست. هەروەها، پێویستە بەزووترین کات، راپرسییەکی گشتی لە هەولێرو سلێمانی و دهۆك‌و کەرکووك‌و مووسڵ‌و نێوچە کوردستانییەکانی دیالەو کووت‌و، لەنێو کوردو کوردستانییەکانی بەغداو خوارووی عێرقدا بکرێ‌و، ئەگەر زۆربەی زۆری دەنگەکان، بۆ سەربەخۆیی بوون، دەبێ دەستوورێك لەسەر ئەو بنچینەیە بنووسرێتەوەو، لەهەمان کاتدا هەڵبژاردنێکی ئازاد بکرێ‌و حکوومەتێکی نوێ بێتە سەرکار، کە پێداویستییەکانی خەڵکی کوردستان، لەبەر بەرەکانێی بێکاری‌و هەژاری‌و ژندوژمنی و گەندەڵیی بەڕێوەبەریتی و پشتگوێخستنی لاوان‌و خوێندکاران‌و کرێکاراندا، بکاتە نەخشەی خۆی‌و، گوندەکان سەرلەنوێ دروستبکاتەوەو، کشتوکاڵ‌و بەرهەمی ئاژەڵی زیندووبکاتەوەو، بەگژ حیزبحزبێنەو خزمەخزمێنەو هۆز هۆزێنەدا بچێ‌و، دەزگەیەکی پۆلیسی‌و، ئاسایشێکی پاکژو بێلایەن‌و دادگەیەکی سەربەخۆ، بۆ خزمەتی خەڵکی کوردستان بخاتە کارو، تۆوی سیخوڕیی دەوڵەتە دراوسێیەکان‌و دوور دەستەکان، لەباشووری کوردستاندا بیڕێ. کۆمەڵگەیەکی شارستانی، کە رێ بە سەندیکای ئازاد بدا، دابمەزرێنێ. بەمە، ئاواتی خەڵکی کوردستان‌و مرۆڤی ئازادیخواز دێتە دی. ئەگەرنا، ئەگەر کورد، هەموو هیوایەکیان بخەنە سەر ئەوەی ئەمریکا چ دەڵێ‌و، بەریتانیا چ دەڵێ و ئەم چ دەڵێ‌و، ئەو چ دەفەرموێ‌و، پێیان وابێ، کە ئەمریکا، کورد بە بێ پێ، دەزانێ؛ وەك، بەڕێز محەممەدی مەلا قادر گوتەنی (میدیا، ژ 269، 2006/12/12)، ئەوا، بە بەڕێزیان دەبێژم، کە ئەمریکا کورد بە "بێ پێ" نازانێ، چۆنکە کورد بێ مەرج‌و پەیمان‌و، وەك نەدی‌و بدی، بەپێی خۆیان؛ کەوتنە پێش مارینزەکان‌و، ئەوەبوو کاتی خۆی، کە لەرۆژنامەی "هاوڵاتی"دا لەبەهاری 2003دا، رەخنەم لەم هەڵوێستەی حیزبە کوردییەکان گرت، حیزبەکان کردیانە چ فەرتەنەیەك

مـن و، کـاتی خۆشـی کـه لـهدژی ئـهوه بـووم، کـه کـورد بـێ پـشتیوانییهکی
ەوڵەتی، بێ گەرەنتی، بچنه هەڵبژاردن و دەنگدان بۆ دەستوور، بەڕێز محەممەد
ادر، دەیفەرموو "ئەوی لەدژی دەنگدان بێ، ئەوا خاینە، یان بێگانە هانیداوە".
ەش، بەڕێزی دەبینێ، هەق و راستی بەلای کێیەوە بوو و، دەستوورو هەڵبژاردن
اقدا چەند بەنرخن. پاشان، ئێمە، ئەگەر بمانەوێ خەڵك هاوکاریمان بکات، دەبێ
، خۆمان باوەڕ بە خۆمان بکەین و، ببینە کەسی یەك. کە منداڵ بووم، جارێکیان
تێکی بـاوکم، کـه عـارەبی مووسـڵ بـوو و، لەگـەڵ بـاوکم بـه ترکـی عوسمـانی
یدەکرد، زۆر گلـەیی لـە بێکەسیی خـۆیی کـرد، باوکیـشم، هەڵبەسـتێکی ترکیـی
مـانی بـۆ خوێنـدەوە، کە بەلامەوە هێنـدە خـۆش بـوو، تکـام لـه بـاوکم کـرد، بۆم
سێتەوە. ئەویش نووسییەوە بۆم و، لەبەرمکرد. هەڵبەستەکە، وتووێژێکە لەنێوان
کەسدا، یـەکێکیان دەبێـژێ: "هـەموو کەسـێك؛ کەسـێکی هەیـە، هەر، ئەز بێکەس
، خوایـه تـۆ کەسـی بێکەسـانیت فریـام کـەوە". ئەویدیکـە دەبێـژی: "گـەورەم،
ێك خۆی باش بێ، خوا کەسێتی و، خراپێش بێ، کەس نابێتە کەسی". وا، ئەو
ستە، کە لەبیرم ماوە، بە ئەلفوبێی کوردی دەینووسمەوە:

کەمیان: کیمسەسز، هیچ کیمسەیۆق، هەر کیمسەنن، وارکیمسەسی. کیمسەسز
، مێدەد، ئەی کیمسەسزلەر کیمسەسی.

وەمیـان: سـەییدم، بیر کیمـسە خـوب ئۆڵـسە، خـودادر کیمـسەسی، بـەد ئـۆلان
مسەنن، هیچ کیمسە ئۆڵمەس کیمسەسی.

ۆتایی ئەم وتارەدا دەمەوێ لە بەڕێز محەممەد مەلا قادرو هەموو سەرکردەکانی
ی و یەکێتی بپرسم، ئێوەیەك کە هەر رۆژە ناڕۆژێك لەگەڵ ئەمریکاییەکان دان و
دنتان بووەو، چوونەتە ئەمریکاو لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ئەمریکا قسەتان کردووە،
ی نـەتانتوانیوە، داخـوازیی و ئامـانجی خۆتانیـان تێبگەیـەنن. ئایـا، ئێـوە لـەم
وە، بەرپرسیار نین؟ کە ئێوە راپۆرتەکەی بێکەرتان بەدڵ نییە، "بەدیل"تان چییە
وە؟

ڕلین 2006/12/15

**یدیا**، ژ 270، 2006/12/19

# پێشگیری لە کارەسات و هەرەسێکی بێوێنە

لە وتاری پێشوومدا کە لەبارەی راپۆرتی بێکەر– هاملتنەوە بوو (میدیا، ژ 70، 2006/12/19) ئاماژەم بۆ نەخۆشییەك کرد کە کۆمەڵگەی کوردەواری پێوە دەناڵێنیو، بووەتە هۆی هەموو ئەو کوێرەوربیانەی تووشی بوون و دەبن و، ئەوە نەخۆشیی باوەڕ بەخۆ نەکردنە. ئەنجامە ناسازەکانی ئەم نەخۆشییەش دەستنیشانکردن، وەك: خۆشباوەڕی، خۆ بەکەم و نزم بینین بەرامبەر دەرەو هەرزانفرۆشی و گرانکڕی، لاساییکردنەوەو چاوەڕوانی؛ لەباتی پێشبینی دەستپێشکەری و... هتد.

ئێستە، ئەگەر چاوێك بە رۆژنامەو ماڵپەڕە ئینتەرنێتییە کوردییەکاندا بخشێنی دەبینین؛ باس هەر باسی راپۆرتەکەی بێکەر– هاملتنەو، قسەو باسی سەرکر کوردەکانیش هەر ئەوەیەو، لەم دواییەشدا (پەرلەمانی هەرێمی کوردستان – عێراق نامەیەکی لاوازو، پڕ لە سوپاس و پەسندانی ئەمریکای، بۆ کۆنگرێس و سەرکۆمار ئەمریکا جۆرج دەبلیو بوش نارد، (خەبات، ژ 2365، 2006/12/25) بێ ئەوە هەڵوێستێکی بوێرانە، یان پێشنیازێکی بەپێز، بخاتە بەرچاو، بۆ وێنە: هەڕەش کردن، بە گشتپرسییەك بۆ بڕیاری چارەنووس و سەربەخۆیی، یان خستنەڕێ ملوێنێك کورد، بەشێوەیەکی ئاشتییانە، بۆ نێو کەرکووك و مووسڵ. دیارە، ئ کردارانەی کاربەدەستانیش، هەمووی، وەك پێشینیان گوتوویانە:"لە پاش بار کەپەنك"ە، ئەگەرنا؛ نێزیکەی ساڵێکە، لیژنەی بێکەر– هاملتن خەریکی کا پێوەندیکردنە بە گەلێك لاوە، بێجگە لە کورد. لەم ماوەیەشدا، کاربەدەستانی کو هێندێکیان چوونە ئەمریکاو، لەسەروو هەموویانەوە، بەڕێز مام جەلال هێندێکیشیان، هەر رۆژە ناوڕێك، لەگەڵ دیپلۆماتی پلەبەرزو جەنەراڵەکا ئەمریکاو هاوپەیمانانەدا کۆدەبوونەوەو، وەزیری دەرەوەی ئەمریکاش، بەڕ کۆندۆلیزا رایس، دووجار هاتە کوردستان. کورت و کرمانجی؛ سەرکردەکانی دو حیزبە دەسەڵاتدارەکە؛ ماوەیەکی زۆریان بەدەستەوە بوو، ئەگەر بیانویستایە، پ لەسەر مافی خەڵکی کوردستان دابگرن و، پێشگیری لەو جۆرە راپۆرتە بکەن، ک دەڵێیت؛ بە فەرمانی جەنەراڵەکانی رژێمی ترك و لەبەر رۆشنایی تەماشاکرد

تەلەفزیۆنی "الجزیرة"نووسراوە. بەلام بەداخەوە، دەرکەوت کە نەیانکردووە، بەبەرئەوە؛ پیلانەکەی بێکەر- هاملتن، خستنیە راچلەکین و خۆخواردنەوەو سەرگێژە. ئەمەش خالانەی ئەوەیە؛ کاتی خۆی؛ شای لێکەوتووی ئێران، کە سەرکردەکانی شۆرشی ئەیلوول، بە دۆستی کوردیان دەزانی و، پێیانوابوو "هیچ کاتێك لەگەلْ سەددام رێکناکەویّ"، کە لەپڕ، پەیمانی جەزائیری لەگەلْ سەددام بەست و، پرسە گورگانەیەکیشی بە سەرکردەکانی کورد نەکرد، کەوتنە واوەیلاو حەلوەلاو، چەند سالێکیش دوای ئەوە، کە حیزبە کوردییەکانی عێراق، بوونە هەڤالبەندی رژێمی مەلاکانی ئێران و، حیزبە کوردییەکانی ئێرانیش، بوونە هەڤالبەندی رژێمی سەددام و، کە هەردوولا (ئێران و عێراق) سالی 1988، پەیمانی ئاگربەستیان بەست؛ بیّ ئەوەی پرسێك بە مان بکەن، بە جارێك، ناوکیان کەوت؛ کەچی لەم کارەساتانەوە، نە پەندێکیان وەرگرت و، نە وانەیەك فێر بوون. ئەوەتا، بەرێز عەدنان موفتی، سەرۆکی پەرلەمان دەبێژیّ: راپۆرتەکەی بێکەر "موفاجەئە" بووە بۆیان (هاولاتی: 2006/12/27). ئاشکرایە، کە ئەمریکاش لە کێشەی ئەفغانستان هیچ فێر نەبوو، کاتێك یارمەتیی ئیسلامییەکانی دا؛ دژی داگیرکەرانی سۆڤێت و دەریپەڕاندن و ئەفغانستانی بەجێهێشت و، ولاتەکە بوو بە گۆرەپانی شەری نێوخۆیی و تالیبانەکان هاتنە سەر کارو، ئەوە بوو تالیبانەکان لەباتی سوپاس، یانزەی سەپتەمبەریان "بەدیاری" دا بە ئەمریکا. خۆ ئەگەر ئەوڕۆ ئەمریکا عێراق بەجێبهێلّیّ، ئەوا، ئەوانەی کە بێکەرو مێکەر، دەیانەویّ بیانهێننە سەرکار، ئەو جۆرە دیارییە پێشکێشی ئەمریکا دەکەن. ئەم راستییەش بەس بوو، پەرلەمانی کوردستان بیری ئەمریکای بخستایەوە.

بۆ رۆنکردنەوەی بابەتەکەو، هەولدان بۆ گەیشتنە چارەسەرێك بۆ کێشەکە، پێویستە جاریّ، زۆر بەکورتی وبەشێوەیەکی زنجیرەیی، رەوەندێکی مێژوویی بخرێتە بەرچاوی خوێنەرەوە:

وەك لەسالانێك لەمەوبەرەوە لێیدواوم، ئەم هەرێمەی کە لە سیّ ستان (لیوا) پێکهاتووە، بەرهەمی راستەوخۆی پەلاماری شێتانەی سەددام بوو بۆ سەر کوێت، کە لە بەرژەوەندیی زلهێزەکانی جیهان و دەولەتە عەرەبی و ئیسلامەکان نەبوو، سەددام ببێتە

خاوەنی بیرە نەوتەکانی کوێتو، تاکە دەسەڵاتداری ڕۆژهەلاتی ناڤین. ئەوجا، بەرێکەوتو، لەبەختی کورد، لەو کاتەدا، چەند هەلومەرجێکی نێوچەیی و جیهانی، لەئارادا بوون؛ کە بۆ دەسکەوتی کورد کەوتنە کار، بەتایبەتی، بوونی رەحمەتی فرانسوا میتران؛ وەك سەرکۆماری فەرەنسا (کە ژنەکەی؛ بەڕێز دانیال میتران دۆستی کوردە)، لەگەڵ رەحمەتی تورگوت ئۆزال؛ وەك سەرۆك وەزیرانی دەوڵەتی ترك، کە دوژمنێکی خەستی سەددامو، دژی بەهێزبوونی عێراق بوو، بێجگە لەوەش، نەیدەویست، دوو ملوێن کوردی باشوور، رابکەنە باکووری کوردستانو وڵاتی ئەناتۆڵ، لەکاتێکدا کە باکووری کوردستان لەشۆڕش دا بوو. هەر لەو دەمەشدا، گەلرەوە ملیۆنیەکەی خەڵکی باشووری کوردستان، سەرنجو سۆزی جیهانی بۆ خۆی راکێشا بوو. ئەمانەش هەمووی، لە پاڵ هەوڵدانی کوردی ئەوروپاو ئەمریکاو، دۆستانی کوردی ئەم وڵاتانەدا، بوونە هۆی ئەوەی کە کۆمەڵەی نەتەوە یەککگرتووەکان؛ بڕیاری دامەزراندنی "نەوایەکی ئارام" بدا، کە کورد بتوانن رووی تێبکەنو، لە دەستدرێژیی سەددام بە دووربن. ئەگەرنا، ئەم "هەرێمە"، نە نرخو ئەنجامی ئەو قوربانییە زۆرە بوو کە کورد دابوویو، نەبەرووبووی خەباتی حیزبەکان بوو، کە هەر ساتە نا ساتێ، دەیکوتنەوە بەچاوی کورددا. خۆ ئەگەر سەددام، سەری لێتێکنەچووایەو، ئەو گەوجێتیەی نەنواندایە، ئەوا، ئەوڕۆ، نەك هەر کەرکووكو مووسڵو شەنگارو مەخموورو خانەقینو مەندەلیو جەلەولاو کویێو کوێ، بەڵکو پێنجوێنو قەڵاچوالانوسەرپەڕەش و هەڵەبجەش کرابوون بە عەرەبو، سلێمانیش گواسترابووەوە بۆ خوارووی عێراقو، هەولێریش کرابوو بە پێتەختی دووەمی عێراقو، لەنیوە پتری بووبوو بە عەرەبو، کەسیش نەیدەگوت "لەل!". ئەو دەمە، حیزبە کوردییەکانیش لە پشت سنوورەوە، جاروبار، بلاڤۆکێکیان دەردەکردو، باسی "ئازایەتیی" خۆیان بەرامبەر یەکدی دەکرد. ئەمەش، مخابن، راستییەکە، کە قسەی ئەوڕۆم نییەو، هەرپاش هاتنە کایەی هەرێمو، هەڵمەتە کاسەیی حیزبەکان، باسمکردووەو بلاوکراوەتەوە.

شایانی باسە، ئەم "نەوای ئارام"ە کە بە بڕیاری ژمارە (688)ی رۆژی 1991/4/5ی کۆمەڵەی نەتەوە یەککگرتووەکان، دامەزرا؛ شتێك بوو کە لە مێژووی کۆمەڵگەی جیهانیو دەستووری نێوان دەوڵەتاندا؛ ئاوارتەو تاکهەڵکەوتوو (مُستثنی)

بوو، واتە: لەوە پێش وێنەی نەبوو، چونکە بەپێی بەندی (2)ی بڕگەی (7) لە گرێبەندی کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتووەکان؛ دەستکێشانە کاروباری نێوخۆیی دەوڵەتان، رێبەند (ممنوع) کراوە. ئەوەش دەبێ بزانین، کە میتران بۆ ئەم کارە، بەتایبەتی قسەی لەگەڵ جۆن میجەر کردو، دابینی کردو، جۆن میجەریش، قسەی لەگەڵ سەرکۆماری ئەمریکا کرد، کە لەسەرەتاوە رازینەبوو بەو کارەو، نەیویست پشتی بگرێ، تەنانەت جەنەراڵێکی گەورەی ئەمریکا گوتی: "فەرمانی سەرشانی هێزەکانی ئەمریکا ئەوە نییە، کورد بپارێزن لەدەستدرێژیی سەددام حسەین، تەنانەت ئەگەر لەبەردەم هەڕەشەی لەنێوچوونیشدا بن". هەر لەکاتی گەلڕەوەکەشدا، کە بەسەتهەزاران کورد، لەسەر سنوورەکانی دەوڵەتی ترکو ئێران، گیریان خوارد بوو، بە هەزارانیان لەسەرماندا رەقدەبوونەوەو، منداڵەکانو پیرەکانیان، لەبرساندا دەمردن، رۆژنامەوانێکی سەر بە تەلەفیزیۆنی CNN لە جۆرج بوشی پرسی؛ ئایا ئەمریکا ئامادە نییە، یارمەتیی کورد بدات، کە ئەوەتە سەددام خەریکە لەنێویان ببات، جۆرج بوش -کە کورد لەسەروبەندی راپەڕیندا، نێویان نابوو "حاجی بوش"؛ بە گوێی خۆم گوێم لێبوو، بەچاوی خۆشم وێنەیم دی- گوتی: "ئەز سەددام بە نەحلەت دەکەم، بەڵام هیچ بەڵێنێکم نەداوە بە کورد، کە لەباری سوپاییەوە، یارمەتییان بدەم". ئەمە ئەو جۆرج بوشە درۆزنە بوو، کە ماوەیەك لەوەپێش؛ خەڵکی عێراقی بانگکردو هاندا، کە دژی سەددام راپەڕنو بیخەن. بەڵام کە کوردو شیعە لە سەددام راپەڕینو، سەددام جۆگەلەی خوێنی لە هەردووکیان دروستکرد، "حاجی بوش" بێدەنگ ما، تەنانەت رێی دا بە سەددام، هێلیکۆپتەرەکانی بەکار بهێنێ، گوایە بۆ گواستنەوەی سەربازەکانی لە کوێتەوە بۆ عێراق، کە زۆر باش دەیزانی، ئەو هێلیکۆپتەرانە دژی کورد بەکار دەهێنرێنو بەکاریش هێنران. شیعەکان لەم ئەزموونە شتێك فێربوون، کوردیش هیچ!!!

بێگومان، "حاجی بوش" دەیتوانی، هەر لە بەهاری 1991دا، عێراق بە ئاسانی بگرێو، ئەگەر ئەو رۆژە، ئەوەی بکردایە، ئەوا، ئەم بەزمەی ئەوڕۆ دروستنەدەبوو بۆی. بەڵام ئەو، لەو ترسەی کە "هاوپەیمانەکانی"، وەك شێخی حیجازو حوسنی موبارەکی میسرو شا حسەینی ئەردەن، خستیانە دڵیەوە، کە گوایە، شیعەکان دەیانەوێ، لەعێراقدا حکوومەتێکی وەك رژێمی ئێران دابمەزرێننو، کوردیش لەدژی

ئەو پرۆژەیە نابێ، چونکە ئەوەتا، سەرکردەکانی کورد لەگەڵ سەرکردە شیعەکانی عێراق دۆستن و، کوردی عێراق لە جەنگی ئێران و عێراقدا لەگەڵ رژێمی ئێران بوون، دەستی لە رووخاندنی رژێمی سەددام هەڵگرت. لێرەدا، دەبێ بۆ مێژوو، ئەوەش بگوترێ، کە لەکاتی راپەڕینی شیعەکاندا، لە بەهاری 1991دا، رژێمی ئێران، ژمارەیەکی زۆر پاسدارو بەسیج و سیخوڕی خۆی کردبوو بە مدیودا، کە ئەمانە لەخوارووی عێراقدا، کەوتنە کوشتنی بەعسییەکان، بەشێوەیەکی زۆر دڕندانەو، بەرزکردنەوەی وێنەی خومەینی و خامەنەیی و چڕاندنی "بژی کۆماری ئیسلامیی عێراق"و، ئەمەش بیانوویەکی باشی دایە دەست "هاوپەیمانانی" ئەمریکا، کە لەڕاستیدا؛ هاوپەیمانی سەددام بوون و، بۆ پاراستن و هێشتنەوەی رژێمی سەددام هەوڵیاندەدا. ئەوەبوو، حوسنی موبارەکی سەرکۆماری میسر بە رۆژنامەی "الحیاة" (1993/5/27)ی گوتبوو، کە ئەو نەیهێشتووە؛ جۆرج بوش فەرمانی گرتنی بەغدا بداو، سەددام بخات، نەبا، عێراق پارچە پارچە ببێ. واتە: نەبا، کوردو شیعە شتێکیان دەستبکەوێ. هەر ئەم بیانووەشە، کەوا ئەوڕۆ بەکار دەبرێ، بۆ گێڕانەوەی سوننییە دەستوەشێنەکانی سەر بە بەعس، بۆ فەرمانڕەواییی عێراق.

هەرچی چۆنیی بێ "نەوای ئارام" دامەزرا، وەك کارێکی "مرۆڤدۆستانە"، نەك بۆ رەچاوگرتنی مافی رامیاری و نەتەوایەتیی کورد. ئەوجا، کە کورد، سەروکاریان لەگەڵ ئەمریکا پەیدا بوو، دەبوو، سەرکردەکانی پارتی و یەکێتی، کە دەسەڵاتدارانی هەرێمەکەن، بیرێکیان لە هەڵسوکەوتی رابوردووی ئەمریکا بەرامبەر بە کورد بکردایەوەو، ئەوەیان بهێنایەوە بیر، کە سەرۆککۆماری ئەمریکا تۆماس ودرۆ ویلسن (1850–1924) لەسەردەمی جەنگی یەکەمیی جیهانیدا؛ 14 پنتی هێنایە پێشەوە بۆ سیاسەتی هاوپەیمانان پاش جەنگ، کە یەکێك لەوانە؛ دانان بوو بە مافی ئەو نەتەوانەدا کە لەسنووری ئیمپراتۆرێتیی عوسمانیدا دەژیان، بۆ بڕیاردان لەبارەی چارەنووسی خۆیانەوە، تا پلەی سەربەخۆبوونیان، کە یەکێك لەو نەتەوانە، کورد بوو. بەڵام کە پەیمانی لۆزان بەستراو پەیمانی سیڤر خرایە پشتگوێ و، کوردستان لەتوپەتکرا، جەنابی ویلسن نقەی لێوە نەهات. هەروەها، لەجەنگی دووەمی جیهانیدا، سەرۆککۆماری ئەمریکا تیۆدۆر رۆزفلت، هاوەڵی ستالینی سۆڤێت و چەرچلی

بەریتانیا بوو، لە کۆنفرانسی تاراندا (1944)، بۆ پاراستنی سنوورەکانی ئێران و رووخاندنی کۆماری کوردستان، بە سەرۆکایەتیی شەهید قازی محەممەد. ئەمریکا، لایەنێك بوو، لە پاڵ بەریتانیا و ئێران و عێراق و ترکیا و پاکستاندا، بۆ بەستنی پەیمانی بەغدا، کە دوایی بوو بە "سەنتۆ". ئەمریکا، لەساڵی 1975دا فاکتەری یەکەم بوو، بۆ هەرەسهێنانی شۆرشی ئەیلوول. وەزیری دەرەوەی ئەو سەردەمەی ئەمریکا، هەنری کیسینگەر (نەك کیسینجەر، کە نیوەکەی ئەڵمانییە، نەك ئینگلیزی) رازی نەبوو، بۆ ماوەی یەك چارەکیش، رێبدا بەرەحمەتی، مەلا مستەفای بارزانی؛ چەند قسەیەك بکات لەگەڵی و، کوردی کرد بە قوربانی "دۆستایەتی"ی ئەمریکاو شای ئێران، چونکە ئەو رۆژە، شای ئێران دەستی دەڕۆیی، ئەوجا، کە شای ئێران لێیقەوما، ئەمریکا ڤیزەیەکی پێڕەوا نەدی، کە بچێتە ئەمریکا بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکەی. بێجگە لە مانەش، ئەمریکا هەر لەپاش جەنگی جیهانیی یەکەمەوە، تا ئەورۆ، کە ئەوڕۆیە، یارمەتیدەری پلەیەکی رژێمی ترکەو، هەتا شای ئێرانیش رووخا، یارمەتیدەرو پشتگیری رژێمی شا بوو. لەمانەش بترازێ، وەزیری بەرگریی ئەمریکا، دۆناڵد رامسفێلد، لەساڵی 1983دا؛ چووە بەغدا بۆ لای سەددام حسەین و، بەڵێنی یارمەتیدانی بە چەکی قورس و پشتگیریی دیپلۆماتی و ئابووری دا پێی؛ لە دژی رژێمی ئێران، ئەمە، لەو سەردەمەدا بوو، کە سەددام، زۆر بێهێز بووبوو، پێی لە عەباکەی خومەینییەوە ئالا بوو، ناچار بووبوو، لەگەڵ مام جەلال وتووێژ بکا، لەبارەی "ئۆتۆنۆمیی راستەقینە"وە بۆ کوردستان و، لەسەر هێندەك شتیش رێککەوتبوو لەگەڵی، بەڵام، کە رامسفێلد، بەڵێنی وا گەورە گەورەی دا بە سەددام، ئیدی سەددام، پشتیکردە مام جەلال و، ئەنجامەکەشی هێندە ئاشکرایە، کە پێویست بەگێڕانەوە ناکات. دەبوو، هیچ نەبێ، مام جەلال ئەمەی لەبیر بوایە.دەبوو، سەرکردەکانی پارتی و یەکێتی، کاتێك، کە هۆیان کەوتە ئەمریکا، ئەم رابووردووەیان، بخستبایە پێش چاوی خۆیان و بیانزانیبایە، کە "هەرێمی ئاسایش" یان "نەوای ئارام" خێرێکی خوایی یە، کە بەرێکەوت، دەستیانکەوتووە، بەتایبەتی، پاش ئەوەی ئەمریکا، بۆ پاراستنی بەرژەوەندیی خۆی، نەك لەبەر خاتری کورد، ناچار ما، بیپارێزێ، بۆ ئەوەی بنکەیەکی هەبێ، کە لەوێوە بتوانێ، چاوێك بخاتەسەر ئێران و عێراق و سووریاو، بۆ ئەمەش،

گەلێك خزمەتی رژێمی تركی كرد، تاكو چاو لە بوونی "نەوای ئارام" بپۆشێ، لەوانە: كردنی ئیسرائیل بە هاوپەیمانی رژێمی تركو، بەشداریكردن لەرفاندنی سەركردەی پ.ك.ك؛ بەڕێز عەبدوڵلا ئۆجەلان و، پێفرۆشتنی چەند جۆرێك چەكی قورس و قرکەر، كە لەدژی كورد بەكارهێنران و، هەوڵدانی بۆ ئەوەی رژێمی ترك ببێتە ئەندامی یەكێتی ئەوروپا. لەگەڵ ئەمەشدا، سەركردەكانی حیزبەكان، بەتایبەتی؛ پارتی و یەكێتی؛ نرخی ئەو هەلكەوتە بێوێنەیەو، ئەو دەرفەتە مەزنەیان، نەگرتەبەرچاو و، ئەوەبوو، پاش ماوەیەكی كورت، دوای هەڵبژاردنی پەرلەمان و هاتنەكایەی حكوومەتی كوردستان لە هەردوو حیزبەكە، كە زۆربەی زۆری هەڵبژێرەكانیش، بەهیوای ژیانێكی خۆش، دەنگیان دا بۆیان، كەچی ئەمان، كەوتنە شەڕی یەكدی، لەسەر دەسەلات. بەلام، دەسەلات بەسەر كێدا؟ دەسەلات بەسەر داگیركەرانی كوردستاندا؟ نەخێر! بەڵكو، دەسەلات بەسەر هەژارو رەشوڕووتی كوردستاندا. ئەمە لەكاتێكدا بوو، كە خەڵكی ئەو هەرێمە، رۆژگارێكیان دەبردە سەر، لەوپەڕی كولەمەرگیدا دەژیان، نانی وشكیشیان دەستنەدەكەوت بیخۆن، تەنانەت، شتومەكی نێو ماڵی خۆیان لەسەر شەقامەكان هەراج دەكرد، بۆ ئەوەی لەبرساندا نەمرن، بەتایبەتی، پاش ئەوەی سەددام، فەرمانگەكانی لە سێ ستانەكە كێشایەوەو، گەمارۆی ئابووریی خستەسەریان، لەپاڵ گەمارۆیەكی دیكە، كە لەلایەن كۆمەڵەی نەتەوە یەككگرتووەكانەوە، بەسەر هەموو عێراقدا، سەپابوو. برسێتی خەڵكەكەو شەڕی خۆكوژیی دوو حیزبەكە، گەیشتە سنوورێك، كە زۆر كەس ناچارمان "هەرێم" بەجێبهێڵن، خۆ ئەگەر پرۆژەی "نان بە نەوت" نەكەوتایە گەڕ، ئەوا، هەرێم هەر ئەوانەی تێدا دەمایەوە، كە بۆ دەستبەسەردا گرتنی ئەم چیاو ئەو شیو، شەڕە قۆچیان لەگەڵ یەك دەكرد. ئەم شەڕە قۆچە، ئەمریكای زۆر شڵەژاند؛ بەتایبەتی لەوە دەترسا، كە رژێمەكانی ئێران و عێراق، كە دوژمنی ئەمریكا بوون، سووت لەو ئاژاوەیە ببینن؛ كە دیارە سووتیشیان لێدی. ئەمریكا، لەڕێی سیخوڕەكانییەوە، باوەڕی هێنابوو بەوەی؛ سەددام خەریكی بەرهەمهێنانی چەكی ئەتۆمە، لەپاڵ چەكی كیمیایی و بایۆلۆژیدا، ئێرانیش خەریكی پەروەردە كردنی تێرۆریستە لە فەلەستین و لوبناندا و، هەردووكیان، ئێران و عێراق، هەڕەشە لە بوونی ئیسرائیل دەكەن، كە

ەمریکا بە هەڤاڵبەندێکی ستراتیژیی خۆی دەزانێ. ئەم هۆیانە هەموو، پێویستیی
ەمریکایان بە مانەوەی "هەرێمی ئاسایش" بەهێزتر کردو، ناچاریانکرد، کە چاو
ەگەڵێك کردەوەی یەکجار خراپی دەسەڵاتدارانی ئەم دوو حیزبە بپۆشێ، تەنانەت،
اش ئەوەی کە ، لەشکری رژێمی ئێران و لەشکری سەددام، نابەرپرسیارانە، هێنرانە
وردستانەوە، ئەمریکا، خۆی لە پاراستنی "هەرێمی ئاسایش" نەکێشایەوە، وەك
ەرەنسا کردی؛ رژێمی ترکیش، لە ترسی پەرەسەندنی پ‌ی‌ کێ کێ، پێویستی بە
ارمەتیی پارتی و یەکێتی هەبوو، بۆ ئەوەی بەربەرەکانێی پ‌ی‌ کێ کێ بکەن بۆی، کە
ەوەبوو کردیان، لەبەر ئەوە، "ئەوای ئارام" مایەوە. ئەوجا، ئەوەبوو ئەمریکا پاش
چەند هەوڵدانێکی سەرنەکەوتوو لە ئەنقەرەو درۆگیدا، هەردوو سەرکردەکەی
ەپاییزی 1998دا بردە واشەنتن و، وازۆی ئاگربەستێکی کرد پێیان، بەسەرپەرشتیی
ەزیری دەرەوەی ئەو دەمەی ئەمریکا، بەڕێز مادلێن ئۆلبرایت، کە نێوەرۆکی ئەو
ێکەوتننامەیە، ساڵانی ساڵیش دوای ئەوە، نەخرایە کارو، باوەڕی گەلێك لایەنیشی
بە پشتبەستن بە کورد، لەقکرد، کە ئاسەواری خراپەکارانەی ئەو بێباوەڕییەش، هەتا
ەندازەیەك لای سەرکردەکانی ئەمریکا ماوەو، لەدووتوێی راپۆرتەکەی بێکەر-
هاملتنیشدا بەدیدەکرێ.

کە ئەمە، ئەم راستییانە، وا بێ پێچوپەنا، دەخەمە سەر کاخەز، مەبەستم
رکهەڵساندنی کورد نییە لەدژی ئەمریکا، یان دژی کاربەدەستەکانی پارتی و یەکێتی.
چونکە، رامیاری، بە رك و کۆنەکین و تۆڵەسەندنەوەی بێوەجانە؛ نابرێ بەڕێوە. پاشان،
دەبێ بزانین، رێبازی رامیاریی جۆرج دەبلیو بوش و هاوکارەکانی، جیاوازیی هەیە لە
رێبازی رامیاری باوکی و سیاسەتکارەکانی پێش خۆیان. بێجگە لەوەش جۆرج دەبلیو
بوش، وەك تۆنی بلێر، سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، مرۆڤێکی ئازا و بەجەرگ و خاوەن
بڕیارە. بەڵام، وەك کورد دەبێژن؛ "کە زۆر هات قەواڵە بەتاڵە"و، جۆرج بوش؛ کە
بەدەنگی گەلەکەی هاتووەتە سەر کار، ناتوانێ و پێیناکرێ، پاساو بۆ ئەوە بهێنێتەوە،
کە هەر رۆژە، چەند سەربازێکی لەعێراقدا بکوژرێن؛ ئەوەش بەدەستی خەڵکانی سەر
بە گەلێك، کە ئەمان چووبن بۆ رزگارکردنی لە ملهوڕێك. ئەوەتا، یەکێکی وەك موقتەدا
سەدر، کە لەزەمانی سەددامدا، لە هیچ کونێکەوە دیار نەبوو، ئەوڕۆ بە پشتی رژێمی

ئێران و، ئەو ملوێنانەی کە لەرژێمی تارانەوە بۆی دێ، ملوێنێك خەڵکی لە خۆی کۆکردووەتەوەو، داوای چوونە دەرەوەی سەربازەکانی ئەمریکا دەکا لەعێراق. سەربازەکانی ئەمریکا، بۆ ئەوە نەچوونەتە عێراق، تا، فیداییەك بچێ خۆی پێیاندا بتەقێنێتەوە، بۆ ئەوەی کە گیانی بە بەهەشت شاد بوو، دەستبەجێ دەرزەنێك لە حۆرییەکانی ئەوێ، بە "سیغە" بکاتە ژنی خۆی و، سەربازەکانی ئەمریکاش، یەکسەر بچنە دۆزەخ!!! ئەمریکاییەکان ژیانیان لەم دنیادا دەبەنەسەر، ژیانیان پاش مردنیان، دەستپێناکات. ئەگەرنا، بڕیاردانی جۆرج دەبلیو بوش؛ بۆ خستنی رژێمی سەددام، بڕیارێکی یەکجار دەگمەن و دانسقەو مەردانەبوو، کە سەرکردەکانی ئەڵمانیا و فەرەنسا، شان بەشانی سەرکردە دیکتاتۆرەکانی روسیا و چین و چەپاژوەکانی ئەوروپا، لەدژی وەستان و بە ملوێن، خەڵکی ساویلکەو چەپڵە بە قوون لێدەرو نەزانیان هێنایە سەر شەقامەکانی ئەوروپا لەدژی ئەمریکا، بەنێوی، گوایە "پاراستنی ئاشتی"یەوە؛ کە لەڕاستیدا بۆ پاراستنی سەددام بوو، نەك ئاشتی، رۆژێك دێ، ئەوانە کاڵەك بە ئەژنۆی خۆیان بشکێنن، ئەو رۆژەش، سەرەتاکەی دەرکەوتووە. ئەوجا، کە سەرکردەکانی دوو حیزبە دەسەلاتدارەکەی باشوور، بەهۆی حیزبحزبێنەو خزمخزمێنەو، سەردەرنەچوونیان لە هونەرو زانستی رامیاری، نەیانتوانیوە، سووت لەم دەرفەتە مەزنە وەربگرن و، لەئەمریکای بگەیەنن کە عێراق و دراوسێکانی، دەوڵەتانی دەستکردن و کێشەکان هەر دەمێنن تا باری خۆڕسکی نەیەتە جێ. ئەوەش کوردستانێکی سەربەخۆیە. کە سەرکردەکانی کورد هەوڵی ئەمەیان نەدابێ و هەر باسی "یەکێتیی عێراق"یان کردبێ، ئەوە، نەگوناهی جۆرج دەبلیو بوش و، نەگوناهی بێکەرو مێکەرە، کە ئەوان، وەك ئەمریکایی، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان کار دەکەن و، ئەوەش ماڤی خۆیانە. گوناه؛ گوناهی سەرکردەکانی دوو حیزبەکەیە، کە دەرفەتیان لە دەستداوەو، ئەوڕۆش مشوور نەخۆرانە، هەر پشت بە "دەستوور" دەبەستن و، چاوەڕوانن بزانن؛ چ دەقەومێ، ئەوجا "تەکانێك بدەن"، لەباتی ئەوە، پێشکات، هەستن پێشگیریی لەرۆژی قەومان و کارەسات بکەن. ئەوەتا، بەڕێز مەسعوود بارزانی دەفەرموێ: "کە دەستوور گۆڕاو ئێراق کەوتە دەست ئەو شۆڤێنیانە؛ ئەوکاتە خوا

یمە، وەکو عەرەب دەڵێن: لکل حادث حدیث" (خەبات، 2006/12/27) بەکورتی،
ا نەکێشن بەتەپڵی سەرماندا، نابێ هۆش بهێنینەوە بە بەرخۆمان...!!!
ەڕێز کاك مەسعوود: سەددام؛ پاش بەستانی رێککەوتننامەکەی 11ی مارت؛
کەوتننامەکەی نەگۆڕی، بەڵکو، بەدواخستنی جێبەجێکردنی؛ بۆ ماوەی چوار
ڵ، کەڵکی لە کاتو چاوەڕوانیو "خواکەریمی"ی کورد وەرگرتو، خۆی وا
ردەوە، کە پێویستی بە گۆڕینی رێککەوتننامەکە نەبوو، بەڵکو بە جارێ فتی کرد.
ونەیەکی دیکەش، پەیمانی سێڤرە، کە لەساڵی 1920دا ئیمزا کرا، بەڵام، سێ
ڵێك چاوەڕوانیو دەستبەکار نەبوونو "خواکەریمی"ی کورد، ماوەی دایە
گەبۆر، کە خۆی لە بەریتانیاو فەڕەنسا نێزیکبکاتەوەو، ئیدی، پەیمانی سێڤر،
یستی بە گۆڕین نەما، چۆنکە بە یەکجاری ڤت کرا. بەڕێز کاك مەسعوود: ئێوە
تا ئێستە، چوار وەزارەتتان نەکردووە بەیەكو، هەتا ئێستەش، لەشکرێکی
دستانیی یەکگرتووی سەربەخۆی ناحیزبیتنان نییەو، هەتا ئێستەش، کەس
نیێ؛ بودجەی پارتیو یەکێتیو حیزبەکانی دیکەی کوردستان چەندەو، داهاتی
ومەتی کوردستان چۆن بەختدەکرێ. هیچ کاربەدەستێکی حکومەتی کوردستانو،
چ مووچەخۆرێك کە ژمارەیان، خوانەیبڕێ، خۆی لە ملوێنێك دەدا، خۆی بە
رسیار نازانێ بەرامبەر گەندەڵیی بەڕێوەبەرێتیو بەرتیلخۆریو بێسەروبەری لە
ەی فەرمانگەکانو، لە هەموو کایەیەکی کۆمەڵگەی هەرێمی باشووردا. سبەینێ
پارەکە لە بەغداوە بڕاو، دوو حیزبەکە مانگانەی ملوێنە مووچەخۆرەکەیان
ەدراو، کوردستانیش هیچ ژێرخانێکی ئابووریی بەرهەمهێنەری نییە، ئەو دەمە
بنێك بێکارو بێنان دەچنە پاڵ ئەوانەی ئێستە بێکارانو، ئەو دەمەش "سفر، سفر
ستەوە".
ەمە واو، کەسێکیش نییە، خۆی بەر بەرپرسیار بزانێ، بەرامبەر ژیانی
مەرگی ومەمرەو مەژی ئاوارەکانی کەرکووکو ماڵوێرانیی هەڵەبجەو گەرمیانو
نانو بارزانو شێخ وەسانانو بالیسانو قەڵادزێ ومەندەلی وجلەولا. هەر بەڵێنەو
یێو، کارێکی لەدواوە نایەت، کە پرسیار لە بەرپرسێك دەکرێ؛ بۆچی وایە،
رمووێ: "کار بەشەوو رۆژێك پێکنایەت"، ئەوە راستە، بەڵام ئێوە، پانزە ساڵە

حکوومەتن، پانزە ساڵ! "ئاخر لەبەرتان مرم!" کەینیٚ 15 ساڵ شەوو رۆژێکە؛ ئێوە، کە دەفەرموون، ئێوە بەرهەڵستکار نین و بەشداری حکوومەتی عێراقن؛ بۆچی چاوەڕوانی دەستی مالیکی و شەهرستانی و کیٚ کیێن؟ هەستن خۆتان لەو ملیاردانەی هەتانە، بۆ هەر یەکێك لەو شوێنانەی باسکران، 50-100 ملوێن دۆلار تەرخانکەن و، ئاوایان بکەنەوەو، کارو خزمەتە گشتییەکان بۆ خەڵك دابینبکەن؛ بۆچی چاوەڕوانی دەستی حکوومەتی بەغدان، کە گەڕەکێکی بەدەستەوە نییە؛ کە دەفەرموون حکومەتی بەغدا، داوای ناردنی پێشمەرگە دەکا بۆ بەغداو نێوەڕاستی عێراق، باشە؛ کە ئێوە لەشکرێکی یەککگرتووتان نەبیٚ؛ پێشمەرگە بە چ نێوێکەوە دەنێرنە ئەویٚ؟ ئایا ئەوەش هەر فیفتی فیفتی دەبیٚ؟ پاشان؛ بۆچی حکوومەتی عێراق رازییە، بەناردنی پێشمەرگە بۆ نێوەڕاست و خوارووی عێراق و، رازی نییە بۆ ناردنیان بۆ کەرکووك و مووسڵ و ریٚی کەرکووك و بەغداو ریٚی مووسڵ و بەغدا؟ تاکەی هەموو رۆژێك، چەند کوردێك لە کەرکووك و مووسڵ و دیالەو بەغدا بکوژرێن، هەر لەبەر ئەوەی کوردن و، کۆچ و باری عەرەبیش، بە هەزاران خێزان روو لە کوردستان بکەن و قوتابخانەی عەرەبی بکرێتەوە بۆیان و، منداڵانی کورد لە ئاکریٚ، لەلایەن مامۆستایانی عەرەبی هەڵاتووەوە بەدارکاری، بە زمانی عەرەبی پەروەردە بکرێن، کە ئەو مامۆستایانە یەك وشە کوردی نازانن؟

ئەم چارەڕەشییە تاکەینیٚ درێژە دەکێشی؟

مخابن، بێسەروبەری، هەموو لایەکی گرتووەتەوەو، گوناهەکەشی، کە لە بنچینەوە؛ گوناهی دوو زلحیزبەکەیە، هەر لە هەنگاوی یەکەمەوە دەستپێکرد، کە بە هەڵەنرا، واتا: خۆکردنەوە بە عێراقی، بیٚ مەرج و گەرەنتی نێونەتەوەیی. دیارە، هەموو هەنگاوەکانی پاش ئەوەش، کە یەکەمیان لەسەر بنچینەی هەڵە نرابوو، هەر بە هەڵە دەرچوون. تەنیٚ بۆ وێنە: بۆچی سەرکردەکانی دوو زلحیزبەکە رازیبوون کە کێشەی دوجەیل، پێش کێشەی ئەنفال و چەکی کیمیایی و هەشتهەزار بارزانی و دە هەزار فەیلی بکەویٚ؛ ئەمە لەکاتێکدا، کە دەبوو کێشەی ئەنفال و چەکی کیمیایی کە دەچنە ریزی خانەی گەلکوژییەوەو، لەلایەن دەوڵەتی عێراقەوەو بە نەخشەو پیلان جێبەجێکراون، بدرێنە دەست دادگەیەکی نێونەتەوەیی، نەك دادگەیەکی دەوڵەتی

ێ خۆی. ئەوجا، کە کێشەی گەلکوژی لە کورد، بیّ نرختر لە کێشەی دوجەیل
، بۆچی کورد بەوە رازیبوون، کە دوو دادوەری کورد، یەك لەدوای یەك، دادگەیی
دام بکەن؟ ئەوجا کە دادوەوری یەکەم، بەرێز رزگار ئەمین، ئەو هەموو رەخنە
رینە گیران لێی و، لە دادگەیی دوورخرایەوە، بۆچی بەرێز رەئووف رەشید
ـوو، جێی بگرێتەوە، یان هیچ نەبیّ، فەرمانی لەسێدارەدانی سەددامی هێندە
ـخست، تا دادگەییکردنی ئەنفال بەرەو تەواو بوون دەچوو، تاکو کێشەی
وژی لە کورد، وەك بەردی بنگۆم ون نەبیّ؟ دوایی، بۆچی کە لەدادگەی ئەنفالدا،
ندیی رژێمی ترك بە ئەنفالەوە باسکرا، پارێزەرە کوردەکان هەڵنەستانە سەر
، داوای رۆنکردنەوەو پرسیاریان لە سەددام و هاوکارەکانی لەو بارەیەوە نەکرد؟
ێ بێزاریی خۆیان بەرامبەر برینی دەنگی تەلەفیزیۆنەکە دەرنەبڕی کە بێگومان،
اتبوونی دەستی هاوبەشیی داگیرکەرانی کوردستان لەئەنفال دا، زۆر گرنگە بۆ
خستنی کێشەی کورد لە سنوورێکی ئینتەرناسیۆنالیدا. بەڵام قسە لەگەڵ کێ
ن و هاوار بۆ کێ بەرین؟ سەددام بە پەلە لە سێدارە درا، بۆ ئەوەی دۆزی ئەنفال و
ی کیمیایی، واتە: کەلکوژی لە کورد سەری تێدا بچیّ و سڕ وتڕی هاوکارانی
امیش بکریّ بە ژێر خۆڵەوەو، لەنێو ئەوانەشدا؛ دۆنالد رامسفێلد..
استی، زۆر سەیرە، ئا لەم بارودۆخە پڕ لە مەترسیەدا، کە بەسەر کوردستاندا
پەڕیّ، هێندەك وشەفرۆش و بێویژدان و زۆرناژەنی دەسەلاتداران، زاتیان داوە بە
ان و، لەباتی خزمەت و پاراستنی یەکێتیی کۆمەڵگەو رێزگرتن لەو درۆشم و
انە کەمانەی، کە بوونەتە جێی دانپێدانانی گشتی، بەزمی گۆڕینی مارشی
ستان و ئالای کوردستانیان هێناوەتە کایە، وەك ئەوەی کورد لە هەموو شتێکی
 بیّ، هەر ئەو دوو شتەی مابیّ تەواویان بکات.
انە، دەبیّ چاویان بکەنەوەو، هۆش بهێننەوە بەر خۆیان و، بزانن کە مارش و
ێ کوردستان، لەلایەن دەوڵەتێکی کوردستانییەوە واتا: کۆماری کوردستان،
ـەرۆکایەتیی پێشەوای شەهید قازی محەممەد، چەسپێنراون و، لەوەوە
چێوەیەکی فەرمییان وەرگرتووەو، لە هەموو لایەکی کوردستاندا رێزیان
لیریّ. ئەوەش بەرۆژو دوو رۆژ روویندداوە، بەڵکو سالانی بردووە. لەبەر ئەوە؛

هەموو دەستکارییەکی ئەو پیرۆزمەندییانە، بەبێ گەڕانەوە بۆ راپرسییەکی ئازادانە
لە تەواوی کوردستاندا، لە خراپەکاری و گێرەشێوێنی و سووکایەتیکردن بە کوردو
کوردستان پتر، هیچی دیکە ناگەیەنێ و، ئەوانەی دەستیانداوەتە ئەم کارە دزێوە
بابچن بەجۆرێکی دیکە بکەونە دۆلار کۆکردنەوەو، خەریکی ڤۆدکاو ویسکی
خواردنەوەی خۆیان بن.
ئەم بارودۆخە نالەبارەی کە ئەورۆ خەڵکی کوردستان تێیکەوتوون، بەڵگەیەکی
بنبڕە بۆ ئەوەی کە حیزبحزبێنە، نەیتوانیوە بچووکترین کێشەی خەڵکی بەشخوراوی
کوردستان، چارەسەر بکا، چ جایەکی، چارەنووسی چل ملوێن کوردو دۆزی
نیشتمانیی کوردستان. لەبەر ئەوە گشتپرسییەکی سەربەستانە، بۆ
دەستنیشانکردنی چارەنووسی خەڵکی باشووری کوردستان و، هەڵبژاردنی
پەرلەمانێکی نوێ، لە کەش و هەوایەکی ئازادداو، هێنانە سەرکاری حکوومەتێکی
نوێی خزمەتگوزار، پێویستیی بێ چەندو چۆنی ئەم کاتەیە. ئەگەرنا، هەرەس و
کارەساتێکی وا خۆی بۆ کورد ماتداوە، کە هەرەس و کارەساتی بەهاری 75، بە هەزار
ئاو لەچاویدا شۆرابێتەوە. دەسەڵاتدارانی کوردیش با دڵنیابن، کە ئەگەر ئەمجارە
قەوما، خوانەکا، بقەومێ، ئەوجا، ئەوی مێشکی تێکنەچوو بێ، ناچێ جارەکی دی
بەسەرکردەیەتیی ئەوان بکەوێتە شاخ و کورتانەکەی جەجال بدروێتەوە بۆیان.

بەرلین 2006/12/31

**میدیا**، ژ 272، 2007/1/9

## ردستان لەتەنگانەداو رۆڵی لەشکری پێشمەرگەی کوردستان

وردستان، بەسەردەمێکی یەکجار مەترسیدارو چارەنووسسازدا تێدەپەڕێو، سەڵاتدارانی کوردستانیش، کە بریتیین لە کاربەدەستانی پارتی و یەکێتی، دەکارییەکی وایان نەکردووە کە بتوانن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو بارودۆخە نازکەدا ن کە لەئەنجامی درێژەکێشانی جەنگی عێراقەوە هاتووەتە کایەوەو عێراق بەرەو ءسهێنان و لەتلەت بوون دەباو مژدەی لەدایکبوونی کوردستانێکی سەربەخۆ دەدا.

کوردستانە سەربەخۆیەی کە بەڕێز مام جەلال، بەخەون و خەیاڵی شاعیرانەی د کوردێکی شۆڤینی دەداتە قەڵەم، بەڵام داگیرکەرانی کوردستان، بە رووداوێکی ەگیراوی دەزانن و، ئۆباڵەکەی دەهێنن بە مل ئەمریکاداو، بەتایبەتی سەرکۆمار، ج دەبلیو بوش، ئەگەرچی بوش خۆی، تائێستا بە یەك وشەش باسی کوردستانی بەخۆی نەکردووە وپێلەسەر "یەکێتیی خاکی عێراق" دادەگرێ.

ورد، دەمێکە گوتوویانە "کەگلۆڵەت کەوتە لێژێ، کەس خاست پێنایەژێ". ڕۆ، گلۆڵەی بوش کەوتووەتە لێژێو، لە هەموو لایەکەوە، نووکی نەشتەر، ست و چەپ و، بەهەق و بە ناهەق، روویکردووەتە لەش و گیانی و، خۆ ئەگەر درا بە بدا، ئەوا زەوری کەوتنەکەی، بەجۆرێ دەبێ، کە نەك هەر رۆژێکی رەش بۆ خەڵکی ،ستان دێنێتە پێشێ و بەس، بەڵکو بربڕەی پشتی گەلێك لایەنیش دەشکێنێ و، ێش هەمووشیانەوە، ئەوانەی دژی پەلاماردانە سەر سەددام وەستان، وەك کەڕەقەکانی رژێمی میلیتاریستی ئەناتۆڵ و شێخەکانی حیجازو شیراکی پاریس و سیالدێمۆکراتەکان و کەسکەکان و چەپاژووەکانی ئەڵمانیاو ئیسپانیا و ئیتالیا و نساو، هەموو ئەو چەپلە بە قوون لێدەرانەی کە بەهەزارانیان رژانە سەر امەکانی ئەوروپاو، بەنێوی "پاراستنی ئاشتی"یەوە، پاسی رژێمی سەددامیان د.

سالآنێکەوە لەمەوبەر، باسی ئەوەم کردووە، کە جۆری هاریکاریکردنی کورد ڵ ئەمریکا، هەر لەسەرەتاوە، دەبوو چۆن بووایە، بەڵام بەداخەوە، ئەوانەی کاریان ست بوو، نەك گوێیان لە قسەکانم نەگرت، بەڵکو کەوتنە دژایەتیشم. کە دەمگوت ج و بێ پەیمانی نووسراو، پێش مارێنزەکان نەکەون. ئێستە، نامەوێ ئەو باسە

جارەکی دی بکێڕمەوە، بەڵام دەمەوێ پەنجە رابکێشم بۆ بابەتێکی گرنگ، ئەوەش ڕۆڵی ئەو هێزە گەلپارێزەیە، کە نێوی پێشمەرگەی راستینە؛ پڕ بەپڕی خۆیەتی شایستەی ئەو نێوەیە.

وشەی پێشمەرگە، لەوەوە نەهاتووە کە یەکێك لە پێش خەڵکی دیکەدا، خۆی ب کوشت بدات. کوردی کۆن، بەو کەسانەیان گوتووە "کەوڵسۆری بەرلەشکر" ئەوانە لەبەردەم لەشکردا وەستاون و، لەکاتی لێدانی "تەپڵی باز"دا، وەك یەکەم کەس کەوتوونەتە وێزەی دوژمن. پێشمەرگە "کەوڵسۆری بەرلەشکر" نییە، بەڵکو خۆ لەشکرە. پێشمەرگە، ئەو مرۆڤە ئازاو بەرجەرگەیە، کە پێش بە مەرگ، واتە: مردن لەنێوچوونی خەڵك دەگرێ. پێشگیریکردن لە شتێك، مانای رێگرتنە لە قەومانی ئە شتە. بۆ وێنە: پێشگیری لە لافاو، مانای بەرگرتنە لە لافاو. بە کورتی؛ پێشمەرگە ئەو کەسەیە کە دەبێتە لەمپەرێك، لەنێوان خەڵکی کوردستان و، ئەوانەدا کە دەیانەو ئەو خەڵکە تەفرو توونە بکەن، واتە: شوورەیەکە لەنێوان خەڵکی کوردستان داگیرکەراندا.

پێشمەرگە، بەم پێوانەیە، خزمەتکاری نیشتمان و پارێزەری خەڵکی کوردستانە نەك چەکداری ئەم حیزب و ئەو حیزب و، ئەم کەسایەتی و ئەو کەسایەتی. پێشمەرگە سەربازە. سەرباز، فەرمانی پۆلیس و پاسەوانانی تایبەتی نابات بەڕێوە. فەرمانی سەرشانی پێشمەرگە، پارێزگارییە لە بوونی خەڵکی کوردستان و سنوورەکانی نیشتمان.

سیاسەتکارانی حیزبەکان کە لەماوەی 15 ساڵی رابوردوودا، تەگەرەو بەرهەڵست بوون لەبەردەم دامەزراندن و رێکخستن و پڕ چەککردنی لەشکرێکی کوردستانید سەری زمان و بنی زمانیان ئەوڕۆ ئەوەیە؛ کە رۆژ رۆژی هێز بەکارهێنان و بەرەنگاری چەکدارانە نییە، بەڵکو رۆژ رۆژی وتوویژو دیپلۆماسێتییە. دیارە، ئەم قسەیە نیوە راستە، بەڵام، هەر نیوەی، نەك هەمووی. چۆنکە، خۆیایە، کە کێشەیەك دەخرێتە سە مێزی گفتوگۆو لێکۆڵینەوە، کاتێك دیپلۆماسێتی دەیباتەوە، ئەگەر هێزێکی سەربازیش پشتگیریلێبکات. بۆ راستی ئەم وتەیەش، وەرن تەماشای ئەمریکا بکەن و ئەو رۆژە بهێننەوە بەرچاو، کە هاتە نێو عێراقەوە، هەموو لایەك رێزیاندەگرت

یسان لێی و، ئەوجا، ئەوڕۆش تەماشای بکەنەوە، کە ئەوەتا بەدەستی
کوژەکانەوە داماوە. لەمەشدا، نامەوێ گوناهی ئەمریکا خۆشی، بخەمەوە بەرچاو،
نکە دەمێکەو، چەند جارو چەند جار لێیدواوم. بەڵام ئەم بەراوردکردنە، ڕێزی
دارو بێهێز دەخاتەڕوو.
ایانی باسە، پێشمەرگە، تایبەتکارێکی دیکەشی هەیە، کە لەشکرە نەریتییەکان
امیەکان) نیانە. پێشمەرگە، هێزێك نییە، کە بە زۆرەملی و تۆپزی دامەزرابێ؛
کو، خۆبەخشانە هاتووەتە کایەوەو، لەمەشدا مەبەستم لەو کەسانە نییە، کە
ەوەندیی تایبەتیی خۆیان، وایکردووە لێیان، ماوەیەك بچنە نێو پێشمەرگەوەو
گانی پێوە بکەن، بەڵکو مەبەستم ئەوانەیە، کە بەفەرمانی ویژدانی زیندوویان و،
مێنانەدی ژیانێکی پڕ لە شادی و ئازادی و ئاشتی بۆ خەڵکی ئەم کوردستانەی
وستی زۆردارانە، بەئارەزووی ناخی دڵیان، ئەو ڕێگەیان گرتووە. لەبەر ئەوە، هەر
ەن کە ئەوڕۆش و لەم تەنگاوییەدا، دەتوانن، جارەکی دی بێنەوە دەست و،
گرەیەك ڕێکبخەن، دوور لەدەسەڵاتی حیزبەکان و، بڕیارێکی بنجبڕانەو بوێرانە
ن، بۆ دامەزراندنی لەشکری پێشمەرگەی کوردستان، لە هەموو ئەو چەکدارانەی
وشەی پیرۆزی پێشمەرگە دەیانگرێتەوەو، دەرگەش بکەنەوە بۆ چەکدارە
مەتەکانی هەموو حیزبەکان و گەلەکانی کوردستان، بە ترکمان و ئاشووری و گشت
نەوە، کە خۆیان بە هاوولاتیی کوردستان دەزانن، تا بچنە نێو ئەو لەشکرەوەو،
ولاش، ڕێنەدەن بە هیچ حیزبێك، چەکدار پێکەوە بنێ، بەڵکو هەموو حیزبەکان
ار بکەن، خەریکی کاری ڕامیاری بن و، خۆ ئەگەر کادرەکانی حیزبەکان،
یستیان بە پاراستنی ژیانیان هەبوو لەشەڕی نەیاران و ناحەزان، ئەوا، بەو پێیە،
بس بیانپارێزێ، نەك ئەندامانی لەشکری پێشمەرگە. پێشمەرگە سەربازەو، نابێ
ی پۆلیس بلیزێ. پۆلیسیش، وەك هێزی ئاسایش، کە فەرمانی بنچینەیی ئەم
گەیە، بەربەرەکانیی سیخوڕەکانی بێگانەیە لە کوردستاندا، دەبێ سەر بە هیچ
یێك نەبن و لە خزمەتی بەرپرسیارانی ئەم حیزب و ئەو حیزبدا نەبن. ئەوجا، کە
مەرگە بوو بە لەشکرێکی یەککگرتووی سەربەخۆ، ئەو دەمە، دەتوانێ سووت لەو
جەیە ببینێ کە بۆ پێشمەرگە تەرخاندەکرێ، چ بۆ ڕەختکردنی لەشکر بە چەکی

قورس و مۆدێرن و، چ بۆ خۆشگوزەرانی سەربازەکانی و ئەفسەرەکانی و، چ بۆ پاداشدانەوەی ئەرکی ئەو پێشمەرگە دێرینانەی کە لەڕۆژانی ڕەشدا، گیان لەسەر دەستان، کەوتنە بەربەرەکانیی دوژمنان، کە ئەوەتە ئەوڕۆ، زۆر بەداخەوە، هێندێکیان شێوی شەویان نییەو، هێندێکیشیان دەربەدەری هەندەرانن. دابینکردنی خۆشگوزەرانی و تێروتەسەلی بۆ پێشمەرگەو پۆلیس و هێزی ئاسایش و، دوورکەوتنەوەیان لە تەنگەبەرێتیی حیزبایەتی، گەورەترین خزمەتە کە پێشکێش بکرێ بە خەڵکی کوردستان.

ئا، لەم ڕۆژەدا، کە لەشکری ئەمریکاو هاوپەیمانەکانی لەعێراقدا، شەڕی ژیان و مردن دەکەن و، لەناچاریدا، خەریکن بیر لەوە دەکەنەوە کە جڵەوی کار بدەنە دەست تاقمێکی ملهوڕی دوژمن بە کوردی وەک تاقمەکەی سەددام، دیارە، بوونی لەشکرێکی پێشمەرگەی سەربەخۆی کوردستانیی ئامادەی کار، پێویستیی بێ چەندو چۆنی ئەم کاتەیە، چۆنکە، ئەو لەشکرە، نەک هەر دەتوانی لە کەرکووک و مووسڵ و دیالەو کووتدا، گێڕانەوەی نێوچە داگیرکراوەکانی کوردستان مسۆگەر بکات و بەس، بەڵکو، دەکارێ، لە بەغداش، جێی خۆی وادابکوتێ، کە دارو دەستەی فەقێ موقتەدا سەدری، گوێ لە مستی ڕژێمی ئێران و، بەعسییەکانی پشتبەستوو بەڕژێمی دیکتاتۆرو گەندەڵی ئەسەد، نەتوانن گرەو لە کوردستان ببەنەوەو، ئەو ئەنفالەی کە هەموو ڕۆژێک بەڕشتنی خوێنی چەند کوردێک بەردەوامە، چیدی، بۆیان نەچێتە سەر.

هێژای گۆتنە، ئەو جەزرەبەیەی کە هێزەکانی ئەمریکا لە 1/26دا لە هەولێر، سرەواندیانە چەند سیخوڕێکی ڕژێمی ئێران، کە بەنێوی دیپلۆماتەوە، خۆیان خزاندبووە ئەوێ و، پاش گرتنیان بە خۆیان و چەند بەڵگەنامەیەکی گرنگەوە، لەکاتی لێکۆڵینەوەدا، ترسنۆکانە، دانیان بە گەلێک کردەوەی ڕژێمی ئێراندا ناو، هێندەک نهێنیان، لەبارەی ڕژێمی ئێران و دەسکەلاکانیان لەعێراقدا درکاندو، بەتایبەتی ڕۆڵی "سوپای مەهدی"ی فەقێ موقتەدا سەدرو "سوپای بەدر"، کە ئەوە بوو هەر ڕۆژێک دوای ئەوە، ئەمریکاییەکان پتر لە 600 ئەندامی "لەشکری مەهدی"یان گرت و، دوو ڕۆژیش دوای ئەوە، واتا؛ لە 1/28دا فەقێ موقتەدا، چەند چڵکاوخۆرێکی خۆی، بەنێوی گوایە "دۆستایەتی"یەوە؛ ڕەوانەی هەولێر کردو بەدرۆ، کەوتە هەڵدان و

پەسندانی کوردو کاك مەسعود بارزانی. هەر لەوکاتەشدا کەوتە هاندانی عەرەبە هاوردەکانی کەرکووك لەدژی کورد. هەر لەم رووداوەشەوە، بەرۆنی دەرکەوت، کە ئەو ئێرانییانەی لە هەولێر دەستگیرکران، دیپلۆمات نەبوون، بەڵکو ئەندامی پلە بەرزی "سوپای قودس"ی سەر بە پاسدارانی ئێران بوون، وەك لەم ناسنامەیەدا دەردەکەویٚ، کە هی یەکێکە لەو پاسدارانەو، لەلایەن ئەمریکاوە، وەك بەڵگە خرایە بەرچاو. یەکێك لە گیراوەکان، سەرتیپ "قایمی"یە، کە دەگوتریٚ گەلێك لە ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی لە نەوەتەکاندا لەسلێمانی و هەولێر کوشتووە. (سەرنج: ناسنامەکە بە فۆتۆکۆپی لە رۆژنامەی "میدیا"دا بلأوکراوەتەوە.

هەرچەندە ئەمریکییەکان؛ هەموو ئەو نێچرانەیان دەستنەکەوت، کە کوتوپڕ چوونە سەریان؛ چونکە، ئەوان بەر لە هەموو شتێك، دەیانویست پاسدار سەحرارووەدی بگرن، کە چەند رۆژێك لەوەپێش لەسلێمانی و هەر ئەو رۆژەش لەهەولێر بووبوو.

سەرحرارووەدی ئەو کەسەیە کە تۆمەتی شەهید کردنی ئەورەحمانی قاسملو دەخرێتە پالی. لەگەڵ ئەوەشدا، بەڵگەی وا گرنگ کەوتە دەستیان، کە توانیان ئیسپاتی بکەن، ئەو بۆمبایانەی سەربازەکانی ئەمریکای پێدەکوژرێن لەعێراقدا، لەئێرانەوە دەنێردریٚ بۆیان. سەیر ئەوەیە، ئەم رووداوە، دڵی ئەمریکای لە سەرکردەکانی پارتی و یەکێتی پیسکرد، کە گوایە، ئەوان خۆیان بە دۆستی ئەمریکا دەدەنە قەڵەم، کەچی، داڵدەی دوژمنانی ئەمریکا دەدەن لە هەولێرو، ئەوجا ئەمریکییەکان، بێگویدانە ئەوەی پێیدەڵێن "سەروەرێتیی هەرێم"، لەهەولێر دەستیانوەشاند لێیان. مەلاکانی ئێرانیش دڵیان لە سەرکردەکانی کورد یەشا کە نەیانتوانیوە کاربەدەستەکانیان بپارێزن. ئەمەش ئەوەیە کەنێویاننناوە "سیاسەتی حەکیمانە"ی کاربەدەستانی هەرێم!.

شایانی باسە، ئەو زانیاریانەی کە لەبارەی هاتوچووی ئەم پاسدارانەوە بە باشووری کوردستان و عێراقدا، کەوتنە دەست ئەمریکاییەکان؛ لەلایەن "موجاهدینی خەلك"ەوە بە ئەمریکاییەکان دران. هەر لەبەر ئەوەشە، کاربەدەستە شیعەکانی عێراق، لەم رۆژانەداو، لەژێر گوشاری ئێراندا، زۆر هەولی دەرکردنی "موجاهدین" دەدەن لەعێراق، بە بیانووی ئەوەوە کە رێکخراوێکی تیرۆریستین و دەسکەلای سەددام بوون

بۆ کوشتنی کوردو شیعەی عێراق. بەڵام هێندەك لە سەرکردە سوننەکانی عێراق، زۆر لە دژی ئەوەن، ئەوەش، نەك لەبەرخاتری "موجاهدین"، کە سوننیەکان بە فارس‌و دوژمنی عەرەب دەیاندەنە قەڵەم، بەڵکو لەرکی شیعەکان‌و ئێران، چۆنکە ئەوانیش بەتەمان "موجاهدین" جارەکی دی دژی کوردو شیعەی عێراق‌و ئێران بەکار بێنن.

ئەم راوە "پاسدار"ەی ئەمریکا لە هەولێر، دەستی گەلێك لایەنی سەر بە رژێمی ئێرانی خستەڕوو، هەڵوێستی مالیکیشی لەقکرد، کە ناوێری دەست لە "لەشکری مەهدی بکاتەوە"، چۆنکە پێویستیی بە دەنگی پەرلەمانتارەکانی فەقێ موقتەدایە، بۆ راگرتنی حکوومەتەکەی. لەبەر ئەوە؛ نامەیەکی نووسی بۆ فەقێ موقتەداو، پاڕایەوە لێی کە خۆی‌و سەردەستەی چەکدارەکانی روو لەئێران‌و خوارووی عێراق بکەن، بەنیازی رێکردنەوە بۆ سەرکەوتنی نەخشەی نوێی جۆرج بوش‌و لەشکری عێراق بۆ بەربەرەکانیی تیرۆریستەکان، کە دیارە دەبێ هەر سوننییەکان بگرێتەوە. ئەوجا ئەوەبوو، چەند هەواڵێکی ناکۆك‌و دژ بەیەك، چ لەلایەن رژێمی ئێران‌و، چ لەلایەن داروودەستەی فەقێ موقتەداوە، بڵاوکرانەوە، لەبارەی ئەوەوە، کە ئایا، جەنابی فەقێ (کە لەم رۆژانەدا لەرۆژنامەیەکی ئەڵمانیدا کرابوو بە "ئایەتوڵڵا") لەئێرانە، یان نا. ئەمەیان لەلایەك‌و، لەلایەکی دیکەشەوە، گەلەکۆمەی سەرۆکهۆزە عەرەبە هاوردەکانی کەرکووك‌و، تورانییەکانی پیاوی ئەنقەرەو، نوێنەرەکەی فەقێ موقتەدا لە کەرکووك‌و، بۆمبا تەقاندن لە ئیمام قاسم‌و رەحیماواو شوێنانی دیکەی کەرکووك‌و رشتنی خوێنی خەڵکی رەشوڕووتی بێگوناهی کەرکووك‌و، چوونی وەزیری دەرەوەی مەلاکانی ئێران بۆ ئەنقەرەو دیمەشق‌و، هەوڵدان بۆ دروستکردنی بەرەیەکی بەعس‌و شیعەو تورانی دژی کوردو، هەر لەو کاتەشدا تامیتامیدانی کورد لەلایەن رژێمی ترکەوە، بەوەی گوایە ئەردۆخان ئامادەیە، لەگەڵ کاربەدەستانی هەرێم بکەوێتە وتووێژ، کە هیوام وایە، ئامانج لەمە، چاوپۆشیی لە گەلکوژیی کوردی باکوور نەبێ، بەدەمشیرینکردنی بەرپرسیارانی کوردی باشوور، بەمەبەستی سووت وەرگرتن لە بێدەسەڵاتی‌و چاوەڕوانی‌و خوا کەرێمی‌و گەندەڵیی‌و حیزبحیزبێنەو خزمخزمێنەو مێشککوێخایی ئەم بەرپرسیارانە. ئەمانە هەمووزەنگی مەترسین‌و ئەوە دەخەنە بەرچاو، کە ئەگەر نەخشەکەی بوش سەرکەوت‌و، عێراقی یەککگرتوو بەسەرۆکایەتیی

"لەشکری مەهدی"و "سوپای بەدر" کەوتەوە سەرپێ، ئەوا، دۆزەخێك بۆ کورد دروستدەکەن، ئەگەر کوردستان لەشکرێکی بەهێزی سەربەخۆی نەبێ. خۆ ئەگەر نەخشەی بوش سەرینەگرت، دەبێ ئەو کاتەش هەر ئەو لەشکرە کوردستانییە هەبێ، نەك هەر بۆ ئەوەی پێش بە مەرگەساتی خەڵکی کوردستان بگرێ‌و بەس، بەڵکو، کەڵك لەو هەل‌و مەرج‌و ئاژاوەیەش وەربگرێ، کە لە هەڵگیرسانی ئاگری سۆرەوە روودەداو، کارێکی واشبکات، کە ئەو چاڵەی رژێمە تیرۆریستە داگیرکەرەکانی کوردستان بۆ خەڵکی کوردستانیان هەڵکەندووە، خۆیان تێیبکەون، چونکە، هیچ دوور نییە، ئەو دەمە ئەمریکا، وەك گایەکی بریندار بوو، پەلاماری ئێران‌و، ئیسرائیلیش پەلاماری سووریا بدات‌و، شەڕکەرەکانی "قاعیدە"ش لەولاتی ئەناتۆڵدا بکەونە چالاکی دژی رژێمی تۆرانییەکان، کە سەرەتای ئەوەش لەم رۆژانەدا دەرکەوتووە. ئەو دەمە رژێمی رووسیای دیکتاتۆر پووتین، بە خەیاڵی خاوی سەردەمی ئیمپراتۆرێتی بابردووی سۆڤێت‌و، بۆ بەرژەوەندیی شۆڤێنستانەی رووس، ئاگری شەڕەکە خۆشتر بکاو، لەمەوە جەنگێکی جیهانیی گشتلاگیر رووبدات، کە ئەگەر کورد، هەر لە ئێستەوە، چ لەباری ستراتیژی لەشکری‌و، چ لەباری ئاسایشی نەتەوەیی‌و، چ لەباری یەکێتیی نیشتمانی‌و هاوسەنگێتیی تەواوی خەڵکی کوردستانەوە، خۆی ئامادە نەکردبێ بۆ ئەو رۆژە، ئەوا، مایەی دەبێتەوە مایەی پیاز فرۆش.

بەڕاستی، جێی داخ‌و خەفەتە، کە مێژووی فەرمانڕەوایی حیزبەکانی باشووری کوردستان، لەم پانزە ساڵەی دواییەدا، کە بەدەنگی زۆربەی هەرەزۆری جەماوەری کوردستان هاتنە سەرکار، مێژوویەکی خۆکوژی‌و هەڵمەتە کاسەیی‌و، گەندەڵی بەڕێوەبەرێتی‌و پڕ کردنی ورگ‌و گیرفانی بەرپرسیاران بوو، لەسەر حسێبی برسیکردنی خەڵکی رەشووڕووتی کوردستان‌و، کەمتەرخەمی بەرامبەر دابینکردنی بنەما سادەکانی ژیانێکی شارستانییانە، وەك ئاوو کارەباو سووتەمەنی‌و دەرمان‌و پۆستەو، ئەوجا، گرانیی لە سنووربەدەری پێویستییەکانی رۆژانە، وەك خواردن‌و خواردنەوەو، پشتگوێخستنی داخوازییە رەواکانی لاوان‌و قوتابیان‌و خوێندکاران‌و کرێکاران‌و ژنان‌و، ناهومێدکردنی خەڵکی ولات، بە جۆرێك کە لەبێدەرەتانیدا پەنابەنە بەر کەرەسە بێهۆشکەرەکان‌و خواردنەوە کهوولییەکان‌و جگەرەکێشان‌و،

ئەوجا، خۆسووتاندنی کچان و ژنان، لەتاو بێبەشتیوانی و زۆرداریی کەرپیاوان و، لەناچارییدا، بیرکردنەوە لە بەجێهێشتنی نیشتمان. ئەمانە، هەریەکەیان دەردێکە، کە ئەگەر خوانەخواستە، رۆژێك هات و قەوما، ئەوا زۆر زەحمەتە باوەڕ بکرێ بەوەی کە، خەڵکی کوردستان، جارەکی دی بەسەرکردەیەتیی ئەم حیزبانە بکەونە بەرخۆدان، بەڵام ئاشکرایە، هەر کاتێك چارەنووسی کوردستان؛ بکەوێتە سەر دووڕێیانی مان و نەمان، ئەوا هەموو خەڵکی بەتەنگەوە هاتوو و بەرۆمەتی کوردستان و، هەموو کوردستانییانی نێو جیهان، دەکەونە بەربەرەکانی وتەکان بەخۆدان. ئەوجا بۆ ئەوەی خەڵکی کوردستان لەیەك بەرەداو، بۆ هێنانەدی ئامانجێکی نیشتمانی، نەك حیزبایەتی و، لەسای سێبەری لەشکرێکی دڵسۆزو کارامەی نیشتمانپەروەر، نەك حیزبپەروەر، بکەونە کار، ئاشکرایە، دامەزراندنی ئەو لەشکرە، بەزووترین کات، ئەرکێکی پێویستە. ئەم کارەش، لەرۆژێکی وەك ئەوڕۆدا، لە کردن دێ، بەڵام لەوانەیە، لەکاتێکی دیکەدا سەرنەگرێ. لەبەر ئەوە، دەشێ، دەستوبرد بکرێ لێی. ئەگەرنا، ناردنی چەند "لیوا"یەك سەرباز لە کوردستانەوە بۆ بەغداو خوارووی عێراق بەفەرمانی نووری مالیکی و بەنێوی "لەشکری عێراق"ەوە، بەڕای من، بەزیانی کورد تەواو دەبێ، بەڵام ئەگەر لەشکرێکی پێشمەرگەی کوردستانی دابمەزرێ و بەمەرجی رێکەوتنێك لەنێوان ئەمریکاو سیاسەتکارانی عێراق و "ل.پ.ك"دا، سەربازی کورد رەوانەی ئەو شوێنانە بکرێ، ئەوا کەلکێکی باشی دەبێ بۆ مسۆگەرکردنی دواڕۆژی کوردستان.

لەکۆتایی ئەم وتارەدا، دەبێ جارەکی دی ئەوە بهێنمەوە بیر کە کورد نابێ پشت بە ئەمریکا ببەستێ بۆ ئەوەی بیانپارێزێ. ئەمەش راستییەکە، کە کاربەدەستانی بەڕێوەبەرێتیی جۆرج دەبلیو بوش، بەئاشکراو بێپەردە، بە بەڕێز قوباد تاڵەبانییان راگەیاندووە، کە نوێنەری حکوومەتی کوردستانە لە ئەمریکا (خەبات ژ 2414، 2/19، ل3). بێجگە لەوەش ئەمریکا لایەنی سیستەمی فیدراڵی ناگرێ، بەڵکو هەوڵی عێراقێکی سەنترالیستی یەکگرتوو دەدات و، دژی ئەوەش نییە کە دەستووری عێراق بەدڵی سوننەکان بێتە گۆڕان. ئەوەش دەبێ بگرینە بەرچاو، کە ئەمریکا، ئەگەرچی هیچ گەرەنتییەك بە کورد نادات، لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر ناڕازییە لە پێوەندیی نێوانی

کاربەدەستانی پارتی و یەکێتی بە ئێران و سووریاوە. چەند جارێکیش لە هەولێرو لەسەر ڕێی مووسڵ و هەولێر بەناڕەوا دەستی لەکورد وەشاندووەو کوردی کوشتووە. کاربەدەستانی کوردیش نەیانتوانیوە هیچ بکەن و بە "هەڵە" لە قەڵەمیان داوە. دوا دەستوەشاندن لە کورد، ئەو پەلامارەبوو کە سەربازەکانی ئەمریکا کردیانە سەر پاسەوانەکانی مەڵبەندی ی.ن.ك لە مووسڵ و ژمارەیەکی زۆریان کوشت. دەبێ ئەوەش بزانین کە پاش جەزرەبەی هەولێرو دوای ئەوەی ئەمریکا ڕازی نەبوو بە تکای، مام جەلال پاسدارەکانی ئێران بەربدا، چەند سەربازێکی ئەمریکایی لەدەوروبەری بەغدا گیران و پاش چەند ڕۆژێك تەرمەکانیان دۆزرایەوە. ئێستە ئەم پرسیارە سەرهەڵدەدا، ئایا کوشتنی پاسەوانەکانی یەکێتی لە مووسڵ تۆڵەسەندنەوەیەك بوو لە ی.ن.ك، یان "ڕێکەوتێك" بوو، وەك ڕیکەوتەکانی دیکە؟ ئەوەش دەبێ بێژم، کە ڕۆژنامەیەکی ئەمریکایی لەسەروبەندی گرتنی پاسدارە ئێرانییەکاندا، بەرەخنەگرتنەوە لە کورد، نووسیبووی: "دۆستەکانمان، دۆستی دوژمنەکانمانن".

بەرلین 2007/2/22

**میدیا**، ژ 279، 2007/2/27

# گەورە ئاو دەڕژێنێ، بچووك لێی هەڵدەخلیسكێ

هەرکە هەواڵی بردنەوەی جامی نەتەوەکانی ئاسیا لەلایەن تیمی عێراقەوە گەیشتە باشووری کوردستان، ئێدی بەجارێك ئەرز قلێشایەوەو، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە لاوان‌و مێرمندالانی کوردو زۆر لەو عەرەبانەی روویانکردووەتە کوردستان، رژانە سەرشەقامەکان‌و کەوتنە سەماو هەڵپەرکێ‌و لەپڕ، وەك لە ئاسمانەوە باریبێ، هەزاران ئالای عێراق بەرزکرانەوە. تەنانەت هێندێك لەسەماکەران، بەشێوەیەکی نیوەڕووت بەسەر ئۆتۆمبێلەکانەوە دەبینران کە چەپڵەیان لێدەداو، قوونیان بادەداو، سەرکەوتنی عێراقیان پیرۆز دەکرد. لەنێو ئەمانەشدا، ژمارەیەکی هەستپێکراو، لەوانەی بوونەتە "عەرەبی سلێمانی"بە عەگال‌و دیزداشەوە دەبینران.

ئەم رووداوە ناکاوەو بەو شێوە بەربڵاوە چاوەڕواننەکراوە، ناوکی هێندەك لە کاربەدەستانی هەرێمی خست، بەتایبەتی لە هەولێرو دهۆك‌و، تووشی سەرەگێژییەکی وای کردن_کە نەیاندەزانی بێژن: "ئەرێ ئەمە چەس؟" چۆنکە ئەوەتە سالانێکە لەو دوو شارە، ئالای کوردستان لەسەر فەرمانگەکانیان هەڵدەکەن‌و، رێ بە هەڵکردنی ئالای عێراق نادەن، بەو پێیەی کە ئەو ئالایەی ئێستەی عێراق ئالای بەعسەو ئەنفالی لەژێردا کراوە، کەچی ئەوەتە نەوەی ئەوانەی ئەنفالکراوە لێیان، بەو ئالایەوە سەرچۆپی دەکێشن، ئەمەش نەك تەنێ لەهەولێری "هۆلاکۆ بەزێن"و سلێمانی "شاری هەڵمەت‌و قوربانی"، بەڵکو لە هەڵەبجەی شەهیدیش. ئەی باوکەڕۆ... باوکەڕۆۆۆ...ی بەرپرسان.

ئەز بەش بەحاڵی خۆم باوکەڕۆ ناکەم، ئەمەش بە شتێکی سەیرو سەمەرەو چاوەڕواننەکراو نازانم، گوناهی ئەو مێرمنداڵ‌و گەنجانەش ناگرم کەوا ئەو هەستە عێراقخوازانەیە دەردەبڕن، بەڵکو بە ئەنجامێکی تەواو ئاسایی سیاسەتی

کاربەدەستانی هەرێمی دەبینم، کە ئەوەتە شانزە ساڵە، گاڵتەی ڕۆژگار، ئەرمانڕەوایی هەرێمێکی پانو بەرینی خستووەتە بەردەستیان،بەڵام ئەوان ەباتی ئەوەی ئەو هەلە بقۆزنەوە بۆ پێداگرتن لەسەر بڕیاری چارەنووسی کوردستانو، لابردنی کولتووری بەعسو هێنانەکایەی پەروەردەیەکی نیشتمانپەروەرانەی کوردستانیانەی ئازادیخواز لە قوتابخانەکانو زانستگەکانو مزگەوتەکانو شوێنە گشتییەکانو فەرمانگەکاندا، هەر لەسەرەتاوە، هەردوو حیزبی دەستڕۆیشتوو، کەوتنە دانە جیرێ لەیەکو، ئەوجا، شێتانە دەستیاندایە بینەقاقای یەکدیو، لایەنگرەکانی خۆیان بەدوژمنایەتییو تینووکردن بەخوێنی یەکدی گۆشکردو، بە هەستی عێراقچێتیو مشەخۆرییو هەڵمەتە کاسەییو گەندەڵیی بەڕێوەبەرێتیو هەر کەس بۆ گیرفانی خۆ، خەڵکیان پەروەردە کردو، ئەوەبوو لەشکری بێگانەی سێ دەوڵەتی داگیرکەریان هێنایە ئەو هەرێمەی کە نێویان نابوو "ئەوای ئارام" یان "هەرێمی ئاسایش". لەکاتێکدا کە ڕەشوڕووتی کورد لەبرساندا کەلوپەلی نێو ماڵی خۆیان لەسەر جادە هەراج دەکرد، ئەمانە دارایی هەرێمیان دەدا بە گوللەو دەیاننا بە سنگی یەکدیەوەو، لەئەنجامی ئەوەشەوە، هەزارانو هەزاران گەنجو مێرمنداڵو تەنانەت پیرەمێردو پیرێژنی کوردستان، وڵاتیان بەجێهێشتو ڕوویانکردە هەندەرانو، خۆ ئەگەر پرۆژەی "نان بە نەوت" نەبووایە، ئێستە هەر خۆیانو کەسوکاریان لە کوردستاندا مابوون.

بیانوو گرتن بە بەڵگەی ئەوەی ئاڵای ئەوڕۆی عێراق "ئاڵای بەعسو ئەنفالەو دەبێ عێراق ئاڵایەکی نوێ بەکردن بدات، یان ئاڵاکەی سەردەمی شانشینێتی (ملکیة)، یان هی سەردەمی قاسم، بخرێتەوە کار، بیانوویەکی زۆر نابەجێیە. چونکە خەڵکی عێراق بڕیاری خۆیانداوەو، ئەوەتا زۆربەی هەرە زۆری شیعەکانو سوننەکانی عێراق، ئەو ئاڵایەی سەردەمی سەددام هەڵدەگرنو بە نیشانەی

خۆیانی دەزانن‌و، بەچاوی خۆشمان دیمان کە بەدەیان هەزار کوردیش هەر ئەو ئاڵایە لە بۆنەکاندا هەڵدەگرن. پاشان، ئایا لەژێر ئاڵای سەردەمی مەلیکدا، کوردستان‌و، بەتایبەتی نێوچەی بارزان بۆمبابارانن نەکرا؟ بۆچی لەسەردەمی قاسم‌و لەژێر ئاڵای قاسم‌و، لەشۆڕشی ئەیلوولداو، تا قاسم کوژرا، کوردستان بۆمبابارانن نەکرا؟ کەواتە، بۆچی دەبێ ئەو دوو ئاڵایە باش بن‌و، ئاڵای بەعس خراپ بێ؟ جیاوازییان چییە؟ دوژمن‌و کوردکوژ هەریەك بابەت نین؟ باشە! خۆ لە سلێمانی هەتا ئەم دووایییەش‌و،هەتا دوو زلحیزبەکە جووتیان نەبەستبوو، ئاڵای کوردستان لە پاڵ ئاڵای بەعسدا دادەنرا. بێجگە لەوەش کەسانێ وا راستبوونەوە کە دەیانگوت دەبێ ئەو ئاڵایەی کوردستان بگۆڕدرێ،چۆنکە ئەو ئاڵایە بوونی هەموو پێکهاتەکانی کوردستان دەرنابڕێ‌و، ئەوەبوو لە "میدیا"دا وتارێکم لەبارەی ئاڵای کوردستانەوە نووسی ("میدیا" ژمارە 265، 2006/11/14)و لەوێدا باسی مێژووی پەیدابوون‌و ئەم دەست‌و ئەو دەستکردنی ئەو ئاڵایەم خستە بەرچاوو، پیێشانمدا کە ئەو ئاڵایە ئاڵای کوردستانە، وەك خاك‌و نیشتمان، نەك ئاڵای نەتەوەییی کورد بە تەنێ. بەکورتی: هەر ئاڵایەك کە ئاڵای عێراق بێ‌و کوردستان بە زۆر بە عێراقەوە ببەستێتەوە، هەروەك ئاڵای بەعس‌و قاسم‌و مەلیك وایە.

ئەو رەخنەیەی کە هێندێك کەس دەیگرن لە هەڵگرانی ئاڵای عێراق‌و، بە خاین‌و بێ ئاوڕوو و پیاوی بێگانەو هەلپەرست دەیاندەنە قەڵەم‌و دەبێژن"ئەو جەماوەرەی کە رۆژێك بوو 98٪ی دەنگی بۆ سەربەخۆییی کوردستان دەدا، کەچی ئێستە بە ئاڵای عێراقەوە بۆ سەرکەوتنی عێراق لە تۆپانێدا هەڵدەپەڕن"، "بێ حەیان". ئەو رخنەگرانە، ئەوە ناهێننە بەرچاو، کە هەر ئەوانەی ئەوکاتە دەنگیان دا، هەر لەیەك کاتدا بۆ عێراقیش‌و بۆ کوردستانیش دەنگیان دا. ئەمەش

جۆره نێره مووکێتی سیاسییه‌یه که سیاسه‌تکارانی ئه‌م دوو زلحیزبه، په‌نجا
ه پێوه‌ی ده‌ژین‌و خه‌ڵکی پێ په‌روه‌رده ده‌که‌ن. پاشان گشتپرسیی
فراندوم) بۆ چاره‌نووسی کوردستان، بیرۆکه‌ی پارتی‌و یه‌کێتی نه‌بوو، به‌ڵکو
که‌ی کۆنگره‌ی نیشتمانیی کوردستان بوو که له‌نێوه‌ڕاستی هه‌شتاکاندا بانگی
داو، له‌کۆنگره‌ی له‌نده‌ن له ئۆکتۆبه‌ری 1998دا به‌ده‌نگی تێکڕای سه‌تان
داری کۆنگره، پشتگیریی لێکراو، درایه ده‌ست حکوومه‌تی کوردستان، که
ده‌مه هه‌ر گوێشیان نه‌دایێ، به‌ڵام دوایی‌و پاش که‌وتنی ڕژێمی سه‌ددام‌و
ڕکبوونی سه‌نگیان له "مجلس الحكم الانتقالي"دا، ئه‌مه‌یان به‌کارهێنا، وه‌ك
تێکی گوشار. ئه‌گه‌رنا هه‌ر ئه‌مانه بوون که به هه‌زاران کوردیان له ده‌ره‌وه‌ی
دستان‌و، به ئاڵای کوردستانه‌وه نارد بۆ ده‌نگدان بۆ ده‌ستووری عێراق، ئه‌و
ستووره‌ی که به‌رپرسه‌کانیان ده‌یانگوت: ئه‌وی ده‌نگ نه‌دا بۆی، خاین‌و
ه‌ری بێگانه‌یه‌و، منیش ده‌مگوت "ده‌ستوور بۆ گه‌لێك‌و وڵاتێکه که ڕێز له
ستوور بگرێ". ئه‌وه‌ته ئه‌وڕۆ ئه‌و ده‌ستووره که له‌لایه‌ن زۆربه‌ی زۆری خه‌ڵکی
اقه‌وه ده‌نگی بۆ دراوه، ناخرێته کارو ڕێزی ناگیرێ‌و داوای گۆڕینی ده‌کرێ،
اییه‌تی له‌و خاڵانه‌دا که پێوه‌ندییان به مافه بنچینه‌ییه‌کانی کورده‌وه هه‌یه.
ه، کاممان له‌سه‌ر هه‌ق بووین؟ بۆچی دان به‌وه دانانێن‌و ناڵێن:"بابه ئێمه
ه بووین‌و خه‌ڵکیشمان به هه‌ڵه‌دا برد"، ئه‌وجا با هێنده ویژدانیان هه‌بێ‌و
ده‌بن بۆ لێپرسینه‌وه‌و، گه‌نجان‌و منداڵان‌و مێرمنداڵان گوناهبار نه‌که‌ن، که
یه عێراقچێتیان کردووه و ئاڵای عێراقیان هه‌ڵگرتووه،چۆنکه عێراقچێتی
ئه‌وه به میرات ماوه‌ته‌وه بۆ ئه‌مان.

دێکی پێشینانی کوردی هه‌یه ده‌بێژێ:"به‌مارو تێشکاوه، به سیچکان
ده‌ستێته‌وه". کاربه‌ده‌ستانی هه‌رێم، هه‌تا ئه‌وڕۆ له هیچ گۆڕه‌پانێکدا

سەرکەوتوو نەبوون– نە کێشەی کەرکووکیان بۆ سووتی کەرکووکییەکان‌و هەموو خەڵکی کوردستان چارەسەر کرد، نە کونی بۆگەنی گەندەڵیی بەڕێوەبەرێتی‌و بەرتیلخۆری‌و خزمخزمێنە‌و حیزبحیزبێنەیان بە دەمەوانەیەکی هاوچەرخانە‌و دادپەروەرانە بەست‌و، نە توانیان سادەترین خزمەت، وەك ئاوو کارەباو سووتەمەنی‌و دەرمان‌و پۆستە بۆ خەڵکی لێقەوماوی کوردستان دابین بکەن‌و، نە سنوورێکیان دانا بۆ ئەو پیاوانەی کە ژنکوشتن‌و ئاو خواردنەوە وەك یەکە بەلایانەوە. ئیدی مرۆڤ چاوەڕوانی چ بکات لە گەنجان‌و مێرمندالانی کوردستان کە لە هەموو خۆشییەکی ئەم ژیانە بێبەشن. با جارێ ئەم کێشانە چارەسەر بکەن‌و خۆیان واز لە عێراقچێتی بێنن، ئەوسا خەڵك بەشانازییەوە ئاڵای کوردستان هەڵدەگرن.

لە نەورۆزی ساڵی 1965دا، ئێمە، چەند برادەرێك لە ئەوروپا، یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا ,نوکسە NUKSEمان دامەزراندو، هەر لەسەرەتاوە بڕیارماندا لە هەموو کۆبوونەوەو سەمینارێکدا بە مارشی کوردستان دەستپێبکەین‌و، بۆ هەموو خۆپێشاندانێك ئاڵای کوردستان لەگەڵ خۆمان ببەین‌و، لەمەشدا تووشی گەلێك گاڵتە پێکردن‌و نێوونەتۆرەی وەك شۆڤێنی‌و فاشستی‌و چی وچی دەبووین، لەلایەن ئەوانەوە کە ئەوڕۆ بوونەتە بەرپرسیارانی حیزبەکان. تەنانەت لەساڵی 1991داو لەکاتی گەلرەوەکەدا، کە بە هەزاران کورد لەسەر شەقامەکانی ئەوروپا داوای پاراستنی کوردو سزادانی ڕژێمی سەددامیان دەکرد، لایەنگرانی کۆنگرەی نیشتمانیی کوردستان لە لەندەن، وەك ڕێکخراوەکانی دیکە، هاتنە سەرشەقام‌و، لە خۆپیشاندانداندا ئاڵای کوردستانیان بەرزکردەوە، کەچی خێزانی سەرکردەیەکی گەورەی یەکێك لە حیزبەکان

ووی:" ئەو پەڕۆ پیسە داگرن". پێشمەرگەی دێرین بەڕێز سابیر کۆکەیی
ووی: "داگرتنی ئەو ئاڵایە دەبێ بەسەر لاشەی مندا بێ".
ام، بەو هەموو زۆرو زۆنگەیەوە، نەیتوانی سلێمانی بعەرەبێنێ، بەڵام ئەوەتە
ی سەری ئەم زلحیزیانەوە کە پێیاندەڵێن "حیزبی ناسیۆنالیستی کورد"،
ە قسەی کاربەدەستانی سلێمانی خۆیان، 13٪ ملکی ستانی سلێمانی بووە
کی عەرەبەکانو لە پارکەکانو چایخانەکاندا تا گۆرانیی عەرەب وەستابێ
خاتری عەرەبە دەوڵەمەندە راکردووەکان، کە بوونەتە خاوەنی سلێمانی،
یی کوردی نابیستریۆ، هەتا کرێکارێکی هەرزانی بێگانە وەستابێ، کار
ت کرێکارێکی هەژاری خەڵکی سلێمانی ناکەوێ. هاکا زۆربەی زۆری
تووانی سلێمانیو هەولێرو تەنانەت قەزاو گوندەکانیش بوون بە عەرەبو،
ەدوای یەك قوتابخانەی عەرەبی دەکرێتەوە بۆیان. ئەمەش گوناهی گەنجو
ی کوردی ئەو شوێنانە نییە، ئەگەر بچنە قوتابخانەی عەرەبیو خۆیان
بێنن. گوناهی ئەوانەیە کە کوردستانێکی سەربەخۆ کە لە سێ ستان
تبوو، بێ پرس بە خەڵکی ئەو شوێنانەو، بێ رەچاوگرتنی چارەنووسی
ی کوردستانو، بێ هیچ گەرەنتییەکی نێونەتەوەیی، بەستیانەوە بە
ەوەو، بەشانازییەوە، دەهۆڵیان بۆ عێراقو عێراقچێتی لێداو ئاوێکیان رشت
ئێستە منداڵو مێرمنداڵو گەنجی چارەڕەشی کوردستان، پێیان
خلیسکێ لێی. پێشنیان راستیان گوتووە: "گەورە ئاو دەرژێنێ، بچووك
دەخلیسکێ".

ن 2007/8/9
ژ 302، 2007/8/14

له زنجیرەی ئەم کۆبەرهەمەدا تا ئیستە ئەمانەی خوارەوە بلاوکراونەتەوە:

1- ژمارە (1) هیندیك لە کیشە بنەڕەتییەکانی قوتابخانەی کوردیی سۆسیالیزم/بابەت بیرکاری وتیۆری ژمارە (1) بەرگی یەکەم، چاپی دووەم – هەولیر کوردستان 2001 بلاوکراوی رۆژنامەی "میدیا" ژمارە (2) چاپی یەکەم-بلاوکراوەی "سۆکسە" لقی سوید ستوکهۆلم، 2596ك/1984ف.

2- ژمارە (2) بیری نەتەوەییی کوردی، نە بیری "قەومیەت"ی رۆژهەلاتی ونە بیر "ناسیۆنالیزم"ی رۆژاوایی یە. بابەتی بیرکاری وپیتۆری ژمارە (2) چاپی دووەم لەندەن 2002 بلاوکراوەی کوردنامە، چاپی یەکەم 1984 ستۆکهۆلم.

3- ژمارە (3) کوردستان وشۆرشەکەی، چاپی دووەم (ئەلیکترۆنی) بە کوردی 2003 زنجیرەی سەمینارەکان وکۆرە زانستییەکان ژمارە (1) چاپی یەکەم بە زمانی ئەلمانی بلاوکراوەی NUKSE مونیخ 1972، چاپی یەکەم بە کوردی، سوید 1984.

4- ژمارە (4) ناسنامە وکیشەی ناسییۆنالی کورد لە چەند سەمینار وکۆرێکی زانستیدا بلاوکراوەی بنکەی کوردنامە-لەندەن 2002. زنجیرەی سەمینارەکان وکۆر زانستیەکان ژمارە (2). ئەم بەرهەمە پێنج بابەتی لەخۆگرتووە: 1-پێوەندارێتی کوردی 2- دۆزی ناسیۆنالی کورد 3- سەمیناری کوردستان، راپۆرتێك لە سە بارودۆخی ئێستەی نەتەوەی کورد وتوویژ لە سەر باری کوردستان. 4- کورد وشۆرش 5- بارودۆخی ئێستەی نەتەوەی کورد و پێشبینیی دوا ڕۆژی.

5- - المستضعفون الکرد واخوانهم المسلمون، سلسلة السمینارات والمحاضرات العلمیة رق (3)، الطبعة الثانیة، السلیمانیة-جنوب کردستان 2006، الطبعة الاولی-لند 1997 من منشورات کوردنامە.

6- ژمارە (6) زنجیرە وتارو وتوویژ لە گەڵ دەزگەی راگەیاندنی گشتی ژمارە (1) سلیمان 2006.

7- ژمارە (7) زنجیرە وتارو وتوویژ لە گەڵ دەزگەی راگەیاندنی گشتی ژمارە (2) سلیمان 2007.

# Introduction in English to this publication

My teacher and comrade in the liberation struggle of the Kur
people, Dr Jemal Nebez, has asked me to write an introductio
this book which I gladly do as it gives me the opportunit
thank him for his kindness and trust. This book is part of a se
The articles collected here all first appeared in the Kur
newspaper, Media of Hawler between 1999 and 2007.

Since this introduction is in English, I should like to mention
Jemal Nebez is known as the founder of the general lines of
Kurdish school of socialism, known as KAJYK-thought. He
born in the city of Sulaimani in Southern Kurdistan, know
the city of attack on tyranny and sacrifice for freedom. Ne
himself has always lived accordingly, applying all his migh
the Kurdish liberation by way of critical thought, explaining
ideas in a great number of meetings and seminars - in Kurdi
as well as in many European cities, and in beautiful Kur
easy to the ears of all Kurds. This, I must say, in addition to
numerous writings which also never stop getting the truth to
masses since they are always based on deep analyses of eve
and circumstance, beyond all personal, partisan, tribal
religious interests. Jemal Nebez, this great Kurdish thinker,
managed to predict so much, and is so infallible in
judgement, because it is the liberation of the Kurdish nation a
whole that he has in mind when dealing with so many differ
aspects of Kurdish politics, culture and life, as this collection
articles demonstrates well.

Still, the articles in this book contain an accurate picture of
events in Kurdistan. Nebez would not let any event pass with
a thorough investigation of its historical background, includ
the positive as well as the negative sides, including the good
well as the bad, because Nebez is not hypocritical. The articles

Nebez are not only stories of realistic events but they are a written history of the Kurdish people for the times they cover. He is thus a neutral and just historian. That does not mean that he is impartial towards his homeland and people. On the contrary and moreover, in his thinking he is always inclusive, not taken in by any Kurdish partisan, tribal and regional disputes.

There are a lot of other names besides Jemal Nebez in the Kurdish liberation movement, many of them empowered by billions of dollars or even armed forces. However, I regard Jemal Nebez' intellectuality the more powerful, because his continuous liberation stance has become an indestructible force.

Finally, I hope I have given this selfmade liberal thinker of truly national stance, Jemal Nebez, our teacher and comrade, his due, and I ask God to give him more power and old age to add more to what he has already achieved. Anyone who reads this part of his works or other parts will know what I have referred to in this brief introduction.

**Dr Jawad Mella**
**Chair of Western Kurdistan Association**

For information about other publications of Jemal Nebez, in English and in other languages) click the following link: **www.jemalnebez.com**

**Jemal Nebez**

# Collected Wo
# No-7
# Articles, Essa
# and Intervie
# with the Med
# No (2)

**First Edition: Hawler - 2007**